

زنجیرا تێگەهشتنەکا باشتر 107

مەوسووعەیا ئیعجازا زانستی د قورئانێ و سوننەتێدا 1

# نیشانێن خودێ د عەرد و عەسماناندا



د.محمد راتب النابلسي

وەرگێران: سیف الدین ئیسماعیل

مەوسووعەیا ئیعجازا زانستێن د قورئانێ و سوننەتێدا

# نیشانێن ( ئایەتێن ) خودێ
# د عەرد و عەسماناندا

د. محمد راتب النابلسی

وەرگێڕان

سیف الدین ئیسماعیل سەیدو

ناڤێ پەرتۆکێ: نیشانێن خودێ د عەرد و عەسماناندا

نڤیسەر: د. محمد راتب النابلسي

وەرگێران ژ زمانێ عەرەبی: سیف الدین اسماعیل سیدو

پێداچۆنا زمانی: محەمەد عیسا هرۆری

بەرگ: محەمەد حسێن

ژمارا سپاردنێ: (D-/٢٦١٥/٢١) سالا (٢٠٢١)

چاپا ئێکێ: ٢٠٢١ زایینی ١٤٤٢ مشەختی

تیراژ: (١٠٠٠) دانە

# ناڤەرۆك

**بابەت** **بەربەر**

## پشكا ئێكێ: پێشەكییێن پەرتووكێ



## پشكا دووێ: گەردوون

## پشکا سێیێ: رۆژ



## پشکا چارێ: عەرد

## پشكا پێنجێ: ئاڤ



## پشكا شەشێ: رووەك

## پشكا حەفتێ: گيانەوەر

## پشكا هەشتێ: ماسی



## پشكا نەهێ: بالندە

## پشکا دەهێ: مێشەوەر

# پشکا ئێکێ

# پێشەکیێن پەرتۆکێ

## ئیعجاز

خودێ مرۆڤ ب باشترین شێوە یێ ئافراندی، و قەدرگرتنەکا مەزن یا دایێ، و گەردوون یێ بۆ وی بەردەستکری، و عەقل یێ دایێ، و یێ ل سەر فیترەتەکێ دایی کو حەز ژ هەڤتەمامییێ دکەت، و دلچۆنێن دنیایێ یێن داینێ کا دێ یێ بهێن فرەهـ و سوپاسدار بیت یان دێ ب دویڤ ڤان دلچۆنان کەڤیت و گونەهکار بیت بەرامبەر فەرمانێن خودێ، و ئازادییا شیانان یا دایێ دا کارێ وی یێ ب بها بیت، و پەرتۆکێن ئینایە خوار کو تشتێن باش یێن حەلال کرین و یێن خراب یێن حەرام کرین، ئەڤە هەمی ژ بەر هندێیە کو مرۆڤ خودایێ خۆ بنیاسیت و پەرستنا وی بکەت، و دا یێ شاد بیت ب ڤێ پەرستنێ ل دنیایێ و رۆژا قیامەتێ.

هەقی دگەل ئافراندنا ئەسمانان و ئەردییە، و ئەوە تشتێ خۆجھ، و ئارمانجدار، بەروڤاژی نەهەقی و پویچییێ، چونکی ئەوە تشتێ کو دێ چیت و بێ رامان و ژ قەستا، هەقی بازنەیەکە چار هێل تێدا د سەرئێکرا دچن، هێلا ڤەگوهاستنا دورست، و هێلا ئاقلێ ئاشکرا، و هێلا فیترەتا ساخلەم، و هێلا ژیوارێ بابەتیی، ڤەگوهاستنا دورست گۆتنا خودایێ پاك و بلندە، دگەل رۆنکرنا پێغەمبەرێ پاراستی ﷺ، و ئاقلێ ئاشکرا تەرازییەکە خودێ یا ئافراندی و خودێ دایە مرۆڤی دا ب رێکا وی خوداێ بنیاسیت، و

فیترەت تەرازیەکا دییە و یا ئێکگرتییە د گەل شریعەتێ خودایی، و ئەو یا چاندییە د ناخێ مرۆڤیدا دا ب رێکا وێ خەلەتییا خۆ ئاشکرا بکەت، و ژیوار چێکرییێ خودێیە ل دویف وان یاسایان دچیت یێن خودایێ مەزن داناین، ڤێجا ئەگەر ئەڤ هەر چار تایە د بنیاتەکی بتنێ بن ئەو د ئێکگرتینە د ناڤبەرا خۆدا.

ئایینێ خودێ ب هەمی یاسایێن خۆڤە ل سەر دو بنیاتان ئاڤا دبیت، خودێ دبێژیت: ﴿وَمَا أَرْسَلْنَا مِنْ قَبْلِكَ مِنْ رَسُولٍ إِلَّا نُوحِي إِلَيْهِ أَنَّهُ لَا إِلَهَ إِلَّا أَنَافَاعْبُدُونِ﴾ [الأنبياء:٢٥]، ئانکو: (مە چو پێغەمبەر بەری تە نەهنارتینە، ئەگەر مە وەحی بۆ نەهنارتبیت، و مە نەگۆتبیتێ چو پەرستییێت راست و دورست ژ من پێڤەتر نینن، ڤێجا من ب تنێ بپەرێسن).

بنیاتێ ئێکێ: نیاسینا هەبوونا خودێ و ئێکاتییا وییە، و یێ بێ کێماسییە، و ئەو خودانێ باشناڤ و سالۆخەتێن بلندە، و ئەڤە ئێکتاپەرێسییە. و بنیاتێ دووێ: نیاسینا رێبازا وییە ژ بۆ پەرستنا وی کو ئەڤ چەندەیە ئەگەرێ هەبوونا مرۆڤی، و ئەڤە ژی پەرستنەکا هەلبژارتییە بۆ مرۆڤی ئانکو نەیا سەپاندییە، و یا تێکەلە ب ڤیانا دلی، بنیاتێ وێ زانینەکا راست و دورستە، یا تژییە ژ شادییەکا بێی دویماهی، و ئەڤ پەرستن و ئێکتاپەرێسییە گوپیتکا زانینێیە و پەرستن گوپیتکا کارییە.

خودێ کو خودانێ مەزنی و بلندییا تەکووز و تمامە (جل جلالە) گەردوون ب عەرد و عەسمانێن ویڤە یێ ئافراندی، و هەمی جیهان ژی، و ل سەر پشکا هەمییان مرۆڤ کو ل دویف سیستەمەکێ گەلەکێ هویربین ئافراندییە، و ژ دیارترینێ ڤان سیستەمان سیستەمێ ئەگەرییە، کو دویڤچۆنا دو تشتان دکەت: هەبوون و نەبوونە، ئێك بەری یێ دییە، ئەم دبێژینە یێ ئێکێ ئەگەر، و دبێژینە یێ دوێ ئەنجام، و ئەو تشتێ ڤی سیستەمێ جوان تەمام دکەت عەقلێ مرۆڤییە کو ل سەر شەنگستێ ئەگەرییێ هاتییە دانان، ئانکو عەقل د چ رویدانان ناگەهیت بێی ئەگەر، و ژ دلۆڤانییا خودێیە بۆ مە کو

ئەڤ سیستەمە د گەردوونیدا چێکری، و ئەو شەنگستێ د عەقلیدا هەی بەرێ مە ددەتە نیاسینا خودێ کو ئەو پەیداکەرێ ئەگەرانە، ئەگەر شوین پێ نیشانا رێڤەچۆنێ بن، و ئاڤ نیشانا بارانان بن، و عەسمان ب بورجێن ویڤە کو کۆمەکا ستێرایە ب شێوەکێ ئەندازەییىنە، و عەرد ب بەرزی و نزمییێن خۆڤە، ما ئەڤە نیشانێن زانا و شارەزایەکی نینن؟

و دیسا ژ دلۆڤانییا خودێیە بۆ مە کو ئەگەر د گەل ئەنجامان شێوەکێ خۆجهی و نەلڤینێ ددەنە گەردوونی، و رێکێ خۆش دکەن بۆ ڤەدیتنا یاسایان، و سالۆخەتێن خۆجە یێن تشتا ددەتێ داکو سەرەدەری د گەل ب ساناهی بکەڤیت، و ئەگەر چێببا ئەگەر و ئەنجام نە د گەل ئێك بان، و ئەنجام نە ل دویڤ رێزا ئەگەرا بان دا گەردوون بیتە شێوەکێ بەرەللایی و بێ رامانی (ژ قەستایی)، و دا مرۆڤ د رێکێن زانینێدا بەرزەبیت، و مفا ژ عەقلێ خۆ نەددیت، بەلێ ئەوێ هزر دکەت کو ب تنێ ئەگەرن ئەنجامان دورست دکەن، و پاشی ب تنێ پشتا خۆ ب ئەگەران راست دکر وی هەڤپشکی بۆ خودێ چێکر لەورا خودێ دێ منەتێ ل ڤی مرۆڤێ کەفتیە د ڤێ هەڤپشکییا ڤەشارتی کەت و دێ وی ئەدەب دەت ب کارئێخستنا کاریگەرییا وان ئەگەرێن وی خۆ پێ پشت راستکری، و دێ بۆ وی ئەنجامێن نەچاڤەرێکری هێن، و ئەو کەسێ دەست ژ ئەگەران بەردا و پشتا خۆ ب خودێ راست کر ـ وەکی هزر دکەت ـ وی گونەه کر، ژ بەر کو وی هزرا وی سیستەمی نەکر یێ کو گەردوونی رێك دئێخیت، و ژ بەر کو وی - ژ نە هەقی - دلێ خۆ برە وێ چەندێ کو خودێ بۆ وی ڤان یاسایان ژ کاربێخیت، و هندیکە مرۆڤێ باوەرداریێ راستەقینەیە دێ ئەگەران وەرگریت بێی کو باوەری هەبیت کو ب ڤان ئەگەران ب تنێ دێ ئەنجام ژێ پەیدا بن، و ل دویڤدا بێی پشت پێ بەستن دێ وەرگریت، و دێ پشت بەستنا خۆ دەتە سەر خودێ، و دێ د وێ باوەرییێدا بیت کو ب حەزکرنا خودێ یێن هەین، و ئەو تشتێ حەزکرنا وی ل سەر نەبیت ئەو تشت نابیت، و نە ب تنێ ئەگەرن دکێشنە ئەنجامان ئەگەر ب حەزکرنا خودێ نەبیت، و ئەڤە

ئێکتاپەرستییا ئەرێنییە، ئەوا کو ل دەڤ گەلەك باوەرداران نەهەی زێدەباری نە باوەرداران، خودێ دبێژیت: (وَمَا يُؤْمِنُ أَكْثَرُهُمْ بِاللَّهِ إِلَّا وَهُمْ مُشْرِكُونَ) [یوسف:١٠٦]، ئانکو: (بارا پتر ژ وان باوەرییێ ب خودێ نائینن، ئەگەر هەر د وی وەختیدا هەڤپشکان بۆ خودێ چێ نەکەن).

## بەلێ ئەڤ سیستەمێ ئەگەری هندەك جاران ژ کار دکەڤیت، کەنگی و چاوا؟

دەمێ مرۆڤەك دبێژیت: موحەممەد ﷺ پێغەمبەرێ خودێیە و یێ هاتی رێبازا خودێ بەلاڤ بکەت، دێ هەر مرۆڤ داخوازا بەلگەیان ژێ کەن کو ئەو پێغەمبەرێ خودێیە، و چاوا دهێتە سەلماندن کو پەرتۆکا وی یا ژ لایێ خودێڤە هاتی؟ و ل ڤێرێ دێ موعجیزە دیاربن دا کو ببنە بەلگە ل سەر راستگۆییا هنارتنا پێغەمبەری، و راستگۆییا رێبازا وی، و موعجیزە د هندەك پێناسێن وێدا یا هاتی سەرپێچییا یاسایێن گەردوونییە، و ب تنێ د شیانێن ئافرێنەرێ گەردوونیدایە، ژ بەر کو هەر وی ئەڤ یاسا و سیستەمە یێن دانایین، و ئەڤ موعجیزە بۆ پێغەمبەرێن خۆ یێن هنارتین دا ببنە بەلگە ل سەر راستگۆییا هنارتنا وان ژ لایێ خودێڤە، و ببیتە راستی د گەهاندنا پەیاما خودێدا، و موعجیزە چێدبیت یا بەر ئاقل بیت بەس نەیا بەرچاڤ و دیارە، و جیاوازی یا هەی د ناڤبەرا کو عەقل حوکمی ل سەر تشتەکێ مەحال بدەت، و بێ دەستهەلاتییا خۆ راگەهینیت ل سەر تێگەهشتنا ڤی تشتی، ئەو تشتێ ئەم نەزانین رامانا وێ ئەو نینە کو ئەو تشت د هەبوونێدا نینە.

بەلێ چو رامان بۆ ئاخفتنا ل سەر موعجیزان (کو شکاندنا یاسایا و عەدەتانە) و ل سەر پشکێن وێ، و رویدانێن وێ، و هزرکرنا خەلەت ل سەر وێ، ئەگەر بنیاتێ ئایینی یێ کو گرێدای باوەری ب خودێ و هەبوونا وی و ئێکتاپەرستییا وی نەبیت، و باوەری ب هندێ کو خودێ هەمی تشتان دزانیت، و ل سەر هەمی تشتان یێ پێچێبوویە، و پربکەرێ وی تشتییە یێ وی بڤێت، و ئەگەر ئەڤ چەندە بوو جهێ رەتکرنێ یان گۆمانێ چو رامان بۆ

ئاخفتنێ ل سەر موعجیزەیان ب هەمیڤە نینە، مرۆڤ بەردەوام د گەل ئێك دئاخڤن ل سەر بنیات و شەنگستێن ئایینی، و باوەردار ل سەر لقێن ئایینی دئاخڤن، و ئاخفتن ل سەر موعجیزەیان ژ لقێن ئایینییە، ڤێجا ئەگەز بنیات یێ ژبەرئێکچۆیی بیت چو مفا د بەحسکرنا موعجیزاتاندا نینە.

پاشی گەردوون ب گالاکسییێن خوڤە (مجرات)، و نیمچە گالاکسییێن خوڤە، و هەسارە و کلکدارێن خوڤە، و ب دویراتییا د ناڤبەرا واندا، و لەزاتییێن رۆناهییێ، و قەبارێ ستێران، و ب زڤرینا وان، و راکێشانا وان، و عەرد ب چیا، و دۆل، و دەشت، و دەریا، و کانی، و رویبارێن خوڤە، و ب گیانەوەر، و رووەك، و ماسی، و بالندە، و کانزا، و سامانێن خوڤە، و مرۆڤ ب عەقل، و هەست، و ئەندام، و کۆئەندام، و ب زکماکی (فیترەت)، و سروشت، و جوتینی (نێر و مێ) و دویندەها خوڤە، ئەڤە هەمی موعجیزەنە، و چ موعجیزە، ب ئاخفتنەکا کورت و ڤەبڕ، گەردوون ب عەرد و عەسمانێن خوڤە و ل دویف وی سیستەمێ نوکە یێ گەردوونی و بێی دەرکەفتنا وی ژ ڤی سیستەمی ئەڤە بخۆ موعجیزەیە، و چ موعجیزە، و بەلگە ل سەر ڤێ چەندێ وەکی خودایێ مەزن دبێژیت: ﴿إِنَّ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَاخْتِلَافِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ لَآيَاتٍ لِأُولِي الْأَلْبَابِ (١٩٠) الَّذِينَ يَذْكُرُونَ اللَّهَ قِيَامًا وَقُعُودًا وَعَلَى جُنُوبِهِمْ وَيَتَفَكَّرُونَ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَذَا بَاطِلًا سُبْحَانَكَ فَقِنَا عَذَابَ النَّارِ (١٩١) ﴾ [ال عمران:١٩٠ -١٩١]، ئانکو: (ب راستی چێکرنا عەرد و عەسمانان، و هاتن و چۆنا شەڤ و رۆژان نیشانن ل سەر هەبوون و دەستهەلاتدارییا خودێ بۆ کەسێت ژیر و ئاقلدار، [کەسێت ژیر و ئاقلدار] ئەوێت راوەستیایی [ل سەر پییان] و روینشتی و ل سەر تەنشتێ درێژکری، خودێ دئیننە بیرا خۆ و زکرێ خودێ دکەن و هزرا خۆ د چێکرنا عەرد و عەسماناندا دکەن، و دبێژن خودێوۆ [ئەڤ جیهانە] تە ژ قەستا چێ نەکریە. پاکی [ژ هەمی کێماسییان] هەر بۆ تەیە، ئێدی تو مە ژ ئاگرێ دۆژەهێ بپارێزە).

بەلێ ژ بەر مژویلبوونا مرۆڤی ب کارێن خۆڤە، و بێ ئاگەهییا وی ژ ئافرێنەرێ وی، و ژبەر کەهیبوونا وی بۆ ماوەکێ درێژ رویێ ئیعجازێ د گەردوونیدا ژ بیر کرییە، و یێ بێ ئاگەهبووی ژ مەزناهییا ئافرێنەری بۆ وان تشتێن ئافراندی، و مرۆڤ دێ یێ نەزان بیت بۆ ڤێ چەندێ، و ب سەرداچۆنا خۆ دێ وەسا هزر کەت کو موعجیزە بەروڤاژی وان تشتایە یێن ئەو دگەل کەهیبووی و راهاتی، پاشی ئەڤ مرۆڤێ نەزان دێ وی تشتێ دگەل کەهیبووی و راهاتی کەتە پیڤەرێ باوەرییا خۆ بۆ تشتان، یان گاورییا وی ب وان، و ئەڤە نەزانینەکا سەیرە ل دەڤ مرۆڤی، زێدەباری کو مرۆڤ گەهشتییە پەیسکێن بلند یێن مەدەنییەت و زانستی، هزرکرنەکا کێم دێ بۆ مرۆڤی باش دیارکەت کو ئافرێنەرێ خودان پایە و بلندی ئەڤ گەردوونێ ب موعجیزە یێ ئافراندی و ل بەر وی نەیا ب زەحمەتە موعجیزەکا دی ل سەر زێدەکەت، یان ب گوهۆڕیت، یان هندەك ژ سیستەمێ وی بگوهۆڕیت یێ کو ل دویڤ وی سیستەمی جیهان ئافراندی.

هندەك زانایێن رۆژئاڤای دبێژن: (ئەو هێز و شیانێن جیهان ئافراندی نەیا ب زەحمەتە ل بەر وی بۆ ژێبرنا تشتەکی ل گەردوونی، یان تشتەکی ل سەر زێدەکەت، خۆ هەکە ئەڤ جیهانە نەبا ژی)، و ئەگەر بێژنە زەلامەکی ژ وان یێ موعجیزەیان رەد دکەت: (دێ جیهانەکا سالۆخەتێن وێ ئەڤە و ئەڤە پەیدا بیت، ئێکسەر دێ بێژیت: ئەڤە نە بەر ئاقلە، و نائێتە هزرکرن، ئەڤ رەدکرنا وی گەلەك تودترە ژ رەدکرنا هندەك موعجیزەیان). ڤ

و تشتێ گرنگ ل ڤێرێ ئەوە ئەم بزانین کو پێغەمبەرێن بەرێ هاتبوونە هنارتن بۆ نەتەوێن وان و نەزێدەتر، ڤێجا موعجیزێن وان هەست پێ کریبوون، و سنورداربوون بۆ سەردەم و جهێ ئەو لێ هاتییە هنارتن، ژ بەر هندێ موعجیزێن وان وەکی گەشبوونا زلکەکێ شخارتێ بوون، کو ب تنێ جارەکێ رویدابوون، و بۆ دەنگ و باسەکێ باوەرییێ پێ دئینیت یێ باوەرییێ پێ دئینیت، و درەوێ پێ دکەت یێ درەوێ پێ دکەت.

هندیکه پێغەمبەرێ مەیە موحەممەد ﷺ کو دویماهی پێغەمبەر و هنارتییە، و یێ هاتییە هنارتن بۆ هەمی مرۆڤان وەك مزگینئین و ئاگەهدارکەر، و دڤێت موعجیزێن وی د بەردەوام بن، و ژ بەر هندێ نیشانێن ئیعجازا زانستی د قورئان و سوننەتێدا موعجیزەکا زانستی یا دەقییە (نفیسییە).

د قورئانا پیرۆزدا هزار و سێ سەد ئایەت بەحسێ گەردوونی و ئافراندنا مرۆڤی دکەن، و ئەڤ ئایەتە نێزیکی شەش ئێکا قورئانێنە، و ئەگەر ئایەتێن فەرمانان بەرێ مە بدەنە گوهداریا خودێ، و ئایەتێن دانەپاشییێ فەرمانا هێلانێ ژ مە بکەن، ئەرێ ئایەتێن گەردوونی بەرێ مە ددەنە چ؟ ئەڤە بەرێ مە ددەنە هزرکرنێ، ژ بەر ڤێ چەندێ یا د گۆتنەکێدا هاتی: (هزرکرنا دەمژمێرەکێ چێترە ژ رابوونا شەڤەکێ بۆ عیبادەتی)[1].

و ژ زانین و شارەزاییا هەرە مەزنا خوداییە، پێغەمبەری ﷺ ئەڤ ئایەتە شرۆڤە نەکرن، چ وەك ئیجتیهادەك ژ وی، یان ئاراستەکرن و شیرەتکرنا خودێ بوو بۆ ڤێ چەندێ، ژ بەر کو ئەگەر ل دویڤ تێگەهشتنا دەوروبەرێن خۆ و ل دویڤ وی دەمی شرۆڤەکربان، دا ئەوێن ل دویڤدا دهێن ڤێ شرۆڤەکرنێ رەتکەن، و ئەگەر ئەڤ ئایەتە ب شرۆڤەکرنا ل دویڤ تێگەهشتنا سەر دەمێن ل دویڤدا دهێن شرۆڤەکربان، دا ئەڤ شرۆڤەکرنە تشتەکێ نەدیار و ئالۆز بیت ل دویڤ تێگەهشتنا کەسێن دەوروبەرێن وی ل وی دەمی[2].

ژ بەر ڤێ چەندێ ئەڤ ئایەتە بۆ سەردەمێن پشتی خۆ هێلان، دا پێشکەفتنا زانستی لایەنێن ئیعجازا قورئانێ ئاشکرا بکەت و ل هەر چاخ و سەردەمەکی، وەکو یا دیار

---

(١) مصنف ابن أبي شيبة من قول الحسن البصري ٣٥٢٢٣، وشعب البيهقي قول أبي الدرداء ١١٨.

(٢) پسیار ژ ئبن عەباسی هاتەکرن سەبارەت گۆتنا خودێ (الذي خلق سبع سموات ومن الارض مثلهن) نینا گۆتە وی یێ پسیار دکر: کی دێ من پشتراست کەت هەکە من بۆ تە گۆت تو گاور نابی؟ تو دێ درەوین دەرنێخی و دەروین دەرنێخستنا تە بۆ وێ گاوریا تەیە ب وێ (تفسير الطبري (١٥٣/٢٨)، تفسير ابن كثير (٣٦٨/٤)).

قورئانا پیرۆز چەندین ئایەتێن ل سەر گەردوونی ب شێوێ ئیعجازێ یێن تێدا هەین و د بەردەوامن هەتا رۆژا قیامەتێ.

## زانست

و زانست وەکی هندەك زانا دیار دکەن، نیاسینا خودێ و زانینا فەرمانا وی، و زانینا ئافراندییێن وی، و زانینا راستییێ و شەریعەتی و ئافراندنێیە، و نیاسینا خودێ بنیاتێ ئایینییە، و زانینا فەرمانا وی بنیاتێ پەرستنێیە، و زانینا ئافراندییێن وی بنیاتە د باشییا ژیانا دنیایێدا.

ئیسلام بەرێ مە ددەتە نیاسینا خودێ، ب رێکا هزرکرنێ د ئافراندنا عەرد و عەسماناندا، ئەڤ چەندە دیار دبیت د سۆرەتێن قورئانا پیرۆزدا، و دهێتە هژمارتن بنیاتێ ئێکێ بۆ ئاڤاکرنا شەنگستێن باوەرییێ، خودێ دبێژیت: (فَلْيَنْظُرِ الْإِنْسَانُ مِمَّ خُلِقَ (٥) خُلِقَ مِنْ مَاءٍ دَافِقٍ (٦) يَخْرُجُ مِنْ بَيْنِ الصُّلْبِ وَالتَّرَائِبِ (٧)) [الطارق : ٥-٧]، ئانکو: (بلا هەر کەسەك برێنتێ، کا ژ چ هاتییە چێکرن * نێ یێ ژ ئاڤەکا هلپەرژی (بلقە) چێبووی * ئەڤ ئاڤە ژ مۆرکێت پشتا مێران، و ژ هەستییێ سینگێ ژنان دزێت).

و خودێ دبێژیت: (فَلْيَنْظُرِ الْإِنْسَانُ إِلَى طَعَامِهِ (٢٤) أَنَّا صَبَبْنَا الْمَاءَ صَبًّا (٢٥) ثُمَّ شَقَقْنَا الْأَرْضَ شَقًّا (٢٦) فَأَنْبَتْنَا فِيهَا حَبًّا (٢٧) وَعِنَبًا وَقَضْبًا (٢٨) وَزَيْتُونًا وَنَخْلًا (٢٩)) [عبس: ٢٤-٢٩]، ئانکو: (بلا مرۆڤ بەرێ خۆ بدەتە خوارن و ڤەخوارنا خۆ [و هویرك هزرا خۆ تێدا بکەت، کا چاوا دبیتە خوارن و دئێتە بەر دەستێ وی] * مە ئاڤ ژ عەوران دارێت * و مە عەرد ب گل و گیا و شینکاتیڤە کەلاشت * مە دان و دەرامەت ژێ دەرێخست * هەروەسا تری و زەرزەوات ژی * و زەیتوون و دارقەسپ ژی).

و هەروەسا دبێژیت: (أَفَلَا يَنْظُرُونَ إِلَى الْإِبِلِ كَيْفَ خُلِقَت(وَإِلَى السَّمَاءِ كَيْفَ رُفِعَتْ (١٨) وَإِلَى الْجِبَالِ كَيْفَ نُصِبَتْ (١٩) وَإِلَى الْأَرْضِ كَيْفَ سُطِحَتْ (٢٠)) [الغاشية: ١٧-٢٠]، ئانكو: (ما نارێننە حێشترێ، کا چاوا هاتییە چێکرن؟ ★ و ما نارێننە عەسمانی، کا چاوا بێ ستوین هاتییە بلندکرن؟ ★ و ما نارێننە چیایان کا چاوا هاتینە چکلاندن؟ ★ و ما نارێننە عەردی کا چاوا هاتییە راستکرن؟).

و دبێژیت: (قُلِ انْظُرُوا مَاذَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَا تُغْنِي الْآيَاتُ وَالنُّذُرُ عَنْ قَوْمٍ لَا يُؤْمِنُونَ) [یونس: ١٠١]، ئانکو: (بێژە: [گەلی گاوران] کا بەرێ خۆ بدەنە عەرد و عەسمانان کا چ تێدا هەیە؟ بەلێ نیشان و ئایەت و ترساندن دێ چ گەهیننە وان ئەوێت باوەرییێ نەئینن).

و هزرکرن د ئافراندنا عەرد و عەسماناندا جۆرەکە ژ پەرستنان، و ژ باشترین پەرستنایە، د سەحیحا ئبن حیبانیدا هاتییە ژ عەتائێ کو عائیشایێ ﷺ گۆت: ((د شەڤا دۆرا مندا پێغەمبەر ﷺ هاتە دەف من، و ڤال: بهێلە ئەز پەرستنا خودایێ خۆ یێ مەزن بکەم، رابوو چو بەر ئاڤێ، دەستنڤێژا خۆ شویشت، پاشی رابوو نڤێژکرن، و کرە گری هەتا ریهێن وی تەڕ بوویە، پاشی چۆ سوجدێ هەتا ئەرد تەڕ بووی، پاشی ل سەر تەنشتێ رازا، هەتا بیلال هاتی دەستویرییێ ژێ وەرگریت بۆ بانگێ سپێدێ، ئینا گۆت: هەی پێغەمبەرێ خودێ تو ژ بەر چ دکەیە گری، و خودێ گونەهێن تە یێن بۆری و داهاتی یێن ژێبرین؟ ئینا گۆت: وەی خولی ب سەرنەکی بیلال، بۆچی ئەز ناکەمە گری و خودایێ مەزند ڤی شەڤێدا ئەڤ ئایەتە بۆ من ئینایە خوار: (إِنَّ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَاخْتِلافِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ لَآيَاتٍ لِأُولِي الأَلْبَابِ) [آل عمران: ١٩٠_١٩١]، ئانکو ب

راستی چێکرنا ئەرد و ئەسمانان، و هاتن و چۆنا شەڤ و رۆژان نیشانن [ل سەر هەین و دەستهەلاتدارییا خودێ] بۆ کەسێن ژیر و ئاقلدار[1].

بەرێ خۆ بدە رۆژێ، و پسیار بکە کێ ئەو بلندکرییە، و کی ئەو کرییە نیشان، و کێ ئەو وەکی دینارێ چێکرییە، و کی ئەو ل هەوا هەلاویستییە وەکی دەمژمێرێ، میلێن وێ دزڤڕن هەتا قیامەت رادبیت، و کێ ئەو برییە میعراحێ، و رێکێن وێ نیشادایىنە، و گەهاندییە قویناغێن وێ، و رۆناهییا وێ ڤەگوهاستییە بۆ ئەسمانێ دنیایێ، ئەوە ئەگەرێ چێبوونا دەمی، و ژێدەرێ قورم و چەقێن وی، و پەرتۆك و پشکێن وی، هەکە ئەو نەبا رۆژێن ڤی دەمی دورست نەدبوون، و مەه و سالێن وی نەدهاتنە رێکخستن، و رۆناهی و تاریاتییا وی ژێکجودا نەدبوون، زێڕێ رەسەن ژ عمبارا کانزایێن وێ دەردکەڤیت، و دلۆڤانی ژ چاڤێن وێ دەردکەڤیت، چەرخ بۆرین ئەو هەر یا مای، و بۆرینا دەمی جوانییا وێ نەبرییە.

خودایێ مەزن راست دبێژیت دەمێ دبێژیت: ﴿سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الْآَفَاقِ وَفِي أَنْفُسِهِمْ﴾ [فصلت: ٥٣]، ئانکو: (نێزیك، نەدویر ئەم دێ بەلگە و نیشانێت [ئێکینی و شیانا] خۆ بۆ وان د ئەرد و ئەسماناندا و د وان ب خۆدا ژی ئاشکەرا کەین).

و بەرێ خۆ بدە دلی، د کار و کارتێکرنا ویدا، و ئارمانج و ئەنجامێ وی، و بها و بەرفرەهییا وی، و دیوار و تاڤێن وی، و پەنجەرك و کونکێن وی، و دەرگەه و پەردێن وی، و شکەفت و چالێن وی، و جۆك و کانیکێن وی، و زەلالی و شێلیاتییا وی، و کار و شەڤبێرییا وی، و بێهنفرەهی و هشیارییا وی، و مەترسییا وی یا مەزن، نە بێ ئاگەه دبیت نە دنڤیت، نە ژبیر دکەت نە خەلەت دبیت، نە دکەڤیت و نە دهلنگڤیت، نە بێزار دبیت و نە گازندێ دکەت، ئەو یێ بەردەوامە و خودا هەدارە، ب فەرمانا وی یێ ئەو جوان ئافراندی، و پێدڤییێن وی بۆ دابین کرین، و پەلێ وی گەش کری، و عەجەل

---

(١) صحیح ابن حبان (٦٢٠).

و دەمێ وی تەقدیر کری، کار دکەت بێی بێهنڤەدان، و بێی لێزڤڕین و بێی ئاراستەکرن.

خودایێ مەزن راست دبێژیت دەمێ دبێژیت: (سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الْآفَاقِ وَفِي أَنْفُسِهِمْ) [فصلت: ٥٣]، ئانکو: (نێزیك، نەدویر ئەم دێ بەلگە و نیشانێت [ئێکینی و شیانا] خۆ بۆ وان د ئەرد و ئەسماناندا و د وان ب خۆدا ژی ئاشکەرا کەین).

و د گەل سەروەرێ مە عەلی ﷺ .. (بەرێ خۆ بدە بچویکییا کەلەخێ مێرییێ، و جوانییا سەروبەرێ وێ، ب چاڤ نقاندنەکێ، یان هزرکرنەکێ دێ بینی چەوا ل سەر ئەردی دیاربوو، و رزقێ خۆ دەستخۆڤە ئینا، و چەوا دندك ڤەگوهاستە مالا خۆ، و ل وێرێ بەرهەڤکر، ل دەمێ گەرمێ بۆ خۆ کۆم دکەت بۆ دەمێ سەرمایێ، رزقێ وێ یێ دیارکرییە، خودێ وێ ژبیرناکەت، و بێ بەهر ناکەت، بلا خۆ ل سەر بەرەکێ رەق بیت، هەکە تو هزرا خۆ د کوئەندامێ وێ یێ خوارنێدا بکەی، ژ سەرێ وێ هەتا بنێ وێ، و ئەو تشتێ د زکێ وێدا، و ئەو تشتێ د سەرێ وێدا ژ چاڤ و گوهێن وێ، هەکە تو بکەی دێ حنێرییا ئافراندنا وێ بینی، و دێ ب سالۆخەتدانا وێڤە وەستی، ڤێجا پاکی و بلندی بۆ وی بیت یێ ئەو راگرتی ل سەر دەست و پێیان، کەسەکی ژ بلی وی ئەڤ فیترەتە نەدایەیێ، و هاریکارییا وی نەکرییە د ئافراندنا وێدا)[1].

خودایێ مەزن راست دبێژیت دەمێ دبێژیت: (وَمَا مِن دَابَّةٍ فِي الأَرْضِ وَلاَ طَائِرٍ يَطِيرُ بِجَنَاحَيْهِ إِلاَّ أُمَمٌ أَمْثَالُكُم مَّا فَرَّطْنَا فِي الكِتَابِ مِن شَيْءٍ ثُمَّ إِلَى رَبِّهِمْ يُحْشَرُونَ) [الأنعام: ٣٨]، ئانکو: (نینە جانەوەرەك ل سەر ڕوییێ ئەردی بچیت یان بالەفرەك ب چەنگێت خۆ، بفریت، هەکە ئەو ژی [د ژین، و مرن، و چێکرن، و ڤەژین و هەوجەییا خۆدا] وەکی هەوە کۆم نەبن، و مە چو [ژ هەوجەییێت هەوە] د کتێبێدا [مەخسەد پێ دەپێ

---

(١) المستطرف في كل فن مستظرف (٢/٢٦٧-٢٦٨) ژ گۆتنا پێغەمبەری ﷺ، و نە یا دورستە بێتە بلندکرن بۆ وی.

پاراستییە] نەهێلایە و ژ بیر نەکریە، ڤێجا پاشی ئەو دێ ب بال خودایێ خۆڤە ئێنە کۆمکرن).

ئەڤە سەبارەت نیاسینا خودێ، زانینا راستییێ، بەلێ زانینا ب فەرمانا خودێ چییە، زانستێ شەریعەتی؟

دەمێ مرۆڤ هزرێ د ئافراندنا عەرد و عەسمانان‌دا دکەت، دزانیت کو خودێ ئافرێنەر و خودان و رێڤەبەرێ وانە، و دێ هندەك ژ باشناڤێن خودێ نیاسیت، و سالۆخەتێن وی یێن بەرز و ژێگرتی، دێ هەست ب پالدانەکا ب هێز کەت بۆ نێزیکبوونێ ژ خودێ ب رێکا ب جهئینانا فەرمانێن وی، و خۆ ژێ دانەپاشا تشتێ وی تشتێ ئەم ژێ داینە پاش، ل وی دەمی زانستێ شەریعەتی دئێت دا فەرمانا خودێ و نەهییا وی دیارکەت، د کارێن پەرستن و کڕین و فرۆتنان و رەوشتی.

و شەریعەتی هەمی دادپەروەرییە، و هەمی دلۆڤانییە، و هەمی بەرژەوەندییە، و هەمی حیکمەتە، و هەر کێشەکا ژ دادپەروەرییێ دەربکەڤیت بۆ ستەمێ بچیت، و ژ دلۆڤانییێ بۆ دل رەقییێ، و ژ بەرژەوەندییێ بۆ خرابکارییێ، و ژ حیکمەتێ بۆ ژ ڤەستاییێ، ئەڤە نە ژ شەریعەتینە، خۆ ئەگەر ب هزار راڤەکرنا بکەنە دناڤدا.

پێغەمبەر ﷺ دبێژیت: (من يرد الله به خيرا يفقهه في الدين)[1]، ئانکو: (هەرکەسێ خودێ خێر و باشی بۆ بڤێت دێ تێگەهشتنێ د دینیدا دەتێ).

هندیکە زانستێ ئافراندنێیە، دێ بینین کو ئیسلامێ گازییا بۆ زانستی کری ب هەمی لایەن و سالۆخەتێن ویڤە، و ئەو یاسا و پەیوەندییێن د ناڤبەرا هەردوییاندا (ئیسلام و زانست) دەستنیشان دکەت، دا مفایی ژێ وەربگرین، بۆ ب جهئینانا وان تشتێن خودێ بۆ مە بەردەست کرین، وەکی خودێ دبێژیت: (أَلَمْ تَرَوْا أَنَّ اللَّهَ سَخَّرَ لَكُمْ مَا فِي

(١) البخاري:٧١، مسلم:١٠٣٧ ژ معاوییەی.

السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ وَأَسْبَغَ عَلَيْكُمْ نِعَمَهُ ظَاهِرَةً وَبَاطِنَةً وَمِنَ النَّاسِ مَنْ يُجَادِلُ فِي اللَّهِ بِغَيْرِ عِلْمٍ وَلَا هُدًى وَلَا كِتَابٍ مُنِيرٍ) [لقمان: ٢٠]، ئانكو: (ما هوين نابينن خودێ هندی د عەرد و عەسمانان‌دا یێ بۆ هەوە سەرنەرم و بەردەستکری، و کەرەمێت خۆ یێت ئاشکەرا [وەکی ئیسلامێ... هتد] و نە ئاشکەرا [وەکی عەقل و زانین و تێگەهشتنێ] ل سەر هەوە یێت بەرفرەهـ کرین، و د گەل هندێ ژی هندەك مرۆڤ یێت هەین بێ زانین و بێ راستەرێییەك و بێ کتێبەکا رۆنکەر، جرەبرێ د دەرهەقێ خودێ‌دا دکەن).

(وَأَنْزَلْنَا مَعَهُمُ الْكِتَابَ وَالْمِيزَانَ لِيَقُومَ النَّاسُ بِالْقِسْطِ وَأَنْزَلْنَا الْحَدِيدَ فِيهِ بَأْسٌ شَدِيدٌ وَمَنَافِعُ لِلنَّاسِ) [الحديد: ٢٥]، ئانكو: (و مە ئاسن یێ بۆ ئینایە خوارێ و هێز و قەوەتەکا دژوار یا تێدا).

و فێربوونا زانستێن ماددی ئاڤاکرنا عەردی بجهدئینیت ب رێکا ئینانەدەرا سامانێن وی، و وەبەرهێنانا وزەیێت وی، و لادانا ئاستەنگان ب جهـ دبیت، و دابینکرنا پێدڤییان وەك بجهئینان بۆ گۆتنا خودێ: (وَإِلَى ثَمُودَ أَخَاهُمْ صَالِحًا قَالَ يَا قَوْمِ اعْبُدُوا اللَّهَ مَا لَكُمْ مِنْ إِلَهٍ غَيْرُهُ هُوَ أَنْشَأَكُمْ مِنَ الْأَرْضِ وَاسْتَعْمَرَكُمْ فِيهَا فَاسْتَغْفِرُوهُ ثُمَّ تُوبُوا إِلَيْهِ إِنَّ رَبِّي قَرِيبٌ مُجِيبٌ) [هود: ٦١]، ئانكو: (و بۆ مللەتێ (ثمود)ی، مە برایێ وان صالح پێغەمبەر بۆ وان هنارت، گۆت: هەی مللەتێ من خودێ بپەرێسن، هەوە ژ وی پێڤەتر چو خودا و پەرستی نینن، ئەوی هوین یێت ژ ئاخێ چێکرین، و هوین کرنە ئاڤاکەر و ئاکنجیێت عەردی، ڤێجا داخوازا گونەهـ ژێبرن و لێبۆرینێ ژێ بکەن، پاشی لێ بزڤڕن و تۆبە بکەن، ب راستی خودایێ من یێ نێزیك و بەرسڤدەهە).

و دیسا فێربوونا زانستێن ماددی، و سەرکەفتن تێدا هێزە، و پێدڤییە د دەستێ موسلمانان‌دا بیت، دا کو بەرسینگگرتنا دژمنێن خۆ بگرن، دژمنێن راستی و باشی و ئاشتییێ، ئەڤە ب جهئینانەکا گرنەکە بۆ گۆتنا خودێ: (وَأَعِدُّوا لَهُمْ مَا اسْتَطَعْتُمْ مِنْ قُوَّةٍ وَمِنْ رِبَاطِ الْخَيْلِ تُرْهِبُونَ بِهِ عَدُوَّ اللَّهِ وَعَدُوَّكُمْ وَآخَرِينَ مِنْ دُونِهِمْ لَا تَعْلَمُونَهُمُ اللَّهُ يَعْلَمُهُمْ)

[الأنفال: ٦٠]، ئانكو: (هوين ژی [گەلی خودان باوەران] هندی هەوە پێ چێ ببیت ژ هێزێ و هەسپێت گرێدایی بۆ وان بەرهەڤ بکەن کو هوین پێ [ب وێ هێزێ] دژمنێت خۆ و هندەکێت ژ بلی ڤان هوین نانیاسن، خودێ وان دنیاسیت، چاڤترساندی بکەن).

و ژ بەر کو هێزا ڤی سەردەمی یا د زانستیدا، و جەنگا نوی نە جەنگا د ناڤبەرا دو باسکاندایە (ساعدین)، بەلکو جەنگا د ناڤبەرا دو عەقلاندایە، ڤێجا پێدڤییە موسلمان یێ ب هێز بیت ژ بەر کو ئەو راستییا ل دەڤ وی پێدڤی ب هێزێیە، وەکی پێغەمبەری ﷺ گۆتی: (المؤمن القوي خير وأحب إلى الله من المؤمن الضعيف وفي كل خير)[1]، ئانکو: (باوەرداری ب هێز باشتر و خۆشڤیترە ل دەڤ خودێ ژ باوەرداری لاواز و خێر یا د هەردوکاندا هەی).

## د قورئان و سوننەتێدا

موعجیزا قورئانێ یا زانستی دیار دبیت بۆ زانایان ل هەر بوارەکی ژ بوارێن وێ، کو ئەو یا رۆن و ئاشکرایە د سیستەمێن خۆدا، و ل بوارێ ڤەگەراندنا دەنگ و باسێن نەتەوێن بەرێ، و د پێشبینییێن وێ بۆ رویدانێن داهاتیدا، و د دیاربوونا وێ ل حوکمێ شەریعەتێ وێ و ژ بلی ڤان ژی، و زاراڤێ ئیعجازا زانستی یێ بەربەلاڤ بووی ل سەردەمێ مەدا ژ بۆ نیشادانا روییێن ئیعجازێ د قورئان و سوننەتێدا، کو ب رێکا زانستێن گەردوونی هاتینە ئاشکراکرن، و موعجیزە د تێگەهێ زانایاندا تشتەکە د سەر شیانێن هزرکرنا عەقلێ مرۆڤیدایە، و ڤەب خوازتن تێدایە، و نە د شیانێن مرۆڤاندایە هەڤرکی و دژایەتییا وێ بکەن.

---

(١) ئیمام موسلمی ڤەگێرایە، ژمارێ (٢٦٦٤) ژ بابێ هورمیرەی.

و مەرەم ب ئیعجازا قورئانێ ئەوە کو قورئانێ ڤەبێ مرۆڤان خوازتییە کو تشتەکێ وەکی وێ بینن و سالۆخدانا ئیعجازێ ل ڤێرێ کو یا زانستییە و بۆ زانستی دچیت، ئەو ب خۆ راستییە، و یا ڤەبڕییە، و د گەل سەردەمی دگونجیت، و ب بەلگەیان یا سەلماندییە، و ئەگەر یا ڤەبڕی نەبیت دێ تشتەکێ خەلەت بیت یان دێ ب گۆمان بیت، و ئەگەر د گەل سەردەمی نەگونجیت دێ بیتە نەزانین، و ئەگەر بێ بەلگە بیت دێ بیتە چاڤلێکرن.

و ئیعجاز بەحسکرنا قورئانا پیرۆز یان سوننەتا پێغەمبەرییە ب راستییەکێ کو زانستێ ئەزموونداری یا دوپاتکری، و یا دوپاتکری کو ل سەردەمێ پێغەمبەری ﷺ نەشیان ب رێکا ئامویرێن مرۆڤان ل وی دەمی بزانن، ل ڤێرە راستگۆییا پێغەمبەری ﷺ دیار دبیت یان دوپات دبیت بۆ وێ چەندا ژ لایێ خودایێ خۆڤە ڤەگەراندی کو ئەو ژی قورئانە، و موعجیزا قورئانێ - کو راستییێن زانستی ب خۆڤە دگریت - بەلگەیە ل سەر هندێ کو پەیاما ئیسلامێ یا جیهانییە.

لەوا دیار دبیت بەری موحەممەدی ﷺ پێغەمبەر دهاتنە هنارتن هەر ئێك بۆ نەتەوێ وی یێ تایبەت، و بۆ سەردەمێن دەستنیشانکری، و خودێ پشتەڤانی لێ دکر ب موعجیزێن هەستپێکری، وەکی گوپالێ موسای ( سلاڤ ل سەر بن) و ساخکرنا مریان ل سەر دەستێ عیسایی ( سلاڤ ل سەر بن)، و ئەڤ موعجیزە د بەردەوام بوون و د پاراستی بوون ب هێزا باوەرپێکرنا وێ د دەمەکێ دەستنیشانکریدا بۆ هەر پێغەمبەرەکی، تا دەم درێژ دبوو، و دچۆ، و کانییا پێغەمبەراتییێ یا زەلال شێلی دبوو، هێزا باوەرپێکرنا وان موعجیزا بەرزە دبوو، دا خودێ پێغەمبەرەکێ دی ب ئایینەکێ نوی هنێریت یێ کو ئەو پێ رازی، و ب موعجیزەکا نوی، و دەمێ خودێ پێغەمبەراتی ب موحەممەدی ﷺ ب دویماهی ئینای، خودێ پاراستنا ئایینێ وی بۆ دابین کر، و پشتەڤانی لێ کر ب موعجیزەکا مەزن، کو بمینیت د ناڤ دەستێن مرۆڤاندا هەتا رۆژا قیامەتێ، خودێ دبێژیت: ﴿قُلْ أَيُّ شَيْءٍ أَكْبَرُ شَهَادَةً قُلِ اللَّهُ شَهِيدٌ بَيْنِي وَبَيْنَكُمْ وَأُوحِيَ إِلَيَّ هَذَا الْقُرْآنُ

لِأُنْذِرَكُمْ بِهِ وَمَنْ بَلَغَ) [الأنعام: ١٩]، ئانكو: ([هەی موحەممەد] بێژە: ئەرێ ج شادەیی ژ هەمییان مەزنترە؟! بێژە: خودێ شاهدە د ناڤبەرا من و هەوەدا، كو ئەڤ قورئانە بۆ من هاتییە هنارتن، دا ئەز هەوە و هەچییێ دگەهیتێ پێ بدەمە ئاگەهداركرن و پێ بترسینم)

و خودێ دبێژیت: (لَكِنِ اللَّهُ يَشْهَدُ بِمَا أَنْزَلَ إِلَيْكَ) [النساء: ١٦٦]، ئانكو: (بەلێ خودێ شادەیییێ ب وێ كتێبا ب زانینا خۆ بۆ تە ئینایییە خوارێ ددەت [كو ئەڤ قورئانە ژ دەڤ خودێیە و تو پێغەمبەری]).

و د ڤان هەردو ئایەتاندا كو هاتبوونە خوار بۆ بەرسڤدانا ل سەر درەوپێكرنا كافران ب پێغەمبەراتییا موحەممەدی ﷺ ئاشكراكەر بوو بۆ سروشتێ موعجیزەیا زانستی كو دێ مینیت د ناڤ دەستێن مرۆڤاندا و دێ نوی بیتەڤە ل هەر ئاشكراكرنەكا مرۆڤان د بیاڤێن زانستاندا، یێن كو پەیوەندی ب رامانێن وەحیا خودایيڤە هەی.

و هۆسا ئەو وەحیا بۆ موحەممەدی ﷺ هاتییە خوارێ ژ وان تشتێن تێدا هاتی ژ زانستێ خودایی دێ مرۆڤ زانن ل هەر دەم و جهەكی، و دێ نوی بیتەڤە د گەل بۆرینا چەرخان و دەمێن درێژ، و ژ بەر ڤێ چەندێ پێغەمبەر ﷺ دبێژیت: ((ما من الأنبياء نبي الا أعطي من الايات ما مثله امن عليه البشر، وانما كان الذي أوتيته وحيا أوحاه الله الي، فأرجو أن أكون أكثرهم تابعا يوم القيامة))[1]، ئانكو: (نینە خودێ پێغەمبەرەك هنارتبیت هەكە هند نیشان و بەلگە نەدابنێ كو مرۆڤ ب وان باوەرییێ پێ بینن، و ئەو نیشان و بەلگەیێ خودێ دایە من وەحی بوو خودێ بۆ من هنارتی، ڤێجا ئەز یێ ب هیڤی مە ل رۆژا قیامەتێ دویكەتییێن من ژ یێن وان هەمییان پتر بن).

ئبن حەجەر ل دۆر شرۆڤەكرنا ڤێ فەرموودەیێ دبێژیت: (ئەڤ ئاخفتنا بۆری بەلگەیە ل سەر موعجیزەیا قورئانێ یا بەردەوام ژ بەر مفایێ وێ یێ زۆر و گشتی، چونكی

---

(١) ئیمامێ بوخاری ب ژمارە (٤٦٩٦)، و موسلمی ب ژمارە (١٥٢) ژ زارێ بابێ هورەیرەی ڤەگێڕاینە.

بانگخوازی و بەلگە و ئاگەهدارکرن ب وی تشتێ کو دێ رویدەت تێدا هەنە ڤێجا مفایێ وێ گەهشتە وی یێ ئامادە، و یێ نە ئامادە، و یێ پەدابووی و یێ کو دێ پەیدا بیت ڤێجا جوانی رێزبەندی بۆ کرییە ... و دبێژن: مەرەم پێ ئەوە موعجیزەیێن پێغەمبەرێن بەرێ ب دویماهی هاتن ب دویماهی هاتنا چاخێن وان و ئەوێن ل وان دەم و جهان بتنێ شیان ببینن، و موعجیزەیا قورئانێ یا بەردەوامە هەتا رۆژا قیامەتێ، و شکاندنا وێ بۆ تشتێ عەدەتی د شێواز، و رەوانبێژی، و دیارکرنا وێ بۆ تشتێن غەیبی و نە دیار، چاخەك ژ چاخان نابۆریت هەکە تشتەك ژ وان تێدا ئاشکرا نەبیت یێن وێ گۆتی دێ ئاشکرا بن ئەڤەژی بەلگەیە ل سەر دورستییا وێ...)[1].

و ژ بەر کو قورئان موعجیزەکا بەردەوامە بۆ هەمی ئافراندییان هەتا رۆژا قیامەتێ و هەر موعجیزەکا زانستی یا د قورئانێدا هاتی کەسێ عەرەب و نە عەرەب دزانیت، و دێ مینیت دیاردەکا نویکری هەتا رۆژا قیامەتێ، و ئەو دەنگ و باسێن د قورئانێدا هاتین ئەم مەرەمێن وان دزانین چونکی ب ئەزمانەکێ عەرەبی یێ ئاشکرایە، بەلێ راستییێن وێ و چاوانییێن وێ ئاشکرا نابن ئەگەر پشتی دەمەکی نەبن، خودێ دبێژیت: (إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ لِلْعَالَمِينَ (٨٧) وَلَتَعْلَمُنَّ نَبَأَهُ بَعْدَ حِينٍ (٨٨)) [ص: ٨٧ - ٨٨]، ئانکو: (ئەڤ قورئانە چامە و دەرسن بۆ خەلکێ هەمی جیهانێ. و ب راستی پشتی دەمەکێ دی هوین دێ راستییا سالۆخێ وێ زانن).

و خودێ وەسا حەز کر کو هەر دەنگ و باسەکێ د قورئانێدا هاتی د دەمێ وی یێ تایبەتدا بێتە ب جهئینان، ڤێجا دەمێ رویدان ئاشکرابوو دێ ئەو رامانێت پیت و پەیڤێن قورئانێدا دیار دکەن گەش و رۆن بن، هەروەکی د ئاخفتنا خودێدا هاتی: (لِكُلِّ نَبَإٍ مُسْتَقَرٌّ وَسَوْفَ تَعْلَمُونَ) [الأنعام: ٦٧]، ئانکو: (هەر سالۆخەکی (خەبەرەکی)

---

(١) فتح الباري (٧/٩) ب دەستکارییەکا کێم.

دویماهیکەکا هەی [کا راستە ئان نە]، و پاشی هوین ب خۆ ژی دێ زانن [کا ئەو قورئان راستە ئان نە]).

و دێ دەنگ و باسێن خودایی مینن زیندی ب هەمی شێوەیان کو نوی دبنەڤە ل هەمی سەدەیان، خودێ دبێژیت: ﴿وَالْخَيْلَ وَالْبِغَالَ وَالْحَمِيرَ لِتَرْكَبُوهَا وَزِينَةً وَيَخْلُقُ مَا لَا تَعْلَمُونَ﴾ [النحل: ٨]، ئانکو: (هەسپ و حێشتر و کەر یێت بۆ هەوە چێکرین دا هوین لێ سویار ببن [و بارێت خۆ پێ ڤەگوهێزن] و جوانییە ژی بۆ هەوە، و ژ تشتێ هەوە زانین پێ نەیی دێ چێ کەت [وەکی ئالاڤێت هاتن و چۆنێ]).

قورئان هاتە خوارێ ل سەر دەمێ بەربەلاڤیا نەزانینێ و چیڤانۆك و کارێن کاهنان و سێربەندی و ستێرناسییێ ل هەمی جیهانێ، و عەرەبان بەهرا مەزن ژ ڤێ نەزانینێ بەرکەفتبوو، هەروەکی قورئان ڤێ چەندێ دیار دکەت، دبێژیت: ﴿هُوَ الَّذِي بَعَثَ فِي الْأُمِّيِّينَ رَسُولًا مِنْهُمْ يَتْلُو عَلَيْهِمْ آيَاتِهِ وَيُزَكِّيهِمْ وَيُعَلِّمُهُمُ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَإِنْ كَانُوا مِنْ قَبْلُ لَفِي ضَلَالٍ مُبِينٍ﴾ [الجمعة: ٢]، ئانکو: (ئەوی پێغەمبەرەك بۆ عەرەبان هەر ژ ناڤ وان ب خۆ هنارت، دا ئایەتێت خودێ کو قورئانە بۆ وان بخوینیت، و دا وان [ژ قرێژا شرکێ و گاورییێ و گونەهان] پاقژ بکەت و وان فێری قورئانێ و سونەتا پێغەمبەری بکەت، هەرچەندە بەری ڤێ ئەو د گومراییەکا ئاشکەرادا بوون).

د وی دەمیدا، و بۆ وێ ئوممەتێ وەحی هاتە خوارێ، و زانستێ خودێ یێ تێدا و نهێنییێن ئافراندییان یێن سالۆخەت کرین (وصف) ل هەمی بلنداهییان (عەسمانان) و هویرکێن (دقائق) ئافراندنێ د ناخێن مرۆڤاندا ئاشکرا دکەت، و دەستپێکێ دزڤرینیتە سەردەمێ بۆری، و نهێنییێن ڤی سەردەمی بەحس دکەت، و غەیبا ئایندەی ئاشکرا دکەت، یێن کو دێ ب سەرێ هەمی ئافراندییێن دی ئێت.

دەمێ مرۆڤ چۆیە د سەردەمێ ڤەدیتنا زانستیدا، و ئامویرێن هویربین یێن ڤەکۆلینێن زانستی ب دەست خۆ ئێخستین، و شیان کۆمەکا مەزن یا ڤەکۆلەران بجەمینن د هەمی

بواراندا، و ڤەكۆلینا وان نهێنییێن پەردە ل سەر بکەن ل عەرد و عەسمانان، و د بیاڤێن نەفسێن مرۆڤاندا، پێشەکیێن وان کۆم بکەن، و زێرەڤانییا ئەنجامان بکەن، د قۆناغەکا درێژا دەربازبوونا چەرخاندا، و دەمێ راستی ئاشکرا بووی، حێبەتییەکا مەزن رویدا کو رۆناهییێن وەحیا خودایی ئاشکرا بوون ئەوا بۆ موحەممەدی ﷺ بەری هزار و چار سەد سالان هاتییە خوار، دیاربوونا ڤێ راستییێ د ئایەتەکا قورئانێدا یان د چەند ئایەتاندا، یان د فەرموودەکێدا یان د چەند فەرموودەکاندا، ب هویربینەکا زانستی یا ب موعجیزە، و ب پەیڤ و رامانەکا رۆن و ئاشکەرا، و ب ڤێ چەندێ قورئانا پیرۆز بۆ مە دیار دکەت و دبێژیت: ﴿قُلْ أَرَأَيْتُمْ إِنْ كَانَ مِنْ عِنْدِ اللَّهِ ثُمَّ كَفَرْتُمْ بِهِ مَنْ أَضَلُّ مِمَّنْ هُوَ فِي شِقَاقٍ بَعِيدٍ (٥٢) سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الْآفَاقِ وَفِي أَنْفُسِهِمْ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ الْحَقُّ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ (٥٣) ﴾ [فصلت: ٥٢ – ٥٣]، ئانكو: (هەی موحەممەد بێژە: کا بێژنە من دێ حالێ هەوە چ بیت ئەگەر ئەڤ قورئانە ژ دەڤ خودێ هاتبیت و هوین باوەرییێ پێ نەئینن، کی ژ وی گومراتر و رێبەرزەترە، ئەوێ هۆسا د دژمنایی و رکمانەکا دویردا دژیت. نێزیك، نەدویر ئەم دێ بەلگە و نیشانێت خۆ بۆ وان د عەرد و عەسماناندا و د وان ب خۆدا ژی ئاشکەرا کەین، دا بۆ وان ئاشکەرا ببیت کو ب راستی ئەڤە (ئەڤ قورئانە و یێ ئینایە خوارێ، و یێ بۆ هاتی کو پێغەمبەرە) راستە، ئەرێ ما ئەڤە نە بەسی وانە کو خودایێ تە ل سەر هەمی تشتان حازر و شاهدە [ئانکو ما شادەییا خودایێ تە، ب راستییا تە و راستییا قورئانا بۆ تە هاتی، نە بەسی وانە]).

و ئێك ژ زانایان دبێژیت: «هندیکە رێکا بەرچاڤە ئەوە کو مرۆڤ ئەو ئایەتێن بەحسێ عەرد و عەسمان و مرۆڤان دکەن کو ئەو وەحیا پێغەمبەر پێ دئاخفتن و د گەهاند ژ بال خودێڤە یا راست بوو»، و زانایەکێ دی[1] دبێژیت: «الآفاق: ئانکو هەر تشتێ ل عەسمانا و عەردی (رۆژ هەیڤ و ستێر و شەڤ و رۆژ، و با و باران و برویسی، و رووەك

(١) ئەڤە ئاخفتنا (عطاء) و (ابن زید)ـە، هەروەسا (قرطبي) یا د تەفسیرا خۆدا (٣٧٤١) ڤەگوهاستی.

و دار، و چیا، و دەریا، و هتد...)) و ئەڤە یا هاتییە ڤەگێڕان ژ لایێ هژمارەکا زانایێت راڤەکرنێ.

و ئەڤە ئایەتێن خودێنە د پەرتۆکا ویدا کو بەحسێ نیشان و سالۆخەتێن ئافراندییێن خۆ دکەت، و راستییا موعجیزا زانستی دیار دکەت کو ل ڤی سەردەمێ ڤەدیتنێن زانستی گەهشتینە بلنداهییێن گەردوونی.

و ئەم یێن ل سەر سۆزا خودێ کو ئەو خودانێ هێز و مەزناهییێیە، ئایەتێن خۆ نیشا مە بدەت، و دێ راستییێن وان بۆ مە ب جە هێن ب دیتنا زانستێ هویربین ب رامانێن ڤان ئایەتان، وەکی خودێ دبێژیت: (وَقُلِ الْحَمْدُ لِلَّهِ سَيُرِيكُمْ آيَاتِهِ فَتَعْرِفُونَهَا وَمَا رَبُّكَ بِغَافِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ) [النمل: ٩٣]، ئانکو: (هەی موحەممەد بێژە: حەمد و سوپاسی هەمی بۆ خودێ، نێزیك دێ ئایەت و نیشانێت [ل سەر دەستهەلاتدارییا] خۆ نیشا هەوە دەت، ڤێجا هوین دێ نیاسن و زانن، و خودایێ تە ژ تشتێ هوین دکەن، نەیێ بێ ئاگەهە).

و ئەڤا بۆری بۆ مە دیار دکەت کو مرۆڤ یێ ل هیڤییا ژڤانەکی ژ خودێ، کو نوی دبیتەڤە و بەردەوام دبیت، ب ئاشکراکرنا ئایەتێن گەردوونی د پەرتۆکا ویدا، ل هەمبەر چاڤان، دا ببیتە بەلگە و سەلماندن، و دێ موعجیزە ل بەرچاڤێن مرۆڤی دیار بن.

و جیاوازی د ناڤبەرا راڤەکرنا زانستی و ئیعجازا زانستیدا ئەوە هندیکە راڤەکرنا زانستییە رامانا ئایەتان ئاشکرا دکەت یان یا فەرموودان، و ل بەر رۆناهییا دورستییا وێ ژ راستییێن زانستێن گەردوونی.

و هندیکە ئیعجازا زانستییە ئەوە بەحسکرنا قورئانا پیرۆز، یان سوننەتا پێغەمبەری ب راستییەکێ کو زانستی سەلماندبیت، کو ل سەر دەمێ پێغەمبەری ﷺ نەشیان ب ئامویرێن مرۆڤان ل دویڤ وی سەردەمی بزانن.

## بنگەه و شەنگستەیێن ڤەکۆلینێن ئیعجازا زانستی:

١- زانستێ خودێ، ئەو زانستێ گشتگیرێ بێ تخوبیە کو تووشی خەلەتییێ نابیت، و چو کێماسی لێ نینن، و زانستێ مرۆڤی یێ سنوردارە، و دەلیڤا زێدەبوونێ یا هەی و تووشی خەلەتییێ دبیت.

٢- هندەك دەقێن قورئانێ یێن هەین رامانا وان یا ڤەبڕییە (قطعیة)، هەروەسا هندەك راستییێن زانستی یێن گەردوونی یێن هەین د ڤەبڕینە.

٣- هندەك دەقێن وەحییێ رامانا وان نەیا ڤەبڕە و گەلەك رامان ژێ دچن، و د زانستیدا تیۆرێن گۆمان د سەلماندنا واندا یێت هەین.

٤- نابیت هەڤدژی بکەڤیتە د ناڤبەرا وەحیا ڤەبڕی و زانستێ تاقیکری یێ ڤەبڕیدا، و ئەگەر ل سەرڤە کەفتە د ناڤدا دێ دیار بیت کو کێماسییەك یا د ڤەبڕییا ئێك ژ واندا هەی، و ئەڤ بنەمایە یێ ئاشکرایە کو زانایێن موسلمانان بریار یا ل سەر دای، و پتر ژ زانایەکی پەرتۆکێن دانایین و یا دوپاتکری کو رێککەفتنەك دناڤبەرا عەقلی و وەحیێدا یا هەی.

دەمێ خودێ ئایەتەکێ ژ ئایەتان نیشا بەندەیێن خۆ ددەت د عەرد و عەسماناندا، راستییەکە بۆ ئایەتەکا قورئانێ یان فەرموودەکە ژ فەرموودەیێن پێغەمبەری ﷺ رامان دیار دبیت و د گەل ئێك رێك دکەڤن، و شرۆڤەکرن خۆجە دبیت، و ب بەلگەیان ئایەتان دەستنیشان دکەت بۆ وان راستییێن زانستی ئاشکراکرین، ئەڤەیە ئیعجاز.

هندیكە دەقێن وەحیێ یێن هاتینە خوار ب پەیڤێن كو كۆمەكا رامانێن دورست ددەن، لەوا پێغەمبەر ﷺ دبێژیت: (بعثت بجوامع الكلم)[1]، ئانكو: (ئەز هاتیمە هنارتن ب پەیڤێن تەڤگر)، ئەڤە دسەلمینیت كو ئەو دەقێن بۆ پێغەمبەری ﷺ هاتین هەمی رامانێن دورست ژێ دەردكەڤن د بابەتێن وێدا كو سەردەم بۆ سەردەمی دیار دبن.

ئەگەر هەڤدژی د ناڤبەرا بەلگەیەكێ ڤەبڕی ژ دەقەكێ قورئانێ و تیۆرەكا زانستیدا چێبوو دێ ئەڤ تیۆرە هێتە رەتكرن، چونكی دەق وەحییە ژ لایێ وی یێ زانین ل سەر هەمی تشتان هەی، و ئەگەر هەردو ئێك بگرن دێ دەق بیتە بەلگە ل سەر دورستییا تیۆرێ، و هەكە دەق فرە رامان بوو، و راستییا زانستی ڤەبڕ بوو دێ دەق ئێتە راڤەكرن ل دویف راستییا زانستی، و دەمێ دەلیڤە نەبیت بۆ پێككرنێ دێ یا ڤەبڕ ئێتە پێشئێخستن.

## پەیڕەوێ ڤەكۆلینێن ئیعجازا زانستی ل بەر رۆناهییا پەیڕەوێ پێشییان و ئاخفتنا راڤەكەران:

هندیكە ئاخفتنا خودێیە ژ نهێنییێن ئافراندییێن خۆ د عەرد و عەسمانانداا غەیبە بەری خودێ وان نهێنییان نیشا مە بدەت، و چو رێك نینن بۆ زانینا چاوانییا وان و بەرفرەهییا بابەتێ وان بەری دیتنا وان، ب تنێ ئەو نەبیت یا مە ب رێكا وەحییێ گوهـ لێ بووی، و زانایێن بەرێ یێن موسلمانان ئەو تشت نەدگۆت یێن كو وان زانین ل سەر نە.

هندیكە رامانا ئایەتێن گرێدای ب كاروبارێن غەیبیڤەیە و سەلماندنێن وان یێن زمانی یێن هاتینە زانین، بەلێ چاوانییێن وان و بەرفرەهییا بابەتێن وان د پەردەپۆشن، ئانكو

---

(١) البخاري ٢٨١٥، مسلم ٥٢٣ ژ زارێ ئەبی هورەیرە.

نەدهاتنە زانین، و ئەوێ بەحسێ راستیيێن وەحییا گەردوونی ب هویرییێن وێڤە کری پشتی خودێ رۆن و ئاشکرا کرین بۆ چاڤان نە وەکی وییە یێ بەحسێ وان کری ب رێکا دەقەکی گوه لێ ببیت، و رامانا وی یا ژیواری نەبینیت، چونکی بەحسکرن و زاینا وی تشێ مرۆڤی گوه لێ بووی و دتی نە وەکی وییە یێ بتنێ گوه لێ بووی.

راڤەکەرێن پێشییان ئەوێن ئایەتێن قورئانێ راڤەکرین گەلەك د سەرکەفتی بوون د شرۆڤەکرنا خۆدا دگەل کو راستییێن گەردوونی ل بەر دەستێ وان نەبوون، د گەل هندێ ئەو شرۆڤەکارێ راستی و چاوانییێن ئایەتێن گەردوونی ل عەرد و عەسماناندا، کو د ڤەشارتی بوون ژ دیتنێ ل سەر دەمێ وی، ب پیڤانا دیتنا ئافراندییان، ل دویڤ وێ چەندا وی گوه لێ بووی ژ وەحییێ، ئەڤە یێ جودایە ژ راڤەکارێ هەمبەر وی ئایەتێن گەردوونی ئاشکرا بووی، و شرۆڤەکرنا ڤی دێ ل سەر وێ یا گوه لێ بووی بیت، و ئەوا د ژیوایدا دبینیت.

و چونکی بەحسکرنا بوارێ ڤەکۆلین و ڤەدیتنێن گەردوونی ل چو دەمان نە تشتەکێ مەترسییە ل سەر عەقیدەیێ، دێ بینین راڤەکەر ل چو سنوران نەراوەستان بۆ وان دەقێن قورئانێ کو ڤێ چەندێ دسەلینین، بەلکو هەول ددا ب وان دەقێن خودێ بۆ وان ب سناهی کرین ژ زانینا وان کو بۆ وان رێدایی ل چەرخێن وان راڤە بکەن، و ل دویڤ وێ شرۆڤەکرین یا خودێ دایێ. و خودێ بوو پشتەڤانێ راڤەکاران بۆ شرۆڤەکرنا وان ئایەت و فەرموودەیێن گرێدایی ب نهێنییێن عەرد و عەسمانانڤە - ئەوێن ل چاخێ وان ئاشکرا نەبوون - و وی ئاستی دیار بکەن یێ مرۆڤ گەهشتییێ ژ زانستی د وان بیاڤاندا، و دیار بکەن کا خودێ چەند ئەو راڤەکەرە سەرئێخسبوون، ڤێجا دەمێ دیتنا راستییێ هات د ژیوارێ وێ گەردوونیدا، دێ پێککرنەکا ئاشکرا دیار بیت د ناڤبەرا وی تشتێ وەحیێ بریار ل سەر دای و وی تشتێ چاڤان دیتی، و سنۆرێن زانینێن مرۆڤان دیار دبن ئەوێن سانسۆرکری ب سانسۆرێن هەستا سنۆردار، و زانستێ مرۆڤایەتی یێ سنۆردارکری ب سنۆرێن دەمی و جهی، و ئیعجاز پتر دیار و ئاشکرا دبیت.

و خودێ پشتەڤانییا راڤەکەران کر سەبارەت وی تشتێ وان شرۆڤەکری ژ ئایەت و فەرموودەیێن گرێدایی نهێنییێن عەردی و عەسمانی، ب خێرا دویفچۆنا وان بۆ دەقێن وەحییا هاتییە خوار، ژ لایێ وی یێ نهێنییێ دزانیت د عەردی و عەسمانیدا، ل بەر رۆناهییا وی تشتێ خودێ نیشا وان دای ژ رامانێن بێژە و ئایەتان.

## رویێن ئیعجازا زانستی:

١- رێککەفتنەکا هویربین هەبیت د ناڤبەرا دەقێن قورئانێ و سوننەتێدا، و وان راستی و نهێنییێن گەردوونی ئەوێن زانایێن گەردوونی ئاشکرا کرین کو د شیانێن مرۆڤاندا نەبوو بزانن ل دەمێ هاتنەخوارا قورئانێ.

٢- راستڤەکرن و دورستکرنا قورئانێ و سوننەتێ بۆ هزرێن نەدورست ل دۆر نهێنییێن ئافراندییان کو ل سەر دەمێن جودا جودا بەربەلاڤ بووی د ناڤ مرۆڤاندا.

٣- ئەگەر مە دەقێن قورئانێ و سوننەتا دورست یێن گرێدای ب گەردوونیڤە کۆمکرن، دێ بینین هەر ئێك تەمامکەرێ یێ دییە، و دێ راستی ئاشکرا بیت، د گەل هندێ ئەڤ دەقە هەر ئێك د دەمەکیدا هاتییە خوارێ، و هەر ئێك د جهەکێ قورئانێدا یێ هاتی، و ئەڤە ژی چێ نابیت هەکە ژ دەڤ خودێ نەبیت ئەوێ نهێنییا ئەسمانان و ئەردی دزانیت.

٤- دانانا یاسایێن شەرعی یێن حەکیمانە، کو حیکمەتا وێ یا ڤەشارتی بوو دەمێ هاتنەخوارا قورئانێ، و ڤەکۆلینێن زانایان یێن ئاشکراکرین د هەمی بوارەندا.

٥- نەهەڤدژییا د ناڤبەرا دەقێن وەحیا ڤەبرِ یێن بەحسێ سالۆخەت و نهێنییێن گەردوونی دکەت - کو گەلەکن - و ئەو راستییێن زانستی ئاشکرا کرین - کو د زۆرن - د گەل هەبوونا هەڤدژییەکا زۆر د ناڤبەرا وان تیۆرێن زانایێن گەردوونی دبێژن کو

دهێنه گوهۆرین د گەل پێشفەچۆنا ڤەدیتنان، و هەبوونا هەڤدژییێ د ناڤبەرا زانستی و فەرمان و رێنمایێن ئایینێن دی یێن دەستکاری و گوهۆرین ب سەردا هاتی.

## پێگرك و رێکخەرێن ڤەکۆلینێ د ئیعجازا زانستیدا د قورئان و سوننەتێدا :

١- دڤێت رامانێن پەیڤان بەرچاڤ بهێنە وەرگرتن وەکی د زمانێ ل دەمێ هاتنەخوارا وەحییێدا هاتی، و بەرچاڤ وەرگرتنا رێزمانی و مەرەمێن وان، و بەرچاڤ وەرگرتنا بنەمایێن رەوانبێژییێ و تایبەتمەندییێن وان، و نابیت پەیڤ ژ راستییا وێ دەرکەڤیت، ب تنێ پەیڤەکا گرێدایی وێ نەبیت و تێرا وێ رامان هەبیت.

٢- دویرکەفتن ژ تەئویلێ[1] د دەقێن گرێدایی ب ئیعجازا زانستی د قورئانا پیرۆزدا.

٣- نابیت راستییێن قورئانێ ببنە جهێ بۆچۆنان، دڤێت راستییێن وێ بنیات بن و ئەو تشتێ رێککەفت د گەل وێ پەسەند ببیت، یێ نەرێککەفت بهێتە رەتکرن.

٤- دڤێت قورئان بهێتە راڤەکرن ل دویف زانستێ باوەرپێکرییەکا نەلڤ و تمام، نابیت ب تیۆر و بۆچۆنان کو هێژ مابن جهێ سەحکرن و تاقیکرنێ، هندیکە پێشبینیکرن و گۆمانن نابیت قورئان ب ڤان بهێتە راڤەکرن، چونکی ئەڤە ل بەردەم راستڤەکرن و دورستکرنێنە، یان ژی ژ کارکەفتنێ د هەر دەمەکیدا.

و هەکە کێماسی د هندەك خواندناندا هەبیت د بیاڤێ ئیعجازا زانستی د قورئان و سوننەتێدا، نە یا دورستە ببیتە حوکمەك و بێت گشتاندن ل سەر هەمییان، و ئەڤ

---

[1] - زڤڕاندنا وێ پەیڤا مەرەم پێ هەی بۆ رامانەکا دویرتر ژ رامانا وێ یا حەرفی. یان وەکی (أبو اسحاق الثعلبي) د پەرتۆکا خۆدا (الکشف والبیان في تفسیر القرآن) دبێژیت: (تأویل) راڤەکرنا ڤەشارتی یا پەیڤێیە. وەرگێڕ.

چەندە فەرز و فەر دکەت ل سەر زانایێن ئیسلامێ یێن خودان شیان ئەو لەزێ بکەن بۆ خزمەتکرنا قورئانێ و سوننەتێ د بیاڤێ زانستێن گەردوونیدا، هەروەکی زانایێن پێشییێ خزمەت کری د بیاڤێ زمانی، و شەنگستەیان، و فقهی، و ژ ل وان ژ بیاڤێن زانستێن شەرعی، ڤێجا ئەم یێن ل بەرانبەر موعجیزەیەکا زانستی یا مەزن کو ئەنییێن سەرکێشێن زانستێن گەردوونی یێن دادپەروەر د چاخێ مەدا بۆ دئێنە چەماندن.

و ئالییێ دی ژ دژمنێن موسلمانان بۆ خۆ ئەو گۆتنێن ب لەز و سەرپێ و نە گەلەك پشتراست د بابەتێ ئیعجازا زانستی د قورئانێ و سوننەتێدا کرنە بەهانەکا مەزن - سەبارەت وان - بۆ دیارکرنا هەڤدژییێ د ئایەتێن قورئانێ و فەرموودەیێن پێغەمبەریدا ﷺ، ب رێکا دیارکرنا هەڤدژییا وێ تیۆرا زانستی بەرفرەھ ئەوا هێشتا نەهاتییە سەلماندن، ڤێجا یا فەرە ل سەر ڤەکۆلەری د بیاڤێ ئیعجازا زانستی د قورئانێ و سوننەتێدا ئەو باش دویفچۆنێ بکەت و ڤەکۆلیت و پشتراست بکەت و لەزێ نەکەت بەری ئەو ئایەتەکێ ژ قورئانێ، یان فەرموودەیەکا پێغەمبەری ﷺ گرێدەت ب گۆتنەکێ کو وەسا دیارکەت ئەو سەر ب زانستی ڤەیە، و زانست ژێ بێ بار و بێ گونەهە.

کورتییا ئاخفتنێ ئەوە راڤەکرنا زانستی بۆ قورئانێ و سوننەتێ یا رەتکرییە ئەگەر پشت بەستن ب تیۆرێن زانستی کربیت کو نەهاتبنە دوپاتکرن و خۆجهکرن، و نەگەهشتبنە پلا زانستی یا دورست و ڤەبڕ، و دیسا دێ یا رەتکری بیت ئەگەر یا جودا بیت د گەل قورئانێ ژ لایێ رێزمانا زمانێ عەرەبیڤە و رامانێن پەیڤ و بێژەیێن وی ل سەر دەمێ پێغەمبەری ﷺ، دیسا دێ یا رەتکری بیت هەکە ژ باگراوەندەکی دەرکەڤیت زانستی بکەتە بنیات، و قورئانێ بکەتە دویفکەتی، و دێ یا رەتکری بیت هەکە بەروڤاژی تشتەکی بیت ژ وان یێن قورئانێ یان فەرموودەیەکا دورست ل جهەکێ دی دیار و ئاشکرا کری، و دێ یا رەتکری بیت هەکە ژ لایێ وان رۆڤان بیت یێن پشتراست نەبووین ژ وی تشتێ وەرگرتین، و ب دورستی پێشکێش نەکرین، و ئەو وەسا هزر دکەن کو ئەو خودان زانستن، و زانست ژ وان بێ بارە، بەلێ دێ یا وەرگرتی و جهێ رازیبوونێ

بیت ژ وان یێن پێگری ب شەنگستەیێن بەرنیاس کرین ژ بنەمایێن تەفسیرێ و پێگری ب وی تشتی کرین یێ سنۆرێن زمانێ، سنۆرێن شریعەتی فەر دکەن، و لێگەڕیان، و پاراستن، و پێگری کی ب وی تشتێ فەر بۆ هەرکەسێ باش هزرا خۆ د قورئانێدا بکەت، هەروەسا ئەو دێ یا وەرگرتی و جهێ رازیبوونێ بیت ژ وی کەسێ خودێ زانینا قورئانێ و سوننەتێ، و زانینا ب یاسایێن گەردوونی پێکڤە ب رزقێ وی کری، ڤێجا دڤێت ئەو دەقێ جهێ ئیعجازا یێ سەلماندی بیت ژ لایێ ڤەگوهاستنێ و رامانێڤە، و ئالییێ زانستی ژی یێ ڤەبڕ بیت و دورستییا وی یا سەلماندی بیت، و رێککەفتن نەیا سەرپێ و هەما هۆسا بیت بەلێ دڤێت یا تەمام بیت، و نە یا دەستکرد و چێکری بیت یان خورتی لێ هاتبیتەکرن و زێدە هاتبیتە ڤەچەماندن.

## گرنگییا ڤەکۆلینێن زانستی و بەرهەمێ وان:

ئەگەر هەڤچەرخێن پێغەمبەری ﷺ ب چاڤێن خۆ گەلەك موعجیزە دیتبن، ژ بەر کو خودێ وەسا خەلکێ وی چەرخی دیت کو موعجیزا پێغەمبەرێ وی د گەل سەردەمێ وان بگونجیت، و بۆ وان دیارکر کو قورئان یا راست و دورستە، و ئەو ئاشکراکرنا خودێ د قورئان و سوننەتێدا ئاشکراکرنەکا ئیعجازا زانستییە، و خەلکێ ڤی سەردەمی بۆ چو تشتا خۆ ناچەمینن وەکی بۆ زانستی خۆ دچەمینن، ب هەمی توخم و ئایینێن خۆڤە.

خودێ بەرێخۆدانا مرۆڤی بۆ وان هەمی تشتێن د عەرد و عەسماناندا هەین کو زانستێ تاڤیکری یێ ل سەر ئاڤا بووی کرییە رێك بۆ باوەری ئینانێ ب وی، و رێك بۆ باوەری ئینانێ ب پێغەمبەرێ وی، و رێك بۆ باوەری ئینانێ ب ئایینێ وی یێ هەق، ئەڤێ داخوازێ بۆ زانستی دکەت، و زانست ژی داخوازێ بۆ دکەت.

و د شیانێن موسلماناندایە خۆ پێش بێخن ژ بۆ دورستکرن و راستڤەکرنا رێرەوێ زانستی ل جیهانێ و بدانن جهێ وی یێ دورست، و بکەنە رێك بۆ باوەرییا ب خودێ و

پێغەمبەرێ وی و وێ راستییا د قورئانێدا هاتی نیشا بدەن، و ببیتە بەلگە ل سەر راستییا ئیسلامێ.

هزرکرن د ئافراندنا عەرد و عەسمانادا پەرستنە و هزرکرن د رامانا فەرمووودەیاندا پەرستنە ژ بلندترین ئاستێن پەرستنێیە، و پێشکێشکرنا وان بۆ خەلکی گازییەکا خۆرستییە بۆ وی خودایێ ئافرێنەرێ عەرد و عەسمانان، و ئەڤە هەمی یا د ڤەکۆلینێن ئیعجازا زانستی د قورئان و سوننەتێدا هاتییە ب جهئینان، و ب ڤێ چەندێ دیسا موسلمانان هان ددەت بۆ ئاشکراکرنا نهێنییێن گەردوونی، ب پالدانێن باوەرییێ کو ئەو ماوێ پاشکەفتنێ ببۆرینن کو ئەو ماوەکێ تێدا ژیایی د ڤان بواراندا، و دێ ڤەکۆلەرێن موسلمانان د ئاخفتنا خودێدا ژ نهێنییێن ئافراندییێن وی بینن بەلگە بۆ هیدایەتا وان د ماوێ لێگەریان و ڤەکۆلینێن واندا، گەهشتنا ئەنجامان دێ بۆ وان نێزیك بیت، و دێ شیان ل دەڤ وان زۆر بن.

ئەگەر مە گرنگییا ڤان ڤەکۆلینان زانی د هێزکرنا باوەرییا باوەردارانداو، و لادانا وان فیتنان کو ئیلحادێ و بێ دینییێ کرینە بەر زانستی، و گازییا نەموسلمانان بۆ ڤی ئایینێ موکم و راست و دورست، و وێ تێگەهشتنا قورئان و سوننەتا دورست نیشا مە ددەت، ئەڤە دێ بنە پالدەر بۆ موسلمانان ژ بۆ پێشکەفتنا زانستی د ناڤ واندا کو د گەل ئایینی هەڤ بگریت، ژ ڤێ چەندێ هەمییێ دیار دبیت کو ئەنجامدانا ڤان ڤەکۆلینان ژ گرنگترین فەرزێن کیفایەتانە (فەرزێن کیفایەتان ئەو یێن هەکە هندەك موسلمان پێ رابوون گونەه ژ سەر هەمی موسلمانان رادبیت، بەلێ هەکە کەس ژ موسلمانان پێ نەرابوو موسلمان هەمی د گونەهکارن)[1].

---

[1] - هندەك هزرێن (پێشکۆتنا قورئانێ و سوننەتێ) هاتینە وەرگرتن ژ ڤەکۆلینەکێ د ئنتەرنێتێدا ل ژێر ناڤێ: (ئیعجازا زانستی وەك بنەجهکرن و پەیرەو)، یا دکتور زەغلول ئەلنەجاری.

# چیرۆکا ڤێ پەرتووکێ

ڤێ پەرتووکێ چیرۆکەك یا هەی... خودێ رۆمەت و بها دانە من کو ئەز بانگەوازییێ بۆ وی بکەم ژ سیه سالان وەرە، ب وێ باوەرییێ کو ئەڤ ئایینە ئایینێ خودێیە، و ئەو - بتنێ - خودان شیانە ل سەر پاراستن و سەرئێخستنا وی، پێدڤی ناکەت ئەم ل سەر دودل بین، بەلێ پێدڤییە ئەم دودل بین ئەگەر خودێ بۆ مە رێك ڤەکر یان نە ڤەکر کو ئەم ببینە سەربازێن وی، و من دەست پێکر د ڤێ بانگخوازیێدا کو من بەرپرسیارییا وێ هەلگرتی بۆ ماوێ سیه سالێن چۆیی ژ بیروباوەرێن خۆجه.

ژ ڤان بیروباوەران کو گۆتارا ئیسلامی بچیتە د عەقلێ مرۆڤیدا، و دلێ وی، و ژیان و دنیایا وی؛ ئەڤەژی ژ بەر هندێ مرۆڤی عەقلەکێ هەی دزانیت، و دلەکێ هەی حەژێکرنێ دکەت، و لەشەکێ هەی بزاڤێ دکەت، و خوارنا عەقلی زانستە، و خوارنا دلی حەژێکرنە، و خوارنا لەشی خوارن و ڤەخارنە، و جل و بەرگ و جهێ حەواندنێییە، و ئەگەر گۆتارا ئیسلامی بنەمایێن عەقلی ل بەرچاڤ وەرنەگریت، و ئەگەر یا ئاراستەکری نەبیت بۆ دلی، و ئەگەر بەرژەوەندییێن سەرەکی و رێ پێدایی یێن مرۆڤی ب جه نەئینیت، ل ڤێرە گۆتارا ئیسلامی سەرکەڤتنێ نائینیت کو شیان هەبیت کارتێکرنێ ل کەسانێن دی بکەت، و دیتن و باوەرییێن وان ب گوهۆڕیت ژ لایەکێ، پاشی رەوشت و شێوێ ژیانا وان ب گوهۆڕیت ژ لایەکێ دیڤە، دگەل دوپاتکرنێ ل سەر هندێ کو ئەڤ گوهۆڕینە یا هەلبژارتییە نە یا سەپاندییە.

هەر بانگخوازەك دڤێت یێ زانابیت د شەنگستە و لقێن ئایینیدا، و راستییێن وی یێن بنەجهکری و سەلماندی ئەوێن هاتینە وەرگرتن ژ هەردو وەحییان؛ قورئان و سوننەت، و یێ زانابیت د سروشتێ ناخێ (نەفسا) مرۆڤیدا و تایبەتمەندییێن وێ، و یێ زانابیت د رێکێن پەروەردەیی یێن کاریگەر د پەیداکرنا گوهۆڕینێن راست د ناخێ مرۆڤیدا، و

پێدڤییه بۆ بانگخوارزی - دیسان - رەوشەنبیرییا سەردەمانە وەرگریت ب لایەنێن وێ یێن جهگر و گۆهۆڕڤە، و ب سروشتێ سەردەمی، و لەزاتییا پێشکەڤتنێ، و هێزێن کاریگەر، و پیڤەرێن پشت بەستن ل سەر دهێتەکرن تێدا، و ئەگەر ئەڤ بهایێ بلند ل بەر بانگخوازی گران بوو پێدڤییە ل بەر وی نەهێتە ڤەشارتن کو بانگخوزاییا بۆ خودێ مەزنترین کارە مرۆڤی نێزیکی خودێ دکەت، و نێزیکی وێ چەندێ دبیت یا پێغەمبەران کری، چونکی خودێ دبێژیت: (يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِنَّا أَرْسَلْنَاكَ شَاهِدًا وَمُبَشِّرًا وَنَذِيرًا (٤٥) وَدَاعِيًا إِلَى اللَّهِ بِإِذْنِهِ وَسِرَاجًا مُنِيرًا (٤٦)) [الأحزاب: ٤٥-٤٦]، ئانکو، هەی پێغەمبەر مە تو یێ هنارتی، دا ببییە شاهد و مزگینئێن و ئاگەهدارکەر. و دا ب دەستوپرییا خودێ داخوازا رێکا خودێ بکەی، و دا ببییە چرایەکێ رۆنکەر و گەش.

و ژ جهگرییێیە کو ئەگەرێن هێزا کارتێکرنا بابەتیی (بێی لایەنگەری)، گرێدانا ئارمانجان ب رێکانڤە، رەسەنییێ ب نوییاتییێڤە، و یا جهگران ب گوهارتییانڤە، و گرێدانا کەڤنی ب نویڤە، و گرێدانا ئیسلامێ ب ژیانێڤە، و ئەو ئایینێ زکماکییێیە (فطرة)، و ئایینێ دۆرهێلییە، و ئایینێ زانستییە، و ئایینێ ناڤجییێیە کو د ناڤبەرا پێدڤییان و بهایان کوم دکەت (پێکڤە گرێ ددەت)، و د ناڤبەرا بیروباوەر و بەرژەوەندییان، و د ناڤبەرا کەرستەی و رۆحێ، و د ناڤبەرا دنیایێ و ئاخرەتێ.

و ژ ڤان بیروباوەرێن جهگر، و دیتنا بابەتیی پێتڤی دکەت کو گۆتارا ئایینی یا هەڤچەرخ بیت، ئەز یێ رژد بووم د گۆتارا خۆ یا ئیسلامیدا ب هەمی جۆر و شێوە و رەنگێن خۆڤە، چ ل مەزگەفتان، یان ل زانکویان، یان ل دەزگەهێن بانگخوازی، یان ل مەلبەندێن رەوشەنبیری، یان دەزگەهێن راگەهاندنا ناڤخۆیی، و عەرەبی و ئیسلامی و نیف دەولەتی، ئەز یێ رژد بووم کو راستییێن ئایینی دگەل راستییێن زانستی پێکڤە کۆم بکەم، دا ئەڤ راستییە خۆجە بیت کو ل دەڤ گەلەك موسلمانان نینە، ئەوێ گەردوون ئافراندی ئەوە یێ قورئان ئینایە خوار، و راستی (هەقی) بازنەکە کو تێدا

هێلێن ڤەگوهاستنا دورست، و عەقلێ خۆرست (صريح)، و فیترەتەکا ساخلەم، و دۆرهێلێ بابەتی دگەهنە ئێك، ژ بەر ڤێ چەندێ پشکەکا زانستی د هەمی گۆتارێن من یێن ئایینیدا یا هەی.

و ئەڤ پەرتووکە د راستییا خۆدا کۆمەکا بابەتێن زانستینە کو هاتبوونە پێشکێشکرن د ماوێ سیه سالاندا د بانگەوازی و رێیا خودێدا، من کۆمکرن، و پێکڤە گرێدان، و ژێك ڤاڤێرتن، و هاتنە نیشاندان بۆ بسپۆرێن د وان زانستێن من ل سەر نڤیسی، و تێبینییێن وان هاتنە وەرگرتن، و من ئەڤ چەندە د لیستا ژێدەر و لێڤەگەڕاندا یا سەلماندی، وێ لیستا ژێدەر و لێڤەگەڕێن گرێدایی ب ئیعجازا زانستی د قورئان و سوننەتێدا کو پشکەکا سەرەکی بوون ژ پەرتۆکخانەیا من.

و دگەل هندێ من شیانێن خۆ مەزاختن د راستڤەکرنا وان ژمارێن کەڤندا کو هاتبوونە وەرگرتن ژ لێڤەگەڕێن زانستیدا بەری دەه یان بیست سالان بۆ نویترین تشتێ زانست گەهشتییێ ژ راستییان و ژماران، و دگەل ڤی هەمی کاری و لێزڤڕینێ و نیشاندان بۆ بسپۆران، دێ خواندەڤان ژمارەکێ یان ڤەبارەکێ یان شێوەکێ یان ناڤەکێ یان سالۆخەتەکێ بینیت، چێدبیت یا جیاواز بیت د وێ پەرتووکا ل بەردەستێ ویدا، بەلێ ئەڤ جێوازییە گەلەکا سروشتییە، چونکی زانست بەردەوام د پێشڤەچوونێدایە، و ئەڤ جێوازییە یا پەسەندە، چونکی ئەڤ پەرتووکە د راستیی و خۆیەتییا خۆدا نیاسینەکە بۆ خودێ، و نە پێناسەکە بۆ هویربینییێن زانستەکێ ژ زانستان.

و راستییێن زانستی یێن ڤێ پەرتووکێ رێکەکە، و نە ئارمانجەکە ئەو بخۆ، و بۆمە ژمارە نەیا گرنگە د ڤێ پەرتووکێدا، بەلێ یا گرنگ بۆ مە سەلماندنا وێ چەندێیە کو نیاسینا خودێ ب رێکا گەردوونی و مرۆڤی رۆهن و دیار دبیت، و ئەگەر جێوازییەك دناڤبەرا ژماراندا هەبیت ئەز نەلایەکم ژ ڤێ جێوازییێ، بەلکو جێوازی یا دناڤ وان لێڤەگەرێن بەر دەستێ مندا، و ئەوا ل بەردەستێ خاندەڤانی، و ئەگەر ئارمانجا مەزن ژ

نڤیسینا پەرتۆکێ یا دیار نەبیت ل دەڤ خاندەڤانی ئەو مفایەکێ وەسا ژێ وەرناگریت ب وێ چەندێ ئەوا کو من ڤیای ژ نڤیسینا پەرتووکێ.

و تەکۆزی (کەمال) بتنێ یا خودێیە، و پێغەمبەر ﷺ بتنێ یێ پاراستییە ژ خەلەتییان، و ئوممەتا وی یا پاراستییە ب هەمیڤە، چونکی هەر داخازکەرەکێ زانستی چێدبیت ژ لایەکیڤە یێ زیرەك و سەرکەڤتی بیت، و یێن دی ژلایەکێ دیڤە، و دان و وەرگرتن د زانستیدا یا پێدڤییە، و چونکی هەر مرۆڤەکێ ژێ دهێتە وەرگرتن و دێ هێتە زڤراندن ل سەر وی، بتنێ پێغەمبەرێ مە نەبیت؛ موحەممەد ﷺ، و ئەز چاڤەرێی برایێن خاندەڤانم - وەکی د پەرتووکێن من یێن بەرێدا وەکری، وەك جێبەجێکرن بۆ وەسیەتا عومەرێ کورێ خەتابی رضي الله عنه دەمێ کۆتی: (أحبُ الناسِ إليَّ مَن رَفع إليَّ عيوبي)[1] (ئانکو، خۆشتڤیترین کەس ل دەڤ من ئەوە یێ کێماسییێن من بۆ من بێژیت) کو کەرەم بکەن تێبینییێن خۆ دیارکەن ل دۆر ناڤەرۆکێن مەوسووعا زانستی، و بەلگەیێن قورئان و سوننەتێ، و بەلگە و وان دەرئێخستنێن د ناڤبەرا راستییێن زانستی و راستییێن ئایینی پێکڤە گرێ ددەت، دا وەربگرم بۆ چاپێن بهێن، ئەگەر خودێ حەزکر، و پەرتووك زێدەتر نینە ژ بلی هەولدانەکا بچویك (متواضع) بۆ دیارکرنا کو ئەوێ گەردوون ئافراندین ئەوە یێ قورئان ئینایە خارێ، و ئەوە یێ پێغەمبەر ﷺ هنارتی دا ببیتە رێ نیشاندەر بۆ مرۆڤان، و ئەگەر من یا دورست کر ئەڤە ژ سەرکەڤتن و قەنجییا خودێیە بۆ من، و ئەگەر من یا دورست نەکربیت ئەڤە ژ کێم خەمییا من و لاوازییا شیانێن منە.

و راستی یا سەر هەمییاندا، و ناڤەرۆك د سەر ناڤ و نیشاناندانە، و بیروباوەر د سەر کەساندانە، و کەسێن باوەردار بۆ ئێك و دو شیرەتکەرێن ئەڤیندارن، و کەسێن دوروی بۆ ئێك و دو ڤێلباز و حەسویدن، و یا هاتییە ڤەگوهاستن کو ئیمامەك (پێشەوا)

---

[1] - سنن الدارمي (١/١٦٩) ب بێژەیا: (رحم الله من أهدى إلي عيوبي).

گەهشتە گەنجەکێ و ل بەر سینگێ ڤی گەنجی کۆرکەك هەبوو، گۆتە ڤی گەنجی: هشیاربە هەی گەنج دێ کەڤی، ئینا گەنجی گۆتێ: بەلکو هەی ئیمام تو ژ خۆ هشیاربە؛ ئەگە ئەز کەڤتم دێ بتنێ کەڤم، بەلێ ئەگەر تو بکەڤی دێ جیهان هەمی دگەلتە کەڤیت، ژ بەر ڤێ چەندێ یێ بچویکتر ژی دشێت رەخنێ بگریت، و یێ مەزن ژی خەلەت دبیت.

و ئەز ل ڤێرە نەشێم چو بێژم بتنێ ئەز دوعا بکەم و دێ بێژم: خودێ ژ پێش مەڤە خێرا سەرورەرێ مە موحەممەدی ﷺ بنڤیسیت هندی ئەو هێژا، و خودێ خێرا دەیك و بابێن مە، و ماموستایێن مە، و شێخێن مە، و ئەوێن ئەم فێرکرین، و ئەوێن ماف ل سەر مە هەی بنڤیسیت هندی ئەو هێژا.

و پێدڤییە ئەز ل دویماهییێ سوپاسییا هەمی برایێن رێزدار بکەم ئەوێن هاریکاربوون بۆ دەرکرنا ڤێ پەرتووکێ، و سوپاسییەکا تایبەت بۆ وان یێن تایپکرنا کۆمپیوتەری کری کو دەق تێدا نڤیسین، و وان کەسێن کاسێت ڤالاکرین بۆ سەر کومپیوتەری، و ئەوێن لێزڤرین بۆ دەقان دگەل کاسێتان کری، و ئەوێن پێداچوونا زمانی یا دەقان کری، و ئەوێن راستڤەکرن ل سەر نڤیسینێن دەستپێکی کری، پاشی ئەوێن دەقێن پەرتووکێ ل سەرێك داناین و رێکخستین، و ب ڤی شێوێ هونەری یێ نوکە پەرتووك دەرئێخستی، و ئەوێن پێداچوونا دویماهییێ کری، و ئەوێن ب چاپکرنا وێ رابوویین، و ئەوێن ل چاپخانا (دار المکتبي)، و ل بەراهییا هەمییان خودانێ وێ، چ هندەکێن ژ وان کرییەك وەرگرت بیت یان داخازا کرییەکێ کری، بۆ هەمی وان کەسێن هاریکاری و بەشداری کری د دەرئێخستنا ڤێ مەوسووعێدا و ئینایە بەردەستان، چ ئەوێن ئەز د نیاسم، یان نەنیاسم - و یێن نەدیار و ئەز نەنیاسم خودێ وان دنیاسیت - ئەو کۆما کارەکێ بانگخوازییێنە، ئەو هەمی د کەڤنە ژێر گۆتنا خودێ: (وَمَنْ أَحْسَنُ قَوْلًا مِمَّنْ دَعَا إِلَى اللَّهِ وَعَمِلَ صَالِحًا وَقَالَ إِنَّنِي مِنَ الْمُسْلِمِينَ (٣٣)) [فصلت، ٣٣] ئانکو، ما ئاخڤتنا کێ ژ یا

وی چێترە ئەوێ بەرێ خەلکی ددەتە ڕێکا خودێ و بانگهەلێرییا ڕێکا وی دکەت، و کار و کریارێت ڕاست دورست دکەت، و بێژیت: ب ڕاستی ئەز ژ موسلمانانم؟.

و هیڤی ژ خودێ دکەم ئەز ئێك ژ وان بم، هیڤییە کو ژ وان کەسان بم یێن کاری دکەت بۆ ڕوییێ خودێ، بەلکی خودێ ژ مە هەمییان قەبیل کەت، و دلۆڤانییێ ب مە هەمییان ببەت.

ئەز خۆ ب تە دپارێزم ئەی خودا کو ئێك هەبیت ب وێ یا تەنیشا مندایی شادتر بیت، و خۆ ب تە دپارێزم کو گۆتنەکا رازیبووناتە تێدا من گۆت بیت، من قەست کربیتە ئێکێ ژ بلی تە، و خۆ ب تە دپارێزم ژ فتنا گۆتنێ، دیسا ئەز خۆ ب تە دپارێزم ژ فتنا کاری، و خۆ ب تە دپارێزم کو من خۆ ب تشتەکی ئینابیتە دەر و ئەز نەیێ باشبم تێدا، دیسان ئەز خۆ ب تە دپارێزم ژ خۆ مەزنکرنێ د وی تشتێ ئەز تێدا یێ باش بم.

د. محمد راتب النابلسي

# پشکا دووێ

# گەردوون

١- گەردوون

٢- (وَالسَّمَاءِ ذَاتِ الرَّجْعِ)

٣- (الَّذِي خَلَقَ سَبْعَ سَمَوَاتٍ طِبَاقًا)

٤- تارياتی د بۆشاييیا دەرڤەيا عەسمانيدا

٥- هێزا راكێشانێ د گەردوونيدا

٦- دويرگەها پێشكەفتی (المرصد العملاق) و دويرترين مەجەرە ژ مە

٧- مەجەرە (گالاكسی) و ستێر و لەزاتيیا وان

٨- جهێن ستێران

٩- هژمارا ستێران د عەسماناندا

١٠- (فَإِذَا انْشَقَّتِ السَّمَاءُ فَكَانَتْ وَرْدَةً كَالدِّهَانِ)

١١- ستێرا گەشەدار (النَجْمُ الثاقِبُ)

١٢- رێرەوێن هەساران و كلكدارا هالی

١٣- لەزاتيیا رۆناهيیێ

١٤- هەيڤ

## ١٥- موعجیزا ئیسرا و میعراجێ نە یا مەحالە ژ لایێ عەقلیڤە

## گەردوون

د سەحیحا ئبن حەبانیدا زار (عطاء)ی کو عائیشایێ ﵂ گۆت: پێغەمبەری ﷺ د شەڤا مندا، گۆت: ((یا عائشة، ذرینی أتعبد لربي عزوجل))، فقامَ الى القِربَةِ فتوضأ منِها،

ثم قامَ يُصلي، ثم اضطجعَ، فبَكى حتى بَلَّ لِحيَتهُ، ثمَّ سَجَدَ حتَى بَلَّ الأرضَ، ثمَّ اضطجعَ علَى جَنبهِ، حتَى أتى بلالٌ يُؤذِنهُ بِصَلاةِ الصُبحِ، فقَالَ: يا رَسُولَ اللهِ مَا يُبْكِيكَ، وَقَدْ غَفَرَاللهُ لكَ مَا تقَدَمَ مِنْ ذَنبكَ وَمَا تأخَرَ؟ فقال: وَيحَكَ يا بلالُ! وَمَا يَمنَعُني أن أبْكيَ، وَقَدْ أنزَلَ اللهُ عَليَ في هذهِ الليلةِ: (إِنَّ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَاخْتِلَافِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ لَآَيَاتٍ لِأُولِي الْأَلْبَابِ)، وَيلٌ لِمَنْ قرَأها، وَلمْ يَتفكَرْ فيهَا))[1].

ئانكو: ئەی عائیشا، من بهێله دا پەرستنا خودایێ خۆ بكەم، پاشی چۆ دەست روی ڤەدا، و رابوو نڤێژ كر، و كره گری هەتا رهێن وی تەر بووین، پاشی سوجدە بر هەتا عەرد ژی ژ بەر رۆندكێن وی تەر بووی، پاشی خۆ رازانده سەر كێلەكا خۆ، هەتا بیلال هاتی و بانگێ سپێدێ دای، ئینا بیلالی گۆتێ: ئەی پێغەمبەرێ خودێ تو بۆچی دكەیه گری، خودێ گونەهێن تە یێن چۆیی و یێن بهێن یێن ژێ برین؟! ئینا پێغەمبەری ﷺ گۆت: ((ويحك يا بلال! وما يمنعني أن أبكي، و قد أنزل الله علي في هذه الليلة))، ئانكو: بیلال! مادێ كی بیته رێگر ئەز نەكەمە گری، كو خودێ د ئەڤ شەڤەدا ئەڤە بۆ من ئینایه خوارێ: (إِنَّ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَاخْتِلَافِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ لَآَيَاتٍ لِأُولِي الْأَلْبَابِ) [آل عمران: ١٩٠]، ئانكو: ب راستی چێكرنا عەرد و عەسمانان، و هاتن و چۆنا شەڤ و رۆژان نیشانن (ل سەر هەبوون و دەستهەلاتداریيا خودێ) بۆ كەسێت ژیر و ئاقلدار.

پاشی پێغەمبەری ﷺ گۆت: ئانكو: وەیل بۆ وی یێ بخوینیت و هزرا خۆ تێدا نەكەت.

---

١. صحيح ابن حبان (٦٢٠).

**و یا ژ پێغەمبەری ﷺ هاتییە ڤەگوهاستن: ((أمَرَني رَبِّي أن يكونُ صَمْتي فِكْراً، ونُطقي ذِكراً، ونَظري عِبرَةً))[1]، ئانکو خودێ فەرمان یا ل من کری بێدەنگییا من هزرکرن بیت، و ئاخفتنا من زکر بیت، و بەرێخۆدانا من سەربۆر بیت.**

**حەسەنێ بەسری دلۆڤانییا خودێ لێ بیت دبێژیت: ((من لم يكن كلامه حكمة فهو لغو، ومن لم يكن سكوته تفكرا فهو سهو، ومن لم يكن نظره عبرة فهو لهو))، ئانکو: ئەوێ ئاخفتنا وی زانین نەبیت ئەو پربێژییە، و یێ بێدەنگییا وی هزر نەبیت ئەو خەلەتییە، و یێ دیتنا وی سەربۆر نەبیت ئەو مژویلکرنە.**

**خودایێ ئافرێنەرێ عەرد و عەسمانان دبێژیت: ﴿سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الْآفَاقِ وَفِي أَنْفُسِهِمْ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ الْحَقُّ﴾.**

**و حەقی یان راستی ئەوە بریار و خۆجهبوون، و نەلڤین، و بلندی، و بەروڤاژی راستییێ ژ کارکەفتییە کو ئەو ژ ناڤچۆن و نەمان و کەفتن و بێ بهاییيە، دێ هوین نیشانێن مە د عەرد و عەسماناندا بینن.**

**یا هاتییە زانین کو هژمارا ستێران د عەسماناندا ب هژمارا ئاخ و بەرانە، ئانکو ب هژمارا گەردێن ئاخێ و بەرانە، و زانایێن گەردوونناسی یێن بەرێ هژمارا ستێران ل دەڤ وان ب هزارەهان بوو، و پشتی کو دویرگەهێن (مرصد) وان پێشکەفتین وان ب ملیۆنەهان هژمارا وان ددانان، پاشی گەهشتنە ب ملیاران، ئانکو هزارەها ملیۆنان، و ئەڤرۆ دیار دکەن ب تنێ مەجەرا مە (رێکا کادزا ـ درب التبانة) ب رێکا دویرگەهێن خۆ یێن پێشکەفتی ئاشکرا دکەن کو سیه ملیار ستێرن، دهێتە زانین کو مەجەرا مە ژ مەجەرێن قەبارێن ناڤنجینە، کو ئێکە ژ سەدان هزار ملیۆن مەجەران، کو ناهێتە زانین**

---

**١ـ رواه القضاعي في مسند الشهاب (١١٥٩)، وقال الذهبي في ميزان الاعتدال (١٥١/٦): ((هذا حديث معضل))، وذكره القرطبي في تفسيره (٣٤٦/٧).**

هژمارا وان ب تنێ لایێ خودێ نەبیت، خودێ راستییێ بۆ مە دیار دکەت، دەمێ دبێژیت: (أَفَلَمْ يَنظُرُوا إِلَى السَّمَاءِ فَوْقَهُمْ كَيْفَ بَنَيْنَاهَا وَزَيَّنَّاهَا وَمَا لَهَا مِن فُرُوجٍ) [ق:٦]، ئانکو: ما ئەو بەرێ خۆ نادەنە عەسمانی د سەر خۆرا، کا مە چاوا ئاڤاکرییە و خەملاندییە؟ و چو کون و دەرز لێ نینن.

ئەڤە ژ لایێ هژمارا ستێران، بەلێ قەبارێن وان چەندن؟!

ئەگەر مە زانی بیت کو قەبارێ عەردی ملیۆن ملیۆن مەترێن چوار گۆشەنە، و رۆژ ملیۆنەك و سێ سەد هزار جاران ژ عەردی مەزنترە، و دویراتی د ناڤبەرا واندا سەد و پێنجی و شەش ملیۆن کیلۆمترە، و ستێرەك ژ ستێرێن بورجێ دوپیشکی بەرفرەهترە ژ عەردی و رۆژێ و د گەل دویراتییا د ناڤبەرا واندا، و ستێرەکا هەی ب ناڤێ (منكب الجوزاء) قەبارێ وێ سەد ملیۆن جارا مەزنترە ژ قەبارێ رۆژێ، خودایێ مەزن ئەڤ راستییە د قورئانێدا یا دیارکری، دەمێ دبێژیت: (وَالسَّمَاءَ بَنَيْنَاهَا بِأَيْدٍ وَإِنَّا لَمُوسِعُونَ) [الذاريات:٤٧]، ئانکو: و مە ئەسمان ب هێز یێ چێ کری، و ئەم خودان شیانین.

ئەڤە سەبارەت هژمار و قەبارێن وان، دویراتی چەندە د ناڤبەرا واندا؟

دویراتییا د ناڤبەرا واندا ب سالێن رۆناهییێ دهێنە پیڤان، و رۆناهی د هەر چرکەکێدا سێ سەد هزار کیلۆمتران دبریت، و هۆسا ئەو د سالەکێدا دەهـ هزار ملیار کیلۆمتران دبریت، و پا دێ یا چاوا بیت ئەگەر ئەم بزانین کو هەیف چرکەك و نیڤێن رۆناهییێ یا ژ مە دویرە، و رۆژ هەشت خۆلەکێن رۆناهییێ یا ژ مە دویرە، و تیرێ کۆمەلا رۆژێ سێزدە دەمژمێرێن رۆناهییێنە، و نێزیکترین ستێرا هەل (ملتهب) بۆ عەردی ب چوار سالێن رۆناهییێ یا ژ مە دویرە! و دا بزانین کا مەرەم ژ چوار سالێن رۆناهییێ چییە، دێ بێژین:

ئەگەر ئەم ب مووشەکەکا عەسمانی بەرەف ڤێ ستێرێڤە بچین کو لەزاتییا وێ هندی مووشەکا چۆنا سەر هەیڤێ بیت، دێ ماوێ ڤێ گەشتێ پتر ژ سەد هزار سالان ڤەکێشیت، و ئەگەر لەزاتییا وێ هندی یا ترومبێلێ بیت دێ پێنجی ملیۆن سالان ڤەکێشیت!! ئەڤەیە مەرەما چوار سالێن رۆناهییێ!!

بەلێ ئەم چ بێژین بۆ (سدیم[1] المرأة المسلسلة [ئەندرومیدا]) ئەوا دو ملیۆن سالێن رۆناهییێ ژ مە دویر؟ و دێ مە چ ئاخفتن بۆ وێ مەجەرا نوکە هاتییە ئاشکراکرن هەبیت کو بیست هزار ملیۆن سالێن رۆناهییێ یا ژ مە دویرە؟ و خودایێ مەزن راست گۆتییە، دەمێ دبێژیت: (فَلَا أُقْسِمُ بِمَوَاقِعِ النُّجُومِ (٧٥) وَإِنَّهُ لَقَسَمٌ لَوْ تَعْلَمُونَ عَظِيمٌ (٧٦) ) [الواقعة]، ئانکو: ڤێجا ب راستی ئەز ب جهێ ستێران سویند دخۆم. و ب راستی ئەڤە سویندەکا مەزنە، ئەگەر هوین بزانن.

و ئەم ل سەر ڤینێن ستێران، و لەزاتییا وان یا بلند، و رێرەوێن وان یێن بەرفرەه، و توندییا وان، و هێزا وان یا رۆناهییێ، و ئەو هێزا وان پێکڤە گرێ ددەت، و هەڤسەنگییا وان یا ڤینێ نەئاخفتین، و د سەر ڤێ هەمییێرا نەشیانا نەتێگەهشتنێ تێگەهشتنە، خودێ دبێژیت: (وَمَا قَدَرُوا اللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِ وَالْأَرْضُ جَمِيعًا قَبْضَتُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَالسَّماوَاتُ مَطْوِيَّاتٌ بِيَمِينِهِ سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى عَمَّا يُشْرِكُونَ) [الزمر:٦٧]، ئانکو: وان (ئەوێت هەڤپشکان بۆ خودێ چێ دکەن) ب دورستی و ب ڕەنگێ پێدڤی، ڕێز ل خودێ نەگرتییە (و وەك پێدڤی نەنیاسیە و مەزن نەدانایە)، و عەرد هەمی رۆژا قیامەتێ د دەستێ ویدایە، و عەسمان ژی د دەستێ وی یێ ڕاستێدا د پێچایینە، و خودێ یێ پاك و بلندە ژ وێ شرکا ئەو دکەن.

---

١- وەکی عەورەکێ ستویرە، و ژ خرڤەبوون و ڤێککەفتنا هژمارەکا مەزنا جورمێن عەسمانی دورست بوویە، و ژ وان ژی مەجەرەیە. وەرگێر.

# وَالسَّمَاءِ ذَاتِ الرَّجْعِ

خودێ دبێژیت: (وَالسَّمَاءِ ذَاتِ الرَّجْعِ (١١) وَالْأَرْضِ ذَاتِ الصَّدْعِ (١٢)) [الطارق]، ئانكو: سويند ب وى عەسمانێ خودان باران، و باران دارێژ. و ب وى عەردێ خودان كەلش [گل و گيا و شينكاتى دكەلێشن].

ئافرێنەرێ گەردوونى، عەسمانى ب پەيڤەكێ سالۆخەت دكەت: (وَالسَّمَاءِ ذَاتِ الرَّجْعِ)، چەند زانست پێش بكەڤيت راستييێن نوى ئاشكرا دبن و دبنە پشتەڤان بۆ ڤى سالۆخەتێ ب موعجيزە. و هەيڤ دچيت د زڤرينا خۆدا ل دۆر عەردى، پاشى دێ زڤريتە جهێ خۆ يێ ئێكێ، و رۆژ ژى دچيت و ل دۆر ستێرەكا دى دزڤريت، و پاشى دێ ڤەگەريتە جهێ خۆ يێ بەرێ، و ديسا كلكدار، و كلكدارا هالى بۆ نموونە ل سالا (١٩١٠ز) سەرەدانا عەردى كربوو، و جارەكا دى ل سالا (١٩٨٦ز) بەرەڤ مەڤە هات، زڤرينا وێ ئانكو خۆلا وێ حەفتێ و شەش سالان ڤەكێشا، عەرد دزڤريت و ڤەدگەريت، ديسا هەيڤ، و رۆژ، و كلكدار و هەر تشتەكێ ل عەسمانى دزڤريت ب شێوێ هێكێ يان بازنەيى و ڤەدگەريتەڤە، دەمێ خودێ بەحسێ سالۆخەتا عەسمانى ب پەيڤەكێ دكەت: (وَالسَّمَاءِ ذَاتِ الرَّجْعِ)، ئەڤە سالۆخەتكرنا ئافرێنەرێ وێ يێ راستە، و پاكى و بلندى بۆ باشترين و چێترين چێكەر.

زانا بەرەڤ لايەنەكێ دى چۆن، ئەڤ گازێن خودێ كرينە د ناڤبەرا عەرد و عەسماناندا، مرۆڤ ئۆكسجينى دهەلكێشيت، و دبيتە گازا رەژوييێ دبێژنێ (دوان ئۆكسيدى كاربۆن $[CO_2]$) ئەوا رووەك وەردگريت، و پاشى دێ زڤرينيت ئۆكسجين. هەتا گازان زڤرينەكا سروشتى يا هەى، ژ ئۆكسجينى بۆ گازا رەژوييێ، پاشى جارەكا دى بۆ ئۆكسجينى.

لايەنێ سێيێ دەمێ پێلێن كارەبايى يێن موگناتيسى دهنێرنە عەسمانى دزڤرنەڤە، و پەخشێن (سەتەلايت، راديۆ... هتد)، ئەڤرۆ ل سەر ڤى بنياتى چێدبن.

لایەنێ چوارێ، دەمێ هەلما ئاڤێ بلند دبیتە عەسمانی دزڤریتەڤە باران، خودێ دبێژیت: (وَالسَّمَاءِ ذَاتِ الرَّجْعِ).

عەسمان هەلما ئاڤێ دزڤرینیت باران، و پێلێن کارەبایێ یێن موگناتیسی دزڤرن و دبنە دەنگ، و گاز د گوهۆرینێن خۆدا دزڤرنە دەستپێکێ، و هەر تشتەکێ ل عەسمانی دزڤریتە جهێ خۆ یێ ئێکێ چونکی دزڤرن، و دچن، و دلڤن، د رێرەوەکا بازنەیی یان شێوێ هێکێ، و دەمێ خودێ ب کورتییەکا حێبەتی دبێژیت: (وَالسَّمَاءِ ذَاتِ الرَّجْعِ) ئەڤە رامانا هندێیە کو قورئان یا ژ دەڤ ئافرێنەرێ ڤی گەردوونی هاتی، و ئەڤە سالۆخەتکرنا خودێیە، و دێ هەست کەی کو ئەڤە سالۆخەتکرنا خودێیە، و یا ئافرێنەرییە، و یا چێکەرییە.

و تشتێ دی، ئەگەر تە بڤێت سالۆخەتا عەردی بکەی ب سالۆخەتەکا گشتگرا تەڤایی کو هەمی سالۆخەت تێدا بن تو نەشێی، و خودێ عەرد یێ سالۆخەتکری ب سالۆخەتەکا کو هەمی سالۆخەتێن دورست تێدا بن، دبێژیت: (وَالْأَرْضِ ذَاتِ الصَّدْعِ).

ل دەمەکی هەمی کیشوەر پێکڤە بوون، پاشی شەق بوون و ژێکڤە بوون، کەڤر شەق دبن، هەروەسا بەر، هەتا بچویکترین گەرد شەق دبن، و ئەگەر ئەم سالۆخەتەکێ نەلف بۆ عەردی ببینین ل وی دەمێ خودێ ئافراندی هەتا دویماهییا ژیانێ، شەقبوونە: (وَالْأَرْضِ ذَاتِ الصَّدْعِ)، شەقبوون یا چاوایە؟

عەرد ژ چەند تەخان پێك دهێت، وەکی هێکێ کا چاوا ژ سەرڤە تیڤلەکێ هشکێ تەنکە، و د بندا تیڤلەکێ ستویرێ شلە، و دویڤدا سپیکە، و پاشی زەرکە.

ل ڤێرە دیار دبیت کو تەخێن دەرڤە رەقترینێ ڤان تەخانە، و چەند ئەم بەرەڤ کویراتییا عەردیڤە بچین رەقاتییا وی کێمتر لێ دهێت، هەتا چر دبیت و ل دویماهییێ تەخا حەلیایی دهێت. و ئەڤ بیردۆزە یا بوویە راستی. چەند ئەم بەرەڤ جەوهەرێ

ناڤخۆیا عەردی بچین رەڤاتی کێم دبیت، و گەرماتی زێدە دبیت، و ل ناڤەندا عەردی، لڤین و ڤێککەفتنەکا حێبەتی یا هەی کو کەرستێن حەلیایی یێن ب ئاگرڤەنە. قورئانێ ئاماژە یا ب ڤێ چەندێ دای، دبێژیت: (أَأَمِنْتُمْ مَنْ فِي السَّمَاءِ أَنْ يَخْسِفَ بِكُمُ الْأَرْضَ فَإِذَا هِيَ تَمُورُ) [الملك:١٦]، ئانکو: ئەرێ ما هوین پشت راست بووینە ژ وی ئەوێ ل عەسمانی (مەخسەد خودێیە) کو هەوە د عەردیدا نەبەتە خوارێ، هەروەکی ب سەرێ قاروونی ئینایی و عەرد بلەرزیت.

رامانا پەیڤا (تَمُورُ)[1] لڤین و ڤێککەفتنە، لڤینا ئاگرێ حەلاندی. د ڤێ ئایەتێدا هۆشدارییێ ددەتە مرۆڤان، ئەم ب ڤێ جهگرییێ خۆشییا دبەین ل پشتا عەردی، و خۆشییا ب رەڤاتی و هێزا وێ دبەین، و ئاڤاهییێن مەزن و بلند ئاڤا دکەین ل سەر بنیاتەکێ ب هێز، بەلێ ئەگەر عەرد هەوە ببەتە خوارێ دێ هوین خۆ ل سەر جهەکێ ئاگرین و حەلیایی و دهێت و دچیت بینن، خودێ دبێژیت: (أَأَمِنْتُمْ مَنْ فِي السَّمَاءِ أَنْ يَخْسِفَ بِكُمُ الْأَرْضَ فَإِذَا هِيَ تَمُورُ) [الملك:١٦].

ئەرێ کێ ئەڤ چەندە گۆتییە پێغەمبەری ﷺ و ئەو یێ نەخواندەوار بوو، و د ناڤەندا ڤی عەردیدا ئاگرەکێ حەلیایی و یێ ب لڤین یێ هەی، ئەرێ ما ئەڤ قورئانە ئاخفتنا خودێ نینە؟!

دەمێ تو هەمبەری ئایەتێن گەردوونی د قورئانێدا راوەستای، دێ بینی کو هەر چەند ڤەکۆلین پێش بکەڤن و ل بەر هەوە بهێنە کرن، دێ رێککەڤن د گەل وێ سالۆخەتکرنا خودێ ب کورتی و ب ئیعجاز و ب رەوانبێژی سالۆخەتکری.

---

١. [مار یمور موراً؛ دەمێ دچیت و دهێت و نەیێ جهگر بیت... ومار الشيء موراً: تێکچۆ و لڤی]، (لسان العرب، مادة مور)، إبن کثیر د تەفسیرا خۆدا دبێژیت (٣٩٩/٤): [فإذا هي تمور، ئانکو دچیت و دهێت و تێك دچیت]، و د تەفسیرا (الطبري)دا (٢١/٢٧): [ژ زار ئبن عەباس بۆ گۆتنا (تمور السماء موراً) دبێژیت: لڤینە، و زار موجاهدی: تدور السماء دوراً].

# الَّذي خَلَقَ سَبْعَ سَمَاواتٍ طِبَاقاً

خودایێ مەزن د سۆرەتا (الملك)دا دبێژیت: (تَبَارَكَ الَّذِي بِيَدِهِ الْمُلْكُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ (١) الَّذِي خَلَقَ الْمَوْتَ وَالْحَيَاةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا وَهُوَ الْعَزِيزُ الْغَفُورُ (٢) الَّذِي خَلَقَ سَبْعَ سَمَوَاتٍ طِبَاقًا مَا تَرَى فِي خَلْقِ الرَّحْمَنِ مِنْ تَفَاوُتٍ فَارْجِعِ الْبَصَرَ هَلْ تَرَى مِنْ فُطُورٍ (٣) ثُمَّ ارْجِعِ الْبَصَرَ كَرَّتَيْنِ يَنْقَلِبْ إِلَيْكَ الْبَصَرُ خَاسِئًا وَهُوَ حَسِيرٌ (٤))، ئانکو: پاکی و بلندی بۆ خودایێ خودان دەستهەلات و فەرمانداری، ئەو ل سەر هەر تشتەکی دەستهەلاتدارە. ئەوێ مرن و ژین دایی، دا هەوە تێدا بجەرببینیت کا کی ژ هەوە دێ کار و کریارێن باش کەت، و ئەوە سەردەست و گونەهـ ژێبەر. ئەوە یێ حەفت عەسمان ل سەرێك دانایین و رانایین، و دانان و رانان و چێکرنا خودێ یا وەسایە تو چو ڤێکنەکەڤتنەکێ تێدا نابینی، چاڤێت خۆ بگێرە تو چو تیك و دەرزان ل عەسمانان نابینی. پاشی جارەکا دی چاڤێت خۆ ل عەسمانان بگێرە، دێ چاڤێت تە شەپرزە و وەستیایی ڤەگەرن.

دێ هەمبەر ڤێ گۆتنا خودێ راوەستین: (الَّذِي خَلَقَ سَبْعَ سَمَوَاتٍ طِبَاقًا).

زانایێن گەردوونی دبێژن: تەخا ئێکێ، تەخا نزما هەوایە، زیندەوەر ژ بالندا و یێن هەڤشێوێ وان تێدا دژین، و ئەڤ تەخە ژ چەند تەخەکان پێك دهێت، و ژ رەوشەکێ بۆ رەوشەکا دی دهێتە گوهۆرین، و ژ جهەکی بۆ جهەکێ دی، ژ گەرمێ بۆ سەرمایێ، و بۆ عەورا، و پاشی بۆ بارانان، و بۆ باهۆزان، و بۆ هورێن دژوار، ژ دەمەکی بۆ دەمەکێ دی، و ژ جهەکی بۆ جهەکێ دیتر، و ژ جوداهییا بەرزی و نزمییا جهەکی بۆ جهەکێ دیتر، و ئەڤ جوداییە بنیاتێ پێشبینیکرنێن کێش و هەواینە.

**ئەڤ تەخا نزما بنی، بلنداهییا وێ ژ شازدە کیلۆمەتران نابۆریت.**

**و تەخا دووێ، تەخەکا وەسایە گەردیلێن گازی یێن گوگردی یێن تێدا هەین، ئەڤ گەردیلێن گازا گوگردی وەکی دانانا دەرزیکێنە بۆ عەوران، و هاتنا بارانان ب ساناهی دئێخیت، و ئەگەر ئەڤ تەخا گوگردی نەبا باران نەدهاتن، و ژیان ل سەر روییێ عەردی نەدبوو، و دیسا د تەخا دوییێدا تەخا ئۆزۆن یا هەی، کو بەرگەکە ژ ئۆکسجینا سێیانی تیشکا سەر بنەفشی یا کوژەك دمێژیت و ناهێلیت، چونکی تیشکا سەر بنەفشی یا کوژەك یا د چاڤێ رۆژێدا هەی، تەخا ئۆزۆن ڤێ تیشکێ دمێژیت، وەناکەت ئەڤ تیشکا کوژەك بگەهیتە عەردی، ب تنێ پشکەکا گەلەکا کێم نەبیت، ژ بۆ کوشتنا میکرۆبێن زیانێ دگەهینە زیندەوەران، دەمێ مرۆڤ خۆ ددەتە چاڤێ رۆژێ یا ب مفایە و پاقژکەرە، و تەخا ئۆزۆن یا تووشی هندەك تێکچۆنان بووی ژ بەر زێدەیا گەشتێن عەسمانی، و هەیڤێن دەستکرد. و مە یا گوه لێ بووی پشتی دەمەکێ کێم دێ کۆنگرەکی گرێدەن ژ بۆ ڤەکۆلینا دیتنا رێکەکێ کو ڤێ تەخێ بپارێزن، چونکی پەنجەشێرێن پیستی دەست ب بەلاڤبوونێ کرییە و ب تەڤایی ل هندەك وەلاتێن پێشکەفتی بەلاڤ بوویە کو گەلەك گەشتیگەلان دهنێرنە عەسمانی کو تەخا ئۆزۆن ل ڤان جهان یا تووشی هندەك تێکچۆنان بووی.**

**و تەخا سێیێ، وەکی فرنەکا ئاگرەکێ دژوار هەی، و هەر تشتێ دکەڤیتە د ناڤ ڤێ تەخێدا حەل دبیت، و ئەگەر ئەڤ تەخە نەبیت دا بەرێن گەردوونی و هەسارۆك ب عەردی کەڤن و هەمی تشتان خراب کەن، بەلێ ئەڤ تەخە هەمی تشتان دحەلینیت، ژ نەیزەك و کانزا و هەسارۆك و بەران، ئەڤە بەرەف عەردیڤە دهێن ب ئەگەرێ هێزا راکێشانێ، بەلێ ل ڤێ تەخێ دهێنە سۆتن و حەلاندن و وەکی گوریییەکا ئاگری یا درێژ ل عەسمانی دیار دبیت، و دبیتە خۆلی، ناهێتە دیتن ئەگەر ب تلسکۆپان نەبیت.**

تەخا چوارێ ژ تەخێن بەرگێ گازی ئەو ژی تەخا ((ئەیونوسفیر))ە، ئانکو ئەو تەخا ئەیونی[1]، ب لایەنێن خۆ یێن شێلی، و بلنداهییا وێ نێزیکی هەشتێ کیلۆمترانە ل سەر تەخا ئەیونوسفیردا، و تەخا ئەیونی تووشی تیشکێن رۆژێ دبیت، و نەخاسمە یێن سەر بنەفشی کو کار دکەن ژ بۆ پویچکرنا گەردیلێن گازا ئۆکسجینێ و نایترۆجینێ ب وێ، و دێ ئێك ژ ئەلکترۆنێن خۆ ژ دەست دەت دێ هێتە داگرتن ب کارەبێ، و دەمێ ئەڤ چەندە چێ بوو دبێژنە ڤان گەردیلان ئایونێن تژیکری، ژ بەر کو ئەڤە جهێ ملیۆنەها خۆدیکان (المرائي)[2] د عەسمانیدا دگرن، دێ پێلێن بێ تێل (لاسلکي) بەروڤاژی کەتە عەردی، و دێ هنێریتە رەخێن وێ، و ئەڤە ئەو رێکە یا ب کار دئینن د هنارتنا نامێن بێ تێل ژ کیشوەرەکی بۆ کیشوەرەکێ دی، و ل دۆر جیهانێ ژ هەمی لایانڤە.

و تەخا پێنجێ ئەڤە دەست پێ دکەت ژ هزار کیلۆمتران هەتا شێست و پێنج هزار کیلۆمتران، پیچ پیچە هەوا کێم دبیت د ڤێ تەخێدا هەر چەند بەرەڤ بلنداهییا بچین هەتا ب ئێك جاری نەمینیت، و ئەو تەخا ل دۆر عەردی ستویراتییا وێ پترە ژ شێست و پێنج هزار کیلۆمتران بەرەڤ سەری، و تشتێ ب موعجیزە ئەوە خودایێ مەزن دبێژت: (وَجَعَلْنَا السَّمَاءَ سَقْفًا مَحْفُوظًا وَهُمْ عَنْ آَيَاتِهَا مُعْرِضُونَ) [الأنبياء:٣٢]، ئانکو: و مە عەسمان یێ کرییە بانەکێ پاراستی (ژ کەفتنێ)، و ئەو نیشان و بەلگەیێت مە کرینە تێدا (وەکی رۆژێ و هەیڤێ و ستێران) بێ ئاگەهن.

(سَقْفًا مَحْفُوظًا)، ئانکو: عەرد ب وی دهێتە پاراستن، و هندەك زانایێن بیانی ب ئێك پەیڤ دبێژن: عەسمانێ عەردی ناڤبرەکێ راستەڤینەیە، و تیراتییا وی یا کێمە، بەلێ گەلەکێ ستویرە، و ئەو تیشکان دراوەستینیت، و هەر تشتێ دهێتە خوار و دکەڤیتە د

---

١. دەرکرنا ئەیونیبوونێ، ئانکو دەمێ کارەب ژ ناڤکێ ڤەدبیت د گەردیلەیدا پشتی کو ئەو هاوکێشی ئێکبوون د بارکرنا وزێدا.

٢. مرآة کۆما وێ مَراءٍ، د (لسان العرب)دا هاتییە د ماددا (مرأ): [و کۆما (مرآة) دبیتە (مَراءٍ) ل سەر وەزنێ (مراعٍ)، گۆت: و گشت خەلك بۆ کۆما (المرآة) دبێژن: مرایا، دبێژیت: ئەڤە یا خەلەتە].

**ناڤدا دسوژیت، ئەو ژیانا مە یا دنیایێ دپارێزیت، چونکی ئەو ناهێلیت بگەهنە عەردی ب تنێ ئەو نەبیت یێ ب مفا بۆ مە، و ئەڤە راستگۆییەکە بۆ گۆتنا خودێ: (وَجَعَلْنَا السَّمَاءَ سَقْفًا مَحْفُوظًا وَهُمْ عَنْ آيَاتِهَا مُعْرِضُونَ).**

**بەرگێ هەوای ناهێلیت نەیزەك، و شوهوب، و کانزا، و بەران، و هەسارۆکان، و تیشکێن کوژەك، و هەر تشتێ ب زیان بیت بۆ عەردی بگەهنە عەردی، ژ بەر کو هەوا یان دێ وێ سۆژیت، یان دێ رێکێ لێ گریت، و تەخا ئوزونی رێکێ ل تیشکێن کوژەکێن رۆژێ دگریت، و دمێژیت، و تەخا چوارێ هەمی تشتان حەل دکەت، سالەکێ هاتە بەلافکرن، و ل سەر فرۆکا حەجێ، کو گەرمی ژ دەرڤەی فرۆکێ پێنجی د بن سفرێدا بوو، و گەرمییا کەش و هەوایی د وان رۆژاندا ل مالا پیرۆز ل بەر سیبەرێ پێنجی و پێنج پلە بوو، و ل عەسمانی پێنجی پلە د بن سفرێدا بوو.**

**دەمێ خودێ دبێژیت: (الَّذِي خَلَقَ سَبْعَ سَمَوَاتٍ طِبَاقًا مَا تَرَى فِي خَلْقِ الرَّحْمَنِ مِنْ تَفَاوُتٍ) [الملك:٣]، ئانکو: ئەوە یێ حەفت ئەسمان ل سەرێك دانایین و ڕانایین، و دانان و ڕانان و چێکرنا خودێ یا وەسایە تو چو ڤێکنەکەفتنێ تێدا نابینی، چاڤێت خۆ بگێڕە تو چو تیك و دەرزان ل ئەسمانان نابینی، ئەڤە نیشانەکا مەزنا گەردوونییە، هەمی کەس نوزانن ب تنێ زانا نەبن، (إِنَّمَا يَخْشَى اللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ الْعُلَمَاءُ) [فاطر:٢٨]، ئانکو: ب راستی ژ بەندەیێت وی بەس زانا ب دورستی ژ خودێ دترسن.**

**هەر پەیڤەکا د قورئانێدا ئاماژێ بۆ زانستەکی و هویربینییەکێ ددەت، ئەگەر مرۆڤ هەمی ژیانا خۆ ب ڤەکۆلینا ڤان ئایەتان ببۆرینیت، نەشێت ڤێ چەندێ ب دویماهیك بینیت، بەلکو نەشێن دەهێکا مافێ وێ ب دەتێ**

# تاریاتی د بۆشاییێا دەرڤەیا عەسمانیدا

زانایەك ژ زانایێن گەردوونی سەرەدانا ئێك ژ مەلبەندێن هاڤێتنا مووشەکێن عەسمانی دا ل هندەك دەولەتێن پێشکەفتی، و ئەو مەلبەندێ وی سەرەدان لێ کری د پەیوەندییەکا بەردەوامدا بوون د گەل گەشتیگەلەکا عەسمانی کو بەری دەمەکێ کێم هاڤێت بوو، و کابتنێ ڤێ گەشتییێ پەیوەندی ب مەلبەندێ خۆ کر، و ب ئێك پەیڤ گۆت: ئەم کۆرە بووین و چو نابینین، و ئەڤ گەشتیگەلە ب رۆژ هاڤێت بوو، و پشتی دەمەکێ کێم، کو پشتی گەشتیگەلا وان ژ بەرگێ گازی بۆری، و چۆیە د ناڤ جهەکێ بێ هەوادا، عەسمان ل بەر وان ب ئێك جاری تاری بوو، و ڤی کابتنی کرە هەوار و گۆت ئەم کۆرە بووین و چو نابینین، ئەرێ چاوا ئەڤ چەندە چێ بوو؟

ئەڤا چێ بووی ژ بەر کو تیشکا رۆژێ دەمێ دگەهیتە بەرگێ گازی رۆناهییا وێ دوەرییێت و ژێك بژالە دبیت د ناڤ گەردیلێن هەوای و تۆزێدا، زانایێن فیزیایی دبێژنە ڤێ چەندێ ژێك وەریانا رۆناهییێ. یان بژالەبوونا رۆناهییێ، تیشکا رۆژێ بەرۆڤاژی دبیتە سەر گەردیلێن هەوای، و گەردیلێن تۆزێ، وەلێ دکەت کو ب برسقن، و ئەڤێ ئەم ل عەردی دبێژنێ: جهەك تیشکا رۆژێ یا لێ هەی، و جهەکە رۆناهی یا لێ هەی، و رۆژ لێ نینە، وەکی کەش و هەوایێ مزگەفتێ، ئەوە کو ئەم د ناڤ مزگەفتێدا ئەم ئێك و دوو دبینین، ب تنێ رۆناهی یا هەی، و تیشکا رۆژێ لێ نینە، چونکی رۆناهی لێك دبژیت، دەمێ ئەڤ گەشتیگەلە ژ بەرگێ هەوایێ عەردی بۆری، بژیان و بەلاڤبوونا رۆناهییێ نەما، و عەسمان گەلەك تاری بوو، چو تشت نەددیتن.

ئەگەر بزڤرینە پەرتۆکا خودێ ئەوا بەری چواردە سەدە و نیڤان هاتییە خوارێ، و وەکو یا دیار ل وی دەمی خەلکێ عەردی هەمییێ نەدزانی و نەدشییان بچنە سەر بانێ هەیڤێ، و نەدزانی، ژ بەرگێ گازی ببۆرن، ئەگەر ئەم بزڤرینە پەرتۆکا خودێ (قورئان)ێ دێ بینین د ڤێ ئایەتێدا ئیعجازەکا زانستی یا تێدا، خودێ دبێژیت: ﴿وَلَوْ فَتَحْنَا عَلَيْهِمْ بَابًا مِنَ السَّمَاءِ فَظَلُّوا فِيهِ يَعْرُجُونَ (١٤) لَقَالُوا إِنَّمَا سُكِّرَتْ أَبْصَارُنَا بَلْ نَحْنُ قَوْمٌ مَسْحُورُونَ(١٥)﴾ [الحجر]، ئانکو: ئەگەر مە دەرگەهەك بۆ وان ل عەسمانی ڤەکربایە و تێڕا سەرکەڤتبانە. (دیسا) دا بێژن: چاڤێت مە یێت هاتینە گرێدان و گرتن، بەلکی سێر (سحر) یا ل مە هاتییە کرن، ئەرێ ما ئەڤە بەلگەیەکێ ڤەبڕ نینە کو ئەڤ ئاخفتنە یا ئافرێنەرێ مرۆڤانە؟

ژ تایبەتمەندییێن وەحیا بۆ پێغەمبەری ﷺ هاتی کو یا ژ دەڤ خودێ هاتی ب دیاردەکا بەرچاڤ و گازیکەر کو ئەو ژی ئیعجازە، ئانکو ئەڤ ئاخفتنە (وەحی) مرۆڤ پێ بێ زار و شیان بوو کو بزانیت دەمێ هاتنە خوارا قورئانێ، و نوکە د گەل پێشکەفتنا زانستی، زانستی دەستپێکر لایەنێن کێم ژ ئیعجازا قورئانێ ئاشکرا کرن، ئەڤە گۆتنا خودێ دوپات دکەت: ﴿سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الْآفَاقِ وَفِي أَنْفُسِهِمْ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ الْحَقُّ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ﴾ [فصلت:٥٣].

و ئەڤ پیتا (س) د گۆتنا خودێدا (سَنُرِيهِمْ) بۆ داهاتییە، هەتا بۆ کەسێن هەڤدژ و ئینکارکەر و گۆمانکاران دیار دبیت کو ئەڤە راستە، و ئەڤە ئاخفتنا خودێیە، د ژیانێدا پێدڤییە چو تشت سەری ل تێگەهشتنا مە نەستینن وەکی تێگەهشتنا مە بۆ رێبازا خودایێ مە، وەکی تێگەهشتنا پەرتۆکا خودێ، و دویراتییێن وی، و سەلماندییێن وی، و حەلال و حەرامێن وی، و سۆز و ژڤاندانا وی، و نیشانێن وی یێن گەردوونی و چێکری، چونکی رێکا بەختەوەری و راستە رێیا مەیە.

# هێزا راکێشانێ د گەردوونیدا

وەکو دهێتە زانین کو ڤی گەردوونی چو دویماهی بۆ نینە، و هەر دەمێ زانست مەجەرەکا گەلەك دویر ئاشکرا دکەت، دوجارکی یان دەهان جار ژ هزار ملیۆن سالێن رۆناهییێ یا ژ مە دویرە، و د گەل هندێ یاسایەك حوکمی لێ دکەت کو ئەو ژی: یاسایا راکێشانێیە، و هەر تەنەکێ (كتلة) د ڤی گەردوونیدا تەنەکی دی رادکێشیت ل دویڤ قەبارێ خۆ، و ل دویڤ دویراتییا د ناڤبەرا واندا هەی، ئەگەر ئەڤ یاسایە ب تنێ یا زال با ل سەر، پێدڤی بوو هەمی گەردوون پێکڤە د ئێك تەندا کۆم ببا، ئەو چییە د ناڤبەرا پێکڤە کۆمبوون و ژێك بژیانێ د گەردوونیدا د گوهۆریت؟

بەرسڤ: ئەو ژی ئایەتەکە د پەرتۆکا خودێدا: (وَالسَّمَاءِ ذَاتِ الرَّجْعِ).

هەر تشتێ ل عەسمانی دزڤریت، و د رێرەوەکێ گرتیدا دزڤریت، دزڤریت و ڤەدگەریتەڤە، و ئەڤ بزاڤا زڤرینێ یا بەردەوام هێزەکا دی ژ زڤراندنا وان چێ دبیت، کو دبێژنێ: هەڤسەنگییا لڤینێ، و ئەڤە ژ نیشانێن بەلگەیە ل سەر مەزناهییا وی.

خودێ دبێژیت: (اللَّهُ الَّذِي رَفَعَ السَّمَاوَاتِ بِغَيْرِ عَمَدٍ تَرَوْنَهَا) [الرعد:٢]، ئانکو: ئەو خودایێ عەسمان وەکی هوین دبینن بێ ستوین بلندکرین.

ستوین یێن هەین، بەلێ هوین ڤان ستوینان نابینن .. بِغَيْرِ عَمَدٍ تَرَوْنَهَا).

هندەك زانا دبێژن: ئەڤە ئاماژێ ب هێزا راکێشانێ ددەت ئەوا د ناڤبەرا مەجەرە و هەسار و تەناندا هەی.

**خودایێ مەزن ئاماژە ب هێزا راکێشانا عەردی یا کری دبێژیت: (أَمَّنْ جَعَلَ الْأَرْضَ قَرَارًا) [النمل: ٦١]، ئانکو: ئەرێ ئەوێت هەوە بۆ خودێ کرینە هەڤپشك چێترن، یان ژی ئەوێ عەرد بۆ هەوە ل سەر ئاوایێ هێکێ راستکری و بۆ ژینێ خۆشکری. و کێ ئەڤ تشتێن ل سەر عەردی خۆجه کرینە و پێڤە بهێنە راکێشان؟ کێش و هەوا و دەریا و هەر تشتەکێ ل سەر عەردی یێ خۆ جهە ب هێزا راکێشانێ، و ئەگەر مرۆڤ ل عەسمانان بفریت دێ گەهیتە وێ خالا راکێشان لێ نە، و کێش (گرانی) ژی نامینیت، (أَمَّنْ جَعَلَ الْأَرْضَ قَرَارًا).**

**ئایەتەکا دی ئاماژێ ب ڤێ راکێشانێ ددەت، خودێ دبێژیت: (وَإِذَا الْأَرْضُ مُدَّتْ (٣) وَأَلْقَتْ مَا فِيهَا وَتَخَلَّتْ(٤)) [الانشقاق]، ئانکو: دەمێ عەرد راست دبیت، و چو کەند و کۆر و چیا تێدا نەمینن. و ناڤ زکێ خۆ ژ مرییێت تێدا و هەر تشتەکێ دی، سەر عەرد کر و چو د ناڤ خۆدا نەهێلا، ئەگەر هێزا راکێشانێ د عەردیدا نەما، دێ عەرد ئەوێن د ناڤ خۆدا هاڤێت و دێ ژێ ڤالا بیت، و دێ هەر تشتەك بۆ خۆ چیت، و دێ ژێ دەرکەڤن و دێ چنە د بۆشاییا عەسمانیدا و نازڤرنەڤە. ئایەتەکا دی یا هەی کو کورتییا ڤێ هزرێیە، خودێ دبێژیت: (إِنَّ اللَّهَ يُمْسِكُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ أَنْ تَزُولَا) [فاطر: ٤١]، ئانکو: ب راستی خودێیە عەرد و عەسمانان رادگریت کو نەکەڤن.**

**و نەمانا رۆژێ د نیڤا عەسمانیدا ئەو ژ رێ دەرکەڤتنە، و مادەم خودایێ پر زانا و شارەزایە دبێژیت: (وَالسَّمَاءِ ذَاتِ الرَّجْعِ) [الطارق: ١١]، ڤێجا هەر هەسارەکا د گەردوونیدا ل دۆر هەسارەکا دی دزڤریت، و رێرەوەکێ بازنەیی یان وەکی هێکێ یێ هەی، و دزڤریتە جهێ چۆنا خۆ، ئەڤ کارە یێ کێیە کو ئەڤ هەسارە ل سەر ڤێ رێرەوێ ب شێوەکێ هویربین بزڤریت؟ ئەگەر عەرد ژ رێرەوێ خۆ دەرکەڤیت دێ ب هەسارەکا دیڤە هێتە راکێشان ئانکو دێ پێڤە نویسیت، و دێ عەرد ب دویماهی هێت، کییە لڤین و زڤرینا ڤان هەساران وەلێ دکەت کو ل سەر هێلەکا چۆنێ یا دورست و تمام بچن؟ وەکی**

چاوا شەمەندەفرەك ژ هێلا خۆ دەركەڤیت دێ كەڤیت، و داكو شەمەندەفر ل سەر هێلا خۆ بمینیت، و ترومبێل ل سەر رێكا خۆ بمینیت، و عەرد بمینیتە د رێرەوێ خۆدا ل دۆر رۆژێ، ئەڤە ژ دانانا خودایێ سەردەست و پر زانایە، خودایێ مە دبێژیت: (إِنَّ اللَّهَ يُمْسِكُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ أَنْ تَزُولَا)، ئانكو: ژ رێرەوێ خۆ دەركەڤیت، و كلكدارا هالی ل سالا ١٩١٠ز سەرەدانا عەردی كر، و بۆ جارا دویێ ل سالا ١٩٨٦ز، ئەڤ كلكدارە بەری هزار هزار سالان رێرەوەكێ هەی ژێ نادەركەڤیت، و دەمەكێ هەی بەروڤاژی ناكەت، كی دهێلیتە د ڤی رێرەویدا، و د ڤێ لەزاتییا هویرببیندا؟ ئەڤ كلكدارە، و كلكدارێن دی، و عەرد، و كۆمەلا رۆژێ .. (وَالشَّمْسُ تَجْرِي لِمُسْتَقَرٍّ لَهَا) [یس:٣٨]، ئانكو: رۆژ ژی بەر ب بنەجهییا خۆڤە دچیت (ئەوا خودێ بۆ دانایی و ژێ دەرناكەڤیت).

هەمی تشتێن د ناڤ گەردوونیدا د رێرەوێن خۆدا دچن و چو جاران ژێ نادەركەڤن ب شیانێن خودێ، خودێ ب تنێ ئافرێنەرێ گەردوونییە: (إِنَّ اللَّهَ يُمْسِكُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ أَنْ تَزُولَا وَلَئِنْ زَالَتَا إِنْ أَمْسَكَهُمَا مِنْ أَحَدٍ مِنْ بَعْدِهِ إِنَّهُ كَانَ حَلِيمًا غَفُورًا (٤١)) [فاطر]، ئانكو: ب راستی خودێیە عەرد و عەسمانان رادگریت كو نەكەڤن، و ئەگەر بكەڤن ژی كەس نینە ژ بلی وی وان (هەردووكان) رابگریت، ب راستی خودێ یێ بێنفرەهە لەزێ ل جزاكرنێ ناكەت و یێ گونەهـ ژێبەرە.

ئەرێ هەمی هێزا عەردی دێ شێت عەردی زڤرینیت ئەگەر ژ رێرەوێ خۆ دەركەفت، یان دێ شێن ئەگەر چاڤێ رۆژێ ژ رێرەوێ خۆ دەركەفت بزڤرینن؟

# دویرگەها پێشکەفتی (المرصد العملاق)، و دویرترین مەجەرە ژ مە

ئێك ژ ئێزگەهێن جیهانی (رادیۆ) دەنگ و باسەك ڤەگوهاست ئەو ژی: ((گەشتیگەلا عەسمانی هنارت کو دویرگەهەکا پێشکەفتی تێدا بوو، تیرا چاڤکێ وێ هەشت متر بوو، هاتبوو هنارتن بەری چوار سالان، ب لەزاتییا چل هزار میلان د دەمژمێرەکێدا، و چوار سال ب سەر هنارتنا وێ بۆرین، ژ پێخەمەت ئاشکەراکرنا ڤەشارتی و نهێنییێن گەردوونی، بەلکی نێزیك ببیت ژ هەسارا موشتەری، و بەری دوو رۆژان وێنەکێ مەجەرەکا نوی هنارت کو ژ نوی هاتبوو ئاشکەراکرن)).

دویرترین مەجەرە هاتییە ئاشکراکرن دویراتییا وێ بۆ مە بیست و چوار هزار ملیۆن سالێن رۆناهییێنە، و یا هاتییە زانین نێزیکترین ستێرا هەل بۆ مە چوار سالێن رۆناهییێ یا ژ مە دویرە، و دێ ڤێ چەندێ کەینە نموونە ئەگەر تە بڤێت بزانی مەرەم ب چوار سالێن رۆناهییێ چییە؟ ئەگەر مە بڤێت ئەم بگەهینە ڤێ ستێرێ ب گەشتیگەلەکا عەردی، دێ پێدڤی نێزیکی پێنج ملیۆن سالان بین.

دویراتییا ستێرا جەمسەری چوار هزار سالن، و مەجەرا (المرأة المسلسلة [ئەندرۆمیدا]) دو ملیۆن سالێن رۆناهییێ یا ژ مە دویرە، و نویترین مەجەرە هاتییە ئاشکەراکرن بیست ملیۆن سالێن رۆناهییێ یا ژ مە دویرە.

ئەو دەنگ باسێ ئێك ژ ئێزگەهێن جیهانی یێن دەنگ و باسان بەلاڤکری ژ وێ گەشتیگەلا عەسمانی ئەوا بەری چوار سالان ب لەزاتییا چل هزار میلان د دەمژمێرەکێدا چۆیە عەسمانی، کو دهاتە هزرکرن یا ل نێزیکی هەسارا موشتەری،

بەری چەند رۆژان وێنەکێ مەجەرەکێ هنارت کو دویراتییا وێ ژ مە ـ و هویربینییێ د ڤێ ژمارێدا بکەن ـ سەدان بلیۆن سالێن رۆناهییێنە، و بلیۆن هزار ملیۆنە، و ئەڤ مەجەرە بەری ڤان سالان ل ڤی جهی بوو، پاشی چۆ جهەکێ دی؛ چونکی لەزاتییا وێ پتر بوو ژ دو سەد و چل هزار کیلۆمەتران د چرکەکێدا، و نوکە ل کیڤەیە؟..

نوکە هزرێ د گۆتنا خودێدا بکەن: (فَلَا أُقْسِمُ بِمَوَاقِعِ النُّجُومِ (٧٥) وَإِنَّهُ لَقَسَمٌ لَوْ تَعْلَمُونَ عَظِيمٌ (٧٦)) [الواقعة]، ئانکو: ڤێجا ئەز ب جهێ ستێران سویند دخۆم. و ب راستی ئەڤە سویندەکا مەزنە، ئەگەر هوین بزانن.

ئەڤ خودایێ مەزن یێ کو ئەڤ گەردوونێ مەزن ئافراندی ئەرێ سەرپێچی ل فەرمانا وی دهێتە کرن؟ ئەرێ مرۆڤ فەرمان و تشتێن وی نەهیا مە ژێ کری بهێلیت؟ و سۆز و ژڤاندانا وی پاشگوه باڤێت، و داخواز و هیڤییان ژ بلی وی بکەت، و ژ بلی وی بترسیت، و هەول ددەت بۆ رازیکرنا ژ بلی وی: (فَلَا أُقْسِمُ بِمَوَاقِعِ النُّجُومِ (٧٥) وَإِنَّهُ لَقَسَمٌ لَوْ تَعْلَمُونَ عَظِيمٌ (٧٦)).

# مەجەرە و ستێر و لەزاتێیا وان

گەلەك جاران مە گوه ل پەیڤا مەجەرە دبیت و دخوینین، بەلێ ئەو راستیێن نوکە هاتینە ئاشکراکرن، کو ژ بەر مەزناهیا وان ناهێتە باوەرکرن.

مەجەرە گزیرتێن مەزنێن گەردوونینە، و یەکێن سەرەکی یێن گەردوونی پێك دئینن، مەجەرە تۆزا گەردوونی، و سەدیم، و ستێر، و هەسارە، و نەیزەك، و شوهوب، و کلکدار، و بوارێن موگناتیسی یێن کارەبێ یێن دژوارن، ئەڤە هەمی یێن د ئێك مەجەرەدا هەین، و تشتێ سەیر، مەزنترین دویرگەهـ ل سەر عەردی، هزار ملیۆن مەجەرە یێن دیارکرین، بەلێ ب تنێ ئەم سێ ژ وان ب چاڤ دبینین، و دەمێ بەرێ خۆ ددەینە عەسمانی مەجەرا رێکا کادزان (درب التبانة) و ماجەلانا بچویك و ماجەلانا مەزن ئەم دبینین، بەلێ دویرگەهێن مەزن و پێشکەفتی پتر ژ هزار ملیۆن مەجەرە دیارکرینە، بەلێ تەخمینێن زانایان دیار دکەن کو ل عەسمانی ملیۆن ملیۆن مەجەرە یێن هەین، و د هەر مەجەرەکێدا ب ژمارەکا ناڤنجی، پتر ژ سێ سەد هزار ملیۆن ستێران یێن تێدا هەین، ژ بەر ڤێ چەندێ خودێ دبێژیت: (فَلَا أُقْسِمُ بِمَوَاقِعِ النُّجُومِ (٧٥) وَإِنَّهُ لَقَسَمٌ لَوْ تَعْلَمُونَ عَظِيمٌ (٧٦)).

ل سەر ڤێ چەندێ مەجەرا رێکا کادزان (درب التبانة) دێ وەرگرین کو مەجەرا مەیە، و ئەم پشکەکا بچویکین ژ وێ، درێژاهیا وێ پترە ژ سەد و پێنجی هزار سالێن رۆناهییێ، و هەیڤ ب تنێ چرکەکا رۆناهییێ ژ مە دویرە، و رۆژ هەشت خۆلەکان یا ژ مە دویرە، و کۆمەلا رۆژێ ژ لایەکی وێ بۆ لایێ دی پتر نینە ژ سێزدە دەمژمێرێن رۆناهییێ، و

سەبارەت درێژاهییا مەجەرا مە، سەد و پێنجی هزار سالێن رۆناهییێنە، و وێنێ وێ وەکی تەشییێیە.

و تشتێ سەیر و نوی ئەوە ئەڤ مەجەرە هەمی ل دۆر خالەکێ دزڤرن ل عەسمانێ دەرڤەدا، و ب لەزاتییەکا مرۆڤ باوەر نەکەت ل دۆر ڤێ خالێ دزڤرن، و رۆناهی د هەر چرکەکێدا سێ سەد هزار کیلۆمتران دبریت، ئەڤ مەجەرە ب لەزاتییێن د ناڤبەرا هەڤدە و هەژدە جارکی ژ لەزاتییا رۆناهییێ دچن.

کۆمەلا رۆژێ بۆ نموونە ل دۆر خالەکێ د مەجەرا مەدا دزڤریت، و زڤرینا وێ ل دۆر ڤێ خالێ دو سەد و پێنجی ملیۆن سالان ڤەدکێشیت، و لەزاتییا وێ پتر ژ هەڤدە جارکی ژ لەزاتییا رۆناهییێ.

ژمارە و لەزاتی و دویراتییێن گەردوونی، تشتەکە عەقلێ مە نەشێت هزرێ تێدا بکەت.

عەرد ب لەزاتییا هزار و شەش سەد کیلۆمتران د دەمژمێرەکێدا ل دۆر خۆ دزڤریت، و عەرد ب لەزاتییا سیه کیلۆمتران د چرکەکێدا ل دۆر رۆژێ دزڤریت، و رۆژ ژی ب لەزاتییا دو سەد کیلۆمتران د چرکەکێدا دچیت، و مەجەرە ب لەزاتییا دو سەد و چل هزار کیلۆمتران د چرکەکێدا، ئانکو نێزیکی لەزاتییا رۆناهییێ، و د گەل هندێ رۆژ پێدڤی ب دو سەد و پێنجی ملیۆن سالایە کو ل دۆر خالەکێ د مەجەرێدا بزڤریت هەتا بگەهیتە جهێ خۆ یێ دەستپێکێ، خودێ دبێژیت: (أَفَلَا يَنْظُرُونَ إِلَى الْإِبِلِ كَيْفَ خُلِقَتْ (١٧) وَإِلَى السَّمَاءِ كَيْفَ رُفِعَتْ (١٨) وَإِلَى الْجِبَالِ كَيْفَ نُصِبَتْ (١٩) وَإِلَى الْأَرْضِ كَيْفَ سُطِحَتْ (٢٠)) [الغاشية]، ئانکو: [١٧] ما نارێننە حێشترێ، کا چاوا هاتییە چێکرن؟!. [١٨] و ما نارێننە ئەسمانی، کا چاوا بێ ستوین هاتییە بلندکرن؟!. [١٩] و ما نارێننە چیایان، کا چاوا د ئەردیدا هاتینە چکلاندن؟!. [٢٠] و ما نارێننە ئەردی، کا چاوا هاتییە ڕاستکرن؟!.

بەری دەمەکی پەڤینەك د ناڤەندا مەجەرەکێدا چێبوو، و ڤێ ژمارەك یا هەی (M28)، گورپیا وێ سەدان ملیۆن کیلۆمتران چۆ، و هێزەکا پویچکەر (تدمیریة) ژ ڤێ پەڤینێ دەرکەڤت هەمبەری دو هزار بلیۆن بلیۆن بومبێن هایدرۆجینی بوو، و ئەڤە دیاردەکە ژ دیاردێن نافێ خودێ (القوي) ئانکو خودان هێز، د گەل هندێ کو ئێك ژ ڤان بومبان بەسی هندێیە کو مەزنترین باژێر ل سەر عەردی پویچ کەت، و دێ یا چاوا بیت ئەگەر ئەڤ پەڤینە یەکسانی دو هزار بلیۆن بلیۆن بومبێن هایدرۆجینی بیت؟!.

خودێ دبێژیت: ﴿إِنَّمَا يَخْشَى اللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ الْعُلَمَاءُ﴾ [فاطر:٢٨]، ئانکو: ب راستی ژ بەندەیێت وی بەس زانا ب دورستی ژ خودێ دترسن.

چەند زانینا تە ل سەر گەردوونی بەرفرەه دبیت ترسا تە زێدە دبیت، ئەم یێ ل سەر عەردی کو هەسارەکا بچویك بچویکە، و عەرد ل دۆر رۆژێ دزڤریت، و رۆژ ل دۆر ستێرەکا د مەجەرێدا دزڤریت، و مەجەرە ل دۆر خالەکا ل عەسمانی دزڤریت، و هەمی دزڤرن، خودێ دبێژیت: ﴿وَالسَّمَاءِ ذَاتِ الرَّجْعِ﴾ [الطارق:١١]، ئانکو هەر جورمەکێ ل عەسمانی د خۆلەکەکا نیمچە هێلکەیی (إهليلجي)[1] دا دزڤریت و دزڤریتەڤە بۆ جهێ چۆنا خۆ یا دەستپێکێ.

هزرێ د ئافراندنا عەرد و عەسمانانیدا بکەن، خودێ دبێژیت: ﴿الَّذِينَ يَذْكُرُونَ اللَّهَ قِيَامًا وَقُعُودًا وَعَلَى جُنُوبِهِمْ وَيَتَفَكَّرُونَ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَذَا بَاطِلًا سُبْحَانَكَ فَقِنَا عَذَابَ النَّارِ (١٩١)﴾ [آل عمران]، ئانکو: (کەسێت ژیر و ئاقلدار) ئەوێت راوەستیایی (ل سەر پێیان) و روینشتی و ل سەر تەنشتێ (کێلەکێ) درێژکری، خودێ دئینە بیرا خۆ و زکرێ خودێ دکەن و هزرا خۆ د چێکرنا عەرد و عەسمانانیدا دکەن، (و دبێژن: خودێوۆ (ئەڤ جیهانە) تە ژ قەستا چێ نەکرییە. پاکی (ژ هەمی کێماسییان) هەر بۆ تەیە، (و ئەم تە ژ کێماسییان و تە ژ چێکرنا ژ قەستا و پویچ پاقژ دکەین). ئێدی تو مە ژ ئاگرێ دۆژەهێ بپارێزە.

---

١- ئەڤ شێوە یێ ژ نافێ دارەکێ هاتی کو ل هندەك وەلاتێن رۆژهەلاتا دویر شین دبیت، بەرهەمێ وێ وەکی شێوێ دندکا کاژێیە. وەرگێر.

# جهێن ستێران

خودێ دبێژیت: ﴿فَلَا أُقْسِمُ بِمَوَاقِعِ النُّجُومِ (٧٥) وَإِنَّهُ لَقَسَمٌ لَوْ تَعْلَمُونَ عَظِيمٌ (٧٦)﴾ [الواقعة]، و پسیار ئەوە : جهێن ستێران چییە؟ ڤان جهان سێ رامان ژێ دەردکەڤن:

رامانا ئێکێ، دویراتی یێن د ناڤبەرا ستێراندا هەین مەحالە عەقل هزرێ بۆ بکەت، هندەك ژ ڤان و د ناڤبەرا عەردی و هندەك مەجەراندا بۆ نموونە بیست هزار ملیۆن سالێن رۆناهیێنە، و ئەگەر مە زانی کو رۆناهی د هەر چرکەکێدا سێ سەد هزار کیلۆمتران دچیت، و دێ د خۆلەکەکێدا چەند چیت؟ ئەڤ ژمارا مەزن سێ سەد هزار دێ لێکدانی شێست بیت، و دێ د دەمژمێرەکێدا چەند چیت؟ و د رۆژەکێدا چەندن؟ و د هەیڤێدا دێ چەند چیت؟ و د سالێدا چەند؟

﴿فَلَا أُقْسِمُ بِمَوَاقِعِ النُّجُومِ (٧٥) وَإِنَّهُ لَقَسَمٌ لَوْ تَعْلَمُونَ عَظِيمٌ (٧٦)﴾، د ناڤبەرا عەردی و هەیڤێ چرکە و نیڤێن رۆناهیێنە، ئانکو سێ سەد و شێست هزار کیلۆمترن، و د ناڤبەرا عەردی و رۆژێدا هەشت خۆلەکن، ئانکو سەد و پێنجی و شەش کیلۆمترن، و درێژاهیا کۆمەلا رۆژێ سێزدە دەمژمێرن، و درێژاهیا مەجەرا رێکا کادزان سەد و پێنجی هزار سالێن رۆناهیێنە، ﴿فَلَا أُقْسِمُ بِمَوَاقِعِ النُّجُومِ (٧٥) وَإِنَّهُ لَقَسَمٌ لَوْ تَعْلَمُونَ عَظِيمٌ (٧٦)﴾، ئەڤە رامانا ئێکێ.

رامانا دووێ: ئەوە کو ڤان ستێران نە ب تنێ جهەکێ هەی، بەلکو چەند جهەکێن هەین، ل ڤێرە: ئەڤ ستێرە ب لڤینن، و هەمی تشت د رێرەوەکێ تایبەتێ خۆدا دچیت، خودێ دبێژیت: ﴿وَكُلٌّ فِي فَلَكٍ يَسْبَحُونَ﴾ [يس: ٤٠]، ئانکو: هەر ئێك د چەرخا خۆدا دزڤریت.

پەیڤا (مَوَاقِعِ) د ڤێ ئایەتێدا نهێنییا ئیعجازا وێیە، و جهی مەرەم پێ ئەوە کو خودانێ جهی یێ تێدا هەی، و خودایێ مەزن سویند ب دویراتیییێن د ناڤبەرا ستێراندا نەخوارییە، بەلکی سویند یا ب وان دویراتیییێن د ناڤ جهێن ستێراندا خواری، ئەڤ چەندە ژ بەر کو ستێر ب لڤینن، و نە د خۆجهن، و ئەگەر زانایەکێ گەردوونی ڤێ ئایەتێ بخوینیت دێ خۆ چەمینیت و سوجدێ بۆ خودێ بەت، و خودێ دبێژیت: (وَإِنَّهُ لَقَسَمٌ لَوْ تَعْلَمُونَ عَظِيمٌ).

عەرد د سێ سەد و شێست و پێنج رۆژاندا ل دۆر رۆژێ دزڤریت، و ستێرەکا دی د کۆمەلا رۆژێدا دو یان سێ سالان ل دۆر رۆژێ دزڤریت، و هندەك کێمتر ژ سالەکێ، هەر ستێرەکێ جهێ خۆ یێ تایبەت یێ هەی، رێرەوەکێ درێژ یان کورت یێ هەی، و شێوێ رێرەوێ وێ یێ بازنەییە یان شێوێ نیمچە هێلکەیی (إهليليجي)، (فَلَا أُقْسِمُ بِمَوَاقِعِ النُّجُومِ) و هەر ستێرەکێ جهەکێ هەی د هەر چرکەکێدا، و هویربینترین دەمژمێرێن جیهانێ ل دویڤ دەمێ هندەك ستێران دەمێ وان چێ دکەن، چێکەرێن ڤان دەمژمێران چێدبیت د سالێدا چرکەکێ گیرۆ ببیت یان پاش بکەڤیت، ژ بەر کو چۆنا ستێرێ نە پاش دکەڤیت و نە پێش ژ ژڤانێ خۆ یێ هویربین، ئەڤان جهان سیستەمەکێ حێبەتی یێ هەی، ژ بەر کو د هەر چرکەکێدا ستێرێ جهەکێ هەی، هەتا کو کلکدارا هالی رێرەوێ خۆ د حەفتێ و شەش سالاندا بری، و مرۆڤان دیت ل سالا (١٩١٠ز)، و جارەکا دی ل سالا (١٩٨٦ز)، و هاتبوو دیتن دو هزار سالان بەری زایینێ، نە پێش دچۆ و نە گیرۆ دبوو، و ل دویراتییا سێ ملیۆن کیلۆمتران بوو ژ عەردی، ئەڤەیە رامانا دویێ بۆ جهێن ستێران.

رامانا سێیێ، د ناڤبەرا ستێراندا هێزا راکێشانێ یا هەی، یا مەزنتر یا بچویکتر رادکێشیت، ئەگەر جهێن ستێران هاتنە گوهۆرین دێ هەڤسەنگییا گەردوونی تێك چیت، و دێ هندەك ستێر ب هندەکا کەڤن، و دێ گەردوون بیتە ئێك تەن (کتلة)، و

جهێن وان دورستکرینه ب چاڤدێرییەکا هەرە باش، داکو زڤرین و خۆجهییا وان یا دورست بیت.

رامانا ئێکێ دویراتییێن بەرفرەهە، و رامانا دووێ لڤین، کو ستێر دهێتە ڤەگوهاستن ژ جهەکی بۆ جهەکێ دی، و رامانا سێیێ ڤەبارێن هندەکان د بچویکن و هندەک د مەزنن، و هندەک د نێزیکن و هندەک د دویرن، ئەڤ ستێرە یێن هاتینە دانان ئەوێن ڤەبارە و دویراتییێن وان د جودا د هندەک جهێن هویربیندا، چونکی ئەگەر هاتبانە راکێشان دا تشتەکێ نەچاڤەرێکری روی دەت د ڤی سیستەمێ چێکری کو ئەم ب چاڤێن خۆ دبینین.

خودێ دبێژیت: (إِنَّ اللَّهَ يُمْسِكُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ أَنْ تَزُولَا) [فاطر:٤١]، رامانا (أَنْ تَزُولَا) چیە؟ نە پویچبوونە، بەلکو مەبەست پێ ئەوە ژ رێرەوێ خۆ دەرکەڤیت، ئەگەر عەرد نێزیکی چاڤێ رۆژێ بوو، دێ لەزاتییا عەردی زێدەبیت، دا کو بۆ لایێ چاڤێ رۆژێ نەهێتە راکێشان، ئەڤ لەزاتییا زێدە دێ هێزەکا دی دەتێ کو بەرامبەر هێزا راکێشانێ بیت و دێ مینیت د جهێ خۆدا، (فَلَا أُقْسِمُ بِمَوَاقِعِ النُّجُومِ (٧٥) وَإِنَّهُ لَقَسَمٌ لَوْ تَعْلَمُونَ عَظِيمٌ (٧٦))، هزرا خۆ ب هویری د ڤێ ئایەتێدا بکەن، و ڤەکۆلینێ ل سەر بکەن، دا خودێ بنیاسن، و خودێ دبێژیت: (وَفِي الْأَرْضِ آيَاتٌ لِلْمُوقِنِينَ) [الذاريات:٢٠]، ئانکو: د عەردیدا نیشان و بەلگە گەلەکن بۆ وان ئەوێت هەڤییێ پەسەند دکەن و پشتەڤانییا وێ دکەن، (قُلِ انْظُرُوا مَاذَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَا تُغْنِي الْآيَاتُ وَالنُّذُرُ عَنْ قَوْمٍ لَا يُؤْمِنُونَ) [یونس:١٠١]، ئانکو: بێژە: (گەلی گاوران) کا بەرێ خۆ بدەنە عەرد و عەسمانان کا چ تێدایە؟ بەلێ نیشان و ئایەت و ترساندن دێ چ گەهیننە وان ئەوێت باوەرییێ نەئینن.

د عەرد و عەسماناندا نیشانێن هەین ب دویماهی ناهێن، و ل چو سنووران نا راوەستن، و د عەرد و عەسماناندا بەلگە یێن هەین نە ب تنێ جهێ باوەرییێنە، بەلکو د ڤەبرینە، و بەلگەیا ڤەبر رەوانترە ژ بەلگەیێ باوەرپێهاتی.

## هژمارێن ستێران ل عەسمانان

زانایێن گەردوونناسی د بەرێدا هژمارا ستێران ب هزارەهان ددانان، و پشتی دەمەکی ب ملیۆنان ددانان، و بەری چەند سالان ب ملیاران تەخمین دکرن، و ل دویڤ تەخمینێن زانایان مەجەرا رێکا کادزا کو مەجەرا مەیە - و ڤەبارێ وێ یێ ناڤنجییە، سیه ملیۆن ستێر یێن تێدا، و کۆمەلا رۆژێ ئێکە ژ ستێرێن وێ، و د مەجەرەکا دیدا زانا گەهشتنە ژمارەکا ئاشۆپی بۆ هژمارتنا ستێرێن ڤێ مەجەرێ کو ملیۆن ملیۆن ستێر یێن تێدا، و ل دویڤ تەخمینێن نوی یێن زانایان ملیۆن ملیۆن مەجەرە یێن هاتینە ئاشکراکرن، و د هەر مەجەرەکێدا هژمارەکا تەخمینکری یا هەی چێدبیت بگەهنە ملیۆن ملیۆن ستێران، (وَالسَّمَاءَ بَنَيْنَاهَا بِأَيْدٍ وَإِنَّا لَمُوسِعُونَ) [الذاريات:٤٧]، ئانکو: مە عەسمان ب هێز یێ چێ کری، و ئەم خودان شیانین، و ژمارا دویماهیێ بوو ملیۆن ملیۆن، ئەوا ل عەسمانا هەی چەند تشتەکێ مەزنە، خودێ دبێژیت: (قُلِ انْظُرُوا مَاذَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ) [یونس:١٠١]، ئانکو: بێژە: [گەلی گاوران] کا بەرێ خۆ بدەنە ئەرد و ئەسمانان کا چ تێدا هەیە؟

هەتا دەمەکێ نێزیك ژی وەسا هزر دکر ل عەسمانی ستێرێن ب لڤین و نەلڤ یێن هەین، و رامانا نەلڤییێ ئەو بوو جهێن وان د نەلڤن و ناهێنە گوهۆرین د گەل چۆنا دەم و چاخان، و چاڤێ رۆژێ ژ ڤان ستێرێن نەلڤ دهژمارت، بەلێ د گەل هندێ خودایێ

مەزن دبێژیت: (وَالشَّمْسُ تَجْرِي لِمُسْتَقَرٍّ لَهَا ذَٰلِكَ تَقْدِيرُ الْعَزِيزِ الْعَلِيمِ) [يس:٣٨]، ئانكو: رۆژ ژی بەر ب بنەجهیيا خۆڤە دچیت (ئەوا خودێ بۆ دانایی و ژێ دەرناکەڤیت)، ئەڤە ژ دانانا خودایێ سەردەست و زانایە. پاشی ل دویماهییێ ئاشکرا کر چاڤێ رۆژێ و کۆمەلا وێ ل دۆر هەسارەکی دزڤرن ل عەسمانی ب لەزاتییا پتر ژ دو سەد کیلۆمتران د چرکەکێدا، و چاڤێ رۆژێ دو سەد کیلۆمتران دبریت د چرکەکێدا، و رۆژ د رێرەوێ زڤرینا خۆدا ملیۆنەهان سالان ڤەدکێشیت، و لەزاتییا زڤرینا عەردی ل دۆر رۆژێ سیه کیلۆمترن د چرکەکێدا.

زانا گەهشتنە هندەك ژمارێن ئاشۆپی د لەزاتییا چۆنا هندەك مەجەراندا، و هندەك مەجەرە د هەر چرکەکێدا دو سەد و چل هزار کیلۆمتران دبرن، ئانکو ب لەزاتییەکا نێزیکی لەزاتییا رۆناهییێ، ئەڤە چ گەردوونە هندە یێ بەرفرەهە؟ خودێ ئافرێنەرێ هەمی تشتایە، و ئەوە چاڤدێر ل سەر هەمی تشتان.

خودێ دبێژیت: (وَهُوَ الَّذِي خَلَقَ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ وَالشَّمْسَ وَالْقَمَرَ كُلٌّ فِي فَلَكٍ يَسْبَحُونَ (٣٣)) [الأنبياء]، ئانکو: خودێ ئەوە یێ شەڤ و رۆژ، و رۆژ و هەیڤ دایین، و هەر ئێك د چەرخا خۆدا دچیت و دگەریت. هەر ستێرەکا قەبارێ وێ چەندێ مەزن بیت یان چەندێ بچویك بیت، رێرەوەك یێ هەی تێدا دزڤریت، خودێ دبێژیت: (لَا الشَّمْسُ يَنْبَغِي لَهَا أَنْ تُدْرِكَ الْقَمَرَ وَلَا اللَّيْلُ سَابِقُ النَّهَارِ وَكُلٌّ فِي فَلَكٍ يَسْبَحُونَ) [يس:٤٠]، ئانکو: نە بۆ رۆژێ دبیت، بگەهیتە هەیڤێ، و نە بۆ شەڤێ ژی دبیت، بەری رۆژێ بێت، و هەر ئێك د چەرخا خۆدا دزڤریت.

قورئانا پیرۆز ئاخفتنا خودایێ گشت جیهانانە، و ئەڤ گەردوونە ئافراندییێ وییە، و دڤێت گونجاندنەکا تمام و بێی کێماسی هەبیت د ناڤبەرا ئافراندییێن وی و قورئانا پیرۆزدا، خودایێ مەزن دبێژیت: (الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ) [الأنعام:١]، ئانکو: پەسن و سوپاسی بۆ وی خودایی ئەوێ عەرد و عەسمان دایین). و د ئایەتەکا

**دیدا: ﴿الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي أَنْزَلَ عَلَى عَبْدِهِ الْكِتَابَ﴾ [الكهف:١]، ئانكو: سوپاسی و پەسن هەمی بۆ وی خودایی، ئەوێ قورئان بۆ بەندەیێ خۆ ئینایيە خوارێ.**

**ئەڤ رۆژا ئەم دنیاسین، گەرماتییا بانێ رۆژێ شەش هزار پلەیە، و د ناڤەندا وێدا بیست ملیۆن پلەیە، و رۆژێ هێزەکا رۆناهییێ یا هەی ب یەکێن رۆناهییێ دپیڤن، بەلێ تشتێ عەقلان حێبەتی دکەت، ئەوە هندەك رۆژ یێن هەین رۆناهییا وان بیست و شەش جاران پترە ژ رۆناهییا رۆژا مە، و هندەك ستێر یێن هەین رۆناهییا وان سەد جاران پترە ژ یا رۆژێ، و هندەك ستێرێن دی یێن هەین رۆناهییا وان پێنج سەد هزار جاران پترە ژ رۆناهییا رۆژێ، و چاڤێ رۆژا مە ب تنێ ئێکە ژ وان رۆژێن ناڤنجی د ناڤ گەلەك رۆژاندا. ئەڤە هەمی راستگۆییە بۆ گۆتنا خودێ: ﴿سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الْآفَاقِ وَفِي أَنْفُسِهِمْ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ الْحَقُّ﴾ [فصلت:٥٣].**

## فَإِذَا انْشَقَّتِ السَّمَاءُ فَكَانَتْ وَرْدَةً كَالدِّهَانِ

دەمێ ڤەکۆلەر و هزرڤان وان ئایەتێن قورئانێ دخوینن ئەوێن گرێدایی ب ئافراندنا گەردوونی و مرۆڤیڤە، ب باوەری و هەر خانەکا د لەشێ ویدا هەست ب ڤێ راستییێ دکەت، و ب هەر چپکەکا خوینێ یا د لەشێ ویدا، کو ئەڤ قورئانە گۆتنا خودێیە بۆ پێغەمبەرێ خۆ موحەممەدی ﷺ ئینایە خوار، و مەحالە کو ئەڤە مرۆڤەکی یان کۆمەکا مرۆڤان بشێن گۆتنێن وەکی قورئانێ بینن، و د ماوێ کۆنگرێن جیهانی یێن هاتینە گرێدان ل گەلەک پایتەختێن جیهانێ ل دۆر ئیعجازا زانستی د قورئان و سوننەتێدا، دیار دبوو کو ڤەکۆلینێن رژد هاتنە کرن ژ لایێ زانایێن نەموسلمانڤە، و دەهـ سالان ڤەکێشا، و ب ملیۆنەهان دۆلار پێ مەزاختن، و ئەنجامێن ڤەکۆلینێن وان کەتنە ئێک و وەکهەڤ بوون و دویر ژ تەئویلا ئایەتێ یان راستڤەکرنەك بۆ راستییەکێ، ئەڤ ئەنجامە وەکهەڤییەکا تمام بوو، بۆ ئایەتەکێ یان پەیڤەکا ئایەتێ، هەتا پیتەکا ئایەتێ، ئەڤە بەلگە و راستگۆییەکە ب گۆتنا خودێ: (سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الْآفَاقِ وَفِي أَنْفُسِهِمْ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ الْحَقُّ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ) [فصلت:٥٣].

ل (٣١/ی چریا ئێکێ/ ١٩٩٠ز)، ئێك ژ ب هێزترین ئاژانسێن عەسمانی ل جیهانێ د ماوێ دویرگەهەکا پێشکەفتیدا ل سەر جهێ خۆ یێ زانیارییان وێنەك نیشان دا، و مرۆڤ ب گۆمان ناکەڤیت ئەو گاڤا بەرێ خۆ ددەتێ: کو وەکی گولەکا ڤەبوویە و بەلگێن وێ

سۆرێ تارییه، و ل دۆر وێ بەلگێن بچویك یێن رەنگێ كەسكێ رۆهنه، و ل نیڤا وێ وەكی پەرداغەكێ شین یێ لێ، و راستییا ڤی وێنەی ئەوە پەڤینا ستێرەكا مەزنە كو ناڤێ وێ: چاڤێ پشیكێیە، و سێ هزار سالێن رۆناهییێ یا ژ مە دویرە، و د ڤی جهێ زانیارییاندا ب هزارەهان وێنێن رەنگین یێن هەین، بەلێ چ پەیوەندییا ڤی وێنەی ب ئیعجازا قورئانێڤە هەیە؟.

د قورئانا پیرۆزدا ئایەتەك یا هەی د سۆرەتا (الرحمن)دا، خودێ دبێژیت: (فَإِذَا انْشَقَّتِ السَّمَاءُ فَكَانَتْ وَرْدَةً كَالدِّهَانِ) [الرحمن:٣٧]، ئانكو: ڤێجا وەختێ عەسمان دكەلشیت و وەكی گولەكا سۆر، و ڕوینێ داخكری لێ دئێت، ئەگەر دویڤچۆنا راڤەكرنا ڤێ ئایەتێ بكەین، پاراپتر راڤەكەرێن قورئانێ بەری بەلاڤكرنا ڤی وێنەی، ئەم نابینین كو ل دویڤ رامانا وێ یا ئیعجازا زانستی راڤەكربیت، چونكی د قورئانێدا ئایەتێن هەین هێژ ب رامانەكا دورست نەهاتینە راڤەكرن، وەكی ئیمام عەلی ﷺ، دبێژیت: شەفبوونا ڤێ ستێرێ وەكی گولەكا برسقییە، ئانكو وێنێ ڤێ ستێرێ ل دەمێ پەڤینا وێ دبیتە راڤەكرنەك بۆ ڤێ ئایەتێ، ئەڤە رەنگەكە ژ رەنگێن ئیعجازێ، و قورئان موعجیزەكا بەردەوامە، و نە شرۆڤەكرنا پێغەمبەری ﷺ ـ چێدبیت ئەڤە ئیجتیهادەك بیت ژ وی، یان ئاراستەكرنەك بیت ژ لایێ خودێڤە ـ بۆ شرۆڤەكرنا پترین ئایەتێن گەردوونی د قورئانا پیرۆزدا، ژ بەر كو ئەگەر شرۆڤەكربا ب شرۆڤەكرنەكا فەبری و كۆرت دا ئەوێن ل دویڤدا دهێن ئینكارێ ل سەر كەن، و ئەگەر ب شرۆڤەكرنەكا ب تێر و تەسەل شرۆڤەكربان دا ئەوێن ل دەور و بەرێن وی ئینكارێ ل سەر كەن، و هێلان بۆ پێشڤەچۆنا ژیانێ و زانستی.

و یا د راڤەكرنا (ابن كثیر)دا[1] هاتی: (فَكَانَتْ وَرْدَةً كَالدِّهَانِ)، ئانكو حەل دبیت وەكی هێڤێنی (الدُرْدِيِّ)[1] و زیف د قالبێ حەلاندیدا.

---

١. تەفسیرا (ابن كثیر) (٤/٢٧٦).

و دهێته ڕەنگکرن وەکی ڕەنگێن بۆیاغان، جارەکێ یا سۆرە، و یا زەرە، و شینە، و کەسکە).

و د گۆتنەکا دیدا[2]: (وَرْدَةً كَالدِّهَانِ) دبێژیت: ئەو پیستێ ب سۆری گەمارکری.

و د گۆتنا ئبن عەباسدا[3]: (فَكَانَتْ وَرْدَةً كَالدِّهَانِ) : وەکی فرسا گولێیە، (جۆرە گیایەکێ گەلەك ب کولیلکە ژ بۆ جوانییێ دهێته چاندن).

و حەسەنێ بەسری دبێژیت[4]: ڕەنگان دورست دکەت.

و موجاهد دبێژیت[5]: (کالدهان): وەکی ڕەنگێن کەڤلێ سۆرە، ئەڤە یا د تەفسیرا (ابن کثیر)دا.

و د تەفسیرا (قرطبي)دا[6] دبێژیت: ((وەکی ڕوینێ زەلال لێ هات، و سعیدێ کورێ جوبەیری و قەتادە دبێژن: ڕامانا وێ ئەوە سۆر دبیت، و دبێژیت: وەکی سۆراتییا د گولێدا و چۆنا ڕوینییە، و دبێژیت: (الدهان) پیستێ ب هەمیڤە سۆر، ئانکو عەسمانی سۆر دکەت وەکی پیستێ گەمارکری ژ بەر توندییا گەرمییا ئاگری)).

---

١. ودُردِيّ الزيت و ژ بلی ڤان ژی ئەوا دمینیتە ب بنێ ویڤە، و د گۆتنا باقریدا: هوین (دُردِيّ) دکەنە د ناڤ مەیێدا؟ گۆتێ: (الدُّرديّ)چییە؟ گۆت: هێڤێنە، دکەنە د ناڤ شەربەتێ و مەیێدا دا ترش ببیت، [و ئەو ب خۆ دمینیتە ب بنێ هەر شلەکێدا وەکی ڤەخوارنان کزبیاتییان] (لسان العرب مادة درد)، و بەرێ خۆ بدە (النهاية في غريب الحديث) (١١٢/٢).

٢. ئەو گۆتنا ئبن عەباسییە، تەفسیرا (ابن کثیر) (٢٧٦/٤).

٣. ئەو گۆتنا ئبن عەباسییە، تەفسیرا (ابن کثیر) (٢٧٦/٤).

٤. ژێدەرێ بەرێ.

٥. ژێدەرێ بەرێ.

٦. تەفسیرا (قرطبي) (١٧٣/٧) ب دەستکاری.

خودێ دبێژیت: (فَإِذَا انْشَقَّتِ السَّمَاءُ فَكَانَتْ وَرْدَةً كَالدِّهَانِ)، دا ئەم بزانین ئەڤ قورئانە ئاخفتنا خودێیە، و ئەو موعجیزەکا بەردەوامە هەتا دویماهییا گەردوونی، و ناهێتە سەر هزرا کەسەکێ کو ستێرەك ل عەسمانی دپەقیت ل سەر شێوێ گولێ، ب هەمیڤە وەکی گولا جورییە، ب بەلگێن وێ یێن سۆر، و وەکی پەرداغەکێ د نیڤێدا، و بەلگێن وێ یێن کەسك، (فَإِذَا انْشَقَّتِ السَّمَاءُ فَكَانَتْ وَرْدَةً كَالدِّهَانِ).

## النَّجْمُ الثَّاقِبُ

خودێ دبێژیت: (وَالسَّمَاءِ وَالطَّارِقِ (١) وَمَا أَدْرَاكَ مَا الطَّارِقُ (٢) النَّجْمُ الثَّاقِبُ (٣) إِنْ كُلُّ نَفْسٍ لَمَّا عَلَيْهَا حَافِظٌ (٤)) [الطارق]، ئانكو: سویند ب عەسمانی، و ستێرێت ب شەڤ دەردكەڤن. تو چ دزانی ئەو ستێرێت ب شەڤ دەردكەڤن چنە؟ ئەو ستێرە یا تارییێ دسومیت و هەلدچنیت. هەر کەسەکی ملیاکەتەك د گەلە. و کار و کریارێت وی دنڤێسیت. و خودێ دبێژیت: (وَالنَّجْمِ إِذَا هَوَى) [النجم:١]، ئانكو: سویند ب ستێرێ وەختێ ئاڤا دبیت.

ب راستی، زانایێن راڤەکرنێ گەلەك مان و بێنفرەهی کێشا دەمێ راڤەکرنا: (النجم الثاقب) هەتا بۆچۆنێن وان گەهشتینە هندێ کو ئەڤ ستێرە رۆناهییا وێ گەلەکا گەشە (الثاقب)[١]، و تەخێن عەسمانی دسومیت و دهێتێ، و ل سەر پەیڤا (الطارق)[١] ب

---

١. [والثاقب: ئانكو گەش، و ژ وێ شوهوبێن گەش، دبێژیت: ثَقَبَ يَثْقُبُ ثقوباً وثقابة: دەمێ گەش دبیت، ويقوبه: ئانكو گەشبوونا وێ، و عەرەب دبێژن: أَثْقِبْ نارَكَ، ئانكو ئاگرێ خۆ گەش بکە] تەفسیرا (ابن كثير) (٤/٤٩٨)، [و ژ زار ئبن عەباسی د گۆتنا: النجم الثاقب، ئانكو گەش] تەفسیرا (گبری) (١٤١/٣٠).

هەمیڤە چو ل سەر نەگۆت، و مە گۆت بوو د قورئانێدا ئایەتێن گەردوونی پێغەمبەری ﷺ ژ بۆ حیکمەتەکا گەلەگا مەزن راڤە نەکربوون، ئەگەر ب راڤەکرنەکا نێزیکی ژینگەها خۆ راڤەکربان، مە دانپێدان پێ نەدکر ئانکو دا ئینکارکەین، و ئەگەر ب راڤەکرنەکا کویر ژ دیتنا خۆ راڤەکربا دا هەڤال و دەوروبەرێن وی ئینکارکەن، ئەڤ ئایەتە هێلان دا زانست ئاشکرا بکەت.

و ئایەتا (وَالنَّجْمِ إِذَا هَوَى) نە (شهب)ـن یێن دهێنە خوار ل عەسمانێ مە، و دەمێ دبێژن ستێرەك رژیا، ئەڤانە خودایێ مەزن د گەلەك ئایەتاندا پێ بەحس کری، وەکی دبێژیت: (إِلَّا مَنْ خَطِفَ الْخَطْفَةَ فَأَتْبَعَهُ شِهَابٌ ثَاقِبٌ) [الصافات:١٠]، ئانکو: (و شەیتان ئاخفتنا ملیاکەتان گوهـ لێ نابن) ژ بلی وی یێ ب دزیڤە ئاخفتنەکێ برەڤینیت (ئەو ئاخفتن ژی وەحی نەبیت، چونکی وەحی یا ژ وان پاراستییە، بەلێ هەر ئەو ئاخفتنا ملیاکەت د ناڤبەرا خۆدا دکەن)، و ئەوی ژی گورپیەکا ئاگری یا کونکەر ب دویڤ دکەڤیت، و خودێ دبێژیت: (وَأَنَّا لَمَسْنَا السَّمَاءَ فَوَجَدْنَاهَا مُلِئَتْ حَرَسًا شَدِيدًا وَشُهُبًا) [الجن:٨]، ئانکو: ئەم چۆین دا بگەهینە عەسمانی و گوهێ خۆ بدەینە ملیاکەتان، مە دیت عەسمان یێ تژی زێرەڤان و نۆبەدارە (ژ ملیاکەتان)، و تژی ستێرە (ملیاکەت د وان وەردکەن یێ گوهدارییا وان بکەت).

ل ڤێرە: (وَالسَّمَاءِ وَالطَّارِقِ (١) وَمَا أَدْرَاكَ مَا الطَّارِقُ (٢) النَّجْمُ الثَّاقِبُ (٣))، ستێرا (الطارق) و ستێرا (الثاقب) و (والنجم إذا هوى)، چو پەیوەندی ب وان ئایەتێن ل سەر (شهب)ێن دئێنە خوارڤە نینە، کو ئەم رۆژانە ب چاڤ دبینین.

---

١. بوخاری د صەحیحا خۆدا د بابەتێ تەفسیرا سۆرەتا (البروج)دا (١٨٨٥/٤) دبێژیت: دهێتە گۆتن ئەو تشتێ شەڤێ دهێت ئەو (طارق)ـە ئانکو دەردکەڤیت، و دبێژن: [الطَّارِقُ النَّجْمُ، والثَّاقِبُ: گەش، دبێژن: ئاگرێ خۆ گەشکە بۆ کوچکی].

ئەڤ بابەتە گەلەکێ ئالۆزە، بەلێ ژ بۆ ب سناهیکرنا ڤی بابەتی، بۆ نموونە ستێر دەمێ مەزن دبن تێك دچن، و بۆشاییێن د ناڤبەرا گەردیلێن وێدا نامینن، هەتا قەبارێ وێ گەلەك بچویك دبیت، و كێشا وێ گەلەك گران دبیت، وەكی تەپا پێیە ئەڤ ستێرێن نیترۆنی یێن تێكچۆی، كێشا وێ دگەهیتە پێنجی هزار بلیۆن تەننان، و ئەگەر ڤێ تەپێ داننە سەر عەردی و كون بكەن و هەتا دگەهیتە لایێ دی، هەروەكی تو پەمبییەكی بینی و تەپەكا ئاسنی دانییە سەر، ئەڤە هەر زوی دێ هێتە خوار، ئەڤەیە (النجم الثاقب)، ستێرا نیترۆنی ئەوا پەستان ل سەر هاتییە كرن هەتا بوویە قەبارێ تەپێ، و كێشەكا هەی هندی یا عەردییە، و ئەگەر عەرد پیر ببیت ـ گەهشتبیتە پیراتییێ، دێ هندی قەبارێ هێكێ لێ هێت، و كێشا وێ ژی، و ئەو كێشا مەزنا عەردی، بەلێ دێ هندی قەبارێ هێكێ لێ هێت، ئەڤەیە (النجم الثاقب) وەكی هندەك زانا دبینن، و قورئان هەلگرا گەلەك ئالیانە (أوجە).

تلسکۆپێن بێ تێل (لاسلكي) یێن هەین برسڤێن بێ تێل وەردگریت ژ ڤان ستێران، لێدانێن (نوبية)، و هەر وەكی ئەڤ ستێرە دهێتە دەرگەهێ عەسمانی، ژ بەر كو توندییێن لێدانێن زێدە دبن د ڤۆناغا گەنجاتییێدا، و توندییێن وێ كێم دبن د پیراتییێدا، و د ماوێ توندییێن لێدانان ئەم دزانین كو ب رێكا تلسكۆپێن بێ تێل دهێن ژیێ ڤێ ستێرێ، ستێرەكە دهێتە عەسمانێ عەردی، و د سومیت، و ئەڤ تشتە ژ نویترین ڤەكۆلینێن گەردوونینە.

خودێ دبێژیت: ﴿وَالسَّمَاءِ وَالطَّارِقِ (١) وَمَا أَدْرَاكَ مَا الطَّارِقُ (٢) النَّجْمُ الثَّاقِبُ (٣)﴾ ـ ئەڤە بەرسڤا سویندێ، كا بەرسڤا سویندێ خودێ دبێژیت: ﴿إِنْ كُلُّ نَفْسٍ لَمَّا عَلَيْهَا حَافِظٌ﴾ هەمی لڤین و راوەستیان و گۆتن و كار و داخوازی و پالدەر و هیڤییێن تە، و هەمی ئەو تشتێن ئەم ژ بەر مرۆڤان دڤەشێرین دێ خودێ بۆ تە پارێزیت، و دێ پسیارا ڤان

هەمییان ژ تە کەت، چونکی ئەوێ ستێرا (الثاقب) و ستێرا (الطارق) (والنّجم إذا هوَى) ئافراندی، ئەوە دێ پسیارێ ژ تە کەت ل سەر کارێن تە.

(وَالسَّمَاءِ وَالطَّارِقِ (١) وَمَا أَدْرَاكَ مَا الطَّارِقُ (٢) النَّجْمُ الثَّاقِبُ (٣) إِنْ كُلُّ نَفْسٍ لَمَّا عَلَيْهَا حَافِظٌ))، چو ستێر ژ زانینا وی بەرزەنابن، ئەرێ دێ تشتەك ل عەردی بەر وی بەرزەبیت؟.

## خۆلگەهێن زڤرینا هەساران و کلکدارا هالی

خودێ دبێژیت: (لَا الشَّمْسُ يَنْبَغِي لَهَا أَنْ تُدْرِكَ الْقَمَرَ وَلَا اللَّيْلُ سَابِقُ النَّهَارِ وَكُلٌّ فِي فَلَكٍ يَسْبَحُونَ) [يس:٤٠]، ئەڤ ئایەتە، رامانا وێ یا دیار ئەوە، چاڤێ رۆژێ رێرەوەکێ زڤرینێ یێ هەی، و دیسا هەیڤێ ژی، و رێرەوێ زڤرینا رۆژێ ناگەهیتە یێ هەیڤێ، و رۆژ ب هەیڤێ ناکەڤیت، ئانکو هەر ئێك د رێرەوەکێ زڤرینێدا دچن، بەلکو (وَكُلٌّ فِي فَلَكٍ يَسْبَحُونَ) ئەڤ رامانە دوپاتکرنەکە بۆ گۆتنا خودێ: (إِنَّ اللَّهَ يُمْسِكُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ أَنْ تَزُولَا وَلَئِنْ زَالَتَا إِنْ أَمْسَكَهُمَا مِنْ أَحَدٍ مِنْ بَعْدِهِ إِنَّهُ كَانَ حَلِيمًا غَفُورًا) [فاطر:٤١]، ئانکو: ب راستی خودێیە عەرد و عەسمانان رادگریت کو نەکەڤن، و ئەگەر بکەڤن ژی کەس نینە ژ بلی وی وان (هەردوکان) رابگریت، ب راستی خودێ یێ بێنفرەهە لەزێ ل جزاکرنێ ناکەت و یێ گونەهـ ژێبەرە، و گۆتنا: (أَنْ تَزُولا)، رامانا وێ: ژ رێ دەرکەفتنە

(ژ جه چۆن)، و ژ ریٚ دەرکەفتنە د دەمیٚ نیڤا رۆژیٚ ئەڤە ژ ریٚ دەرکەفتنا چۆنا رۆژێیە د نیڤا عەسمانیدا.

و ژ ڤیٚ ئایەتیٚ مرۆڤ وەسا تیٚ دگەهیت کو هەر هەسارەکا د عەسمانیدا رێرەوەك ییٚ هەی تێدا دزڤریت، هەتا دەمیٚ هندەکان ئەڤ گۆتنا خودیٚ دخواند: (وَالسَّمَاءِ ذَاتِ الرَّجْعِ) [الطارق:١١]، دیت کو ئەڤ ئایەتە هویربینترین سالۆخەتە بۆ عەسمانی، چو هەسارە و ستێر ل عەسمانان نین رێرەویٚ خۆ ییٚ زڤرینیٚ نەبیت، و دزڤریتە جهیٚ هاتنا خۆ پشتی دەمەکی، و ئەڤ کلکدارە کو خەلك هەر رۆژ زێرەڤانییٚ ليٚ دکەن، کلکدارا هالی، هەر ژ رۆژا خودیٚ عەرد و عەسمان ئافراندین د رێرەوەکێدا دزڤریت و هندی سەریٚ تبلیٚ ناچیت بۆ لایەکی، گەهشتە خالەکیٚ سیٚ سەد ملیۆن کیلۆمەتران نێزیکی عەردی بوو، کوریەك یا هەی درێژاهییا ویٚ زێدەترە ژ نۆت و سیٚ ملیۆن کیلۆمەتران، و مرۆڤ ترسیان کو چۆنا ویٚ بمینیت هەر سەر هێلەکا راست، و ب عەردی ب کەڤیت، و ئایەتا پیرۆز دبێژیت: (إِنَّ اللَّهَ يُمْسِكُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ أَنْ تَزُولَا).

ب راستی مانا ڤیٚ کلکداریٚ د رێرەویٚ خۆ ییٚ زڤرینێدا ب ملیۆنەهان سالان، و دیسا عەرد و رۆژ هەر ب ڤیٚ مانیٚ د سروشتیٚ خۆدا نیشانەکا مەزنە، خودیٚ دبێژیت: (لَا الشَّمْسُ يَنْبَغِي لَهَا أَنْ تُدْرِكَ الْقَمَرَ وَلَا اللَّيْلُ سَابِقُ النَّهَارِ وَكُلٌّ فِي فَلَكٍ يَسْبَحُونَ).

هەر هەسارەکیٚ خۆلگەها زڤرینا خۆ ییٚ تایبەت ییٚ هەی، نە زێدە دبیت و نە کێم، نە ب لەز دکەڤیت نە هێدی (گران)، و رۆژ ژی ب هەیڤیٚ ناکەڤیت، و زڤرینا عەردی ل دۆر خۆ یا خۆجهە، و درێژاهییا شەڤیٚ ناهێتە گوهۆرین، ئانکو: سالنامە بۆ هزارەهان سالانە پشتی سەد سالان دیٚ بێژیتە تە: د رۆژا (١٧)ی نیسانیٚ بۆ نموونە ل سالا (٣٠٠٠) دیٚ رۆژ هەلێت ل دەمژمێر شەش و دو خۆلەك، رامانا ڤیٚ چەندیٚ چییە؟ خودیٚ دبێژیت: (وَلَا اللَّيْلُ سَابِقُ النَّهَارِ وَكُلٌّ فِي فَلَكٍ يَسْبَحُونَ).

زڤرینا عەردی ل دۆر خۆ یا جهگرە، و ل دۆر رۆژێ یا جهگرە، و هەر ئێك د رێرەوەكێ زڤرینێدا دچیت، زانایێن گەردیلەیی حێبەتی بوون ژ ڤێ ئایەتێ: (وَلَا اللَّيْلُ سَابِقُ النَّهَارِ وَكُلٌّ فِي فَلَكٍ يَسْبَحُونَ)، ئەڤ چەندە هەمی بۆ چ دزڤرن؟ ئەڤ ئایەتە بۆ هەمی تشتێن خودێ ئافراندین دزڤریت، بۆ نموونە مینبەرێ گەردیلێن تێدا، و د گەردیلاندا نیترۆناتێت هەی ل دۆر خۆ دزڤرن، و سیستەمێ گەردیلان وەكی سیستەمێ مەجەرانە، و هەر تشتێ چاڤێ تە بكەڤیتە سەر ژ گەردان پێك دهێت، و گەرد ژ گەردیلان پێك دهێت، و گەردیلە ژ ناڤكێ و كارەبان كو ڤان رێرەوێن زڤرینێ یێن هەین، و لەزاتییێن جهگر، ئەڤ ئایەتا ئاماژێ ب گەردیلێ ددەت، خودێ دبێژیت: (وَلَا اللَّيْلُ سَابِقُ النَّهَارِ وَكُلٌّ)، ئانكو هەمی تشتێن خودێ ئافراندی: (فِي فَلَكٍ يَسْبَحُونَ)[1].

گەردیلێن كەڤری، بەری، داری، پەرداغێ ئاڤێ، مێز، هەر تشتێ چاڤێ تە دكەڤیتە سەر ب تنێ ئەو لەشەكە ژ گەردان پێك دهێت، و گەرد ژ گەردیلان، و گەردیلە ژ ناڤكێ؛ و كارەبان ل دۆر ناڤكێ دزڤرن.

---

١. فِي فَلَكٍ يَسْبَحونْ: ئانكو ب لەز دهێن و دچن وەكی یێ مەلەڤانییا د ئاڤێدا دكەت، خودێ دبێژیت كو ئەو راستگۆترینێ ئاخفتنكەرایە: (وَالسَّابِحَاتِ سَبْحًا)، و دبێژنە هەسپی دەمێ دەستێ خۆ د غاردانێدا درێژ دكەت: سابح، و ژ لایێ رێزمانێڤە نەگۆت: يَسْبَحْنَ و نەگۆت: تَسْبَحُ، [وكل في فلك يسبحون، ئبن عەباس دبێژیت: دزڤرن وەكی تەشی دزڤریت]؛ (إبن كثير ٣/١٧٩).

# لەزاتییا رۆناهییێ

خودایێ مەزن د پەرتۆکا خۆ یا پیرۆزدا دبێژیت: (يُدَبِّرُ الْأَمْرَ مِنَ السَّمَاءِ إِلَى الْأَرْضِ ثُمَّ يَعْرُجُ إِلَيْهِ فِي يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُ أَلْفَ سَنَةٍ مِمَّا تَعُدُّونَ) [السجدة:٥]، ئانكو: ئەو (خودێ) ژ عەسمانی کاروبارێ عەردی (هەتا رۆژا قیامەتێ) ب رێڤە دبەت. پاشی ئەڤ کاروبارە د رۆژەکێدا (کو رۆژا قیامەتێیە) دێ بلندبنە دەڤ وی، درێژاهییا وێ رۆژێ ب هژمارا هەوە هزار سالێت هەوەنە.

قورئان د گەل وان دئاخڤیت یێن پشت بەستنێ ب سالا هەیڤێ دکەن (السنة القمرية)، و هەیڤ هەیڤێ جارەکێ ل دۆر عەردی دزڤریت، ئەگەر ئەم دویراتییا مەلبەندێ هەیڤێ هەتا مەلبەندێ عەردی بپیڤین، ئانکو نیڤا تیرێ بازنێیە کو ئەڤە رێرەوێ هەیڤێیە ل دۆر عەردی، و ئەم لایێن ڤی بازنەی بپیڤین پشتی کو مە نیڤا تیرێ وێ زانی، دێ زانین کا هەیڤ چەند کیلۆمتران دبریت د زڤرینا خۆدا ل دۆر عەردی د هەر هەیڤەکێدا، و ئەگەر ئەم درێژاهییا لایێن بازنێ وەربگرین و لێکدانی دوازدە هەیڤان بکەین، دێ زانین کا هەیڤ چەند کیلۆمتران دبریت د زڤرینا خۆدا ل دۆر عەردی د سالەکێدا، و ئەگەر ئەم ڤان کیلۆمترێن هەیڤێ د سالەکێدا ل دۆر عەردی برین لێکدانی هزارێ بکەین، دێ زانین کا هەیڤ د زڤرینا خۆدا ل دۆر عەردی ل هزار سالان چەند کیلۆمتر برینە، ئەڤ ژمارە یەکسانی وێ دویراتییێیە یا کو هەیڤێ ب کیلۆمتران بری دزڤرینا خۆدا ل دۆر عەردی د هزار سالاندا: (فِي يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُ أَلْفَ سَنَةٍ مِمَّا تَعُدُّونَ) [السجدة:٥].

ئەوا هەیڤ ب هزار سالان دبریت، رۆناهی د رۆژەکێدا دبریت، ب بەلگە ئەگەر ئەم وێ چەندا هەیڤێ دزڤرینا خۆدا ل دۆر عەردی د هزار سالاندا بری دابەش بکەین، دێ

دویراتییێ ل سەر چرکەیێن رۆژێ دابەشکەین، کو د بیست و چار دەمژمێراندا دێ لێکدانی شێستێ کەین و جارەکا دی لێکدانی شێستێ، دێ بۆ مە دەمەك دەرکەڤیت، ئەگەر ئەم دویراتییێ جارەکا دی دابەشی ڤی دەمێ بۆ مە بەری نوکە دەرکەفتی بکەین، دێ ئەڤ ژمارە دەرکەڤیت (٢٩٩,٧٩٢,٥کم)، و ئەڤ ئەنجامە ب شێوەکێ تمام رێك دکەڤیت د گەل وێ لەزاتییا رۆناهییێ یا نیف دەولەتی کو د کۆنگرەکێ نێڤ دەولەتیدا ئەوێ ل پاریسێ هاتییە گرێدان هاتبوو راگەهاندن، و لەزاتییا رۆناهییێ گرنگترین یاسایە مرۆڤی زانی د سەدێ بیستێدا و ئەڤ لەزاتییە بلندترین لەزاتییە د گەردوونیدا، ئەگەر هەر تشتێ ب لەزاتییا رۆناهییێ چۆ دێ بیتە رۆناهی، و دێ تەنا وی بیتە چوننە و قەبارێ وی چو دویماهیك نابیت، و ل ڤێرە دێ دەم راوەستیت، و ئەگەر لەشەك ب لەزتر بیت ژ رۆناهییێ دێ دەم بۆ پاش زڤریت، و ئەگەر کێمتر لێ هات ژ رۆناهییێ دێ دەم سست بیت.

و ئەو دویراتییا هەیڤ د رێرەوێ زڤرینا خۆ یا تایبەتدا ل دۆر عەردی د هزار سالێن هەیڤیدا دبریت هندی وێ دویراتییێیە یا کو رۆناهی د رۆژەکا عەردیدا دبریت، و ئەڤەیە ئەو بیردۆزا رێژەیی کو رۆژئاڤا خۆ پێ مەزن دکەت.

و ئایەتا دویێ، ئەو ژی خودێ دبێژیت: (تَعْرُجُ الْمَلَائِكَةُ وَالرُّوحُ إِلَيْهِ فِي يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُ خَمْسِينَ أَلْفَ سَنَةٍ) [المعارج:٤]، د ڤێ ئایەتێدا گۆتنا: (مِمَّا تَعُدُّونَ)، تێدا نینە، چونکی ئەڤە لەزاتییا ملیاکەتانە، کو ژ لەزاتییا رۆناهییێ دبۆریت.

# هەیڤ

ئەم هەمی دزانین هەیف هەیڤێ جارەکێ ل دۆر عەردی دزڤریت، و ل دۆر خۆ ژی دزڤریت د دەمەکێ هندی خۆلا خۆ یا زڤرینێ ل دۆر عەردی، ژ بەر ڤێ چەندێ ئەم ب تنێ روییەکێ هەیڤێ دبینین ب درێژاهییا ژیانێ، چونکی ل دۆر عەردی و ل دۆر خۆ د ئێك دەمدا دزڤریت، و خۆلا خۆ یا زڤرینێ ل دۆر خۆ و ل دۆر عەردی بیست و نەهـ رۆژ و هەشت دەمژمێران تمام دکەت.

بەلێ تشتێ سەرنج راکێش ئەوە هەیف د هەمی رۆژاندا د بازنێ چۆنا خۆدا ل دۆر عەردی سێزدە پلەیان دبریت، و هەر رۆژەکێ چل و نەهـ خۆلەکان گیرۆ دبیت ژ رۆژا بەرێ، و ئەگەر ئەڤ گیرۆبوونە نەبا دا هەیڤ ب درێژاهییا ژیانێ چواردە شەڤی دیار کەت ئانکو هەمی دەما هەیف دا یا چواردە شەڤی بیت، بەلێ گیرۆبوونا هەلاتنا وێ ب چل و نەهـ خۆلەکان ژ هەلاتنا رۆژا بەرێ د هەمی رۆژاندا ئەوە کو هەیڤێ د پلەیێن رێکخستیدا نیشا مە ددەت، ژ هەیڤا کڤانەیی، بۆ چارێك، بۆ چواردە شەڤییێ، بۆ (عرجون) وەکی شێوێ بستیکا هشك یا ئویشییێ قەسپێ، بۆ بەرزەبوونەکا تمام، ژ بەر ڤێ چەندێ خودایێ مە دبێژیت: (هُوَ الَّذِي جَعَلَ الشَّمْسَ ضِيَاءً وَالْقَمَرَ نُورًا وَقَدَّرَهُ مَنَازِلَ لِتَعْلَمُوا عَدَدَ السِّنِينَ وَالْحِسَابَ) [یونس:٥]، ئانکو: ئەوی (خودێ) رۆژ بۆ هەوە کرییە چرا و هەیف کرییە رۆناهی، و کرە قویناخ قویناخ دا هوین هەژمارا سالان و حسێبا خۆ بزانن.

کێ ئافراندییە و داهێنایە، و هەیف وەلێ کرییە د هەلاتنا خۆدا هەر رۆژەکێ چل و نەهـ خۆلەکان ژ رۆژا بەری خۆ گیرۆبیت، ژ بەر ڤێ گیرۆبوونێ د ڤان پلەیێن رێکخستیدا

دیار دکەت، هەتا هەیڤ بوویە سالنامە د نیڤا عەسمانیدا؛ دا هوین هەژمارا سالان و حسێبا خۆ بزانن؟ ئەو ژی خودایێ گشت جیهانایە.

تشتەکێ دی، تەنا هەیڤێ پشکەکە ژ هەشتێ پشکان ژ تەنێ عەردی، و هێزا راکێشانێ ل سەر بانێ هەیڤێ هەمبەری شەش ئێکا هێزا راکێشانا عەردییە، و ئەو مرۆڤێ کێشا وی ل سەر عەردی شێست کیلۆگرام بیت دێ ل سەر بانێ هەیڤێ دەه کیلۆگرام بیت، ژ بەر کو راکێشان د هەیڤێدا کێمترە.

هندەك هەیڤ یێن هەین چەند سالەکان جارەکێ ل دۆر خۆ دزڤرن، هندەك هەیڤ یێن هەین گەلەك دویر دکەڤن، و هندەك گەلەك نێزیك دبن، بەلێ هزرکرنا دورست، و هزرکرنا هویربین ئەوە کو ئەگەر هەیڤ ل دۆر خۆ و ل دۆر عەردی د ئێك دەمدا نەزڤریبا، و ئەگەر د ماوێ زڤرینا خۆدا سێزدە پلە نەبریبان، و ئەگەر گیرۆبوونا هەلاتنا وێ چل و نەه پلە نەبان سالنامە نەدبوو، و مە مفا ژێ وەرنەدگرت.

دێ چ بیت ئەگەر دویراتییا د ناڤبەرا عەردی و هەیڤێ کێم ببا ل دویف دویراتییا نوکە؟ خودێ دبێژیت: (الشَّمْسُ وَالْقَمَرُ بِحُسْبَانٍ) [الرحمن:٥]، ئانکو: رۆژ و هەیڤ ل دویف حسێبەکێ (یا ب رێك و پێك) دگەڕن (و ب ڤێ گەڕیانێ ئەم هەژمارا هەیڤ و سالوەخەت و سالان دزانین).

دویراتییا هەیڤێ ژ رۆژێ ل دویف حسێبەکا هویربینە، و هەلکێشان و داکێشان ل ژێر کاریگەرییا هەیڤێ روی ددەن، بەلێ ب کارتێکرنەکا سنوردار، و ئەگەر ئەڤ دویراتییە کێم بوو دێ ئاستێ دەریای بلند بیت، و دێ ب سەر هشکاتییێدا هێت، پاشی ژێ هاتە داکێشان، دێ ژیان ل سەر عەردی یا مەحال بیت، و ئەگەر نێزیك بوو ژ وێ دویراتییا نوکە دێ عەرد وێ کێشیتە خۆ، و دێ ب عەردی کەڤیت، و ئەگەر هەیڤ ژ عەردی دویر کەڤت پتر ژ یا نوکە هەلکێشان و داکێشان نامینن، و ڤان هەردو دیاردان (هەلکێشان و داکێشان) د دەریایاندا کارەکێ گرنگ و مەترسی یێ هەی، و ئەگەر هێژ

پتر دویر کەڤت دێ هەسارێن دی هەیڤێ کێشنە خۆ، و دا عەرد چوار دەمژمێران ل دۆز خۆ زڤریت!! دا رۆژ بیتە دو دەمژمێر، و دیسا شەڤ ژی دا بیتە دو دەمژمێر، ئەڤە هەمی دکەڤنە بن گۆتنا خودێڤە: (الشَّمْسُ وَالْقَمَرُ بِحُسْبَانٍ).

خودێ دبێژیت: (وَالْقَمَرَ قَدَّرْنَاهُ مَنَازِلَ حَتَّى عَادَ كَالْعُرْجُونِ الْقَدِيمِ) [يس:٣٩]، ئانکو: هەیڤ ژی مە چۆنا وێ یا کرییە قویناخ قویناخ (هەر شەڤەکێ یا ل جهەکی، د شەڤا دویماهییێدا جارەکا دی وەکی دەستپێکێ لێ دئێتەڤە)، و هۆسا قویناخ قویناخ دچیت هەتا جارەکا دی وەکی بستیکا ئویشییێ قەسپێ یێ کەڤن لێ دئێت). (قَدَّرْنَاهُ مَنَازِلَ) ئانکو: مە چۆنا وێ یا کرییە قویناخ قویناخ، پاشی خودێ دبێژیت: (لَا الشَّمْسُ يَنْبَغِي لَهَا أَنْ تُدْرِكَ الْقَمَرَ وَلَا اللَّيْلُ سَابِقُ النَّهَارِ وَكُلٌّ فِي فَلَكٍ يَسْبَحُونَ) [يس:٤٠]، ئانکو: نە بۆ رۆژێ دبیت، بگەهیتە هەیڤێ، و نە بۆ شەڤێ ژی دبیت، بەری رۆژێ بێت، و هەر ئێك د چەرخا خۆدا دزڤریت). و د ئایەتەکا دیدا دبێژیت: (وَسَخَّرَ لَكُمُ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ دَائِبَيْنِ) [ابراهيم:٣٣]، ئانکو: رۆژ و هەیڤ ژی یێت ب بەر خزمەتا هەوە ئێخستین، و بەردەوامن د ڕاستکرنێدا (اصلاح) یان بەردەوامن د چۆنێدا بێ ڕاوەستیان).

ناهێتە سەر هزرا کەسەکێ کو ژیان ل بەر وی چەند درێژ بیت هەیڤ دیار نەکەت، خودێ دبێژیت: (وَسَخَّرَ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ كُلٌّ يَجْرِي إِلَى أَجَلٍ مُسَمًّى وَأَنَّ اللَّهَ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ) [لقمان:٢٩]، ئانکو: رۆژ و هەیڤ یێت بۆ هەوە خزمەت خۆش کرین (یێت ئێخستینە د خزمەتا هەوەدا) هەر ئێك هەتا وەختەکێ دیارکری دێ ئێت و چیت، و تشتێ هوین دکەن خودێ ژێ ب ئاگەهە.

و ژ نیشانێن بەلگە ل سەر مەزناهییا خودێ، خودێ دبێژیت: (تَبَارَكَ الَّذِي جَعَلَ فِي السَّمَاءِ بُرُوجًا وَجَعَلَ فِيهَا سِرَاجًا وَقَمَرًا مُنِيرًا) [الفرقان:٦١]، ئانکو: پاك و بلند بوو، و پڕ خێر و بەرەکەت بوو ئەو خودایێ عەسمان بۆ ستێران کرییە جه و قویناخ، و ڕۆژا گەش و هەیڤا ڕۆنکەر کرینە تێدا.

و خودێ دبێژیت: (أَلَمْ تَرَوْا كَيْفَ خَلَقَ اللَّهُ سَبْعَ سَمَوَاتٍ طِبَاقًا (١٥) وَجَعَلَ الْقَمَرَ فِيهِنَّ نُورًا وَجَعَلَ الشَّمْسَ سِرَاجًا (١٦)) [نوح]، ئانكو: ما هوین دەستهەلاتدارییا خودایێ خۆ د چێكرنا عەسماناندا نابینن، كا چاوا حەفت قاتێن عەسمانان ل سەرێك نژناندینە. و كا چاوا هەیڤ د عەسمانێ دنیایێدا كرییە ڕۆناهی بۆ عەردی، و كا چاوا رۆژ بۆ هەوە كرییە چرایەكێ گەش).

ئاخا هەیڤێ رۆناهییێ ڤەدگێریت (تربة عاكسة)، و ئەڤە ژ حیكمەتا خودێیە، و رۆناهییا هەیڤێ دهێتە هژمارتن هەژدە پشكن ژ رۆناهییا رۆژێ، و ئەو سالنامەكا هویربینە، خودێ یا كرییە د نیڤا عەسمانیدا، و رۆژ كرییە دەمژمێرەكا رۆژانە، رۆژ دەمژمێرە، و هەیڤ سالنامەیە، خودایێ پر زانا و شارەزا دبێژیت:

(هُوَ الَّذِي جَعَلَ الشَّمْسَ ضِيَاءً وَالْقَمَرَ نُورًا وَقَدَّرَهُ مَنَازِلَ لِتَعْلَمُوا عَدَدَ السِّنِينَ وَالْحِسَابَ) [یونس:٥].

ئەڤە نیشانێن خودێ یێن گەردوونینە شەهدەیێ بۆ مەزناهی و ئێكاتییێ ددەن، كو دەنگێن بووڤێن رۆژئاڤای ب ڤان نیشانان بلند دبوو د چەند سالێن بۆریدا، و ئەڤ چەندە یا د قورئانێدا بەربەلاڤە بەری چواردە سەدان، پا دێ كیڤە چی هەی مرۆڤ؟ ئەرێ دێ تو ژ هزركرنا د ڤێ چەندێدا رەڤی؟.

# موعجیزا ئیسرا و میعراجێ نه یا ئەستەمە (مەحالە) ژ لایێ عەقلیڤە

بابەتەکێ گەلەکێ هویربینە کو یێ گرێدایە ب ئیسرا و میعراجێڤە، مرۆڤان بۆ هەر تشتەکی تایبەتمەندییەك یان سروشتەك یێ دانای، و یاسا یێن هاتینە دانان ژ لایێ خودێڤە بۆ هەمی هەبوویێن عەرد و عەسمانان، ئاڤێ تایبەتمەندییێن خۆ یێن هەین، هەروەسا ئاگری، و یاسایێن هەین بۆ ڤەگوهاستنێ ژ جهەکی بۆ جهەکێ دیتر، و لەشی کاودانێن خۆ یێن تایبەت یێن هەین کو د گەلدا بگونجیت، و کاودانێن هەین هەڤدژن د گەلدا، دێ بۆ هەوە ڤان راستییێن خوارێ بەحس کەین دا جوداهییێ د ناڤبەرا مەحالێ کەس ل سەر هیبوویی و تشتێ بۆ عەقلی مەحال بکەین:

دەمێ خودایێ مەزن ب حەزکرنا خۆ ئاگر وەلێ کری کو یێ ب سۆتن بیت، و دشێت هەر دەمەکی وەل ئاگری بکەت یێ ب سۆتن نەبیت، و هەر تشتەکی سروشتەکێ تایبەت یێ هەی، و هەر یاسایەکا کەرستەیی و هەر پەیوەندییەکا خۆجه د ناڤبەرا دو تشتاندا، ئەڤە ژ ئافراندنا خودایێ مەزنە، و هەر تشتێ حەزکرنا وی ل سەر بیت دشێت بئافرینیت، ئەگەر ئافراندییەك ل سەر شێوەکێ ئافراند، دشێت ل سەر شێوەکێ دی بئافرینیتەڤە، دەمێ قورئان بەحسێ هندەك رویدانێن دژی یاسایێن سروشتی دکەت، وەکی ئیسرا و میعراجێ کو ئەڤە موعجیزەیە، ئەڤە نابیت ل دویڤ یاسایێن سروشتی تێبگەهین ئەوێن خودێ دانایین، هندیکە ئیسرا و میعراجە هەڤدژی ڤان یاسایانە، چونکی مرۆڤ هندەك جاران وەسا هزر دکەت کو ب تنێ ئەگەرن ئەنجامان دورست دکەن، و ئەگەر مرۆڤی باوەرییا خۆ ب ئێك جاری ب ڤێ چەندێ ئینا دێ کەڤیتە د هەڤپشکییێدا، ئەوێ ئەنجامی دورست دکەت ئەو نەئەگەرە، بەلکو ئەو خودایێ مەزنە،

و ئەگەر د هەر دەمەکیدا دێ ژ کار کەڤیت یان دێ هێتە لادان، و دەمێ هندەك موعجیزە ل سەر دەستێ پێغەمبەران (سلاڤێن خودێ ل سەر بن) دهێن، یان دەمێ هندەك موعجیزە یێن پێغەمبەرێ مە بن ﷺ، ئەڤە نە مەحالە بۆ عەقلی، بەلێ یێ سەیرە ل هەمی دەمان، و زانایێن عەقیدێ جیاوازی یا کری د ناڤبەرا کا چ مەحالە ل هەمی دەمان، و چ یێ مەحالە ژ لایێ عەقلیڤە، و وەکی ڤێ هاتە گۆتن د دەریایا د ناڤبەرا مسرێ و سەینادا، خودێ دبێژیت: ﴿فَلَمَّا تَرَاءَى الْجَمْعَانِ قَالَ أَصْحَابُ مُوسَى إِنَّا لَمُدْرَكُونَ﴾ [الشعراء:٦١]، ئانکو هەڤالێت مووسایی گۆتن: بێ گۆمان ئەڤە گەهشتنە مە، فیرعەون یێ ل پشت وان و دەریا یا ل پێشییا وان، خودێ دبێژیت: ﴿قَالَ كَلَّا إِنَّ مَعِيَ رَبِّي سَيَهْدِينِ﴾ [الشعراء:٦٢]، (مووسایی) گۆت: نەخێر.. ئەو ناگەهنە مە (نەترسن)، ب راستی خودایێ من یێ د گەل من (ب راستەرێییێ و هاریکارییا خۆڤە)، دێ رێکەکێ بۆ مە ڤەکەت و نیشا مە دەت.

خودێ سروشتێ ئاڤێ ب شیان و حەزکرنا خۆ شل یێ دایی، ئەو دشێت هەر دەمەکی بقەرسینیت و هشك بکەت، ب تنێ ئەو ئاماژەك بوو ژ مووسا پێغەمبەر ﷺ، دەمێ ب گوپالێ وی هەتا دەریایی شەق بووی بوو رێکەکا هشك. ئەگەر مە هزر د نیعمەتێن خودێدا کر، و مە مەزناهییا وی زانی، ئەم نابینین بەروڤاژی و هەڤدژییا د سیستەمێ سروشتیدا تشتەکێ مەحال بیت بۆ عەقلی، بەلکو یێ مەحالە بۆ وان تشتێن مرۆڤ ل سەر هیبوویی، ب تمامی وەکی ئاگر ل دەڤ مرۆڤان یێ ب سۆتنە، و ئاڤ یا شلە، بەلێ خودایێ مە ئەوە ئافرێنەرێ یاسایانە، و ئەوە ئافرێنەرێ سروشتێ تشتان، و ئەوە ئافرێنەرێ پەیوەندییێن جهگر، ئەوێن تو هزر دکەی کو د جهگرن، ئەو نە د جهگرن، ژ بەر کو ئەگەر بڤێت خۆجە کەت دێ خۆجە بیت، و ئەگەر بڤێت نە یێ خۆجە بیت دێ گوهۆریت وەکی وی دڤێت، و ئەوە یاسایێن جهی چێ کرین، و یێن دەمی، ئەگەر تو پەرتۆکێن ژیاننامێ پێغەمبەری ﷺ بخوینی، کو پێغەمبەر ﷺ ل مەکەهێ د ئێك شەڤدا ژ مالا خۆ دەرکەفت چۆ قودسێ، ئەڤە ژ سەرپێچییا خودێیە بۆ یاسایێن جهی،

ئەڤە شیانێن خودێ یێن بێ سنور دیار دکەت کو بەروڤاژی یاسایێن جهی و دەمی بیت. قورەیشییان درەو پێ کر، بەلێ دەمێ وان داخواز ژێ کری بۆ وان مزگەفتا ئەقسایێ ل قودسێ سالۆخەت بکەت، پێغەمبەری ﷺ وەسا سالۆخەت کر هەروەکی وی دیتی، بەلێ وان وەسا هزر کر کو بەلکی ئەڤ سالۆخەتێن گۆتین ژ هندەکێن دی زانی بیت.

ئینا قورەیشییان داخواز ژێ کر بەحسێ وان بکەت یێن ب رێکێڤە دیتین، ئینا بەحسێ کاروانەکی کر و ناڤێن خودانێن کاروانی گۆتن، و دەمێ ئەڤ کاروانە هاتییە مەکەهێ و پسیار ژێ کری: کینە خودانێن کاروانی؟ بەرسڤا وان یا وەکهەڤ بوو ب تمامی د گەل بەحسکرنا پێغەمبەری ﷺ. ژ بەر ڤێ چەندێ رویدانا ئیسرا و میعراجێ یا بەلگە کرییە ب نیشانێن رۆن و ئاشکەرا، بەلگێن وێ د دیارن، و ب فەرموودێن دورست و ئاشکەرا، و ئەڤە یا بەرنیاسە ئایین ڤێ پێدڤی دبینیت.

رویدانێن ئیسرا و میعراجێ ژ لایێ زانستیڤە د شیاندایە ل بەر عەقلی، و نە د شیاندایە هەمبەر وان تشتێن مرۆڤ ل سەر هیبوویی، و مرۆڤ هندەك جاران د ناڤبەرا وان تشتێن ل سەر و هیبوویی و عەقلیدا تێکەل دکەن، و ئەوێن خودێ نەنیاسن، و شیانێن وی نەزانن، و نەزانی رامانا گۆتنا خودێ: (كُنْ فَيَكُونُ)، ئانکو هەبە دێ هەبیت، و نەزانن کو دەم و جه ژ چێکرییێن وینە، و چێدبن بهێنە لادان، ئەوان ئەڤ راستییە نەزانی، هندەك جاران ئینکارا رویدانا ئیسرا و میعراجێ دکەن، و هندەك ژ وان دان پێدانێ ب ئیسرایێ دکەن، و ئینکارا میعراجێ دکەن، و هەردو (ئیسرا و میعراج) د جهگرن، چونکی ئەڤ گەردوونە ب هەمیڤە، و ب مەجەرە و هەمی زڤرینێن خۆڤە، و ب عەرد و عەسمانێ خۆڤە یێن ژ نەییێ هاتی، ئەرێ عەقلێ تە دشێت ڤێ کێشێ تێبگەهیت، (كُنْ فَيَكُونُ)، خودێ هەبوو، و چو تشت د گەل وی نەبوون، کی ژ ڤان مەزنترە؟ ئەڤ گەردوونە هەمی ژ نەبوونێ هاتبیتە هەبوونێ، یان پێغەمبەر ﷺ بهێتە ڤەگوهاستن ب شیانا خودێ، نە ب شیانا پێغەمبەری؟ ل ڤێرێ کار (أَسْرَى)یە د زمانێ

عەرەبیدا، و نە (سَرَی)یە، کارێ (أَسْرَی) تێپەرە، زارۆکەکێ بچویکێ لاواز، ئەرێ یا بەر ئاقلە کو بشێت بچیتە سەرێ چیایێن هەمالایا؟! نەبەر ئاقلە، بەلێ ئەگەر بهێتە هەلگرتن، و ببەن، و ب سەر بێخن، ل ڤی دەمی دێ یا بەر ئاقل بیت، و خودایێ مە دبێژیت: (سُبْحَانَ الَّذِي أَسْرَى بِعَبْدِهِ) [الاسراء:١]. پێغەمبەر ب شیانا خودێ هاتە ڤەگوهاستن ژ مەکەهێ بۆ قودسێ، و ل ڤێرێ برە عەسمانی ب شیانا خودێ، ل ڤێرە شیانا خودێ چو تخویب نینە، کو ب هەمی تشتانڤە یا گرێدایە، و ئیسرا و میعراج تشتەکێ بەر عەقلە، و یێ قەبیل نەکرییە هەمبەر وی تشتێ مرۆڤ ل سەر هیبوویی، و مرۆڤان ل سەردەمێ پێغەمبەری ﷺ ئەڤ چەندە نەدزانی و نەداهێنابوو، بەلێ نوکە مرۆڤ شیاینە ژ عەردی بچنە هەیڤێ د سێ رۆژاندا، و لەزاتییا گەشتیگەلا وی چل هزار میل بوو د دەمژمێرەکێدا، و ئەو تشتێ ل سەر دەمێ پێغەمبەری ﷺ یێ مەحال نوکە د شیاندایە و کەڤتییە د دەستێ مرۆڤیدا، و هەمی تشت ل بەر عەقلی د شیاندایە، بەلێ نە د شیاندایە هەمبەر هیبوونی، ئەڤ خالە چێدبیت ژ هش و بیرێن هندەك مرۆڤاندا چۆ بیت، بەلێ مە دڤێت دویڤچۆنەکا کورت بکەین، و ئەو ژی کو هەر چەند عەقلێ مرۆڤی گەشێ بکەت، و هەر چەند هویربینییێ د زانیارییێن ویدا بکەت، دێ بینیت کو گەردوون ب شێوێ خۆ یێ نوکە بێی سەرپێچییا سیستەمێ وی بهێتە کرن ئەو موعجیزەیە، ئەرێ گەردوون نەموعجیزەیە؟

مرۆڤ د مالبچویکێ دایکا خۆدا دبیت، کو ئافراندییەك دورست دبیت مێشکەك هەبیت، و خانە، و دەمار، و لۆلەیێن خوینێ، و دل هەبیت، و کون هەبن، و دەرپۆشك، و کۆئەندامێ هەرسکرنێ، و کورە رژێن، و کۆئەندامێ هەناسێ، و کۆئەندامێ زڤرۆکا خوینێ، و کۆئەندامێ دەرکرنا زێدەیان، ئەڤە هەمی ژ چپکەکا ئاڤێ، و بێی وەستیانا دایکا وی، و بێی نەخشەدانانا بابێ وی، ب راستی ئەڤ زارۆکە ب تنێ موعجیزەیە، بێی سەرپێچییا موعجیزەیان.

هەر چەند مرۆڤایەتی پێش بکەڤیت د زانستێن خۆ یێن گەردوونی دێ موعجیزێن عەقلی هێن و ئاشکەرا بن کو بەری دەم هەستپێکری بوون، ژ بەر ڤێ چەندێ د دەمەکێدا مرۆڤ دکەڤتنە سەر چەنگان د بێ شیانییا خۆدا د بوارێن زانینێدا کو موعجیزە د هەستپێکری بوون، بەلێ دەمێ پێشکەڤتین قورئان هات کو ئەو موعجیزەیە بۆ پێغەمبەری ﷺ، و ئەو موعجیزەکا بەردەوامە، و موعجیزێن هەستپێکری وەکی زلکێ شخارتێنە، گەش دبیت، پاشی دڤەمریت، و دێ بیتە دەنگ و باسەکێ راست بۆ ئەوێن باوەر ژێ دکەن، و دێ بیتە تشتەکێ درەو ژ لایێ کەسێن درەو پێ دکەن، بەلێ موعجیزا قورئانێ ب هاتن و چۆنا رۆژان هەتا دویماهییا زڤرینێیە، و هەر چەند زانست بەرەڤ پێش بچیت لایەکێ ژ لایێن ئیعجازا وێ ئاشکەرا دبیت، و موعجیزەکا عەقلی یا د ناڤ دەستێن مەدا، پێدڤییە ئەڤە بۆ مە دوپات بکەت کو ئەڤ ئایینە یێ راستە، و ئاگر یێ راستە، و ئەوا ل سەر مە ئەوە کو ئەم بزاڤێ بکەین، خودێ دبێژیت: (وَلَقَدْ يَسَّرْنَا الْقُرْآنَ لِلذِّكْرِ فَهَلْ مِنْ مُدَّكِرٍ) [القمر:١٧]، ئانکو: ب سویند مە قورئان بۆ تێگەهشتن و ژ بەرکرن و شیرەت وەرگرتن یا ب ساناهی ئێخستی، ئەرێ ئێك هەیە شیرەت و چامەیان ژێ وەرگریت؟.

# پشکا سێیێ

# رۆژ

١- رۆژێن گەردوونی

٢- دویراتییا د ناڤبەرا هەسارێن کۆمەلا رۆژێدا

٣- رۆژ و عەرد

٤- هزرکرن د دویراتییا د ناڤبەرا مە و رۆژێدا

٥- رۆژا عەردی

٦- سالا رۆژێ و سالا هەیڤێ

# رۆژێن گەردوونی

پسیار ژ سەرۆکێ مەزنترین ئاژانسا عەسمانی هاتە کرن ل سەر (سەدیم)ی کو ئەڤە پێکهاتییەکێ گەلەکێ مەزنە ژ گازا و تۆزا عەسمانی، و دیسا ل سەر وی تەنێ سۆر و هەلبوویی و یا سپی و رەش پسیار پێ کر، وی زانایێ مەزن بەرسڤ دا، کو ژ مەزنترین زانایێن عەردی بوو د زانستێ گەردوونیدا، گۆت: رۆژێن هەلبوویی سێ جۆرن: رۆژێن هەل ب رەنگێ سۆر وەکی رۆژا مە، کو یا د نیڤەکا ژیێ خۆدا، کو پێنجی ملیار سال ل سەر هەلبوونا وانڤە یێن چۆین، و پێنجی ملیار سالێن دی ژ ژیێ وان یێن ماین، کو ئەڤە یێن د نیڤا ژیێ خۆدا.

و هندەك رۆژ یێن هەین پشتی کو د قۆناغا سۆربوونێدا دبۆرن قەبارێ وان گەلەك مەزن دبیت، پاشی تێك دچن و ژ نیشکەکێڤە دهێنە ئێك، قەبارێ وان ئێك ژ سەدێ دمینیت، و ل ڤی دەمی رەنگێ وێ سپی دبیت، و دێ رۆناهییەکا سپی ژێ دەرکەڤیت، بەلێ گەرمییا وێ گەلەك زێدەترە ژ رەنگێ سۆر، و ئەو رۆژا رەنگێ وێ دهێتە گوهۆرین ژ رەنگێ سۆر بۆ رەنگێ سپی گەرماتییا وێ گەلەك توندترە ژ گەرمییا سۆری.

و پشتی ڤێ چەندێ ئەڤ رۆژە دێ د قویناخا سێیێرا چیت، ئەو ژی کەتنەسەرێك و تێکچۆنا وێیە، هەروەکی مترەکا چوارگۆشە یا ئاسنی تێك بچیت و ببیتە قەبارێ گەردیلەکێ، ب چاڤ ناهێتە دیتن، و نە ب میکرۆسکۆپی، و رامانا ڤێ چەندێ ئەوە تیراتییا ڤێ رۆژێ دێ گەلەك بلند بیت، و دێ راکێشانا وێ گەلەکا ب هێز بیت ب پلەیەکێ کو رۆناهی ژێ نەبرسقیت و ژێ نەدەرکەڤیت.

زانا نوکە دبێژنێ (کونێن رەش)، ئەڤانە هێزەکا راکێشانێ یا ب مەترسی یا هەی، و ئەگەر عەرد بکەڤیتە د بازنێ راکێشانا وێدا دێ عەرد هندی قەبارە و کێشا هێکێ لێ هێت.

هزرا عەردی بکە ب هەر پێنج کیشومرێن ویڤە، و دەریایێن رێژا ٧٢% ژ رویبەرێ عەردی پێك دئینن، ئەڤ تەنێ مەزن هەمی ئەگەر کونەکا رەش وێ راکێشیت دێ قەبارێ وێ هندی قەبارێ هێکێ لێ هێت.

ئەڤە ڤویناخا سێیێیە، ژ بەر کو رۆناهی ژێ نابرسقیت، و هێزەکا راکێشانێ یا ب مەترسی یا هەی، و گەرماتییا وێ ناهێتە سالۆخەتکرن.

دێ هەلویستێ مە چ بیت ژ سوننەتێ دەمێ فەرموودەکا پێغەمبەری ﷺ ل سەر مەدا دهێت و ئەڤ راستییە تێدا هاتبیت بەری هزار و چوار سەد سالان؟

پێغەمبەر ﷺ وەکی ترمزی و ئبن ماجەی ژ ئەبو هورەیرە ڤەگوهاستی، دبێژیت: ((أوْقِدَ عَلَى النَّارِ أَلْفَ سَنَةٍ حَتَّى احْمَرَّتْ، ثُمَّ أُحْمِيَ عَلَيْهَا أَلْفَ سَنَةٍ حَتَّى ابْيَضَّتْ، ثُمَّ أُحْمِيَ عَلَيْهَا أَلْفَ سَنَةٍ حَتَّى اسْوَدَّتْ، فَهِيَ سَوْدَاءُ مُظْلِمَةٌ))[1]، ئانکو: هزار سال یێ ب سەر هەلبوونا ئاگریدا بۆرین هەتا سۆر بوویی، پاشی هزار سالێن دی هەتا سپی بوویی، پاشی هزار سالێن دی هەتا رەش بوویی، ئەو یێ رەشێ تارییە وەکی شەڤا تاری.

ئەڤە ژ بەلگەیێن پێغەمبەربوونا پێغەمبەری ﷺ، چاوا زانی کو ئاگر هزار سالان یێ هەلبوو هەتا سۆر بووی؟

---

١. ترمزی (٢٥٩١).

ئیمامێ مەناوی د پەرتۆکا ((فیض القدیر))دا د شرۆڤەکرنا ڤێ فەرمووودێدا دبێژیت: (یا دیار ژمارا هزار سال بۆ گەلەکیییە و مەرەم پێ ئەوە دەمەکێ درێژ)[1]، ئانکو دەمەکێ درێژ ژ بۆ گەلەکی و زێدەیییێ (مبالغ)ێیە.

و ئەڤ عەسمانێن ب مەجەرە و جهێن بلند و ئاسێ (کازار) و ستێر و هەسارە و بورج و کلکدار و رۆژ و هەیڤێن خۆڤە.

و عەرد ب چیا و دەشت و دەریا و رویبار و ماسی و بالندە و گول و کولیلك و گیانەوەر و ئافراندی و شەڤ و رۆژ و چاڤێ رۆژێ و هەیڤا خۆڤە.

و چێکرنا مرۆڤی، و سروشتێ وی، و شێوێ لەشێ وی، و ئەندامێن وی، و هەڤژینا وی، و زارۆکێن وی، هەمی نیشانێن بەلگەنە ل سەر خودێ، ئاماژێ ب وی ددەن، ب ئاخفتنکەرن بۆ تەکووزییا وی، بەرجەستەکرینە بۆ ناڤ و سالۆخەتێن وی، و ئافراندی نیشانە بۆ ئافرێنەری، و چێکری نیشانە بۆ چێکەری، و سیستەم نیشانە بۆ رێکخستنکەری، و رێڤەچۆن نیشانە بۆ رێنیشاندەری، و پێ نیشانە بۆ رێڤەچۆنێ، و ئاڤ نیشانە بۆ رویبار و گەرێن ئاڤێ، ئەڤ عەسمانێ خودان بورج، و عەردێ خودان بەرفرەهی، ئەرێ مانە نیشانن بۆ زانا و شارەزایەکی؟..

سَلِ الوَاحَةَ الخَضرَاءَ وَالمَاءَ جَارِيَا وَهَذِي الصَحَارَى وَالجِبَالَ الرَوَاسِيَا

سَلِ الرَوْضَ مُزدَاناً سَلِ الزَهرَ وَالنَدَى سَلِ اللَيلَ وَالإِصبَاحَ وَالطَيرَ شَادِيَا

وَسَلْ هَذِهِ الأَنسَامَ وَالأَرضَ وَالسَمَا وَسَلْ كُلَّ شَيءٍ تَسمَعَ الحَمْدَ سَارِيَا

★ ★ ★

---

١- فیض القدیر (٣/ ٨٠).

الشَمسُ وَالبَدرُ مِنْ أنوَارِ حِكْمَتِهِ		وَالبَرُ وَالبَحرُ فَيضٌ مِنْ عَطايَاهُ

فالطيرُ سَبَّحَهُ وَ الزَّرع قدَّسَهُ		وَالمَوج كَبَّرَهُ وَالحُوتُ نَاجاهُ

وَالنَّمل تحت الصُخُورِ الصُمّ مَجَّدَهُ		وَالنَحلُ يَهتِفُ حَمْداً في خلاياه

رَبُ السَمَاءِ وَرَبُ الأرضِ قدْ خَضَعَتْ		إنسٌ وَجِنٌ وَ أملاكٌ لِعَلْيَاه

النَاسُ يَعصُونَهُ جَهراً فَيَستُرهُم		وَالعَبْدُ يَنسَى وَرَبِي لَيسَ يَنسَاهُ

د ڤان دێرێن هۆزانێدا ئاماژەکرنەکە بۆ هەمی وان دیاردێن ل عەردی، و زیندەوەرێن وێ، و رۆژ و هەیڤێ، کا چاوا هەمی ژ چێکری و دانێن خودێنە، و د سەر ڤان هەمیانرا مرۆڤ سەرپێچییا فەرمانا خودێ دکەت[1].

---

١ـ وەرگێر.

# دویراتی د ناڤبەرا هەسارێن کۆمەلا رۆژێدا

ژ وان راستییێن ڤەبڕ، کو د گەردوونیدا سەد هزار ملیۆن مەجەرە هەتا نوکە یێن هاتینە زانین، ئەڤ ژمارە دیتنا نوکەیە، مەجەرا مە رێکا کادزا ئێکە ژ ڤان مەجەران، و قەبارێ وێ یێ ناڤنجییە، و سەد هزار ملیۆن ستێر و هەسارە یێن تێدا، و درێژییا وێ سەد و پێنجی هزار سالێن رۆناهییێنە، و بەرفرەهییا وێ بیست و پێنج هزار سالێن رۆناهییێنە، و دویراتییا هەیڤێ ژ مە چرکەکا رۆناهییێیە، و دویراتییا رۆژێ هەشت خۆلەکن، و کۆمەلا رۆژێ دویراتییا وێ سێزدە دەمژمێرن، بەلێ ئەڤ مەجەرا رێکا کادزا درێژییا وێ سەد و پێنجی هزار سالێن رۆناهییێنە، و بەرفرەهییا وێ بیست و پێنج هزار سالێن رۆناهییێنە، ل ڤێرە د سالێدا رۆناهی چەندێ دبریت؟ رۆناهی د ئێك سالدا دەھ ملیۆن ملیۆن کیلۆمەتران دبریت، (١٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠)، ئانکو سێزدە سفر یێن ل بەر.

و نوکە کۆمەلا رۆژێ یا کو ئەم تێدا، درێژییا وێ سێزدە دەمژمێرێن رۆناهییێنە، گەردوونناسێ ئەلمانی (جوهان بوت) دیت کو دویراتییێن د ناڤبەرا هەساراندا د کۆمەلا رۆژێدا دکەڤنە دویڤ ئێکبرنەکا بیرکاری یا سەیر! وی بەرپەرەك بەلاڤکر و ل سەر نڤێسی: (٠)، (٣)، (٦)، (١٢)، (٢٤)، (٤٨)، (٩٦)، (١٩٢)، یا دیارە کو هەر ژمارەك دوجارکی یا ژمارا بەری خۆیە، ژمارە (٠) بۆ هەسارا عەتارد دانا، و بۆ زوهرە (٣)، و بۆ عەردی (٦)، و مەریخێ (١٢)، و ل ڤێرە راوەستییا، پاشی ژمارە (٤) ل سەر ڤان ژمارا هەمییان زێدەکر، پاشی ل سەر (١٠)ێ دابەشکر کو ئەنجامێ وێ دەرکەڤت دویراتییا هەر هەسارەکێ ژ رۆژێ، ئەڤ یاسایە ل سەدێ نۆزدێ دەرکەڤتبوو، ل دۆر ڤێ چەندێ

**دەنگڤەدانەکا مەزن پەیدابوو، ژ بەر دو ژماران، ئەو ژی ژمارە (٢٤) تێدا نەبوو، چو ستێر ل جهێ وێ نینن، و ل جهێ ژمارە (١٩٢) ژی نینن، ئەڤ یاسایە وەسا هاتە هژمارتن کو نەیا دورستە، پاشی ئاشکرا کر د ژمارە (٢٤)دا کۆمەکا هەسارۆکان یێن تێدا هەین، و د جهێ (١٩٢)دا هەسارا ئورانۆس دکەڤتە وێرێ، ڤێ کۆمەلا رۆژێ یاسایەکا گەلەك هویربین یا هەی، هەر ستێرەك رێکخست ب شێوەکێ ل دویڤ ئێکێ ئەندازەیی یان ژمێریاری، و ژمارە (٤) ل سەر زێدەکر، و دابەشی (١٢)ێ کرن، و ئەنجام ئەو بوو دویراتییا هەر هەسارەکێ ژ رۆژێ.**

**ئەڤ گەردوونە مەزناهییا خودێ دیار دکەت، ئەڤ گەردوونە بەرجەستەبوونە (تجسید) بۆ ناڤێن خودێ، خودێ دبێژیت: (قُلِ انْظُرُوا مَاذَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَا تُغْنِي الْآَيَاتُ وَالنُّذُرُ عَنْ قَوْمٍ لَا يُؤْمِنُونَ) [یونس:١٠١]، ئانکو: بێژە: (گەلی گاوران) کا بەرێ خۆ بدەنە عەرد و عەسمانان کا چ تێدا هەیە؟ بەلێ نیشان و ئایەت و ترساندن دێ چ گەهیننە وان ئەوێت باوەرییێ نەئینن.**

# رۆژو عەرد

زار ئەبو دەردائی ﷺ گۆت: پێغەمبەر ﷺ دبێژیت: ((ألا أخبرُكُمْ بخيرِ أعمالِكُمْ، وأزْكَاها عِنْدَ مَلِيكِكُمْ، وأرفعِهَا في دَرَجاتِكُم، وَخيْرٌ لكُمْ مِنْ إنْفَاقِ الذّهبِ والوَرِقِ، وَخيْرٌ لكُمْ مِنْ أنْ تلقَوْا عَدُوَّكُم، فتضرِبُوا أعنَاقهُمْ، وَيَضرِبُوا أعنَاقكُمْ؟ قالوا: بَلَى، قَالَ: ذِكْرُ اللهِ تعالى))[1]، ئانکو: ئەرێ ئەز باشترین کار بۆ هەوە نەبێژم، و پلەیێن هەوە بلند بکەت، پاقژتر بیت ل دەڤ خودایێ وە، و بۆ هەوە چێتر بیت ژ پارە و زێری، چێترە بۆ هەوە کو هوین شەرێ دژمنێن خۆ بکەن و هوین وان بکوژن و ئەو هەوە بکوژن؟ گۆتن: بەلێ، گۆت: زکرێ خودێ.

د ماوێ ڤێ فەرموودا پێغەمبەریدا ﷺ دیار دبیت، کو بیرئینانا زکرێ خودێ سەنگەکا مەزن یا هەی د ژیانا باوەرداریدا، چاوا نە، دێ بینین د قورئانا پیرۆزدا پتر ژ سێ سەد ئایەتان بەحسێ بیرئینانێ یێ کری، ئەڤان ئایەتان یا دوپاتکری کو دڤێت بیرئینان ل دەڤ تە هەبیت د هەمی کاروباراندا و هەمی دەمان، چونکی پەرستنە بۆ دلی و هزرێ و ئەزمانی، دیسا ژ زکرییە کو تو بیرئینانا خودێ بکەی د نیشانێن وی یێن گەردوونی، و قورئانی، و چێکری، تو هزرا وی بکەی د ماوێ ڤەنجییێن وی یێن دیار و ڤەشارتی، و بیرئینانا وی د فەرمان و نەهییێن ویدا، و بیرییا وی بکەی د دلێ خۆدا و زکرێ وی ل سەر ئەزمانێ تە بیت (تەسبیح و حەمد و ئێکتاپەرێسی و تەکبیرا وی)، و ئێکتاپەرێسیا وی ل بیرا تە بیت و دوعایان ب تنێ ژ وی بکەی د هەمی کاروبارێن خۆدا، و هەمی گاڤا، و تو گەلەك هزرا وی بکەی، داکو دلێ تە رەحەت بیت، و خەمێن

---

١ـ ترمزی (٣٣٧٧)، ئبن ماجە (٣٧٩٠)، ئەحمەد (٢١٧٥٠)، و مالك (٤٩٢).

ته بچن، و بێهنا ته فرەھ بیت، و رزقێ ته بەرفرەھ بیت، و دا ب سەر دژمنێ خۆ بکەڤی.

هزرکرن د نیشانێن خودێدا ل عەرد و عەسمانان و هزرکرنا د نەفسێن خۆدا ژ زکرێ خودێیە، و ئەڤ هزرکرنە بۆ هندێیە دا خودێ بنیاسین و ئەم مافێ رێزگرتنێ بدەینێ، خودێ دبێژیت: (إِنَّ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَاخْتِلَافِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ لَآيَاتٍ لِأُولِي الْأَلْبَابِ (١٩٠) الَّذِينَ يَذْكُرُونَ اللَّهَ قِيَامًا وَقُعُودًا وَعَلَى جُنُوبِهِمْ وَيَتَفَكَّرُونَ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَذَا بَاطِلًا سُبْحَانَكَ فَقِنَا عَذَابَ النَّارِ (١٩١) ) [آل عمران].

ژ وان نیشانێن خودێ د عەرد و عەسماناندا دانای راکێشانا لڤینێیە، د ناڤبەرا هەساران و ستێراندا، خودێ دبێژیت: (اللَّهُ الَّذِي رَفَعَ السَّمَاوَاتِ بِغَيْرِ عَمَدٍ تَرَوْنَهَا) [الرعد:٢].

و پەیڤا (تَرَوْنَهَا) ئاماژە ب هندێ ددەت کو خودێ عەسمان یێن بلندکرین ب ستوینەکێ ئەم نابینین ئەو ژی هێزا راکێشانێیە یا کو گەردوونی هەمییێ رێك دئێخیت، ژ گەردیلەی بگرە هەتا دگەهیتە مەجەرێ.

بۆ نموونە چاڤێ رۆژێ عەردی ب هێزەکا مەزن رادکێشیت، ژ بەر کو دا عەرد د رێرەوەکێ گرتیدا ل دۆر رۆژێ بزڤریت، ئەگەر راکێشانا رۆژێ بۆ عەردی نەما، دێ عەرد ژ رێرەوێ خۆ ل دۆر رۆژێ دەرکەڤیت و دێ بەرەف جهەکێ نەدیارڤە چیت، کو تاریاتی و قەرسینە، و ژیان ژی ل سەر نامینیت، دێ پلا گەرماتییا وێ گەهیتە دو سەد و حەفتێ پلان د بن سفرێدا، د ڤێ پلێدا گەردیلا لڤین نامینن، خودێ دبێژیت: (يُمْسِكُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ أَنْ تَزُولَا) [فاطر:٤١].

و ژ بەر کو دا بزانین هێزا راکێشانا رۆژێ بۆ عەردی دێ وەسا دانین کو ئەڤ هێزە نەما ژ بەر هەر ئەگەرەکێ، و ژ بەر کو دا عەرد بمینیت گرێدای ب رۆژێڤە د رێرەوەکێدا دچیت ل دۆر وێ، دڤێت عەرد یێ گرێدایی بیت ب ستوینێن بەرچاڤ ژ پیلای، و پیلا

موکومترینێ کانزایانه، و ژ هەمیان پتر یێ خۆ راگرتییه بۆ هێزا شدیانێ، ژ بەر کو تێلا پیلای یا تیرا وێ مللیمترەك سەد کیلۆ گرامان رادگریت، ل ڤێره ئەم پێدڤی ملیۆن ملیۆن وەریسێن پیلایینه، درێژییا هەر وەریسەکی سەد و پێنجی و شەش ملیۆن کیلۆمتر بن، و تیرا هەر وەریسەکی پێنج متر بن، و وەریسەك ژ ڤان وەریسان پتر ژ دو ملیۆن تەنان هێزا شدیانێ راگریت، ئەرێ هێزا راکێشانا رۆژێ بۆ عەردی چەندە؟ ئەو ژی دو ملیۆن تەن لێکدانی ملیۆن ملیۆنه، پاشی ئەگەر ئەم ڤان وەریسێن پیلایی د رویێ عەردیڕا بکەین هەمبەری رۆژێ دێ ژ نیشکەکێڤه بینین ئەم یێ ل بەرامبەر دارستانەکا مەزن ژ وەریسێن پیلایی، چونکی دێ دویراتیا د ناڤبەرا دو وەریسان کێمتر بیت ژ تیرا وەریسێ سێیێ، ئەڤ دارستانه ژ وەریسێن پیلایی دێ تیشکا رۆژێ ل مه گریت، ئانکو تیشکا وێ ناگەهیته مه، و دێ رێگرییێ ل هەر بزاڤەك و ئاڤاکرن و چالاکییەکێ کەت، ئەڤ هەمی هێزا مەزن ژ بەر کو دا عەردی ژ رێرەوێ وێ بگوهۆرن ل دۆر رۆژێ ب سێ مللیمتران د هەر چرکەکێدا، خودایێ مەزن راست یا گۆتی دەمێ دبێژیت: (اللَّهُ الَّذِي رَفَعَ السَّمَاوَاتِ بِغَيْرِ عَمَدٍ تَرَوْنَهَا).

و ژ راستییێن جهگر ئەوه کو عەرد ل دۆر رۆژێ درێرەوەکێ شێوێ هێکێ دزڤریت، و ڤی رێرەوی دو تیرێن هەین؛ بچویکتر و مەزنتر، و یاسایا راکێشانێ کۆنترۆلا پەیوەندییا د ناڤبەرا عەردی و رۆژێدا دکەت، ژ بەر کو تەنێ مەزنتر تەنێ بچویکتر راکێشیت، و هەر چەند تەنه مەزنتر بیت راکێشانا وێ ب هێزتره، و دەمێ دویرکەفتن هەبیت د دویراتییا د ناڤبەرا دو تەناندا هێزا راکێشانێ لاواز دبیت، و عەرد د رێرەوێ خۆدا ل دۆر رۆژێ ب لەزاتییا (٣٠) کم د چرکەکێدا دچیت، دەمێ عەرد نێزیکی تیرا بچویکتر بوو دێ نێزیکی رۆژێ بیت، و ل ڤی دەمی هێزا راکێشانێ دێ زێده بیت بۆ عەردی، چێدبیت بۆ رۆژێ بهێته راکێشان، و ل ڤی دەمی دێ عەرد بیته هەلم د ماوەکێ گەلەك کێمدا، چونکی گەرمییا سەربانێ رۆژێ شەش هزار پلەیه، و د مەلبەندێ وێدا بیست ملیۆن پلەیه، و ناڤخۆیا رۆژێ تێرا ملیۆنەك و سێ سەد هزار عەردان هەیه، و ژ بەر کو

دا عەرد نەئێتە راکێشان بۆ رۆژێ، و ژیان ب دویماهیك نەهێت عەرد لەزاتییا خۆ زێدە دکەت دا ژ ڤێ زێدەبوونا لەزاتییێ هێزەکا نوی دورست ببیت هەمبەری وێ هێزا راکێشانێ ئەوا دورست بووی ژ نێزیکبوونا عەردی بۆ رۆژێ، و دەمێ دگەهیتە تیرا مەزنتر هێزا راکێشانا رۆژێ بۆ عەردی لاواز دبیت، چێدبیت عەرد ڤەرەسیت یان بهێتە بەردان ژ راکێشانا رۆژێ، و د عەسمانێ گەردوونیدا بەرزە ببیت، و بقەرسیت، و ژیان ل سەر ب دویماهی بهێت، ژ بەر ڤێ چەندێ لەزاتییا عەردی سست دبیت هەتا هێزەکا کێم لاواز دبیت و دا د گەل وێ لاوازیا راکێشانێ بگونجیت ئەوا ژ دویراتییا عەردی ژ رۆژێ دورست بووی، و ئەگەر لەزاتییا عەردی یا ب لەز بوو یان یا ژ نیشکەکێڤە بوو دێ هەمی تشتێن ل سەر هەرفن و پویچ بن، و ئەگەر سستبوون یا ب لەز بیت یان ژ نیشکەکێڤە بیت دیسا هەمی تشت دێ پویچ بن، ژ بەر ڤێ چەندێ لەزاتی یا سستە (هێدی)، و سستبوون یا هێدییە، ب جهێنانەکە بۆ ناڤێ (اللطیف) ژ ناڤێت خودێیە، ئانکو یێ هویربین، خودێ دبێژیت: (إِنَّ اللَّهَ يُمْسِكُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ أَنْ تَزُولَا) [فاطر:٤١].

# هزرکرن د دویراتییا د ناڤبەرا مە و رۆژێدا

خودایێ مە دبێژیت: (قُلِ انْظُرُوا مَاذَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَا تُغْنِي الْآيَاتُ وَالنُّذُرُ عَنْ قَوْمٍ لَا يُؤْمِنُونَ) [یونس:١٠١]، و خودێ دبێژیت: (وَكَأَيِّنْ مِنْ آيَةٍ فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ يَمُرُّونَ عَلَيْهَا وَهُمْ عَنْهَا مُعْرِضُونَ) [یوسف:١٠٥]، ئانکو: چەند گەلەکن ئایەتێت خودێ د عەرد و عەسماناندا ئەوێت ئەو د بەرڕا دبۆرن و ڕوییێ خۆ ژێ وەردگێڕن.

زانا دبێژن: ((رۆژ ملیۆنەك و سێ سەد هزار جاران ژ عەردی مەزنترە، و ئەو ئەزمانێ گوڕییێ یێ ژێ دەردکەڤیت درێژییا وی پترە ژ ملیۆن کیلۆمەتران، و ئەگەر عەرد بکەڤیتە د ناڤ رۆژێدا دێ د ماوێ چرکەکێدا حەلبیت))، هندەك زانا دبێژن: ژییێ رۆژێ ژ پێنج هزار ملیۆن سالان پترە، و د ناڤبەرا رۆژێ و عەردیدا سەد و شێست و پێنج ملیۆن کیلۆمەترن، و د بورجێ دویپشکیدا ستێرەکا گەش یا هەی کو مرۆڤ ل عەردی وێ دبینیت، ناڤێ وێ (دلێ دویپشك)ییە، ئەڤ ستێرا گەش دکەڤیتە د ناڤەندا بورجێ دویپشکیدا، و گەلەك یا گەشە، ئەڤ ستێرە هندی رۆژێ و عەردییە و د گەل دویراتییا د ناڤبەرا واندا، (قُلِ انْظُرُوا مَاذَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَا تُغْنِي الْآيَاتُ وَالنُّذُرُ عَنْ قَوْمٍ لَا يُؤْمِنُونَ)، و خودێ دبێژیت: (وَكَأَيِّنْ مِنْ آيَةٍ فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ يَمُرُّونَ عَلَيْهَا وَهُمْ عَنْهَا مُعْرِضُونَ)، و خودێ دبێژیت: (فَلَا أُقْسِمُ بِمَوَاقِعِ النُّجُومِ (٧٥) وَإِنَّهُ لَقَسَمٌ لَوْ تَعْلَمُونَ عَظِيمٌ (٧٦)) [الواقعة].

د ناڤبەرا مە و هەیڤێدا نێزیکی ئێك چرکا رۆناهییێیە، ئانکو هەیڤ چرکەکا رۆناهییێ یا ژ مە دویرە، و د چرکەکێدا رۆناهی سێ سەد و شێست هزار کیلۆمەتران دبریت، و د

ناڤبەرا مە و رۆژێدا هەشت خۆلەكێن رۆناهییێنە، ئانكو رۆناهییا رۆژێ ب هەشت خۆلەكان دگەهیتە عەردی.

و د ناڤبەرا مە و دویرترین ستێر د كۆمەلا رۆژێدا سێزدە دەمژمێرێن رۆناهییێنە.

و نێزیكترین ستێر بۆ عەردی كو نە ژ كۆمەلا رۆژێیە، ئەو ژی ستێرا جەمسەرییە (نجم القطب)، كو چار هزار سالێن رۆناهییێ یا ژ مە دویرە، و هەیڤ چركەكێ.

و د ناڤبەرا عەردی و دویرترین ستێر د مەجەرا (رێكا كادزان)دا سەد و پێنجی هزار سالێن رۆناهییێنە، و هندەك مەجەرە هەژدە هزار ملیۆن سالێن رۆناهییێ ژ مە دویرن، خودێ دبێژیت: (فَلَا أُقْسِمُ بِمَوَاقِعِ النُّجُومِ)، خودایێ پر زانا و شارەزا دبێژیت: (وَإِنَّهُ لَقَسَمٌ لَوْ تَعْلَمُونَ عَظِيمٌ).

وعن ابن عباس «أنهُ باتَ عِندَ نَبيِّ اللهِ (صلى الله عليه وسلم) ذاتَ ليْلَةٍ، فقامَ نَبيُّ اللهِ (صلى الله عليه وسلم) مِنْ آخِرِالليلِ، فخَرَجَ، فنَظَرَ إلى السَمَاءِ، ثمَّ تلا هذهِ الآيَةَ فِي آلِ عِمْران: (إنَّ فِي خَلْقِ السَمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَاخْتِلَافِ اللَيْلِ وَالنَّهَارِ)، حَتَى بَلَغَ: (فَقِنَا عَذَابَ النَّارِ)، ثمَّ رَجَعَ إِلى البَيتِ، فتسَوَكَ، وَتوَضَأ، ثمَّ قامَ فصَلَى، ثمَّ اضطَجَعَ، ثمَّ قامَ، فخَرَجَ، فنَظَرَ إلى السَماءِ، فتَلا هذهِ الآيةَ، ثمَّ رَجَعَ، فتَسَوَكَ، فتوَضَأ، ثمَّ قامَ فصَلَى»[1]، ئانكو: ژ زار ئیبن عەباس ((كو ئەو شەڤەكێ ما ل دەڤ پێغەمبەری ﷺ، ئینا پێغەمبەر ل دویماهییا شەڤێ رابوو، و دەركەفت، و بەرێ خۆ دا عەسمانی، پاشی ئەڤ ئایەتا د سۆرەتا (ال عمران)دا خواند: (إِنَّ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَاخْتِلَافِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ)، هەتا گەهشتییە: (فَقِنَا عَذَابَ النَّارِ)، پاشی زڤری مال، و سیواك د دەڤێ خۆ وەردا، و دەستنڤێژا خۆ شویشت، پاشی رابوو نڤێژ كر، پاشی رازا، پاشی رابوو، و دەركەفت، و

---

١. موسلمی یا ڤەگێری (٢٥٦).

بەرێ خۆ دا عەسمانی، و ئەو ئایەت خواندەڤە، پاشی زڤری، و دەستنڤێژا خۆ شویشت، پاشی رابوو نڤێژ کر).

و حەسەن دبێژیت: (تفکرُ ساعَةٍ خَیْرٌ مِنْ عِبادَةِ سِتِینَ عاماً)[1] ئانکو: هزرکرنا دەمژمێرەکێ چێترە ژ پەرستنا شێست سالان، ((ولا عِبادَةَ کَالتفکُّرِ))[2]، خودێ دبێژیت: (وَمَا قَدَرُوا اللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِ وَالْأَرْضُ جَمِيعًا قَبْضَتُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَالسَّماوَاتُ مَطْوِيَّاتٌ بِيَمِينِهِ) [الزمر:٦٧]، ئانکو: وان (ئەوێت هەڤپشکان بۆ خودێ چێ دکەن) ب دورستی و رەنگێ پێدڤی، رێز ل خودێ نەگرتییە (و وەك پێدڤی نەنیاسییە و مەزن نەدانایە)، و عەرد هەمی رۆژا قیامەتێ د دەستێ ویدایە، و عەسمان ژی د دەستێ وی یێ راستێدا د پێچاییینە.

١. ئبن ئەبی شەیبە یا د (المصنف عن الحسن موقوفا)دا دەرئێخستی (٣٥٢٢٣)، و بەیهەقی د (الشعب عن أبي الدرداء)دا ١١٨.

٢. مسند الشهاب عن أبي علي مرفوعا (٨٣٨).

# رۆژا عەردی

خودایێ مەزن دبێژیت: (قُتِلَ الْإِنْسَانُ مَا أَكْفَرَهُ (١٧) مِنْ أَيِّ شَيْءٍ خَلَقَهُ (١٨) مِنْ نُطْفَةٍ خَلَقَهُ فَقَدَّرَهُ (١٩) ثُمَّ السَّبِيلَ يَسَّرَهُ (٢٠) ثُمَّ أَمَاتَهُ فَأَقْبَرَهُ (٢١) ثُمَّ إِذَا شَاءَ أَنْشَرَهُ (٢٢) كَلَّا لَمَّا يَقْضِ مَا أَمَرَهُ (٢٣) فَلْيَنْظُرِ الْإِنْسَانُ إِلَى طَعَامِهِ (٢٤) أَنَّا صَبَبْنَا الْمَاءَ صَبًّا (٢٥) ثُمَّ شَقَقْنَا الْأَرْضَ شَقًّا (٢٦) فَأَنْبَتْنَا فِيهَا حَبًّا (٢٧) وَعِنَبًا وَقَضْبًا (٢٨) وَزَيْتُونًا وَنَخْلًا (٢٩) وَحَدَائِقَ غُلْبًا (٣٠) وَفَاكِهَةً وَأَبًّا (٣١) مَتَاعًا لَكُمْ وَلِأَنْعَامِكُمْ (٣٢)) [عبس]، ئانكو: وەی بۆ مرۆڤی، چەندێ بێ نان و خوێیە و چەند یێ ژ رێ دەرکەڤتییە. خودێ ژ چ چێکرییە (بیرا وی دئینیتە بنەتارێ وی، دا خۆ مەزن نەکەت و ب خۆ نەخرپێت، و خۆ ل سەر سەرێ بەنییێن خودێ مەزن نەکەت. ژ چپکەکێ، بێ کێماسی و نەو یێ تەکووز چێکری. پاشی رێکا بوونێ بۆ ب ساناهی ئێخستی (و ژیان بۆ ساناهی کر و هەردو رێك بۆ ئاشکەراکرن، رێکا باشی و باوەرییێ و رێکا خرابی و گاورییێ، کا وی کیژ بڤێت بلا بۆ خۆ وێ بگریت. پاشی دەمێ خودێ ڤیا، دێ زیندی کەتەڤە. نەخێر د سەر ڤێ هەمییێرا، تشتێ خودێ ژێ ڤیایی نەکر. بلا مرۆڤ بەرێ خۆ بدەتە خوارن و ڤەخوارنا خۆ (و هویرك هزرا خۆ تێدا بکەت، کا چاوا دبیتە خوارن و دئێتە بەر دەستێ وی. مە ئاڤ ژ عەوران دارێت. و مە دان و دەرامەت ژێ دەرئێخست (وەکی دەخلی و جەهی و برنجی، کو خوارنا سەرەکینە بۆ مرۆڤی). هەروەسا تری و زەرزەوات ژێ. و زەیتوون و دارقەسپ ژێ. و جنیك و بیستانێت تێکرا ژێ. و فێقی و چەرە ژێ. سوود و مفا بۆ هەوە و تەرش و دەوارێت هەوە.

و خودێ دبێژیت: (قُلِ انْظُرُوا مَاذَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ) [یونس:١٠١].

رۆژ نیشانەكا رۆهن و دیارە ژ نیشانێن خودێ وەكی رۆهنییا وێ، و ستێرەكا قەبارە نافنجییە ئەگەر بەراورد بكەین د گەل ستێرێن دی، و د گەل هندێ قەبارێ وێ ملیۆنەك و سێ سەد جاران ژ عەردی مەزنترە، و سەد و پێنجی و شەش ملیۆن كیلۆمتران یا ژێ دویرە، و رۆژ ڤێ دویراتییێ ب هەشت خۆلەكان دبریت، و هندەك ستێرێن هەین قەبارێ ئێك ژ وان پتر ژ قەبارێن رۆژێ و عەردی و د گەل دویراتییا د نافبەرا واندا.

و گەرماتییا رۆژێ د نافەندا وێدا دگەهیتە بیست ملیۆن پلەیان، و ئەگەر عەرد بكەڤیتە د ناڤ رۆژێدا دێ د ماوەكێ كورتدا حەلبیت و بیتە هەلم، و درێژاهییا وێ گوڕییا ژ بانێ وێ دەردكەڤیت پتر ژ نیڤ ملیۆن هتا ملیۆن كیلۆمتران، و د هەر چركەكێدا وزێ بەرهەم دئینیت، كو هەمبەر سۆتنا دو ملیار تونێن رەژوییا بەرییە د چركەكێدا، و چاڤێ رۆژێ رۆژانە سێ سەد و شێست هزار ملیۆن تەننان تەنا خۆ ژ دەست ددەت، زانایێن گەردوونی وەسا هزر دكەن كو پتر ژ پێنج هزار ملیۆن سال یێن ل سەر ژیێ ـ هەلبوونا وێ ـ وێ بۆرین، ئەو مرۆڤان پشت راست دكەن كو رۆژ پشتی پێنج هزار ملیۆن سالێن دی نافەمریت، و ئەگەر ژ نیشكەكێڤە رۆژ ڤەمری دێ عەرد كەڤیتە د تاریاتییێدا، و دێ پلێن گەرماتییێ هێنە خوارێ و دێ بنە سێ سەد و پێنجی پلە د بن سفرێدا، و دێ عەرد بیتە گۆرستانەكا ڤەرسی یا مەزن، و نەبوونا گەرماتی و رۆناهییێ تێرا هندێ هەیە هەمی دیاردا ژ دیاردێن ژیانێ بكوژن ل سەر عەردی.

و پرسیار بكە كێ ئەو وەك ئاگرەك بلندكری، و كێ وەك منارەیەكێ چكلاندی، و كێ وەكی دەمژمێرێ ل هەوای هەلاویستی، میلێ وێ هەتا رۆژا قیامەتێ دێ كاركەت، و كێ ب رێڤەچۆن دایێ، و رێكێن وێ نیشادانە، و بورجێن وێ بۆ دیاركرن و رۆناهییا وێ ڤەگوهاستە عەسمانێ دنیایێ؟

ئەوە دەم پێ دئێتە زانین، و کێ چەق و تا و بنەما و وەرز ژێ برن، ئەگەر ئەو نەبا رۆژێن وی نەدگونجیان و هەیڤ و سالێن وی ژی نەدهاتنە رێکخستن، و رۆناهی و تاریاتییا وی ژی نەدکەفتنە دویڤ ئێك، تشتێ رەسەن یێ ژ گلکەنێن (مناجم) وێ دەرکەتین، و تیرۆژك ژێ دەردکەڤن، چەرخ و دەورانان خۆ ل بەر نەگرت، و کەڤناتییا وێ چو ژ جوانییا وێ کێم ناکەت.

خودێ دبێژیت: (وَمِنْ آيَاتِهِ اللَّيْلُ وَالنَّهَارُ وَالشَّمْسُ وَالْقَمَرُ لَا تَسْجُدُوا لِلشَّمْسِ وَلَا لِلْقَمَرِ وَاسْجُدُوا لِلَّهِ الَّذِي خَلَقَهُنَّ إِنْ كُنْتُمْ إِيَّاهُ تَعْبُدُونَ) [فصلت:٣٧]، ئانکو: ژ نیشانێت مەزناتی و شیانا خودێ شەڤ و رۆژ، و رۆژ و هەیڤن، سوجدەیێ نە بۆ رۆژێ ببەن و نە بۆ هەیڤێ، و سوجدەیێ بۆ وی خودایی ببەن یێ ئەو دایین و ئەو چێکرین، ئەگەر هوین راست وی ب تنێ دپەرێسن، و خودێ دبێژیت: (وَسَخَّرَ لَكُمُ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ دَائِبَيْنِ) [ابراهيم:٣٣]، و خودێ دبێژت: (وَالشَّمْسُ تَجْرِي لِمُسْتَقَرٍّ لَهَا ذَلِكَ تَقْدِيرُ الْعَزِيزِ الْعَلِيمِ) [يس:٣٨].

# سالا رۆژێ و سالا هەیڤێ

ژ ئیعجازا زانستی یا قورئانێ سالا رۆژێ دبێژنێ سالا قولپینێ کو ئەو ماوەیە د ناڤبەرا دو چۆنێن ل دویف ئێك یێن رۆژێ د خالەکا نافنجیدا، و درێژییا ڤێ سالێ سێ سەد و شێست و پێنج رۆژن، و پشتی ناڤبرێ هزار و چار سەد و بیست و دو (١٤٢٢، ٣٦٥رۆژ)، ئەڤە سالا رۆژێیە ب هویراتی، و د گەل چۆنا وێ هاڤین و پاییز و زڤستان و بهار روی ددەن، و سالا هەیڤێ سێ سەد و پێنجی و چار رۆژن، و پشتی ناڤبرێ سیە و شەش هزار و حەفت سەد و هەشتێ (٣٦٧٨٠، ٣٥٤رۆژ)، ئەو ماوەیە د ناڤبەرا دو غەیرینێن ل دویف ئێکێن دابەشکری ل سەر هژمارا لڤینێن هەیڤێ یێن بازنەیی، و جوداهی د ناڤبەرا سالا رۆژێ و سالا هەیڤێدا دەه رۆژن، و پشتی ناڤبرێ هەشت سەد و حەفتێ و پێنج هزار (٨٧٥٠٠٠، ١٠ رۆژ)، ب ڤێ چەندێ هەر سیە و سێ سالێن رۆژێ، سێ سەد و پێنجی و هەشت رۆژ پترن ژ یێن هەیڤێ، یان نێزیکی سالەکێ، و ل سەر ڤێ چەندێ هەر سەد سالێن رۆژێ بەرامبەری سێ سەد و سێ سالێن هەیڤێنە، و سێ سەد سالێن رۆژێ دێ بنە سێ سەد و نەهـ سالێن هەیڤێ و پشتی ناڤبرێ شەش (٣٠٠ س، ر = ٦، ٣٠٩ س، هـ)، ئەڤە ل دویف ژمێرییا هویربین یا گەردووناسان، و ئەڤە راستییەکا گەردوونی یا نەلڤە، کو زانستێ نوی ئەڤ چەندە یا پشتراستکری، و ل سەر جهگر بووینە، و قورئانا پیرۆز بەری وان یا دیارکری د چیرۆکا هەڤالێن شکەفتێدا، خودێ دبێژیت: (وَلَبِثُوا فِي كَهْفِهِمْ ثَلَاثَ مِئَةٍ سِنِينَ) [الكهف:٢٥]، ئانکو: (ئەو سێ سەد سالان (نڤستی) د شکەفتا خۆدا مان)، ئەڤە سالێن رۆژێ، (وَازْدَادُوا تِسْعًا)، ئانکو: نەهـ سالێت دی لێ زێدەکرن. ئەڤە سالێن هەیڤێنە کو تشتەکێ گەلەکێ هویربینە، و ب

ژمێریارییێن هویربین د دویرگەهێن پێشکەفتیدا، ب ژمێریارییێن گەردوونناسی یێن گەلەگ هویربین ب شەش ژماران پشتی ناڤبرێ، و پشتی هژمارییەکا هویربین هەر سێ سەد سالێن رۆژێ یەکسانی سێ سەد و نەهـ سالێن هەیڤێنە.

(ابن کثیر) د تەفسیرا خۆدا دبێژیت بۆ گۆتنا خودێ: ﴿وَلَبِثُوا فِي كَهْفِهِمْ ثَلَاثَ مِئَةٍ سِنِينَ﴾: ((ئەڤە دەنگ و باسەکە ژ لایێ خودێڤە بۆ پێغەمبەرێ خۆ ﷺ ب وی ماوێ هەڤالێن شکەفتێ د شکەفتێدا بۆراندی ژ دەستپێکا نڤستنا وان هەتا خودێ ئەو راکرینەڤە، و خەلکێ وی دەمی ب سەر هەلبووین، کو بۆ ماوێ سێ سەد سال و نەهـ سالێن زێدە ل دویف سالناما هەیڤێ ـ کو دبنە سێ سەد سالێن رۆژێ، و جوداهی د ناڤبەرا هەر سێ سەد سالێن رۆژێ بۆ یێن هەیڤێ نەهـ سالن، ژ بەر هندێ پشتی سێ سەدێ یا گۆتی: ﴿وَازْدَادُوا تِسْعًا﴾[1].

و د تەفسیرا (الجلالین)دا: ((گۆتنا خودێ: ﴿وَازْدَادُوا تِسْعًا﴾، ئانکو نەهـ سال، هەر سێ سەد سالێن رۆژێ دبنە سێ سەد و نەهـ سالێن هەیڤێ))[2].

و خودایێ مەزن راست یا گۆتی، دەمێ دبێژیت: ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَذِكْرَىٰ لِمَن كَانَ لَهُ قَلْبٌ أَوْ أَلْقَى السَّمْعَ وَهُوَ شَهِيدٌ﴾ [ق:٣٧]، ئانکو: ب ڕاستی ئەڤە (د هیلاکبرنا گوندێت ستەمکار) چامە و دەرسن، بۆ وی یێ خودان عەقل، یان بۆ وی یێ گوهدارییێ دکەت و هشێت وی د سەرێ وی.

---

١ـ تەفسیرا (ابن کثیر): (٨٠/٢).

٢ـ تەفسیرا ئەلجەلالەین: (٣٨٤/١).

# پشکا چارێ

## عەرد

١- هەیڤ غەیرین و رۆژ غەیرین

٢- پەستانا هەوای و شوینوارێن وێ

٣- بازنییا عەردی و پەیڤا ( عْمیق )

٤- (أَلَمْ نَجْعَلِ الْأَرْضَ كِفَاتًا)

٥- خۆجهبوونا عەردی

٦- (الذي جَعَلَ لَكُمُ الْأَرْضَ مَهْدًا)

٧- لەزاتییا عەردی

٨- ژ ئیعجازا زمانی د قورئانێدا (في أَدْنَى الأَرْضِ)

٩- چیا

١٠- کانزایێ زیڤی

١١- (وَأَنْزَلْنَا الْحَديد)

١٢- ئاخ و ئەو بوونەوەرێن تێدا

١٣- تصريف الرياح

١٤- پيسبوونا هەواى و ژينگەهێ

١٥- ياساييێن فيزيايى و كيميايى

١٦- بيڤەلەرزێن دنيايێ و بيڤەلەرزا قيامەتێ

١٧- بيڤەلەرزا قاهيرە

١٨- كەعبە مەلبەندێ هەردو جيهانێن كەڤن و نوييە

١٩- عەردێ عەرەبان وەسا بوو و دێ زڤريتەڤە كەسكاتى و روويبار

# هەیڤ غەیرین و رۆژ غەیرین

دەمێ ئیبراهیمێ کورێ پێغەمبەری ﷺ مری، پێغەمبەری هەلویستەکێ بابینییێ وەرگرت وەك بابەکێ دلۆڤان، و باوەری ب (قەزا و قەدەرا خودێ هەیی) و پێ بهێن فرەه بوو بۆ حوکمێ خودێ، و پێ رازی ب حەزکرنا وی، و زار ئەنەسی رضي الله عنه گۆت: ((دَخَلْنا مَعَ رسولِ اللهِ (صلى الله عليه وسلم) على أبي سَيْفِ القَيْنِ وَكانَ ظِئْراً[1] لإبراهيمَ عليه السلام، فأخَذَ رسولُ اللهِ (صلى الله عليه وسلم) إبراهيمَ فقَبَّلَهُ، وَشَمَّهُ، ثمَّ دَخَلْنا عَلَيْهِ بَعْدَ ذلِكَ، وَإبراهيمُ يَجودُ بِنَفْسِه، فجَعَلَتْ عَيْنا رَسولِ اللهِ (صلى الله عليه وسلم) تَذْرِفانِ، فقالَ لهُ عبد الرَّحمن بْنُ عَوْفٍ رضي اللهُ عنهُ: وَأنْتَ يا رَسولَ اللهِ، فقالَ: ((يا ابْنَ عَوْفٍ إنَّها رَحْمَةٌ))، ثمَّ أتبَعَها بأخْرى ـ فقالَ: ((إنَّ العَيْنَ تَدْمَعُ، وَالقَلْبَ يَحْزَنُ، وَلا نَقولُ إلاَّ ما يُرْضي رَبَّنا، وَإنَّا بِفِراقِكَ يا إبراهيمُ لَمَحْزونونَ))[2]، ئانکو: ئەم د گەل پێغەمبەری ﷺ چۆینە دەڤ (أبي سيف القين) و ئەو هەڤژینێ داییا ئیبراهیمی بوو، پێغەمبەری ﷺ ئیبراهیم گرت و ماچکرێ، و بێنکرێ، پاشی ئەم چۆینە دەڤ، و ئیبراهیم پێ بزاڤا دکەت، ئینا چاڤێن پێغەمبەری ﷺ تژی رۆندك بوون، (عبد الرحمن بن عوف) خودێ ژێ رازی بیت گۆتێ: تو ژی ئەی پێغەمبەرێ خودێ، گۆت: ((ئەی کورێ عەوفی ئەڤە دلۆڤانییە))، و هێژ رۆندك بارین، ئینا گۆت: ((ب راستی چاڤ ب رۆندك دکەڤن، و دل ب

---

١. [د گۆتنا (ظِئْراً)دا، ئانکو دایین، و ئەڤ ناڤە دانا سەر چونکی هەڤژینێ داییێ بوو، و پەیڤا (ظِئْر) ژ شیردانا حێشترێ یا هاتی دەمێ دلۆڤانییێ ب تێژکێ غەیری خۆ دبەت، و ئەڤە دهێتە گۆتن بۆ وێ ژنا شیرێ خۆ ددەتە زارۆکەکێ دی، و ئەڤێ پەیڤێ (ظِئْر) دبێژنە هەڤژینێ وێ ژنێ چونکی ئەو بارابتر پشکدارییێ د پەروەردەکرنا وی زارۆکیدا دکەت]. (فتح الباري ٢/١٧٣).

٢. بوخاری (١٢٤١)، و موسلم (٢٣١٥).

خەم دکەڤیت، و ئەو چو نابێژین ئەو نەبیت یا خودایێ مە پێ رازی، و ئەم بۆ جودابوونا تە ب خەمین)).

و ئەو رۆژا ئیبراهیم مری رۆژ ژی غەیری، سەحابییێن پێغەمبەری هزر کر رۆژ یا ژ بەر مرنا ئیبراهیمی غەیری، ئینا پێغەمبەر ﷺ رابوو ئاخفت و ئەو هەلگرێ وەحیا عەسمانی بوو، وی رەت کر کو راستییێن زانستی د گەل هەستێن موسلمانان تێکەل ببن، ژ زار ئەبی بەکری گۆت: پێغەمبەری ﷺ گۆت: «إنَّ الشمسَ والقمرَ آيتانِ مِن آياتِ اللهِ، لا ينكَسِفانِ لمَوتِ أحدٍ، وَلا لحَياتِه، وَلكِنَّ اللهَ تعالى يُخَوِّفُ بها عِبادَهُ»[1]، ئانکو: رۆژ و هەیڤ دو نیشانن ژ نیشانێن خودێ، ب مرن و ژیانا چو کەسان ناغەیرن، بەلێ خودێ بەندەییێن خۆ پێ دترسینیت.

هەیڤ غەیرین: ئەوە بەرزەبوونا هەیڤێ یان پشکەکا وێ، دەمێ عەرد د ماوێ چۆنا خۆدا دکەڤیتە د ناڤبەرا هەیڤێ و رۆژێدا.

و رۆژ غەیرین: بەرزەبوونا رۆژێ یان پشکەکا وێ، دەمێ هەیف د ماوێ چۆنا خۆدا د کەڤیتە د ناڤبەرا رۆژێ و عەردیدا.

و رۆژ غەیرین و هەیف غەیرین دو ئاماژەنە بۆ نیعمەتا رۆژێ و هەیڤێ، و رۆژ و هەیف دو نیشانێن بەلگەنە ل سەر مەزناهییا خودێ و دلۆڤانییا وی، خودێ دبێژیت: ﴿وَمِنْ آيَاتِهِ اللَّيْلُ وَالنَّهَارُ وَالشَّمْسُ وَالْقَمَرُ لَا تَسْجُدُوا لِلشَّمْسِ وَلَا لِلْقَمَرِ وَاسْجُدُوا لِلَّهِ الَّذِي خَلَقَهُنَّ إِنْ كُنْتُمْ إِيَّاهُ تَعْبُدُونَ﴾ [فصلت:٣٧]، و دبێژیت: ﴿قُلْ أَرَأَيْتُمْ إِن جَعَلَ اللَّهُ عَلَيْكُمُ اللَّيْلَ سَرْمَداً إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ مَنْ إِلَهٌ غَيْرُ اللَّهِ يَأْتِيكُم بِضِيَاءٍ أَفَلاَ تَسْمَعُونَ﴾ [القصص: ٧١].

چێدبیت ئێك پسیارکەت و بێژیت: چاوا هەیف هەمی چاڤێ رۆژێ دگریت د گەل هندێ کو هەیف چار سەد جاران ژ رۆژێ بچویکترە؟

---

١ـ بوخاری (٩٩٥) و موسلم (٩١٥).

بەرسف: رۆژ چار سەد جارکی ژ عەردی یا دویرە هەمبەر دویراتیيا هەیڤێ بۆ رۆژێ، ل ڤێرە هەردو (رۆژ و هەیف) قەبارێ وان وەکی ئێك دیار دکەن، ژ بەر هندێ هەیف دشێت هەمی تیشکا رۆژێ بگریت، دەمێ هەیف د ناڤبەرا هەردوکاندا دچیت.

و پێدڤییە بەرێخۆدانا جوانییا وێنێ رۆژغەیرینێ مە مژویل نەکەت، ژ بەر مەترسییا تیشکا رۆژێ ل سەر چاڤێن مە، چونکی بەرێخۆدانا رۆژێ ل دەمێ غەیرینێ بێی بەرچاڤکێن رەش یێن تایبەت ب غەیرینێڤە، زیانێن مەزن دگەهینیتە چاڤی، بێی مرۆڤ هەست پێ بکەت، چونکی تۆڕا چاڤی چو پێشوازکەر نینە بۆ ئێشانێ، و ل ڤێرە دڤێت ئەم هشیار بین تایبەت بۆ زارۆکان کو چو ژ مەترسییێ نوزانن، چونکی تۆرێن چاڤێن وان هەستیارترن ژ یێن مەزنان.

پێغەمبەری ﷺ نڤێژا رۆژ غەیرینێ یا کرییە سوننەت بۆ مە، و ئەم خواندنێ تێدا درێژکەین، و سوجدەیێ ژی درێژکەین، دا سوجدەیا مە دەمێ غەیرینێ بنخێڤیت.

و ل دویف ژمێریارییێن گەردوونناسی رۆژغەیرین یا ل یازدەی هەیڤا تەباخێ سالا (١٩٩٩ز) رویدای، و ل هەمی وەلاتێن عەرەبی هاتە دیتن، بەلێ نەیا تەڤایی بوو ب تنێ ل باکوورێ رۆهەلاتا دویر نەبیت، و ل باکوورێ رۆژهەلاتا سوریا پیچەك بەری نیڤرۆ د وێ رۆژێدا گەهشتە قویناخا رۆژغەیرینا پشکی (جزئي)، کو نێزیکی دەمژمێرەکێ ڤەکێشا، و پاشی رۆژ ب هەمیڤە بەرزەبوو، و بوو تاریاتییەکا تمام بۆ ماوێ دو خۆلەکان.

و د ڤان دو خۆلەکاندا بۆ مە هەلکەڤت ئەم بەرێ خۆ بدەینە وان پەڤینێن ل سەر بانێ رۆژێ روی ددەن، و ئەم دشیاین ئەزمانێن گوڕیێ کو درێژاهییا وان نێزیکی ملیۆن کیلۆمترایە ببینین، و د شیاندا بوو پێنج هەساران (عەتارد، زوهرە، مەریخ، موشتەری، زوحەل) ببینین.

و دەربرینەکا بەربەلاڤ یا د ناڤ مرۆڤاندا هەی، دەمێ مرۆڤ خۆ ل بەر تشتەکێ دگریت و ئەو تشت نەیێ خۆ ل بەرگرتنێ بیت، دێ بێژنێ: نیڤرۆ ستێر یێن دیتین، بەلێ ... د ماوێ رۆژغەیرینێدا ئەم ل دەمێ نیڤرۆ ستێرا ژ راست دبینین بێی گۆمان.

مفاییێ زمانی (عەرەبی) د پەیڤا رۆژ غەیرین و هەیڤ غەیرینێدا:

گەلەك جاران ئەڤ هەردو پەیڤە (کسوف و خسوف) دهێنە گۆتن ل سەر ئەزمانێ مرۆڤان، و دەستنیشان دکەت ئێك ژ وان بۆ هەیڤێ، و یا دی بۆ رۆژێ، مە وەسا دیت کو ئەم ڤی مفاییێ زمانی ل ڤێرە بینینە خوارێ، بەلکی مفایەك تێدا بیت.

د (لسان العرب)دا یا هاتی: ((كَسَفَ القَمَرُ يَكْسِفُ كُسوفاً، وَكَذلِكَ الشمس كَسَفَت تكْسِف كسوفاً)): ئانکو رۆناهییا وێ چۆ، و رەش بوو، و هندەك دبێژن: (انكسف) ئەڤە خەلەتە، و (كَسَفَها اللهُ وأكْسَفَها)... و هەیڤ ژ ڤێ هەمییێ وەکی رۆژێیە، و (كَسَفَ القمرُ): رۆناهییا وێ چۆ، و هاتە گوهۆرین بۆ رەشی، و (كسفتِ الشمسُ وخَسَفت) ئێك رامانە، و د فەرموودێدا ژی بەحس ژێ هاتییە کرن (کسوف و خسوف بۆ رۆژێ و هەیڤێ)، ل ڤێرە بۆچۆنێن جودا هەنە بۆ ڤان هەردو ناڤان (کسوف و خسوف)، هندەك ژ وان هەردو ب پیتا (ك) دەستپێکرینە، و هندەکێن دی ب پیتا (خ)، و هندەکێن دی (ك) بۆ رۆژێ و (خ) بۆ هەیڤێ دانایینە، ئانکو [كَسَفَ] بۆ رۆژێ و [خَسَفَ] بۆ هەیڤێ، بەلێ هەمی د رێککەڤتینە کو رۆژ و هەیڤ دو نیشانن ژ نیشانێن خودێ ژ بەر مرن و ژیانا چو کەسان ناهێنە غەیرین، و ئەوا گەلەك د زمانیدا دهێتە ب کارئینان، ئەوە کو (کسوف) بۆ رۆژێ، و (خسوف) بۆ هەیڤێ، دبێژیت: (كَسَفَتِ الشَّمسُ، وكَسَفَها اللهُ، وانكسفت، وخسف القمرُ وخسفه اللهُ وَانْخَسَفَ... ئەبو زەید دبێژیت: (كَسَفَتِ الشَّمسُ) دەمێ رۆژ ل رۆژێ رەش دبیت، و (كسفتِ الشَمسُ النُجومَ) ئەو ژی دەمێ رۆناهییا رۆژێ ل سەر ستێراندا دگریت و تشتەك ژێ دیار نەکەت، و رۆژ ل ڤی دەمی دێ بیتە برینا

رۆناهییا ستێران))[1]، سەعلەب دبێژیت: ((كَسَفَتِ الشَّمسُ، وخَسَفَتِ القمرُ) ئەڤە باشترە)[2].

ئیبن ئەسیر دبێژت: ((پەیڤا (خسوف) د گەلەك فەرمووداندا یا هاتی بۆ رۆژێ، و ئەوا بەرنیاس د زمانیدا (كسوف)ـە، نە (خسوف)ـە، و ئەوا هاتی وەكی ڤێ د فەرموودێدا ژ بەر نێركرنێیە (لتذكیرِ) بۆ ناڤێ هەیڤێ ل سەر مێكرنا رۆژێ (تأنیثِ)، و هەردو گەهاندنە ئێك بۆ وی تشتێ تایبەت ب هەیڤێڤە، و دیسا بۆ شوینگرتنێ (قەرەبووكرنێ)، و د گۆتنەكا دیدا هاتییە: بۆ غەیرینا رۆژ و هەیڤێ پەیڤا (كَسَفَ) نەیا گونجایە بۆ هەردویان، و گۆتنا (خسوف) بۆ رۆژێ یا ئێك لاییە، و ژ بۆ هەڤپشككرنا (خُسُوف و كُسوف) د ئێك راماندا ئەوە نەمانا رۆناهییا هەردوكان، و تارییبوونا وان))[3].

---

١. لسان العرب مادة كسف، د گەل راستڤەكرنەكا كێم و سڤك.

٢. لسان العرب مادة خسف.

٣. النهاية في غريب الحديث (٣١/٢).

# پەستانا هەوای و شوینەوارێن وێ

خودایێ مەزن دبێژیت: (فَمَنْ يُرِدِ اللَّهُ أَنْ يَهدِيَهُ يَشْرَحْ صَدْرَهُ لِلْإِسْلَامِ وَمَنْ يُرِدْ أَنْ يُضِلَّهُ يَجْعَلْ صَدْرَهُ ضَيِّقًا حَرَجًا كَأَنَّمَا يَصَّعَّدُ فِي السَّمَاءِ كَذَلِكَ يَجْعَلُ اللَّهُ الرِّجْسَ عَلَى الَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ) [الأنعام:١٢٥]، ئانكو: ڤێجا هەر كەسێ خودێ بڤێت راستەرێ بكەت، دێ سینگێ وی بۆ وەرگرتنا ئیسلامێ ڤەكەت، و هەر كەسێ بڤێت گۆمرا بكەت، دێ سینگێ وی وەسا تەنگ كەت (وەختێ دبێژنێ موسلمان ببە) هەروەكی سەرئەڤراز دبیتە عەسمانی، ب ڤی رەنگی، خودێ پیساتی و ئیزایێ ددانیتە سەر وان، ئەوێت باوەرییێ نەئینن.

ئەڤ ئایەتە ژ بەلگەیێن ئیعجازا زانستینە د قورئانا پیرۆزدا، و ژ بەلگەیێن پێغەمبەربوونا موحەممەدینە ﷺ، زانستێ نوژدارییا فرینێ و عەسمانی دوپاتكرییە، ئەگەر مرۆڤ ژ عەردی بەرەڤ تەخێن بلندێن عەسمانیڤە بچیت، دێ نیشانێن ئەندامی ل دەڤ وی دورست بن، دێ پیچ پیچە بێهنا وی تەنگ بیت و دێ هەست ب بهێنتەنگییێ كەت كو ئەڤ بێهنتەنگییە دێ كەڤیتە د سینگیدا، هەتا دگەهیتە قوناخەكا بەرتەنگ ئەوا قورئانێ بەحس ژێ كری: (يَجْعَلْ صَدْرَهُ ضَيِّقًا حَرَجًا كَأَنَّمَا يَصَّعَّدُ فِي السَّمَاءِ) [الأنعام: ١٢٥]، ژ بەر كو هەر چەند بەردەوام بەرەڤ بلنداهییێڤە بچین دێ پەستانا هەوای كێم بیت، و ئۆكسجین ژی كێم دبیت.

ئەگەر مرۆڤ ژ ئاستێ دەریای بلند بوو و گەهشتە بلنداهییا دەه هزار پێیان هەست ب چو تشتی ژ نیشانێن كێمبوونا ئۆكسجینی ناكەت، و نزمبوونا پەستانێ، بەلێ ئەگەر ژ

ڤێ بلنداهییێ بۆری و گەهشتە شازدە هزار پێیان، ل ڤێرە دێ بینین ئەو کۆئەندامێن خودێ کرینە د لەشێ ویدا دێ خۆ د گەل ڤێ گوهۆرینا پەستانێ و کێمبوونا ئۆکسجینی گونجینیت، و ئەگەر ما ل ڤی جهی د ناڤبەرا دەه هزار هەتا شازدە هزار پێیان دێ لێدانێن دلێ وی زێدە بن، و کارێ هەردو سیهێن وی، و دێ پەستانا وی بلند بیت ژ بەر کو دا ئەندامێن وی پێدڤییا لەشێ وی ئۆکسجینی و پەستانێ دابین بکەن، بەلێ ئەگەر ژ شازدە هزار پێیان بۆری بۆ بیست و پێنج هزار پێیان، ل ڤێرە کۆئەندامێن لەشی دورست کار ناکەن د ڤی ئاستێ بلنداهییێدا، دێ چ چێبیت؟ دێ نیشان دیار بن و ل پێشییا هەمییان بهێنتەنگی، (يَجْعَلْ صَدْرَهُ ضَيِّقًا حَرَجًا كَأَنَّمَا يَصَّعَّدُ فِي السَّمَاءِ).

و ئەگەر بیست و پێنج هزار پێیان بلند بوو و پتر ل ڤێرە دێ هەستێ خۆ ب هەمیڤە ژ دەست دەت، ژ بەر ڤێ چەندێ سویارێن فرۆکان ئەوێن ل بلنداهییا چل هزار پێیان دفرن، ئەڤ فرۆکە یا تژی کرییە ب هەشت جارکی هندی وی هەوایێ کو ل سەر عەردی هەی، ژ بەر کو دا پەستانا هەوای و ئۆکسجین د فرۆکێدا هەبن وەکی ل سەر عەردی، ئەگەر ئەڤە نەبن دێ هەمی سویار هەستێ خۆ ب ئێك جاری ژ دەست دەن، و ئەڤ ئایەتە ژ بەلگەیێن ئیعجازا زانستییە د قورئانا پیرۆزدا، و ژ بەلگەیێن پێغەمبەربوونا موحەممەدییە ﷺ.

ئەڤە نیشانێن کێمبوونا ئۆکسجینی بوون، و بۆ نیشانێن هاتنەخوارا (نزمبوونا) پەستانێ چ هەیە؟

زانا دبێژن: ((هەر گازەکا د لەشێ مرۆڤیدا ژ بەرێك دهێتە دەر د گەل هاتنەخوارا پەستانێ، و د گەل هندێ دێ کاریگەرییەکا خراب کەتە سەر گولچیسك و قۆلۆن و گوهێ ناڤین، و نزمبوونا پەستانێ شوینوارێن مەترسیێ یێن هەین، ژ وان ژی ئێشانێن زکی کو مرۆڤ خۆ ل بەر ناگریت، و نەخاسمە ئێشانێن قۆلۆنێ، و دیسا ئێشانێن هەردو سیهان، و گوهی، و گەهان، ئەڤە هەمی نیشانێن کێمییا پەستانێنە، ئەرێ پێغەمبەر ﷺ

چۆیە عەسمانی و ئەڤ ئاخفتنە گۆت بیت؟ ئەرێ کەسەك د ژیانا ویدا چۆیە عەسمانی؟ ئەرێ کەسەك ل فرۆکێ سویار بوویە د ژیانا ویدا هەتا ڤان نیشانان سالۆخەت بکەت؟ خودێ دبێژیت: (فَمَنْ يُرِدِ اللَّهُ أَنْ يَهدِيَهُ يَشْرَحْ صَدْرَهُ لِلْإِسْلَامِ وَمَنْ يُرِدْ أَنْ يُضِلَّهُ يَجْعَلْ صَدْرَهُ ضَيِّقًا حَرَجًا كَأَنَّمَا يَصَّعَّدُ فِي السَّمَاءِ). ژ بەر ڤێ چەندێ ئیمام عەلی ﷺ دبێژیت: (في القرانِ الكَريمِ آيات لمّا تفسَّر). ئانکو: د قورئانێدا ئایەت یێن هەین هێژ نەهاتینە راڤەکرن.

پشتی زانست پێشڤە چۆی، و مرۆڤ ل فرۆکە و بالۆنان سویار بووی د تەخێن بلندێن عەسمانیدا ئەڤ راستییە ئاشکراکرن، و دەمێ سویاری فرۆکێ دبی تو هەست ب چو تشتێ ژ ڤی شێوەی ناکەی، چونکی ئامویرێن فرۆکێ پەستان هەشت جارکی یا داگرتی، دا پەستانا هەوای و رێژا ئۆکسجینێ یا گونجای بیت وەکی وێ یا ل سەر عەردی، و ئەگەر ئامویرێن پەستانێ ژ نشکەکێڤە ل عەسمانی ژ کار کەڤتن پێدڤییە فرۆکەڤان فرۆکێ ژ نەچاری دادەت دا سویار نەمرن، و ئەڤە رامانا گۆتنا خودێیە: (يَجْعَلْ صَدْرَهُ ضَيِّقًا حَرَجًا كَأَنَّمَا يَصَّعَّدُ فِي السَّمَاءِ).

و ڤەکۆلینەك ل ژێر ناڤ و نیشانێ: پەستانێن بلند هاتە پێشکێشکرن، و دەست پێ کربوو ب پێناسا یەکا پەستانێ، و ئەو ژی پەستانا هەوایە کو یەکسانی هزار و سێ و سێ گرامان ل سەر سەنتیمترەکا دوجاری، و ئەڤە کێشا حەفتێ و شەش سەنتیمترێن چوار گۆشەنە ژ زیبەقی، ئەڤ پەستانا هەوای یەکا پیڤانا پەستانێیە، و ئەم دزانین کو رووبەرێ لەشێ مرۆڤی ژ میترەکێ هەتا دو میترانە، پەستانەکێ ل سەر خۆدا دهەلگریت ژ دەه هەتا بیست تەنان بێی هەست پێ بکەت، و ئەم هەمی یێن د بنێ دەریایەکا تژی هەوادا، و هەر ئێك ژ مە دەه هەتا بیست تەنێن پەستانا هەوای ل سەر خۆدا دهەلگریت، ئەڤە یەکا پەستانێیە.

زانا دبێژن: پەستانا د ناڤ عەردیدا سێ هزار و شەش سەد ملیۆن پەستانێن هەوایینە، هەروەسا پەستانا بنێ رۆژێ سەد ملیۆن پەستانێن هەوایینە، و ستێرەکا نیترۆنی یا هەی ب قەبارێ رۆژێ پاشی تیرا وێ بوو چاردە کیلۆمتر، پەستانا ڤێ ستێرێ ملیۆن ملیۆن بلیۆن پەستانێن هەوایینە، ئەڤە ئەو پەستانێن بلندن.

رەقترین توخمێ پەستانکری د عەردیدا ئەلماسە، ئەو یێ پەستانکرییە ب چوار ملیۆن پەستانێن هەوایی، بەلکو پەستانا وی پتر ە ژ پەستانا مەلبەندێ عەردی، بەلێ هندەك دەستەکێن زانستی شیان پەستانێ ل رەژیا سادە بکەن ب پێنج هزار پەستانێن هەوایی ب گەرمییا دو هزار پلە، و کرە ئەلماسەکێ چێکری، و ئەلماسێ چێکری ئەوێ د بازاراندا ئەو رەژییەکا پەستان لێکرییە ب پێنج هزار پەستانێن هەوایی ب گەرمییا دو هزار پلە.

و زانایێن نوژدارییێ ئاشکەرا کر کو دەرمانێن شل ب مفاترن ژ دەرمانێن پەستان لێکری، چونکی چێدبیت پەستانێ کارتێکرن هەبیت ل سەر بنیاتێ گەرستەی.

راستییەکا هەی دێ دانمە بەر دەستێن هەوە، دێ مفایی ژێ وەرگرین د کاروبارێن دەروونیدا، و ئەو ژی مەزنترین بەرێ گرانبها (جوهرة) د جیهانێدا بهایێ وی سەد و چل ملیۆن دۆلارن، ئەگەر تو رەژییەکێ ب قەبارێ وێ بینی، و تو هەردویان بەراورد بکەی (هەلسەنگینی) دێ بینی کو پەستانێن بلند رەژی یا تێك ڤوتای و کرییە ئەلماس.

دەمێ مرۆڤێ باوەردار باوەری ب خودێ ئینا، و ب پێغەمبەرێ وی، و بۆ کێشەکا مەزن ژییا، و پەستانێن بلند خۆ ل بەر گرت؛ دێ ئەڤ پەستانە وی کەنە مرۆڤەکێ گەشبوویی.

ئەڤە رەژییەکا سادەیە، بهایێ پارچەکا وێ نابیتە ڤوریشەك، ب پەستانێن بلند دبیتە پارچەکا ئەلماسی و ب بهایێ گەلەکێ مەزن.

خۆ درێژكرن و بهێنڤەدانا ل جهێن گەشتیاری و گەریان ل دویف حەزێن جنسی و خۆشییان ئەڤە باوەرییێ چێناكەت، و قارەمانییێ و سەركەڤتنێ، بەلێ گڤاشتنێن د رێكا خودێدا مرۆڤی دكەتە مرۆڤەكێ گەشبوویی.

د شیاندایە ئەم ب ڤێ چەندێ مفایی ژ ڤێ نموونا فیزیایی وەرگرین د پەیوەندییێن مەدا د گەل خودێ، و ب راستی پێغەمبەری ﷺ ژیانەكا تژی گڤاشتن ژیا بوو، و ئەو مشەخت بوو، و تامكرە رەنگێن ئێزایێ، و هەردەمێ تام دكرە تشتەكی ژ وان ئێزایان، نێزیكییا وی بۆ خودێ زێدە دبوو، و كاروبار و كاودان بەرفرەه نابن ئەگەر بەری هنگی بەرتەنگ نەبن، و سپێدە هەناسێ ناكەت ئەگەر پشتی شەڤەكا تاری نەبیت، خودێ دبێژیت: ﴿وَعَسَى أَنْ تَكْرَهُوا شَيْئًا وَهُوَ خَيْرٌ لَكُمْ﴾ [البقرة:٢١٦]، ئانكو: دبیت هەوە تشتەك نەڤێت، و ئەو ب خۆ باشی بیت بۆ هەوە.

# بازنییا عەردی و پەیڤا ((عمیق))

د قورئانا پیرۆزدا ئاماژێن هەین بەرێخۆدانا مرۆڤی راکێشیت، خودێ دبێژیت: (وَأَذِّنْ فِي النَّاسِ بِالْحَجِّ يَأْتُوكَ رِجَالًا وَعَلَى كُلِّ ضَامِرٍ يَأْتِينَ مِنْ كُلِّ فَجٍّ عَمِيقٍ)[1] [الحج:٢٧]، ئانكو: گازی مرۆڤان بکە بۆ حەجێ، ڤێجا پەیادە و سویاری حێشترێت لاواز و وەستیایی، ژ هەمی رەخ و روی و کنارێت دنیایێ، دێ ڤەست کەنێ.

چێدبیت ئێک پسیار بکەت: بۆچی گۆتییە (مِنْ كُلِّ فَجٍّ عَمِيقٍ)، و نەگۆتییە (من کل فج بعید)؟

زانا دبێژن: ب کارئینانا پەیڤا (عمیق) ئانکو کویر جهێ پەیڤا (بعید) ئانکو دویر، ئەڤە ئاماژەکە بۆ بازنەییا عەردی، ژ بەر کو هێلێن (پانییێ و درێژییێ) ل سەر عەردی نە د راستن، بەلکو د چەمیاینە، و هێلا چەمیای پێدڤی ب دویراتییا سێیێ هەیە (بعد ثالث)، و پێدڤی ب روی و کویراتییێ یا هەی.

---

١. (قرطبي) د تەفسیرا خۆدا (٣٩/١٢) دبێژیت: [و پێیێن زەلامان یێن ل سەر چۆکێن وان ژ بەر وەستیانا وان د هاتن و چۆنێدا] (وعلى كل ضامر يأتين)، چونکە رامانا (ضامر معنی ضوامر)... و ضامر: حێشترا لاوازە کو ژ گەشتێ وەستیابیت، و خودێ سالۆخەت کر ب ئەنجام و بەرهەمێ وێ بۆ هاتنا مەکەهێ ب دویماهیک دهێت، و نەگەرێ بەحسکرنا حێشترێن لاواز، دبێژیت: (يَأْتِينَ مِنْ كُلِّ فَجٍّ عَمِيقٍ)، ئانکو کارتێکرن لێ دبیت ب درێژاهییا گەشتێدا، و پەیڤا (الضمير) بۆ حێشترێ یا هاتی وەك رێزگرتنەك بۆ وێ ژ بەر ڤەستکرنا وێ بۆ حەجێ د گەل خودانێن وێ، وەکی خودێ دبێژیت: (والعاديات ضبحا) وەك رێزگرتنەك و سەنگەك بۆ هەسپێ جیهادێ دەمێ بۆ رێکا جیهادێ بزاڤێ دکەت.

ژ بەر هندێ خودێ د ڤێ ئایەتێدا ئاماژە دایە کو ئەڤ عەردێ ئەم ل سەر شێوێ وی یێ بازنەییە.

بەلێ ئەو تشتێ سەرنجا مرۆڤی دکێشیت ئەوە حیکمەتا قورئانا پیرۆز، یا گونجاندی د ناڤبەرا پێدانێن سەردەمێ هاتنەخوارا قورئانێ، و پێدانێن سەردەمێن دویڤدا.

# أَلَمْ نَجْعَلِ الْأَرْضَ كِفَاتًا

خودێ دبێژیت: (أَلَمْ نَجْعَلِ الْأَرْضَ كِفَاتًا) [المرسلات:٢٥]، ئانكو: ما مە عەرد بۆ هەوە نەكرییە مرۆڤ هەلگر.

پەیڤا (كِفَاتا): یا هاتییە وەرگرتن ژ كارێ (كَفَت)، و (يَكْفَتَ يَكْفِتهُ كَفْتاً، وكَفْتهُ: ضَمهُ وقَبَضهُ[1])، و ژ سالۆخەتێن عەردی (تَكْفت)، ئانكو رادكێشیت، و ڤەدگریت، و دگریت (مچاندن) و ئەڤ ئایەتە ئاماژەكا دیارە بۆ راكێشانێ، و هەر تشتێ ل سەر عەردی بۆ عەردی دهێتە راكێشان، و گرانییا تشتا د راستیدا ئەو هێزە یا عەرد وان رادكێشیتە خۆ، و گرانییا تشتی د گەل قەبارێ عەردی دگونجیت، ئەو تشتێ كێشا وی ل سەر عەردی سەد كیلۆ بیت، دێ ل سەر بانێ هەیڤێ شەش ئێكا ڤێ كێشێ بیت، بۆ نموونە: مرۆڤێ كێشا وی ل سەر عەردی شێست كیلۆ بیت، دێ ل سەر بانێ هەیڤێ بیتە دەه كیلۆ، چونكی كێشا تشتی ئەو هێزە یا عەرد بۆ لایێ خۆ دكێشیت، و كێشا تشتی ل سەر هەیڤێ ژی ئەو هێزە یا مەلبەندێ هەیڤێ بۆ لایێ خۆ دكێشیت، خودایێ مەزن دبێژیت: (أَلَمْ نَجْعَلِ الْأَرْضَ كِفَاتًا) [المرسلات: ٢٥].

دێ ژیان یا چاوا بیت ئەگەر هێزا راكێشانێ نەبیت؟ چاوا ئاڤ دێ یا خۆجه بیت ئەگەر هێزا راكێشانا عەردی نەبیت؟ چاوا هەوا دێ ب عەردیڤە یێ گرێدای بیت ئەگەر راكێشانا عەردی نەبیت؟ ئەگەر عەرد هەوای نەراكێشیت دێ هەوا یێ نەلڤ بیت و

---

١. بەرێ خۆ بدە (لسان العرب، مادة كفت، و د فەرهەنگا (المحيط)دا (مادة كفت): [كفتَ يكْفِتُ كفْتاً: رادكێشیت، و ڤەدگریت، و دگریت، و (الكِفات): ئەو جهە یێ تشت تێدا دهێتە هەلگرتن، و عەرد هەلگرێ مەیە].

عەرد ژی پێ ب لڤینە، و د گەل لڤینا عەردی و نەلڤینا هەوای، دێ بابەلیسک پەیدا بن، کو لەزاتییا وان دێ ژ هزار و شەش سەد کیلۆمتران زێدەتر بیت د دەمژمێرەکێدا، و ئەڤە بەسی هندێیە کو هەر تشتەکێ ل سەر عەردی وێران بکەت.

کێ هەوا ب عەردیڤە گرێدایە؟ ئەو ژی هێزا راکێشانێیە، کێ دەریا ب عەردیڤە گرێداینە؟ ئەو هێزا راکێشانێیە.

و ئەمانا کێشێ کاودانەکێ خۆ ل بەر نەگرە، خودێ دبێژیت: (أَمَّنْ جَعَلَ الْأَرْضَ قَرَارًا) [النمل:٦١]، ئانکو: ئەرێ ئەوێت هەوە بۆ خودێ کرینە هەڤپشك چێترن، یان ژی ئەوێ عەرد بۆ هەوە ل سەر ئاوایێ هێکێ راستکری و بۆ ژینێ خۆشکری، خودێ عەرد وەلێ کر کو بزڤریت، و پێ خۆجە بیت، و تشت ژی ل سەر خۆجهکرن، و چو تشتا گرانی نابیت ئەگەر هێزا راکێشانێ نەبیت، خودێ دبێژیت: (أَلَمْ نَجْعَلِ الْأَرْضَ كِفَاتًا (٢٥) أَحْيَاءً وَأَمْوَاتًا (٢٦)) [المرسلات]، ئانکو: ما مە عەرد بۆ هەوە نەکرییە مرۆڤ هەلگر. ساخان ل سەر روییێ خۆ رادکەت، و مریبان د زکێ خۆدا ڤەدشێریت).

و هندەکان وەسا هزر دکر، دێ ل دویماهییێ عەرد مرۆڤان بۆ لایێ خۆ راکێشیت دا د ناڤ خۆدا ڤەشێریت (گۆر بکەت)، بەلێ خودایێ مەزن دبێژیت: (أَلَمْ نَجْعَلِ الْأَرْضَ كِفَاتًا (٢٥) أَحْيَاءً وَأَمْوَاتًا (٢٦)).

مرۆڤێ زێندی پێ گرێدایە ب عەردیڤە، بەرەڤ عەردی دهێتە راکێشان، و ئەڤەیە گرانییا وی، رامانا وێ چییە ئەگەر مرۆڤەك هەشتێ کیلۆ بیت؟ رامانا ڤێ چەندێ ئەوە هێزا راکێشانا وی بۆ عەردی یەکسانی ڤێ ژمارێیە، خودێ دبێژیت: (أَلَمْ نَجْعَلِ الْأَرْضَ كِفَاتًا (٢٥) أَحْيَاءً وَأَمْوَاتًا (٢٦)).

ئەرێ ما ئەڤە نە ئاخفتنا خودێیە؟ ئەڤان بیردۆزێن زانستی، یان ڤان راستییێن زانستی کو ڤەبرکرینە، ئەڤانە د قورئانا پیرۆزدا ئاماژە یا پێ هاتییە دان.

# خۆجهبوونا عەردی

د ئایەتەکا قورئانا پیرۆزدا، خودێ دبێژیت: (أَمَّنْ جَعَلَ الْأَرْضَ قَرَارًا)[1] [النمل:٦١].

کێ ئەڤ عەردە خۆجھ کریە؟ ئاڤاهی خۆ جھ دبن و خۆ ل سەر دگرن و ناهەرفن، کێ عەرد خۆجھ کرییە؟ و د گەل هندێ کو عەرد دلڤیت، و د هەر چرکەکێدا سیھ کیلۆمتران دچیت، و ئەگەر بھژیت چو ئاڤاهی ل سەر نامینن، یا خودێ تو نیعمەتێن خۆ نیشا مە بدەی ب مشەبوونا وان نە ژ دەستدانا وان، خودێ دبێژیت: (وَتَرَى الْجِبَالَ تَحْسَبُهَا جَامِدَةً وَهِيَ تَمُرُّ مَرَّ السَّحَابِ) [النمل:٨٨]، ئانکو: (وێ رۆژێ کو رۆژا قیامەتێیە) دێ چیایان بینی، یا ژ تەڤە د راوەستاینە، و ئەو ب خۆ کا چاوا عەور دچن، وەسا دچن.

تو هزر دکەی کو ئەڤ چیایە د نەلڤن و ل جهێن خۆ د راوەستیاینە، بەلێ د راستیدا وەکی عەورا دچن چونکی د گەل عەردی دزڤرن.

---

١ـ (ابن كثير) د تەفسیرا خۆدا (٣/٣٧١) دبێژیت: [خودێ دبێژیت: (أمن جعل الأرض قراراً)، ئانکو جهەکێ راستییایە نە یێ خوار و خویلە و خەلکێ وی نا لڤلڤینیت، و نا لەرزینیت، و ئەگەر ئەو یێ وەسا با ژیان ل سەر عەردی نە دبوو، بەلکو ژ ڤەنجی و دلۆڤانییا خۆ عەرد رائێخستییە و دەشت کرییە و خۆجھ و نا لەرزیت، و نا لڤیت، وەکی خودێ دبێژیت: (اللَّهُ الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ الْأَرْضَ قَرَاراً وَالسَّمَاءَ بِنَاءً)، (وجعل خلالها أنهارا)، ئانکو وەلێ کرییە کو رویبارێن شرین د ناڤڕا بچن، و رویبارێن مەزن و بچویک تێدا یێن دەرئێخستین، و د ناڤدا دچن بۆ رۆژهەلات و رۆژئاڤا، و باشوور و باکوور، ل دویڤ بەرژەوەندییێن بەندەیێن وی د هەرێم و دەڤەراندا ـ چونکی یێن جهێن عەردیدا چێکری ـ و رزقێ وان دئینیت ل دویڤ پێدڤییێن وان].

ئەو هەڤپەیمانا کو دەولەتەك ژ دەولەتێن بەلقانێ بومبەباران کری د ماوێ شەش هەیڤاندا، و ب پێشکەفتیترین جۆرێن چەکی، ب فرۆکێن شەبەح، و ب کارئینانا تیشکا لێزەری، و ب کارئینانا ئامویرێن ژمێریاری، و ب کارئینانا هەیڤێن دەستکرد، ب نویترین چەکی گوللەباران دکر، ب شەڤ و رۆژ، د ئێك رۆژدا چار سەد جاران فرۆکە دهنارتنە سەر، د گەل ئینانا ئارمانجێ ب پلەکا مەزن، بومبە دکەڤتە ژۆرا نفستنێدا، و د بۆریا کارگەهێدا، و د ڤان شەش هەیڤێن بومبەبارانکرنا بەردەوام، و مەزاختنێن وێ نێزیکی سێ سەد هزار ملیۆن دۆلاران بوون، ئەوا ڤێ بومبەبارانێ کری د ڤان شەش هەیڤاندا نەدهاتە ئاستێ هندێ یا بیڤەلەرزێ د چل و پێنج چرکاندا کری، خودێ دبێژیت: (إِنَّ بَطْشَ رَبِّكَ لَشَدِيدٌ) [البروج:١٢]، ئانکو: ب ڕاستی ئیزادانا خودایێ تە یا دژوارە.

خودێ دبێژیت: (أَمَّنْ جَعَلَ الأَرْضَ قَرَاراً)، مە چو تشت د دەستدا نینە، کی دزانیت ئەگەر عەرد ب هەشت پلەیان ب پیڤەرێ (ریختەر) هژیا چو ئاڤاهی نامینن، دێ مرۆڤ د بن ئاڤاهییانڤە مینن ئاهێن وان دێ بلند بن، و کەسێ گوه لێ نینە، بەلکو چو کەس پویتەی پێ ناکەن.

خودێ دبێژیت: (قُلْ هُوَ الْقَادِرُ عَلَى أَنْ يَبْعَثَ عَلَيْكُمْ عَذَابًا مِنْ فَوْقِكُمْ) وەکی برویسی و مووشەکان، (أَوْ مِنْ تَحْتِ أَرْجُلِكُمْ) [الأنعام:٦٥]، وەکی بیڤەلەرز و مینان، (أَوْ يَلْبِسَكُمْ شِيَعًا وَيُذِيقَ بَعْضَكُمْ بَأْسَ بَعْضٍ) [الأنعام:٦٥]، وەکی شەرێن ناڤخۆیی، ئانکو: بێژە: ئەو (خودێ) دشێت هنداڤی هەوە یان د بن پێییێت هەوەدا ئیزایەکێ ب سەر هەوەدا بینیت، یان ژی هەوە ژێکڤەکەت و بکەتە دەستەك دەستەك، و هندەکان ژ هەوە ب هندەکا بئێشینیت.

خودێ دبێژیت: (وَضَرَبَ اللَّهُ مَثَلًا قَرْيَةً كَانَتْ آمِنَةً مُطْمَئِنَّةً يَأْتِيهَا رِزْقُهَا رَغَدًا مِنْ كُلِّ مَكَانٍ فَكَفَرَتْ بِأَنْعُمِ اللَّهِ فَأَذَاقَهَا اللَّهُ لِبَاسَ الْجُوعِ وَالْخَوْفِ بِمَا كَانُوا يَصْنَعُونَ) [النحل:١١٢]،

ئانكو: خودێ (خەلكێ) گوندەكی دكەتە نموونە، ژین و ژیارا خۆ تەنا و تەسەل دبۆراندن، و ژ هەمی رەخانڤە رزقەكێ بەرفرەهـ بۆ وان دهات، بەلێ شوینا شوكور و سوپاسییا خودێ بكەن، نیعمەت و كەرەمێت وی (یێت خودێ) نەئینانە بەر چاڤێت خۆ و نە شوكوراندن. خودێ ژی كراسێ برسێ و ترسێ كرە بەر وان و ژار و ژیر كرن، ژ بەر وان كار و كریارێت ئەوان دكرن.

رامانا دووێ: كێ سیستەمێ راكێشانێ چێكرییە؟ و هەر تشتێ ل سەر روییێ عەردی دهێتە راكێشان بۆ عەردی، ئەڤەیە كێش، گەشتیڤانێن عەسمانی ل سەر جهێ خۆ دنڤن د گەشتیگەلا خۆ یا عەسمانیدا، و دەمێ گەهشتنە خالا نەبوونا راكێشانێ دێ ئێك ژ وان هشیار بیت، و ئەو د بانێ گەشتیگەلێدا، كێش نینە، و ژیان بێی كێش مرۆڤ خۆ ناراگریت، و هەمی تشت ژ دەستێن مرۆڤی دچن، كێ ئەڤ تشتە وەلێ كرییە خۆجهـ ببیت ل سەر روییێ عەردی؟ و كێ سیستەمێ راكێشانێ چێكرییە؟ ئەو ژی خودێیە، ئەڤە رامانا دووێیە بۆ گۆتنا خودێ: (أَمَّنْ جَعَلَ الْأَرْضَ قَرَارًا).

رامانا سێیێ: كێ بۆ تە ـ هەی مرۆڤ ـ هەمی پێدڤییێن تە د عەردیدا داینە؟ و ئەرێ دێ تو د جهەكێ بێی ئاڤ خۆجهـ بی؟ تو خۆجهـ نابی ئەگەر د جهەكێ ئاڤ و جهێ ڤەحەواندنێ لێ نەبیت، و ئەوێ مرۆڤ ل سەر روییێ عەردی خۆجهـ كری هەمی پێدڤییێن وی یێن هەی، و هندەك زانایان هژمارتییە كو د عەردیدا دو سەد و هەشتێ و پێنج گەرستێن خوارنێ یێن هەین، مرۆڤ جۆرە و جۆر دخۆت.

نیشانێن خودێ یێن د دەستێن مەدا، بەلێ یێ دلشاد ئەوە یێ شیرەتان ل كەسانێن دیتر دكەت، و خرابكار شیرەتا ناكەت ژ بلی خۆ نەبیت، و دەمێ نەگوهدارییا فەرمانا خودێ هاتە كرن ل دەڤ مرۆڤان دێ خودێ وان سزا و رەزیل كەت، خودێ دبێژیت: (وَلَنُذِيقَنَّهُمْ مِنَ الْعَذَابِ الْأَدْنَى دُونَ الْعَذَابِ الْأَكْبَرِ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ) [السجدة:٢١]، ئانكو: بێ گۆمان

ئەم ئیزایا دنیایێ بەری ئیزایا مەزنتر (یا قیامەتێ) دێ دەینە بەر وان، دا ئەو ل خۆ بزڤرن.

و خودێ دبێژیت: (ظَهَرَ الْفَسَادُ فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ بِمَا كَسَبَتْ أَيْدِي النَّاسِ لِيُذِيقَهُمْ بَعْضَ الَّذِي عَمِلُوا لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ) [الروم:٤١]، ئانکو: خرابی و نەخۆشی و تەنگاڤی ل گوند و باژێرێت سەر ئاڤێ و ل یێت نە ل سەر ئاڤێ، ئاشکرابوو، ژ بەر گونەهێن مرۆڤان، دا تاما جزایێ هندەك ژ وان گونەهان نیشا وان بدەت، بەلکی تۆبە بکەن و ل خۆ بزڤرن.

زەلامەك راوەستیا، و وانەك دا ل سەر بیڤەلەرزێ ل تورکیا، گۆت: مە شەرێ خودێ و پێغەمبەرێ وی دکر، و مە دهاڤێتە دەرسۆکێ، و د گەل جوهیان ئەم رێك دکەڤتین دژی موسلمانان، و مە دکرە ڤێری بۆ ویستگەهێن سەتەلایتان کو ژەهرا خۆ د ناڤ مرۆڤاندا پەخش بکەن، ئینا خودێ ئەم سزا داین، ئەڤە ئاخڤتنا ئێك ژ سەرکردێن تورك بوو د ئەنجومەنێ نوینەرێن (پەرلەمان) واندا گۆتی.

خودێ یێ ب دلۆڤانە بۆ مە، بەلێ ئەگەر ئەم دلۆڤانییێ ب خۆ نەبەین پێدڤییە چارەسەرییا مە ب کارێن خۆ بکەت، و یا هاتییە ڤەگوهاستن د فەرموودەکا قودسیدا: ((إن تابوا فأنا حبيبُهم، إن لم يتوبوا فأنا طبيبُهم، أبتلِيهم بالمصائب، لأُطهرَهم مِن الذنوبِ والمعايبِ، الحسنةُ بعشرِ أمثالها، وأزيد، والسيئةُ بمثلها وأعفو، وأنا أرأف بالعبدِ مِن الأم بولدِها))، ئانکو: ئەگەر تۆبە کر ئەز خۆشڤییێ وانم، ئەگەر تۆبە نەکر ئەز نوژدارێ وانم، دێ بەلایان دەمێ، دا وان ژ گونەه و کێماسییان پاقژ بکەم، هەر باشییەك ب دەهانە، و زێدە دکەم، و خرابی ب ئێکێیە و لێ دبۆرم، و ئەز دلۆڤانترم بۆ بەندەیێ خۆ ژ دایکێ بۆ زارۆکێ خۆ).

# الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ الْأَرْضَ مَهْدًا

ئەم یێ ل سەر هەسارەکی دژین نافێ وێ عەردە، و ئەم هەمی دزانین کو کۆمەلەکا رۆژێ یا هەی، وەکی عەتارد، و زوهرە، و مەریخ، و موشتەری، و زوحەل، و ئورانوس، و نیبتون، و بلوتون، ئەڤ هەسارە ل دۆر رۆژێ دزڤرن بەلێ ب کێر ژیانێ ناهێن، بۆچی عەرد ب تنێ ب کێر ژیانێ دهێت؟ هەسارا عەتارد؛ رۆژا وێ هەشتێ و هەشت رۆژێن عەردینە، ئانکو چل و چار رۆژ شەڤن و چل و چار رۆژا هەتاڤە، ئەرێ دێ ب کێر ژیانێ هێت؟ دێ نڤی و دێ هشیاربی و هۆسا، و هێژ درێژییا شەڤێ یا مای، کو چل و چار رۆژا شەڤە، و سالا وێ ژی دیسا هەشتێ و هەشت رۆژن، ئانکو هەر چار وەرز یێن د هەشتێ و هەشت رۆژاندا، و ئەڤ هەسارە د هەشتێ و هەشت رۆژاندا ل دۆر رۆژێ دزڤریت، و د ڤی هەساریدا هەوا نینە، ل ڤێرە ئەو ب کێر ژیانێ ناهێت، ئەو چ نهێنییە کو عەرد ب تنێ ب کێر ژیانێ دهێت؟

تشتەکێ دی، هەسارا ((زوهرە)) رۆژا وێ دو سەد و بیست و پێنج رۆژێن عەردینە، ئانکو نیڤا رۆژێن وێ شەڤە و نیڤا دی هەتاڤە، و سالا وێ دیسا دو سەد و بیست و پێنج رۆژن، بەلێ گەرماتییا ڤێ هەسارێ دەمێ رۆژ دگەهیتە بیست پلان، هندەك جاران مە گوه لێ دبیت گەرماتییا عەردی ل جهێن پیرۆز (حیجاز) دگەهیتە چل پلان هەتا پێنجییان، تشتەکە مرۆڤ خۆ ل بەرناگریت، و پلا گەرمییا ڤێ هەسارێ د رۆژێدا دگەهیتە بیست پلان، و ب شەڤێ دگەهیتە بیست پلان ژێر سفرێدا، ئەرێ ئەڤ هەسارە دێ ب کێر ژیانێ هێت، و نە هەوا لێ هەیە و نە ئاڤ؟

و هەسارا مەریخیٚ؛ رۆژا وێ وەکی یا عەردییە، بیست و چار دەمژمێرن، بەلێ سالا وێ شەش سەد و هەشتێ و حەفت سالێن عەردینە، و مرۆڤ دێ ژیت زارۆکێن وی دێ ژین و زارۆکێن زارۆکێن وی ژی دێ ژین و ئەڤە هەمی هاڤینێ نابینن، دێ مرۆڤ و زارۆکێن زارۆکێن وی د زڤستانێدا ژین، ئەرێ ئەڤ هەسارە دێ ب کێر ژیانێ هێت؟ دێ رووەك ژ کیڤە هێن؟ کی دێ وەرزان گوهۆریت، کو سالا وێ شەش سەد و هەشتێ و حەفت سالن، و ئەڤ هەسارە د ڤی ماوێ درێژدا ل دوّر رۆژێ دزڤریت، و پلا گەرماتییا وێ حەفتێ د بن سفرێدایە، و یا بێ ئاڤ و هەوایە، ل ڤێرە ئەڤ هەسارە ب کێر ژیانێ ناهێت.

و هەسارا موشتەری؛ د رۆژێدا دەه دەمژمێران هەتاڤ لێ ددەت، ئانکو د ماوێ پێنج دەمژمێراندا رۆژا وێ ب دویماهیک دهێت، و سالا وێ بەرامبەر دوازدە سالێن عەردییە، و گەرمییا وێ سەد و سیە پلان د بن سفرێدایە، و تیراتییا وێ چارێك تیراتییا عەردییە، ئەو هەسارەکە ژ گازان، و ئەو ب کێر ژیانێ ناهێت.

هەسارا زوحەل؛ سالا وێ بیست و نەه سالێن عەردینە، و دویراتییا وێ ژ رۆژێ ملیارەك و چار سەد هزار کیلۆمترن.

و هەسارا ئورانوس؛ سالا وێ چل و هەشت سالێن عەردینە.

و نیبتون؛ سالا وێ سەد و نۆت و شەش سالێن عەردینە، و هەسارا بلوتون؛ سالا وێ دو سەد و چل و حەفت سالێن عەردینە.

خودێ دبێژیت: (الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ الْأَرْضَ مَهْدًا)[1] [طه:٥٣]، ئانکو: ئەوێ عەرد بۆ هەوە خۆشکری و دەشتکری (و بەرهەڤکری بۆ ژیانا هەوە).

---

١. (إبن كثير) (١٥٧/٣) د تەفسیرا ڤێ ئایەتێدا دبێژیت: [ئانکو جهگربوونە هوین ل سەر خۆجه دبن، هوین رادبن و ل سەر دنڤن، و گەشتێ ل سەر دکەن].

چاوا تو زارۆکەکێ ساڤا دکەیە د لاندکەکا خۆش و بەرفرەهدا، و جهەکێ نەرم د ناڤدا، و د گەرماتییەکا ناڤنجیدا، چاوا لاندکا زارۆکی ژ هەمی لایانڤە د گەل وی دگونجیت و ب کێر وی دهێت؟ خودایێ مە ئەڤ عەردە یێ بۆ مە کرییە لاندك، ئانکو نێزیکیا وی بۆ رۆژێ کرییە د جهەکێ ناڤنجیدا، و گەرماتییا وی یا ناڤنجی کری د ناڤبەرا چلێ و سفرێدا، و تیراتییا وی و راکێشانا وی و زڤرینا وی یا رۆژانە و سالانە یێن ناڤنجی کرین، ئەڤە ژ قەنجی و کەرەمێن خودێنە بۆ مرۆڤی. و خودایێ مە ئاماژە یا ب ڤێ چەندێ دای، دبێژیت: ﴿الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ الْأَرْضَ مَهْدًا وَجَعَلَ لَكُمْ فِيهَا سُبُلًا لَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ﴾ [الزخرف: ١٠]، ئانکو: ئەوێ عەرد بۆ هەوە خۆشکری و رائێخستی، و بۆ ژیانا هەوە بەرهەڤکری و رێك بۆ هەوە کرینە تێدا، دا هوین (د وەغەرێت خۆدا) راستەرێ ببن (و بگەهنە وێ یا هەوە دڤێت).

خودێ هزرێن مە هشیار دکەت، و هۆشدارییێ ددەتە عەقلێن مە، و سەرنجێن مە رادکێشیت، ﴿أَلَمْ نَجْعَلِ الْأَرْضَ مِهَادًا﴾ [النبأ: ٦]، ئانکو: ما مە عەرد بۆ هەوە و ژینا هەوە و جانەوەرێت هەوە، خۆش نەکرییە و رانەئێخستییە و بەرهەڤ نەکرییە. و ئەڤ عەردە یێ هاتییە ئامادەکرن بۆ هەوە گەلی مرۆڤان، و دورست کری بۆ پێشوازیکرنا هەوە، ئەرێ هەوە هزر د ڤێ چەندێدا کرییە؟ ئەرێ هەوە هزر د ڤی عەردیدا کرییە یێ خودێ بۆ هەوە خۆجه کری؟ د هەر چرکەکێدا سیه کیلۆمەتران دبریت، ئەرێ تشتەك لڤی؟ ئەرێ دیوارەك هژیا؟ ئەرێ بانەك شەق بوو؟ ﴿أَلَمْ نَجْعَلِ الْأَرْضَ مِهَادًا﴾.

هەوا یێ د گەل عەردی، و د گەلدا دزڤریت، بایێن خۆش یێن هەین، بایێن هەیی کێش و هەوای دگوهۆرن و پاقژ دکەن، و هۆسا، و ئەگەر هەوا یێ ژ عەردی جۆدا با د لڤینێدا دا بابەلیسك دورست بن کو لەزاتییا وان هزار و شەش سەد کلیۆمەتر بن د دەمژمێرەکێدا، و بۆ زانین کو توندترین جۆرێن بابەلیسکێن وێرانکەر بۆ هەمی تشتێن ل سەر رویێ عەردی لەزاتییا وان ژ هەشت سەد کیلۆمەتران نابۆریت، و د لەزاتییا دو

سەد کیلۆمتران د دەمژمێرەکێدا با دبنە وێرانکەر، ب لەزاتییا هەشت سەد کیلۆمتران چو تشت ل سەر رویێ عەردی نامینیت، و ئەگەر هەوا تشتەك با، و عەرد تشتەك، و عەرد ژی دزڤریت ل ڤێرە دا بابەلیسك پەیدا بن کو لەزاتییا وان هزار و شەش سەد کیلۆمتر بن د دەمژمێرەکێدا، و دا هەمی تشتان وێران کەت، (أَلَمْ نَجْعَلِ الْأَرْضَ مِهَادًا).

کێ عەرد رائێخستییە و خۆشکرییە و د هەمان دەمدا یێ ب لڤینە؟ ئاڤاهی ب چەند ڤاتان ل سەر دئێنە ئاڤاکرن، ئەگەر عەرد پیچەکێ هژیا دێ ئاڤاهی ب سەرێکدا ئێن، و خانی دێ ئێنە هەرافتن، و پر دێ ئێنە پرت پرت کرن، و دا جۆ تژی بن، کێ خۆجە کرییە؟ و داکو نەمینی د خافلییێدا هەی مرۆڤ بیڤەلەرز یێن کرینە نموونە، هندەکێن ژ وان عەردی سەرێك و بن ئێك دکەن، د چەند چرکاندا، و دێ بازێر د بن ڤاتێن ئاخێ کەڤن، (أَلَمْ نَجْعَلِ الْأَرْضَ مِهَادًا).

کێ عەرد دانایە سەر رێرەوێ وێ؟ کێ لەزاتییا وێ زێدە کرییە دەمێ نێزیکی تیرا نێزیك دبیت؟ کێ ئەڤ زێدەبوونە پلە پلە کرییە؛ د لەزاتییەکا سستا رێکخستیدا، کێ وەلێ کرییە هۆسا بیت؟ دەستێ کێ ئەو گرتییە کو نەچیت؟ ئەو ژی دەستێ خودایێ دلۆڤان و شارەزایە، خودێ دبێژیت: (أَلَمْ نَجْعَلِ الْأَرْضَ مِهَادًا).

کێ گەرمییا گونجایی دایيە عەردی؟ ئەگەر ژ زڤرینێ راوەستییا دێ گەرمییا وێ بیتە سێ سەد و پێنجی پلە د رۆژێدا، و د شەڤێدا دێ بیتە دو سەد و حەفتێ پلە ژێر سفرێ! کێ کرییە د پلێن ناڤنجیدا کو د گەل لەشێن مە بگونجیت؟ کێ شەڤ و رۆژ ب درێژاییەکێ چێکرینە کو ل دویڤ پێدڤییێن مە یێن نڤستنێ و کاری بیت؟ کێ؟ (أَلَمْ نَجْعَلِ الْأَرْضَ مِهَادًا).

دەمێ هوین قورئانێ دخوینن ب لەز نەخوینن، ل سەر ئایەتێن وێ راوەستن، هزرکرنێ تێدا بکەن، (أَلَمْ نَجْعَلِ الْأَرْضَ مِهَادًا)، چاوا بۆ تە ئامادە کرییە؟ و تو بۆ وێ ئامادەکری؟ چاوا ب ڤەبارەکێ، و لەزاتییەکێ، و خۆجهییەکێ د گەل هەوای، و ئاڤ، و رۆژ، و رووەك،

و گیانەوەر، و بەرزی و نزمی، و شەڤ و رۆژ، و لڤین، و راکێشان، کو ل دویڤ پێدڤییێن تە رێك بکەڤیت؟ و دو دەست و دو پێ داینە تە، و دو چاڤ و دو سیە، و دو گوە، و هێزەکا پێزانینێ، و یا دی یا دادیکرنێ، و ئەزمانەکێ رەوانێ ئاخڤتنێ و رۆهنکرنێ، و گوهەکێ بهیستنێ پێ دزانیت کا چ ل دەڤ یێن دی هەیە.

قورئان گەردوونەکێ ئاخڤتنکەرە، و گەردوون قورئانەکا بێدەنگە، و پێغەمبەر ﷺ قورئانەکا د چۆنێدایە، و هزرێ د چێکرنێن خودێدا بکە، ژ بەر کو تو خودێ د ماوێ گەردوونێ ویدا بنیاسی، خودێ دبێژیت: ﴿إِنَّمَا يَخْشَى اللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ الْعُلَمَاءُ﴾ [فاطر:٢٨].

# لەزاتییا عەردی

د قورئانا پیرۆزدا دو ئایەتێن هەین ب شێوازەکێ کۆرت و فەبرین ئاماژێ ددنە لەزاتییا عەردی، یا ئێکێ: خودێ دبێژیت: (أَمَّنْ جَعَلَ الْأَرْضَ قَرَارًا وَجَعَلَ خِلَالَهَا أَنْهَارًا وَجَعَلَ لَهَا رَوَاسِيَ وَجَعَلَ بَيْنَ الْبَحْرَيْنِ حَاجِزًا أَءِلَهٌ مَعَ اللَّهِ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ) [النمل:٦١]، ئانکو: ئەرێ ئەوێت هەوە بۆ خودێ کرینە هەفپشك چێترن، یان ژی ئەوێ عەرد بۆ هەوە ل سەر ئاوایێ هێکێ راستکری و بۆ ژینێ خۆشکری، و رویبارێت ئاڤێ ئێخستینە تێدا، و چیا بۆ کرینە سنگ، دا نەهژیێت، و ناڤبر دانایینە د ناڤبەرا هەردو دەریایاندا (دا ئاڤا شرین و سویر تێکەلی ئێك نەبن)؟ ئەرێ پەرستییەکێ دی د گەل خودێ هەیە (هەتا ئەو، وی بپەرێسن، یان ژی خودێ ب تنێ ئەڤە داینە)؟ (نەخێر.. ئەو بێ هەفپشکە، و چو پەرستی د گەل نینن)، بەلێ باراپتر ژ وان نوزانن، و ئایەتا دووێ: (اللَّهُ الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ الْأَرْضَ قَرَارًا وَالسَّمَاءَ بِنَاءً وَصَوَّرَكُمْ فَأَحْسَنَ صُوَرَكُمْ وَرَزَقَكُمْ مِنَ الطَّيِّبَاتِ ذَلِكُمُ اللَّهُ رَبُّكُمْ فَتَبَارَكَ اللَّهُ رَبُّ الْعَالَمِينَ) [غافر:٦٤]، ئانکو: خودێیە ئەوێ عەرد بۆ هەوە کرییە جهێ خۆجهی و ئاکنجیبوونێ و بۆ ژینێ خۆشکری، و عەسمان کرییە بان، و وێنە و شکل دا هەوە و وێنەیێ هەوە جوان کر و رزقێ پاك و پاقژ دا هەوە، ڤێجا پاکی و بلندی بۆ خودێ خودانێ هەمی خەلکی.

لەزاتییا عەردی نیشانەکا مەزنە گەلەك مرۆڤان ئاگەه ژێ نینە، و یا خۆ دویرکری کو هزرا خۆ تێدا بکەن، ئەڤ عەردە ب لەزاتییا (١٦٠٠) کیلۆمتران د دەمژمێرەکێدا د هێلا کەمەریدا ل دۆر خۆ دزڤریت، و ئەڤ عەردە ب لەزاتییا ـ وەکی زانایان تەخمین کری سیهـ کیلۆمتران د چرکەکێدا ل دۆر رۆژێ دزڤریت، و د گەل ڤێ چەندێ عەرد یێ

خۆجهە ب خۆجهییەکا تمام، ب بەلگە، ئەگەر عەرد هندی سەرێ تبلا دەستێ مرۆڤی بهژیێت دێ ئاڤاهی شەق بن و ب سەرێکدا هێن، (أَمَّنْ جَعَلَ الْأَرْضَ قَرَارًا) کێ ئەو دەستهەلات هەیە کو هۆسا یێ خۆجە بیت؟ ئەرێ هەوە ئەو دەستهەلات هەیە گەلی بەندەیێن لاواز کو عەردی خۆجه بکەن؟ دەمێ د هندەك وەلاتاندا دهژیێت دێ باژێرەك ژ باژێرێن وان رویت و رەوالەکەت (کەتە دەشت)، بۆچی نەشیا ل سەر پال بدەت؟ یان هێلا ل سەر خۆجهییێ؟ (فَجَعَلْنَا عَالِيَهَا سَافِلَهَا).

دێ چ کەن؟ ئەرێ هوین دشێن لەرزینێن وێ پال بدەن؟ یان خۆجهیيا وێ پەیداکەن؟ (أَمَّنْ جَعَلَ الْأَرْضَ قَرَارًا)، ئەڤ خانییێ تو بهایێ وی دەهان ملیۆنان ددەی د هندەك تاخێن پێشکەفتیدا، چو بها هەیە ئەگەر عەرد پیچەکێ هژیا، و ئاڤاهی شەق بوون، و ئەڤ سامانێ مرۆڤی هەیی، ئەگەر تە خانی ب ڤی سامانی کرین، و عەرد ب هژیانەکا کێم هژیا و شەق بوو، دێ تو چ کەی؟ (أَمَّنْ جَعَلَ الْأَرْضَ قَرَارًا)، ل فرۆکەکێ سویار ببە، و بەرێ خۆ بدە رەخێ هەردو پەروانان، ئەو راست و چەپ د هژیێن، ئەرێ مرۆڤ دشێت فرۆکەکێ چێکەت کو چو جاران نەهژیێت؟ ئەو (عەرد) خۆجهییەکا تمامە، سەد سال، و دو سەد سال، بەلکو چەند سەدەك دێ ب سەر ئاڤاهییەکیڤە بۆرن، و دێ وەکی خۆ مینیت، تو چ ڤەگوهاستن و گوهۆرینەکێ نابینی، و ئەڤە بەلگەیە ل سەر هندێ کو عەرد یێ خۆجهە.

خودایێ مە دبێژیت: (وَتَرَى الْجِبَالَ تَحْسَبُهَا جَامِدَةً وَهِيَ تَمُرُّ مَرَّ السَّحَابِ صُنْعَ اللَّهِ الَّذِي أَتْقَنَ كُلَّ شَيْءٍ) [النمل:٨٨]، ئانکو: (وێ رۆژێ کو رۆژا قیامەتێ) دێ چیایان بینی، یا ژ تەڤە د راوەستیاینە، و ئەو ب خۆ کا چاوا عەور دچن، وەسا دچن، ئەڤە چێکرنا خودێیە، ئەوێ هەمی تشت موکوم و بنەجه چێکری.

ئەگەر چیا وەکی عەوران بچن، رامانا وێ ئەوە کو عەرد دزڤریت، ئەڤە ئاماژەکا جوانە د پەرتۆکا خودێدا بۆ زڤرینا عەردی ل دۆر خۆ.

عەرد د هەر چرکەکێدا د زڤرینا ل دۆر خۆدا نیڤ کیلۆمترێ دبریت، چونکی چێوێ (محیط) عەردی چل هزار کیلۆمترن، و ئەو خالا د چێوەیدا پشتی بیست و چار دەمژمێران دێ زڤریتە جهێ خۆ، و ئەگەر چل هزار کیلۆمتران سەر بیست و چار دەمژمێران دابەش بکەن دێ ئەنجام بیتە هزار و شەش سەد کیلۆمتر د دەمژمێرەکێدا، ئانکو نیڤ کیلۆمتر د چرکەکێدا، ئەڤە لەزاتییا عەردییە د زڤرینا ل دۆر خۆدا.

(أَمَّنْ جَعَلَ الْأَرْضَ قَرَارًا)، کێ خۆجه کرییە ب خۆجهییەکا نەلڤ؟ و ئەو ل دۆر خۆ دزڤریت، و ل دۆر رۆژێ، و د گەل رۆژێ، و رۆژ د گەل مەجەرێ، خودێ دبێژیت: (لَا الشَّمْسُ يَنْبَغِي لَهَا أَنْ تُدْرِكَ الْقَمَرَ وَلَا اللَّيْلُ سَابِقُ النَّهَارِ وَكُلٌّ فِي فَلَكٍ يَسْبَحُونَ) [يس:٤٠].

رامانا دووێ: ئەگەر مرۆڤەك ل گەشتیگەلەکا عەسمانی سویار بیت، و ژ سنورێ هێزا راکێشانا عەردی ببۆریت، ل ڤێرە کێش نامینیت، مرۆڤی شیان نامینن، چونکی گەشتیگەل ل ڤێرە یا بێ کێشە، و ئەگەر تشتەك د گەشتیگەلێدا کەفت دێ بلند بیت و ب بانێ وێڤە نویسیت، کێ وەل تشتان کرییە کو راوەستن و ب عەردیڤە بنویسن؟ ئەو ژی خودێیە، (خَالِقُ كُلِّ شَيْءٍ فَاعْبُدُوهُ) [الأنعام:١٠٢]، ئانکو: ئەوە (خودێ) چێکەرێ هەمی تشتان، وی بپەرێسن، ئەگەر لەزاتییا زڤرینا عەردی زێدە بوو، دێ ئەوێن ل سەر فرن، و ئەگەر لەزاتییا وی هەڤدە جارکی زێدە بوو دێ هەمی ئەوێن ل سەر عەردی فرن، کێ وەل مە کرییە ل سەر عەردی خۆجه بین؟ ئەگەر تە پەرداغەکێ ئاڤێ دانا سەر مێزێ، بۆچی خۆ ل سەر دگریت؟ ب هێزا راکێشانێ دراوەستیت، هەمی تشت بۆ مەلبەندێ عەردی دهێنە راکێشان، کێ وەل دەریایێن پشکا باکوور و باشوورێ عەردی کرییە ب عەردیڤە گرێدای بن؟ ئەگەر مرۆڤەك بچیتە نیڤا پشکا باشوورێ عەردی، بۆ ئوسترالیا، بۆ ئەرجەنتینێ، دێ چ بینیت؟ دێ بینیت عەرد هەر عەردە، و عەسمان ژی هەر ئەو عەسمانە، بەرێ خۆ بدە ئوسترالیا ل سەر گۆیا عەردی، دێ بینی یا ل پشکا باشووری، عەسمانی چ پێناسە هەیە ل ڤێرە؟ ئەو جهێ بەرامبەرە بۆ مەلبەندێ

عەردی، ئەگەر خۆ تو بچییە پشکا باشووری ژی، (أَمَّنْ جَعَلَ الْأَرْضَ قَرَارًا)، کیٚ دەریا ب عەردیڤە گریٚداینە د هەردو پشکیٚن باکوور و باشووریٚ عەردی؟ کیٚ وەل تەنا هەوای کرییە ب عەردیڤە ییٚ گریٚدای بیت؟ و ئەگەر هەوا ب عەردیڤە ییٚ گریٚدای نەبیت، دیٚ باهۆز و بابەلیسک پەیدا بن، دیٚ هەمی تشتان ویٚران کەن، بەلیٚ بەرگیٚ گازی ییٚ گریٚدایە ب عەردیڤە، (أَمَّنْ جَعَلَ الْأَرْضَ قَرَارًا)؛ دەمیٚ تو تشتەکی دانییە سەر عەردی دیٚ د جهیٚ خۆدا مینیت، ب شیانا خودان شیانەکی (خودیٚ)، ب ریٚکا سیستەمیٚ راکیٚشانیٚ، ژ بەر کو هەمی تشت بۆ عەردی دهیٚنە راکیٚشان.

ئەو ژی دو ئایەتیٚن قورئانا پیرۆزن کورت ڤەبرینا ویٚ، یا ئیٚکیٚ خودیٚ دبیٚژیت: (أَمَّنْ جَعَلَ الْأَرْضَ قَرَارًا وَجَعَلَ خِلَالَهَا أَنْهَارًا وَجَعَلَ لَهَا رَوَاسِيَ وَجَعَلَ بَيْنَ الْبَحْرَيْنِ حَاجِزًا أَءِلَهٌ مَعَ اللَّهِ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ) [النمل:٦١]، و یا دوویٚ: (اللَّهُ الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ الْأَرْضَ قَرَارًا وَالسَّمَاءَ بِنَاءً وَصَوَّرَكُمْ فَأَحْسَنَ صُوَرَكُمْ وَرَزَقَكُمْ مِنَ الطَّيِّبَاتِ ذَلِكُمُ اللَّهُ رَبُّكُمْ فَتَبَارَكَ اللَّهُ رَبُّ الْعَالَمِينَ) [غافر:٦٤].

ئەگەر تو بچییە سەر بانیٚ هەیڤیٚ دیٚ کیٚشا تە هیٚتە خواریٚ بۆ شەش ئیٚکیٚ، و ئەگەر کیٚشا تە ل سەر عەردی شیٚست کیلۆگرام بیت دیٚ ل سەر بانیٚ هەیڤیٚ بیتە دەه کیلۆگرام، ئەڤە سیتەمیٚ راکیٚشانیٚیە.

خودیٚ د وان هەردو ئایەتاندا سەرنجا مە بۆ ڤیٚ راستیییٚ دکیٚشیت، و مرۆڤیٚ بەختەوەر ئەوە ییٚ هزریٚ د ڤان هەردو ئایەتاندا بکەت، و ب راستی هزرکرنا دەمژمیٚرەکیٚ چیٚترە ژ پەرستنا شیٚست سالان، خودیٚ دبیٚژیت: (قُلِ انْظُرُوا مَاذَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَا تُغْنِي الْآيَاتُ وَالنُّذُرُ عَنْ قَوْمٍ لَا يُؤْمِنُونَ) [یونس:١٠١].

# ژ ئیعجازا زمانی د قورئانێدا (فِي أَدْنَى الأَرْضِ)

ژ بەلگەیێن ئیعجازا قورئانا پیرۆز کو وێ پێشبینییا کری بۆ داهاتی، و ئەو پێشبینییا خودێ گۆتی یا هاتییە رویدان، ژ ڤێ گۆتنا خودێ دبێژیت: (غُلِبَتِ الرُّومُ (٢) فِي أَدْنَى الْأَرْضِ وَهُمْ مِنْ بَعْدِ غَلَبِهِمْ سَيَغْلِبُونَ (٣) فِي بِضْعِ سِنِينَ لِلَّهِ الْأَمْرُ مِنْ قَبْلُ وَمِنْ بَعْدُ) [الروم]، ئانکو: رۆم هاتە شکاندن (ب دەستێ فورسێ). د نێزیکترین عەرددا (ژ مەکەهێ یان ژ فورسێ) و ئەو پشتی شکەستنا خۆ دێ بسەرکەڤن. د چەند سالێت بێندا (ژ سێیان هەتا دەهان) و ئەمر و فەرمان هەر یێ خودێیە بەری سەرکەڤتنێ و پشتی سەرکەڤتنێ ژی.

تشتێ مە دڤێت د ڤێ ئایەتێدا رۆن بکەین ئەڤەیە: (فِي أَدْنَى الْأَرْضِ)، خودێ چ ژ ڤێ چەندێ دڤێت؟ و کیژ جە نزمترین جهە ل عەردی؟ عەرد شێوێ تەپێیە، و ژ بەر کو تەپە هێلێن وێ د پێکڤە گرێداینە، و د بەردەوامن، و ئەو وێنێ ئەندازەیی یێ ئێکانەیە ئەگەر مرۆڤ ل سەر هێلەکا وێ بچیت ناگەهیتە چو دویماهییان، ژ بەر بازنییا وی، و ڤی وێنەی چو رەخ نینە، و قورئانا پیرۆز د هندەك ئایەتێن دیدا ئاماژە ب بازنییا عەردی کرییە، وەکی خودێ دبێژیت: (وَالْأَرْضَ مَدَدْنَاهَا) [الحجر:١٩]، ئانکو: مە عەرد یێ دەشت کری، ئانکو هێلێن سەر عەردی ناهێنە برین، و ل چو تخوییەکی ناهێنە راوەستاندن، بەلکو پێکڤە د گرێداینە، ئەگەر مرۆڤ بەرەف باکووری بچیت هەتا بگەهیتە جەمسەری، و پاشی بزڤریتە د نیڤا دی یا عەردیدا، دێ زڤریتە وێ خالێ یا وی دەستپێکری، ئەڤەیە رامانا: (وَالْأَرْضَ مَدَدْنَاهَا).

د ڤێ ئایەتێدا ئاماژەكە بۆ هندێ كو عەرد یێ بازنەیە، بەلێ رامانا: (أَدْنَى الْأَرْضِ) پەیڤا (أَدْنَى) دو رامانان ددەت: رامانا نزمترین و رامانا نێزیكترین، و ئەگەر ئەم ژ رامانا (نێزیكترین) دویر بكەڤین ژ بەر كو عەرد شێوێ تەپێیە، دێ مینیت رامانا: ژێرترین، و دیرۆكنڤیس ل سەر هندێ د رێكەڤتینە كو ئەو جەنگا رۆم ل سەر فورسێ سەركەفتی ب جهێنانەك بوو، بۆ سۆزا خودێ د هندەك سالاندا، و ل دەڤەرا (ئەغوار) ل فلستینێ بوو، و ژ بەر ڤێ چەندێ هندەك زانایێن موسلمانان چۆنە لایێ مەزنترین زانایێن جیۆلۆجیا ل جیهانا رۆژئاڤا، و ئەڤ پسیارە ژێ كر: كیژ جهێ عەردی نزمترین جهە؟ ئەگەر بێژین: كیژ جهـ نزمترینە ل سەر عەردی و د دەریایاندا، دا ئەڤ زانایە بەرسڤێ ددەت: كەنداڤێ مریانایە، یان ژی دۆلا مریانا، كو كویرترین خالە د بنێ دەریایاندا، كویراتییا وێ دگەهیتە پتر ژ دوازدە هزار متران، بەلێ نزمترین عەردێ هشكاتی دكەڤیتە عەردێ فلستینێ، ل وی دەمێ هاتنەخوارا ڤێ ئایەتێ د شیانێن مرۆڤیدا نەبوو لێگەریانا هەر پێنج كیشوەران بكەن ژ بۆ پیڤانێ، دا بزانن بلندترین و نزمترین خال تێدا كیژ جهە، بەلێ قورئانێ ئاماژە دایە كو رۆم هاتە شكاندن د نزمترین جهـ دا، و ئەو (رۆم) پشتی شكەستنا خۆ دێ ب سەركەڤن، و (أَدْنَى الأَرْضِ) ئانكو نزمترین خال ل عەردی، و پەرتۆكێن دیرۆكێ د رێكەڤتینە د گەل گۆتنا خودێ د هندێدا كو نزمترین خال د عەردیدا دەڤەرا غورە ل فلستینێ (٣٩٢م) ل ژێر ئاستێ دەریایێ، و ئەو ژی دەریایا مریە (بحر الميت).

و هەروەكی ئیمام عەلی ﵁ دبێژیت: هندەك ئایەت یێن د قورئانێدا هەین هێژ نەهاتینە راڤەكرن، ئەڤە راستگۆیەكە بۆ گۆتنا خودێ: (سَنُرِيهِمْ آَيَاتِنَا فِي الْآَفَاقِ وَفِي أَنْفُسِهِمْ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ الْحَقُّ) [فصلت:٥٣].

هەتا ئاشكرا دبیت كو قورئان پەرتۆكا خودێیە، و ئافرێنەرێ گەردوونی دزانیت كا كیژ خال د عەردیدا نزمترین خالە ژ یێن دی، و ئایەتەكا دی یا هەی هندەك رامانێ ددەت ل

سەر وی بابەتێ ئەم د ناڤدا، خودێ دبێژیت: ﴿وَأَذِّنْ فِي النَّاسِ بِالْحَجِّ يَأْتُوكَ رِجَالًا وَعَلَى كُلِّ ضَامِرٍ يَأْتِينَ مِنْ كُلِّ فَجٍّ عَمِيقٍ﴾ [الحج:٢٧].

خودێ نەگۆتییە: (وعلى كل ضامرٍ يأتين من كل فجٍ بعيدٍ)، ئەگەر عەرد یێ دەشت و راست با دا پەیڤا (بعيد) گونجایتر بیت ژ پەیڤا (عَمِيقٍ)، و ژ بەر کو عەرد بازنەیە، و تو هەر چەند ژ رویێ عەردی ژ خالەکێ دویرکەڤی دێ رێرەو یێ چەمیایی بیت، و دێ پەیڤا (عَمِيقٍ) هێت، و هەر چەند تو ژ مەکەهێ دویرکەڤی دڤێت رێرەو یێ چەمیایی بیت، و ئەڤ هاتنە رێیە دێ یا کویر (عميق) بیت، و ئەڤە دورستترە کو بهێتە سالۆخەتکرن کو ئەو یا دویرە (بعيد)، ﴿وَأَذِّنْ فِي النَّاسِ بِالْحَجِّ يَأْتُوكَ رِجَالًا وَعَلَى كُلِّ ضَامِرٍ يَأْتِينَ مِنْ كُلِّ فَجٍّ عَمِيقٍ﴾.

# چیا

خودایێ مە د قورئانا پیرۆزدا دبێژیت: (وَجَعَلْنَا فِيهَا رَوَاسِيَ شَامِخَاتٍ وَأَسْقَيْنَاكُمْ مَاءً فُرَاتًا) [المرسلات:٢٧]، ئانكو: مە چیاییێت بلند تێدا یێت چێكرین، و مە ئاڤەكا شرین و خۆش یا دایە هەوە.

و خودێ دبێژیت: (أَفَلَا يَنْظُرُونَ إِلَى الْإِبِلِ كَيْفَ خُلِقَتْ (١٧) وَإِلَى السَّمَاءِ كَيْفَ رُفِعَتْ (١٨) وَإِلَى الْجِبَالِ كَيْفَ نُصِبَتْ (١٩)) [الغاشية]، و دبێژیت: (أَلَمْ نَجْعَلِ الْأَرْضَ مِهَادًا (٦) وَالْجِبَالَ أَوْتَادًا (٧)) [النبأ].

خودێ ب دەڤێ ئایەتێن پیرۆز گازی مە دكەت ژ بۆ بەرێخۆدانا مە بۆ چیا، كا چاوا داناینە؟ و ئەڤ ئایەتە د قورئانا پیرۆزدا ل سەر چیا دئاخڤن.

چیا وەكی ستوینەكا چكلاندییە (سنگ)، سێكا وی یا د عەردیدا، و د ناڤ چەند تەخەكاندا دبۆریت، و ئەڤ تەخە ژ جهـ ناچن د ماوێ زڤرینا عەردیدا، ژ بەر ڤێ ستوینا چكلاندی كو ئەو ژی چیایە هەمی پێكڤە یێن گرێداین.

رامانەكا دی: خودێ د گۆتنا خۆدا ئاماژێ دكەت: (أَلَمْ نَجْعَلِ الْأَرْضَ مِهَادًا (٦) وَالْجِبَالَ أَوْتَادًا (٧)) [النبأ]، بۆ هندێ كو ئەڤ چیاییێ هوین ب چاڤێن خۆ دبینن، سێكا وی یا ب سەرڤەیە، و دو سێكێن دی یێن ژێر عەردی، و هەر چیایەك سێكەكا وی یا ب سەرڤە، و دو سێك یێن بن عەردیدا، بۆ نموونە چیاییێن هەمەلایا كو بلندترین گوپیتك ژ وان چیایان گوپیتكا ئێڤرستە بلنداهییا وی (٨٨٨٠) مترن، ئەڤە ئەو سێكا ب سەرڤەیە، بەلێ دو جاركییا ڤێ بلنداهییێ یا د ژێر عەردیدا وەكی سنگی، ل ڤێرە خودێ دبێژیت:

(وَالْجِبَالَ أَرْسَاهَا (٣٢) مَتَاعًا لَكُمْ وَلِأَنْعَامِكُمْ (٣٣)) [النازعات]، ئانكو: چيا بۆ (عەردى) كرنە سنگ، دا نەهەژيێت. دا هوين هەمى پێكڤە ب جانەوەرێت خۆڤە مفايى ژێ وەرگرن.

و رامانا سێيێ: خودێ دبێژيت: (وَاللَّهُ جَعَلَ لَكُمْ مِمَّا خَلَقَ ظِلَالًا وَجَعَلَ لَكُمْ مِنَ الْجِبَالِ أَكْنَانًا) [النحل:٨١]، ئانكو: خودێ بۆ هەوە ژ وى تشتێ وى چێكرى سيبەر و سە داييێ (دا ژ گەرما رۆژێ بێنە پارستن) و بۆ هەوە شكەفت ئێخستينە د چيايان‌دا، و زنجيرێن چيايێن دكەڤنە سەر كەناران، ئەو دەڤەرا دكەڤيتە پشت وەلێ دكەت كو دەڤەرەكا هشك بيت، و نەيا ب شهە، و دەڤەرەكا هێمنە، و نە دەڤەرەكا بايێن ب هێزە، ئەگەر مرۆڤ بچيتە حەلەبێ د رێكا (حمص)ێرا، دێ بينى دار هەمى د خوارن و ڤەچەميانە بەرڤ لايێ رۆژهەلاتێ، ژ بەر هەبوونا بۆشاييەكێ يان ڤەكرنەكێ د ناڤبەرا دو زنجيرێن چيايێن دكەڤنە سەر كەنارێن چيايێن لازقييە، و چيايێن لوبنان، و چيا د ڤێ ئايەتێدا خودێ يێ كرييە پاراستنكەر، (وَاللَّهُ جَعَلَ لَكُمْ مِمَّا خَلَقَ ظِلَالًا وَجَعَلَ لَكُمْ مِنَ الْجِبَالِ أَكْنَانًا)[1] و گوهۆرينا كەش و ئاڤ و هەواى يا گرێدايە ب چيايانڤە و ب بۆشاييێن وانڤە، چونكى ئەو بەرسينگێ باى دگرن، و دراوەستينن.

رامانا چارێ: خودێ دبێژيت (وَهُوَ الَّذِي مَدَّ الْأَرْضَ وَجَعَلَ فِيهَا رَوَاسِيَ وَأَنْهَارًا) [الرعد:٣]، ئانكو: ئەو خودايێ عەرد ژ بەرێك كێشايى و دەشتكرى (كو ب كێر ژيانێ بهێت)، و چيايێت بنەجه (كو بۆ عەردى ببنە سنگ و نەهێلن ژ بەرێك بچيت)، و رويبار ئێخستنە تێدا، و پەيوەندى د ناڤبەرا رويبار و چيايان‌دا، ئەوە: چيا عومبارن بۆ رويباران، (وَجَعَلَ فِيهَا رَوَاسِيَ وَأَنْهَارًا) [الرعد:٣].

---

١. (قرطبي) د تەفسيرا خۆدا (١٠/١٥٩) دبێژيت: گۆتنا خودێ: (ظِلالاً)، الظلال هەمى ئەوێن خۆ پێ سيبەر دكەن ژ خانى و داران، و گۆتنا خودێ: (مما خَلَقَ) هەمى كەسان دگريت، سيوانە (شەمسى)يە.

رامانا پێنجێ: (وَأَلْقَى فِي الْأَرْضِ رَوَاسِيَ أَنْ تَمِيدَ بِكُمْ) [النحل:١٥]، ئانكو: چیاییێت مەزن و بنەجھ یێت ئێخستینە د عەردیدا دا عەرد هەوە راگریت.

عەرد د گەل زڤرینا خۆ یا ب لەز، ل دویڤ ڤێ ڤیابا تێکچۆن دورست ببا، بەلێ دەمێ چیا ب دابەشکرنەکا هویربین هاتنە دابەشکرن ل سەر روییێ عەردێ، دێ ئەڤ دابەشکرنە کێشیتە هندێ خۆجهییێ بۆ عەردی پەیداکەن د گەل زڤرینا وی، ئەڤەیە مەرەما ڤێ ئایەتێ: (وَأَلْقَى فِي الْأَرْضِ رَوَاسِيَ أَنْ تَمِيدَ بِكُمْ)، ئانكو: دا عەرد تێك نەچیت د دەمێ زڤرینێدا.

رامانا شەشێ: خودێ دبێژیت (أَمَّنْ جَعَلَ الْأَرْضَ قَرَارًا).

کێ عەرد وەلێ کرییە یێ خۆجھ بیت؟ کێ وەلێ کرییە یێ راوەستیای بیت ب راوەستییانەکا تمام، د گەل هندێ یێ ب لڤینە؟ ژ بەر کو عەرد د چرکەکێدا سیھ کیلۆمتران دبریت، ب لەزاتییا هزار و شەش سەد کیلۆمتران د دەمژمێرەکێدا ل دۆر خۆ دزڤریت، و د گەل ڤێ چەندێ ئاڤاهی دئێنە ئاڤاکرن و دەرز ناکەڤنێ، و ئەگەر عەرد تێکچۆ کێمتر یەکەکێ ب پیڤەرێ بیڤەلەرزان دێ ئاڤایی ب سەرێکدا هێن، (أَمَّنْ جَعَلَ الْأَرْضَ قَرَارًا وَجَعَلَ خِلَالَهَا أَنْهَارًا وَجَعَلَ لَهَا رَوَاسِيَ).

تشتەکێ دی، خودێ دبێژیت: (وَجَعَلْنَا فِيهَا رَوَاسِيَ شَامِخَاتٍ وَأَسْقَيْنَاكُمْ مَاءً فُرَاتًا)[1] [المرسلات:٢٧].

---

١- (ابن کثیر) د تەفسیرا خۆدا (٤/٤٦١) دبێژیت: (وَجَعَلْنَا فِيهَا رَوَاسِيَ شَامِخَاتٍ)، ئانكو چیا یێن ئێخستینە د عەردیدا دا نەلەرزیت و تێك بچیت، (وَأَسْقَيْنَاكُمْ مَاءً فُرَاتًا)، ئانكو ئاڤەکا شرینا زەلال ژ عەوران، یان ئەوا ژ کانییێن عەردی د زێت، (وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِلْمُكَذِّبِينَ)، ئانكو ئیزا و نەخۆشی بۆ وی بیت یێ هزرکرنێ د ڤان چێکرییێن بەلگە ل سەر مەزناهییا ئافرێنەرێ وان بکەت پاشی پشتی ڤێ هەر یێ بەردەوام بیت ل سەر درەوپێکرن و کوفرا خۆ.

زانا دبێژن: ((چیایان چار جارکی رووبەرێ عەردی یێ زێدەکری، و ئەگەر ئەم وی رووبەرێ چیای گرتی ژێ راکەین دێ کۆمییا رووبەرێ عەردی پێنج جارکی کێم بیت، چونکی ئەڤ چیایە رووبەران دو قات دکەن، و ئەو بای پاقژ و هین دکەن، و چیایان هندەك کارێن هەین ب تنێ خودێ دزانیت))، ژ بەر ڤێ چەندێ خودایێ مە دبێژیت: (أَفَلَا يَنْظُرُونَ إِلَى الْإِبِلِ كَيْفَ خُلِقَت (١٧) وَإِلَى السَّمَاءِ كَيْفَ رُفِعَتْ (١٨) وَإِلَى الْجِبَالِ كَيْفَ نُصِبَتْ (١٩)) [الغاشية].

# کانزایێ زیڤی

یا هاتییە بەحسکرن کو کارگەهێن داگرتنا شیشکێن گازی د دویماهییا ڤویناخا چێکرنا واندا بۆ کەرستان د بۆرییێن زیڤڕا دچیت، ئاڤ تێڕا دهێت ژ بەر پاقژکرنێ ژ میکرۆبان، و پشتی ئەڤێ پەرتۆکەك کەڤتە د دەستێ مندا کو ل سەر (فلزات) و کانزایان دئاخفت، من ل سەر بابەتێ زیڤی ڤەکر، و من ل سەر خواند، و دانەرێن ڤێ پەرتۆکێ ـ پەرتۆك یا وەرگێڕای بوو ـ چو تشت ل سەر پەرتۆکا خودێ (قورئانێ) نەدزانین، و چو ل سەر ئیسلامێ ژی ب هەمیڤە نەدزانی، بەلکو چێدبیت چو بهایی ب هەمی ئایینان نادەن، دانەرێن ڤێ پەرتۆکێ دبێژن: ((زیڤی تایبەتمەندییەکا گرنگ یا هەی ـ ئەڤ ئاخڤتنا هویربین وەکی د پەرتۆکێدا هاتی ـ ئەو ژی ئەو میکرۆبێن د ئاڤێدا ناهێلیت، بۆ تایبەتمەندییەکا تیژك هاڤێتنێ، یان دێ ئاڤ د بۆرییێن زیڤڕا چیت، و یان دێ هندەك پارچێن زیڤی کەنە تێدا.

و د جهەکێ دیدا دبێژن: ئەڤ کانزایە کوژەکێ بەکتریانە.

و د جهێ سێییێدا دبێژن: هەما بەس ئاڤ و کانزایێ زیڤی ڤێك بکەڤن دێ ئاڤێ ژ وان میکرۆبێن تێدا پاقژ کەت.

و د جهەکێ دیدا دانەرێ ڤێ پەرتوکێ دبێژیت: دا کو لیترەکا ئاڤێ پاقژ بکەی تێرا هەیە تو هندەك پشکان ژ گرامەکا کانزایێ زیڤی دانییە د ناڤدا.

و تشتێ پێنجێ: ئەوە کو رەنگێ زیڤی ناهێتە گوهۆرین، ئەگەر هەوا یێ پیس نەبیت، ئەگەر د ناڤ هەوایدا گازێن پیس هەبن دێ رەنگێ وی هێتە گوهۆرین، ل ڤێرە هەر وەکی کانزایێ زیڤی دێ بیتە پیڤەرەك بۆ پاقژکرنا هەوای)).

زێدەباری بۆ باشییێن گەلەکێن زیڤی، زیڤ دهێتە ب کارئینان د ناڤ پیشەسازییێدا، و د وێنەیدا، و د گەهاندناندا، و یێن وەکی ڤان، زێدەباری هندێ کو بهایێ زیڤی وەك کانزایەك بۆ هەلسەنگاندنا کەل و پەلان، خودایێ مەزن د سۆرەتا (الإنسان)دا دبێژیت: (وَيُطَافُ عَلَيْهِمْ بِآنِيَةٍ مِنْ فِضَّةٍ وَأَكْوَابٍ كَانَتْ قَوَارِيرَ (١٥) قَوَارِيرَ مِنْ فِضَّةٍ قَدَّرُوهَا تَقْدِيرًا (١٦)) [الانسان]، ئانکو: خزمەتکار، ئامانێت زیڤی و پەرداغێت تەنك و زەلال، ل بەر وان دگێرن. ئامان ژ زیڤینە و بەس تێرا وان یا تێ هەی نە کێم نە زێدە.

بۆچی خودێ بەحسێ زیڤی کر، و یێ زێری نەکر، کو زێر ب بهاترە ژ زیڤی، و زێر ئامانێن خەلکێ بەحەشتێنە؟ ئەڤە ئاماژەکا قورئانێیە بۆ تایبەتمەندییێن زیڤی، ئەڤ ئایەتە دوپات دکەت کو بنەمایێن زانستی د پەرتۆکا خودێدا (قورئانێ) یێن هەین.

# وأنزلنا الحديد

خودێ دبێژیت: (لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِالْبَيِّنَاتِ وَأَنْزَلْنَا مَعَهُمُ الْكِتَابَ وَالْمِيزَانَ لِيَقُومَ النَّاسُ بِالْقِسْطِ وَأَنْزَلْنَا الْحَدِيدَ فِيهِ بَأْسٌ شَدِيدٌ وَمَنَافِعُ لِلنَّاسِ وَلِيَعْلَمَ اللَّهُ مَنْ يَنْصُرُهُ وَرُسُلَهُ بِالْغَيْبِ إِنَّ اللَّهَ قَوِيٌّ عَزِيزٌ) [الحديد:٢٥]، ئانكو: ب سویند مه پێغەمبەرێت خۆ ب بەلگە و موعجیزەیێت ئاشكەراڤە هنارتن، و مە كتێب و ترازی و عەدل د گەل وان هنارت دا مرۆڤ [ب ڤان] عەدالەتێ بكەن د هەمی كاروبارێت خۆدا، و مە ئاسن یێ دایی و چێكری، هێز و قەوەتەكا دژوار یا تێدا، و مفا و فازانج ژی بۆ مرۆڤان یێ تێدا، و دا خودێ بزانیت [ئانكو بۆ هەوە بەرچاڤ بكەت، چونكی خودێ هەر دزانیت] كا كی دێ باوەرییێ ب غەیبێ ئینیت، و دینێ وی و پێغەمبەرێت وی ب سەر ئێخیت، ب راستی خودێ یێ ب هێز و سەردەستە.

(الْبَيِّنَاتِ) ئانكو موعجیزەنە، كو دوپاتییێ ل سەر راستگۆییا پێغەمبەران دكەن، و پەرتۆك رێبازە، و ترازی ئەو عەقلە هندی وی تشتییە یێ مرۆڤ پێ هاتییە راسپاردن، و ئارمانج ب جهئینانا دادپەروەرییێیە د عەردیدا، و هێزا ژ پاشڤەبرنێ ئاسنە كو موكومییەكا توند یا هەی، و یێ ب مفایە بۆ مرۆڤان.

و زانایێن گەردوونی نوكە د وێ باوەرێدانە نەیزەك و شوهوب ب تنێ هاڤێتنێن گەردوونی یێن جێوازن د قەبارێن خۆدا، و باراپتر پێك دهێن ژ كانزایێ ئاسنی، و ژ بەر ڤێ چەندێ كانزایێ ئاسنی ئێكەم كانزا بوو مرۆڤی ڤەدیتی و نیاسی ل سەر رویێ عەردی، چونكی ب شێوەكێ پاقژ ژ عەسمانی دهێتە خوارێ ل سەر شێوێ نەیزەكان، د هەمی سالاندا ب هزاران (نەیزەك و شوهوب) دهێنە خوار و بەرەف هەسارا عەردی

دهێن، و هندەك ژ وان كێشا وان دگەهیتە دەهان تەننان، و ل ئەمریكا نەیزەكەك یێ هاتییە دیتن كێشا وی دگەهیتە شێست و دو تەننان، ئەڤ نەیزەكە پێك دهێت ژ پرتێن ئاسنی و نیكلی، و ل ویلایەتا ئەریزۆنا، شوینوارێ كەفتنا نەیزەكەكی هاتییە دیتن كو چالەكا مەزن یا چێكری، كویراتییا وێ دگەهیتە دو سەد متران، و تیرا وێ هزار مترە، و ئەو چەنداتییێن ئاسنی یێن كو دەرئێخستی ژ پرتێن تێكەل د گەل نیكلی دگەهشتە دەهان تەننان.

و ژ ڤێ شرۆڤەكرنا زانستی بۆ مە دیار دبیت، ئەو سالۆخەتكرنا هویربین یا قورئانێ، (وَأَنْزَلْنَا الْحَدِيدَ) [الحديد:٢٥]، بەلێ (بَأْسٌ شَدِيدٌ) چییە؟ و ئەو چ مفانە ئاسنی هەین وەكی قورئانێ ئاماژە پێ دای؟ دبێژیت: (فِيهِ بَأْسٌ شَدِيدٌ وَمَنَافِعُ لِلنَّاسِ)؟ زانایێن كیمیایی ئاشكەرا كر كو كانزایێ ئاسنی ژ هەمی كانزایان پتر یێ خۆراگر و ب هێزە، و ب سروشتێ خۆ یێ نەرمە، و خۆ ل بەر پەستانێ دگریت، و دیسا ژ هەمی كانزایان چرترە، و ئەڤە مفایی دگەهینیتە عەردی بۆ پاراستنا هەڤسەنگییا وی، دیسا كانزایێ ئاسنی دهێتە هژمارتن كو سێكا پێكهاتەیێن عەردی پێك دئینیت، پترین توخمێن مەگناتیسییە، و ئەڤ چەندە بۆ پاراستنا راكێشانا عەردییە.

دیسا ئاسن توخمەكێ سەرەكییە د گەلەك زیندەوەراندا، هەروەسا د گەشەكرنا رووەكاندا كو پێكهاتەیێن وێ ژ ئاخێ دمێژیت، و خوێ یێن وێ دچنە د پێكهاتەیێ خانێن خوینا زیندەوەراندا.

و ل ڤێرە جهێ ئاماژە پێكرنێیە بۆ هندێ كو رێككەفتنەكا ژمارەیی یا حێبەتی یا هەی د ناڤبەرا ژمارا سۆرەتا (الحدید)، كو پێنجی و حەفتە (٥٧) د قورئانا پیرۆزدا، و كێشا گەردیلەیی یا كانزایێ ئاسنی.

و كۆنگرەك ل سالا (١٩١٠ز) هاتە گرێدان، ژ بۆ ڤەكۆلینا كاروبارێن كانزایان د ناڤخۆیی و كویراتییێن عەردیدا، و ل ڤێرە دودلی بۆ ئامادەبوویێن كۆنگرەی دورست

ببوو كو ل سالا (١٩٧٠ز) دێ عومبارییا ئاسنی د عەردیدا ب دویماهیك هێت! و راپۆرت ل دۆر هەبوونا ڤی (فلز)ێ مەزن دەرئێخستن، كو یێ مشەیە د عەردیدا ب چەنداتییێن مەزن، و نویترین ئامار دیار دكەن كو كەرستێ ئاسنی ئەوێ د ناڤ تیڤكلێ عەردیدا هەی هەمبەر پێنج ژ سەدێ (٥%) ژ كێشا تیڤكلێ عەردییە، هندەك ژ وان (فلزات)ێن ئاسنێ هەیی ل سەر روییێ عەردی حسێب دكەن حەفت سەد و پێنجی هزار ملیۆن ملیۆن تەنن! ئەڤ تشتە نە مەرەما مەیە، بەلێ تشتێ مەرەما مە پێ ئەوە كو ژیانا مە یا مرۆڤان، و ژیانا هەمی زیندەوەران، و ژیانا هەمی رووەكان یا راوەستییایە ل سەر ئاسنی! ئەڤ تشتە چێدبیت نەهێتە باوەركرن.

ئاسن دچیتە ناڤ پێكهاتا خوینێ، و ئەگەر ئاسن د ناڤ خوینا مرۆڤیدا ب تنێ سێ گرام كێم ببن دێ ژیانا وی كەڤیتە بەر گەفا مرنێ، و كێشا ئاسنی د ناڤ پێكهاتێ مرۆڤیدا ژ ڤان گرامان زێدەتر نینە، چونكی یێ د ناڤ هیموگلوبینا خوینێدا، و ئاسنە وەل خوینێ دكەت كو رەنگێ وێ سۆرێ تاری بیت د مرۆڤیدا، و د هەمی زیندەوەراندا.

# ئاخ و ئەو زیندەوەرێن د ناڤدا

تشتەکێ هەی چو نامینیت مرۆڤ باوەر بکەت، کو د ناڤ مەترەکا چارگۆشە یا ئاخا ئەم ب کار دئینین بۆ چاندنێ پتر ژ دو سەد هزار کرمێن (عنکبی) یێن تێدا هەین، و سەد هزار مێش، و سێ سەد کرمێن ئاخا سادە، و ب هزارەهان ملیۆنان ژ میکرۆبان، و زیندەوەرێن گەلەك هویر، و د ئێك گرامێ ئاخێدا، چەندەهان ملیار ژ بەکتریا یێن تێدا هەین، زیندەوەرێن گەلەك هویرن، ل سەر شێوێ دارێن راست و تەپکان و ل سەر شێوێ بادایی (بورغی)، هندەك ژ وان پێدڤی ب ئۆکسجینێیە، و هندەك ژ وان پێدڤی پێ نینە، هندەك ژ وان د حولینە، و هندەك ژ وان کۆلکێن پێڤە دشێن پێ بزاڤێ بکەن، ب راستی ئەڤ کارگەهە خودان بزاڤەکا بەردەوامە، ب هندەك کاران رادبن ژ ئالۆزترین کارانە و دائێخستینە هەتا نوکە، کارێن ڤان زیندەوەران چییە؟ زانایان هندەك کارێن وان زانین، و کارێ وان یێ دورست هێژ نەهاتییە زانین و یا مای نهێنی، و ئەڤ کارگەها بزاڤەکا بەردەوام هەی ب هندەك کاران رادبن ژ گرنگترین کار و مفاینە بۆ مرۆڤی، ئەگەر رەگەزێ مرۆڤی ل سەر عەردی نەمینیت، دێ ژیان هەر مینیت بەردەوام، بەلێ ئەگەر ئەڤ زیندەوەرە نەمینن دێ ژیان ب هەمیڤە ل سەر عەردی ب دویماهی هێت، چێدبیت هەبوونا ڤان زیندەنەوەران گرنگتر و مەترسیتر بیت ژ هەبوونا مرۆڤی، هەر تشتێ ئەم دخوین ب شێوەکێ ئێکسەر یان نەئێکسەر، بنیاتێ وی ژ رووەکێ کەسکە، و دەمێ تو گۆشتی دخۆی، گۆشت یێ ژ گیای چێبووی، و دەمێ پەز گیای دخۆت و لەشێ وی گەشێ دکەت و مەزن دبیت، تو وی گۆشتی دخۆی، خوارنا تە چ یا ئێکسەر بیت یا نەئێکسەر بیت بنیاتێ وێ رووەکێ کەسکە، خودێ دبێژیت: (الَّذِي جَعَلَ لَكُمْ مِنَ الشَّجَرِ الْأَخْضَرِ نَارًا

**فَإِذَا أَنْتُمْ مِنْهُ تُوقِدُونَ) [يس:٨٠]، ئانكو: ئەوێ بۆ هەوە ژ دارا شین ئاگر دایی، ڤێجا هوین ئاگری پێ هەل دکەن.**

**پەیڤا (الأَخْضَرِ) ل ڤێرە زانا حێبەتیکرن، چاوا دار کەسك دبیت، و چاوا دبیتە سۆتەمەنی؟ دار نابیتە سۆتەمەنی ئەگەر یا هشك نەبیت، و بۆچی خودێ گۆتییە: (مِنَ الشَّجَرِ الأَخْضَرِ) [یس:٨٠].**

**هندەك زانا دبێژن: پەیڤا (الأَخْضَرِ) ئاماژەکا زانستییە بۆ هندێ کو ئەڤ دارە نابیتە دار ئەگەر بەلگێن کەسك نەبن، ژ بەر کو بەلگێن کەسك بنیاتێ هەبوونا وێنە، بەلکو گەشەبوونا رووەکی پشت بەستنێ ب رویدانەکێ گرێ ددەت ناڤێ وێ شیکرن و دەربرینا رۆناهیییێیە، چو رووەك نینە بێ رۆناهی، و بێ رۆژ، و بێ ئاڤ، و رۆژ، و گازا دووان ئۆکسیدێ کاربۆنی ($CO_2$) ئەوا خودێ کرییە د هەواییدا ئەوە ئەگەرێ گەشەکرنا رووەکی، و بەلگێن دارا کارگەهێن چێکرنا کەرستێن رووەکی یێن سەرەکی و ئەندامینە.**

**بەلگ دوەریێن، و با دهێت، و دێ ڤان بەلگێن وەریای بژینیت ل سەر هەمی لایێن ئاخێ، و ب ملیاران زیندەوەرێن هویربین دێ هێن و داعویرن، و دەمێ داعویران دێ بنە خوارنەکا باش بۆ زیندەوەرێن مەزنتر ژ وان، ئەو ئێك خانەیینە ب داعویرانێ رادبن، و پاشی دێ بنە خوارنەکا باش بۆ زیندەوەرێن ژ وان باشتر، ئەو ژی بەکتریانە، ئەڤە ب سێ قویناخان چێدبیت؛ و ئەڤ کریارێن زیندەیی پێدڤی ب هەواینە، و هەوا د ناڤ ئاخێدا ژ کیڤە دهێت؟ کارێ کرمان ئەوە تونێلا د ئاخێدا ڤەدکەن، و کرم و یێن بخۆر و مار، و هەمی زیندەوەرێن د بن ئاخێڤە دژین کارێ وان با گوهۆرینە، و ئەگەر ئەڤە نەمینیت شینبوون ل سەر عەردی نامینیت.**

**ئەڤ کرمە ئاخێ دادعویرن، و پیتێنەرێ (سماد) دەردکەن، و ب تنێ ـ خودێ دزانیت ـ کا ئەڤ کرمە چەند تەننان بەرهەم دئینن د هکتارەکێدا، و ئەڤ کرمە چەند تەنان ژ پیتێنەری د کیلۆمترەکا دوجاریدا بەرهەم دئینن.**

**ئەو گەردوونەكێ مەزنە، و ئافرێنەرەكێ مەزنە، و یاسایەكا زانایانەیە، دێ كیڤە چین؟ و ئەو چییە مە ژ خودێ دكەت، و ژ جێبەجێكرنا فەرمان وی؟ ئەڤە هندەك راستییێن گرنگ بوون، (وَمَا أُوتِيتُمْ مِنَ الْعِلْمِ إِلَّا قَلِيلًا) [الاسراء:٨٥]، ئانكو: ژ كێمەكا زانینێ پێڤەتر بۆ هەوە نەهاتییە دان).**

**(وَلَا يُحِيطُونَ بِشَيْءٍ مِنْ عِلْمِهِ إِلَّا بِمَا شَاءَ) [البقرة:٢٥٥]، ئانكو: (ئەو) ب سەر چو زانینا وی هلنابن، ئەو نەبیت یا وی (خودایی) ڤیایی).**

**د ئێك گرامدا چەند ملیار ژ بەكتریا یێن تێدا، چ روی ددەت د بن ئاخێڤە؟ ناهێتە زانین ژ بلی خودێ، ئانكو كەس نوزانیت ژ بلی خودێ، ئەو كارگەهن، بوونەوەرن، و كریارێن گوهۆرینێنە، و هاوكێشەنە، و ئەم نوزانین، چ یێ مە نینە ب تنێ ئەم بەرهەمی دچنین، و دخوین، زەرزەواتی دچنین، و دخوین، و دەرامەتی د دورین، و دخوین، و یا مایی ل سەر خودێیە، (وَإِنْ تَعُدُّوا نِعْمَةَ اللَّهِ لَا تُحْصُوهَا) [إبراهيم:٣٤]، ئانكو: ئەگەر هوین نیعمەت و كەرەمێت خودێ بهەژمێرن هوین نەشێن بهەژمێرن (چونكی هندی گەلەكن ب دویماهی نائێن.**

**خودێ عەرد و تشتێن تێدا یێن ئافراندین، و یێن ژێر عەردی، و ل سەر عەردی دا ئەم وی بنیاسین، و ئەگەر مە ئەو نیاسی ئەڤە مە ئەو ئارمانجا ئافراندنا مە ب جە ئینا، و ئەگەر ئەم وی نەنیاسین وەی بۆ وێ پەشێمانییا دبینین، خودێ دبێژیت: (أَنْ تَقُولَ نَفْسٌ يَا حَسْرَتَا عَلَى مَا فَرَّطْتُ فِي جَنْبِ اللَّهِ) [الزمر:٥٦]، ئانكو: دا كەس (رۆژا قیامەتێ) نەبێژیت: حەیف و مخابن بۆ وێ تەخسیری و سستییا من د گوهدانا خودێدا كری.**

# تصريف الرياح

ژ وان نیشانێن ئاخفتنکەر ل سەر مەزناهییا خودێ، خودێ دبێژیت (وَتَصْرِيفِ الرِّيَاحِ) [البقرة:١٦٤]، ئانکو: ئینان و برنا بای. ئەڤ بایێ کو ئەگەرەکە ژ ئەگەرێن ژیانا مە، ئەو رحا زیندەوەرایە، چاوا خودێ بای دئینیت و دبەت؟

هندەك زانا دبێژن: ((دەمێ ئاڤ دکەڤیتە بەر گەرمییێ، و ب رەخڤە لەشەکێ رەق هەبیت و تووشی هەمان گەرمی ببیت، دێ ئاڤ گرانتر بیت بۆ وەرگرتنا گەرمێ ژ لەشێ رەق))، و ئەگەر ئەم چەندەکا ئاڤێ دانین ب قەبارەکێ هندی وێ ب رەخ وێڤە ژی تشتەکێ رەق بینین، و هەردویان دانینە بەر تیشکا رۆژێ بۆ ماوێ دەمژمێرەکێ، دێ پلا گەرماتییا ئاڤێ شەش پلا بلند بیت، و یا تشتێ رەق دەه پلا دێ بلند بیت، ژ بەر کو ئاڤ یا گرانە بۆ وەرگرتنا گەرمییێ، و بەردان و ژێ دەرئێخستنا وێ.

لەوا دەمێ تیشکا رۆژێ ل دەڤەرێن کەناری ددەت، هشکاتی ب لەزتر دشارییێت ژ دەریای، دەمێ هشکاتی ب لەزاتییەکا زێدەتر دشارییێت، هەوا ژێك دهێتە دەر، و بەرەف بلندیێ دچیت، دلڤلڤیت، ل ڤێرێ دێ پەستان کێم بیت، و ئەگەر هەوایێ دەریای گەلەك تیر بوو و گەلەك سار بوو و پەستانا وی گەلەك بیت، دێ ئەو هەوا هێتە هشکاتی، لەوا ل هەر جهەکی ژ جهێن کەناران، دێ بینین بایێ هین یێ دەریایی دهێتە ڤەگوهاستن پشتی نیڤرۆ ژ دەریای بۆ هشکاتی، خودێ دبێژیت: (وَتَصْرِيفِ الرِّيَاحِ).

ئیمام (طبري) د تەفسیرا خۆدا[1] دبێژیت: ((گۆتنا نهێنی د ئاخفتنا خودێدا: (وَتَصْرِيفِ الرِّيَاحِ)... خودێ بای وی دەمی فرێ دکەت جارەکێ ئاڤزکەر (لواقح)، و جارەکێ خرش دکەت، و فرێ دکەت وەك ئیزایەك هەمی تشتان وێران دکەت ب فەرمانا خودێ... و زار قەتادەی بۆ گۆتنا خودێ: (وَتَصْرِيفِ الرِّيَاحِ وَالسَّحَابِ الْمُسَخَّرِ) دبێژیت: خودایێ مە خودان شیانە ل سەر ڤێ چەندێ، ئەگەر ڤیا دێ کەتە ئیزا، بایەکێ خرش، ئاڤزکرنێ نەکەت، ئەڤە ئیزایەکە ل سەر وان یێ بۆ فرێ دکەت... و هندەك زمانناسێن عەرەبییێ وەسا هزر دکر کو رامانا گۆتنا خودێ: (وَتَصْرِيفِ الرِّيَاحِ) ئەوە کو جارەکێ ژ باشووری دهێت، و جارەکێ ژ باکووری، و ژ رۆژهەلاتی، و ژ رۆژئاڤای، پاشی گۆت: و ئەڤ ئینان و برنا وییە (تصریفها)، و ئەڤ سالۆخەتێ با پێ سالۆخەتکری سالۆخەتێ گۆتنا (تصرُّفها)یە نە (تصریفها)یە، چونکی ئینان و برنا وی (تصریفها)یە ئینان و برنا خودێیە بۆ بای، و گۆتنا (تصرُّفها) جیاوازییا هاتنا بایە.

---

١. تەفسیرا (طبري) (٢/٦٥).

# پیسبوونا هەوای و ژینگەهێ

ئەوا مرۆڤ د ژینگەهێدا دکەت کارتێکرنەکا نەرێنی د ساخلەمییا مرۆڤیدا دکەت، و مرۆڤ دەمێ خۆ دیار دکەت کو یێ خۆشحال بووی د ژیانا خۆدا، بەلێ ژ لایەکێ دیڤە وی ژیانا خۆ وێرانکر.

پیسبوونا ژینگەهێ ب ئێکەم ئۆکسیدی کاربۆن (CO) دێ مینیت هندی ترومبێل و فرۆکە و ئامویرە د هەر کارگەهەکێدا مابن، یان د کێلگەهەکێدا، و ئەڤ گازە چ دکەت؟ دهێتە سۆتن، و ئەڤ گازە ب هیموگلۆبینا خوینێڤە دگریت، و گازا دوان ئۆکسیدا کاربۆنێ ئەوا ترومبیل و فرۆکە بەرددەن و هەمی ئامویرێن سۆتنێ، سۆتنا سۆتەمەنییێ شل، ب خەنایا خوینێڤە دهێتە گرتن، و هیموگلوبینا خوینێ ئەو کەرستێ سۆرە د خوینێدا، کەرستێ ئاسنی د خوینێدا، ئەڤ ئاسنە کارلێکێ د گەل گازا دوان ئۆکسیدێ کاربۆنێ دکەت دێ کارکەت بۆ دەرئێخستنا ئۆکسجینێ ئەوا کو خوین ڤەدگوهێزیت، چونکی هەڤگرتنا ڤێ گازێ ب هیموگلوبینا خوینێڤە بهێزترە ژ هەڤگرتنا وێ ب ئۆکسجینێڤە، دێ بیتە ئەگەرێ کێم وەرگرتنا خانان ژ ئۆکسجینێ، دێ چ چێ بیت؟

دێ لێدانێن دلی بلند بن، و وەستیانا کۆئەندامێ هەناسێ دێ زێدە بیت، و ئەڤە هەمی دێ بنە ئەگەرێ دل تەنگبوون (توندبوون) و وەستیانێ دکێشیتە گەلەك نەخۆشییێن دلی و سینگی، و دەمێ مرۆڤ هەناسێ ب هەوایەکی دکەت کو هەشتێ پشك ژ ملیۆنێ ژ گازا ئێکەم ئۆکسیدێ کاربۆن تێدا بن د ماوێ هەشت دەمژمێران دێ هەست ب خەندڤینێ کەت، و دەمێ تو د جادەکا قەرەبالغدا بی، و ترومبێل ڤێ گازا ژەهراوی هەشت دەمژمێران دەردکەن، ڤی دەمی تە هەوایەکێ پیس هەلکێشا کو هەشتێ پشك ژ ملیۆنێ ژ ڤێ گازێ یێن تێدا، دێ چ چێ بیت؟ لەزاتییا ڤەگوهاستنا ئۆکسجینی بۆ

خوینێ دێ کێم بیت ب رێژا پازده ژ سەدێ، و ئەڤە ئەگەرە کو خوین تایبەتمەندییێن خۆ یێن سەرەکی ژ دەست بدەت.

و دەمێ بزاڤا هاتن و چۆنێ توند بوو، و جادە ب قەرەبالغ کەڤتن ب هۆیێن جودا یێن ڤەگوهاستنێ د دەمێن زێدە قەرەبالغدا، دێ ڤەگرتنا هەوای ژ ئێکەم ئۆکسیدێ کابۆنی گەهیتە چل پشك د ملیۆنێدا، ژ بەر ڤێ چەندێ گەلەك خەلکێ ئاکنجییێن جهێن قەرەبالغ ب هاتن و چۆنێ تووشی نیشانێن ژەهریبوونا توند و سەرئێشێ دبن، و لاوازییا دیتنێ، و کێمی د رێکخستنا ماسۆلکاندا، و ڤەرەشیان، و گەلەك ئێشانێن هناڤان (باطني)، و د کاودانێن گەلەك توندا ڤان نیشانان ژ دەستدانا هۆشێ یا د گەلدا، و هندەك جاران مرنا ژ نیشکەکێڤە.

ئەڤ هەوایێ ب دوان ئۆکسیدێ کاربۆنی پیس بووی، ژ دەست کەڤتییێن شارستانییا نوینە، و پێشکەڤتنا مرۆڤی ـ ب پیڤەرێ ڤی سەردەمی ـ کو ل ترومبێلەکێ سویار ببیت، و د رێکێن مەزنێن پر قەربالغا ترومبێلان بچیت، یا تژی دوان ئۆکسیدێ کاربۆن بیت.

و ئۆکسیدا کاربۆنی دهێتە هژمارتن بەرپرس ژ زێدەبوونا تووشبوویێن نەخۆشییێن بێهنتەنگییا دۆم درێژ (الربو المزمن)، و کولبوونا سیهێ یا توند، و هندەکێن دی.

ژیان یا هاتییە ئافراندن ب ئافراندنەکا پاقژ، و مە ب ئامویرێن خۆ یا پیس کری، و ب رەوشتێ خۆ یا پیس کری، و پیساتی گەلەکا بەرفرەهە، سەقایەکێ هەی یێ ب دەنگی پیس بووی، و ئەڤ دنگە دنگا بەردەوام ژینگەهێ پیس دکەت، و ئەڤ گازا ژەهراوی ژینگەهێ پیس دکەت، و هەر تشتێ مرۆڤان چێکری خۆشییا ژیانێ پێ دهێتە برن، ئەڤێ ب تنێ ئارمانجەك ب جه ئینا، و گەلەك ئارمانج وێرانکرن؛ ساخی و ساخلەمی و زەلالی و پاقژییا خۆ ژ دەست دا، ئەز نابێژمە هەوە سویاری ترومبێلێ نەبن، نەخێر، بەلکو مەرەما من ژ ڤێ ئاخڤتنێ ئەوە بۆ هەوە کاریگەرییا شارستانییا رۆژئاڤا یا نەرێنی د ژینگەها مرۆڤایەتییێدا دیارکەم.

# یاساییێن فیزیایی و کیمیایی

دەمێ مرۆڤێ باوەردار زانستان دخوینیت، ب ئافرێنەرێ گەردوونیڤە گرێ ددەت، و وێ زانینێ ئاشکەرا دکەت ژ ڤان یاسایێن خودێ چێکرین.

ئەم هەمی دزانین دیاردەکا هەی ژ تایبەتمەندییێن کانزایانە ئەو ژی شلبوونا کەرستێن رەقە، کەرستێن رەق دهێنە گوهۆرین بۆ شلی ب حەلکرنێ، دێ چاوا شێین کانزایان ژ جهێن وان ئینینە دەر ئەگەر د گەل ئاخێ تێکەل نەبوون، و دێ چاوا شێین زڤرینینە شێوێ وێ ئەگەر حەلاندنا وێ و قەرسینا وێ نەبان، ب حەلکرنێ و قەرسینێ ئەم کانزایان ژ کویراتییا عەردی دئینینە دەر، و ب ڤان هەردویان ئەم کانزایان شێوە دکەین وەکی مە دڤێت، ئەڤە یاسایەکە ب حەزکرنا خودێیە.

تشتەکێ دی: هەلمبوون و چربوون، ئەگەر ب ڤان هەردو یاسایان نەبیت، ئەرێ دا باران هێن؟ ئاڤا دەریای زێدە یا سویرە، و تیشکا رۆژێ دکەتە هەلم، چێکرنا کێیە کو کەرستێن حەلیایی د ناڤ شلەیدا (وەکی خوێ) نەبنە هەلم؟ دێ د ئاڤێدا مینیت، و ب تنێ ئاڤا بێ زەغل دێ بیتە هەلم، و کێ یاسایا تیربوونێ چێکرییە، کو هەلمێ دکەتە ئاڤ، و ئاڤێ دکەتە هەلم بێی کو کەرستێن گیرهەیی د ناڤ ئاڤێدا هەلگریت دەمێ دبیتە هەلم؟ ئەگەر یاسایا هەلمبوون و تیربوونێ نەبا باران نەدبوون، و ئاڤا شرین ژی نەدبوو ئەم ڤەخۆین، و تێهنکا خۆ بشکێنین.

تشتەکێ دی: دیاردا گیرهەبوونێ، مرۆڤ ژ ئاڤەکا لاواز یێ هاتییە ئافراندن، مرۆڤی هەستی یێن هەین، و هەستییێ رانی هێزا پتر ژ دو سەد و پێنجی کیلۆیان یا هەی، و

مرۆڤێ خودان هێز و شیان دشێت خۆ ل بەر پێنج سەد کیلۆگرامان بگریت، ئەڤێ رەڤاتییا هەستییان، چاوا دا ب ڤی شێوەیی بیت ئەگەر دیاردا (گێرهەبوون)ێ نەبا؟ ژ بەر کو کەرستێن حەلیایی د شلەیدا ژ شلەی ڤەدبن و دبنە گێرهە و ڤی هەستی دورست دکەن.

نوژدار دبێژن: ناڤکا ددانی پشتی ئەلماسی دهێت بۆ رەڤاتییێ، ئەگەر گێرهەبوون نەبا ددانان ئەڤ موکومییە نەدبوو، و هەستی ژی نەدبوون. وەکی مە نوکە هەی.

و دیاردەکا دی ئەو ژی حەلاندنە، ئەگەر حەلاندنا کانزایان د ناڤ ئاڤێدا نەبا رووەك نەدشیا هەمی کانزایان د ئاخێدا وەربگریت، هەمی خوێ یێن کانزایان د ئاخێدا د گەل ئاڤێ دهێنە حەلاندن، و ئاڤ د گەل کانزایێن حەلاندی بەرەڤ سەری دچن و بەلگێن رووەکان پێدڤییا خۆ ژێ وەردگرن، و ئەگەر دیاردا حەلاندنێ نەبا خوارن ل سەر شێوێ شلەی حەل نەدبوو، و ئەڤ شلە دهێتە ڤەگوهاستن بۆ خوینێ، و خوین ڤان هەمی کەرستێن خوارنێ بۆ خانان ڤەدگوهێزیت.

ئەگەر ئەم ل سەر یاسایا شلبوونا کەرستێن رەق، و یا ڤەرسینێ، و یا حەلاندنێ، و یا گێرهەبوونێ، و یا هەلبوونێ، و یا چربوونێ راوەستین شیانا خودێ و زانینا وی دێ بۆ مە ئاشکەرا بیت.

ئەگەر مرۆڤێ باوەردار بڤێت خودێ ب دورستی بنیاسیت، هەمی تشت د سەلماندینە ژ لایێ ویڤە، هەر یاسایەکا مرۆڤ دخوینیت هەتا د پەرتۆکێن زانستی یێن خۆرستی و زەلالدا، دێ بینیت ئەڤ یاسایە ئاماژێ ب مەزناهییا خودێ دکەت، و ئەگەر دیاردا حەلاندنا خوێیان نەبا ئەم نەدشیاین ل ڤی جهی بین، چاوا تو ل سەر هەردو پێیان ب رێڤە دچی؟ ئەگەر دیاردا گێرهەبوونێ نەبا چو مرۆڤ نەبوون ل سەر پێیان ب رێڤە بچن، و ئەگەر دیاردا حەلاندنێ نەبا تو نەدشیای هەمی خوارنێ وەربگری، تو پێکهاتێن ئاسنی د خۆی و هەست پێ ناکەی، خوێ یێن کانزایان هەمی د خوینا تەداد حەلاندینە،

ئەگەر دیاردا حەلاندنێ نەبا تو نەدشیای مفایی ژ کانزایان وەربگری، و نەدشیای مفایی ژ خوارنێ وەربگری.

هویربینییێ د ڤان شەش یاسایاندا بکەن، (حەلاندن، گیرهەبوون، هەلبوون، چربوون، شلبوونا کەرستێن رەق، قەرسین. ئەڤە شەش یاسانە، بێی ڤان ژیان ل سەر عەردی چێ نەدبوو، خودێ دبێژیت: ﴿قُلِ انْظُرُوا مَاذَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَا تُغْنِي الْآيَاتُ وَالنُّذُرُ عَنْ قَوْمٍ لَا يُؤْمِنُونَ﴾ [یونس: ١٠١].

(طبري) د راڤەکرنا ڤێ ئایەتێدا دبێژیت: ((خودێ دبێژیت: هەی موحەممەد بێژە وان موشرکێن ژ قەومێ خۆ ئەوێن پسیارا ئایەتان دکەن ل سەر دورستیا وی تشتێ تو گازییا وان بۆ ئێکتاپەرستییا خودێ دکەی، و لادانا بوت و هەڤال پشکان: گەلی مرۆڤان بەرێ خۆ بدەنێ چ د عەسمانانداا هەیە ژ نیشانێن بەلگە ل سەر وێ راستییا گازییا هەوە دکەم ژ ئێکتاپەرستییا خودێ؛ ژ رۆژا وێ، و هەیڤا وێ، و جوداهییا شەڤ و رۆژێن وێ، و هاتنە خوارا بارانێ بۆ رزقێن بەندەیان ژ عەورێن وێ، و د عەردیدا ژ چیایێن وێ، و بژالەییا وی ب رووەکێ وی، و قویتێن خەلکێ وی، و هەمی رەنگێن حێبەتییێن وی، و ئەوا د ڤێ چەندێدا بۆ هەوە ئەگەر هوین عەقلمەندییێ و هزرکرنێ بکەن شیرەت و سەربۆرە، و بەلگەیە ل سەر هندێ کو ئەڤ چەندە ژ کارێ وییە ئەوێ د دەستهەلاتا خۆدا نابیت هەڤالەک هەبیت، و وی چو پشتەڤان نینە ل سەر رێڤەبرنا وی و پاراستنا وی، بەسی هەوەیە نیشانێن ژ بلی ڤان))[1].

---

١. تەفسیرا (طبري) (١١/١٧٥).

# بیڤەلەرزێن دنیایێ و بیڤەلەرزا قیامەتێ

د سەحیحا بوخاریدا زار ئەبی هورەیرە دبێژیت: پێغەمبەری ﷺ گۆت: ((لا تقومُ الساعةُ حتى يُقبضَ العِلمُ، ويَكثرَ الزّلازلُ، ويتقاربَ الزّمانُ، وتظهرَ الفتنُ، ويَكثرَ الهرجُ، وهوَ القتلُ القتلُ، وحتى يَكثرَ فيكمُ المالُ فيَفيضَ))[1]، ئانكو: قیامەت نارابیت هەتا زانست نەمینیت، و بیڤەلەرز زێدە دبن، و دەم نێزیك دبیت، و فیتنە بەلاڤ دبن، و كوشتن زێدە دبیت، و هەتا مال ل دەڤ هەوە مشە دبیت و دێ زێدە دبیت.

د هەر دەمەكیدا مە د دەنگ و باساندا گوه لێ دبیت، بیڤەلەرزەكێ یا ل جهەكی دای، و هندەك بیڤەلەرز پلێن وان د مەزنن، كو دبنە ئەگەرێ ژ دەستدانا ژیانا دەهان هزار كەسان، و زۆربوون و دژواریا بیڤەلەرزان راستگۆییا گۆتنا پێغەمبەرییە، كو ئەو ژ دەڤ خۆ نەئاخفتییە، بەلكو ئەو ب وێ وەحییێ دئاخفت ئەوا ژ لایێ خودێڤە بۆ دهات، ئەڤان بیڤەلەرزان كار و مەرەمێن وان: ئەو رامانا بیڤەلەرزا مەزن ددەتە مە، ئەوا خودێ سۆز ل سەر هاتنا وێ دایی: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمْ إِنَّ زَلْزَلَةَ السَّاعَةِ شَيْءٌ عَظِيمٌ﴾ [الحج: ١]، ئانكو: گەلی مرۆڤان پارێزكاریا خودایێ خۆ بكەن، ب ڕاستی بیڤەلەرزا رۆژا قیامەتێ تشتەكێ مەزنە.

عەرد ژ پترینێ هەسارێن د كۆمەلا رۆژێدایە كو تیراتییا وێ یا زۆر بیت، و تیراتییا عەردی پێنج جاركی پترە ژ تیراتییا ئاڤێ، و زانا بیڤەلەرزێ شرۆڤە دكەن، لڤینەكە د ناڤ عەردیدا، ژ بەر كو پەستانەكا مەزن دكەڤیتە سەر تیڤكلێ عەردی و عەرد خۆ ل بەر ناگریت، ل ڤێرە دێ ئەڤ تیڤكلە تیك و شەق بیت، ئەڤ شەقبوونە د تیڤكلێ

---

١. بوخاری (٩٨٩).

عەردیدا، ئەڤ بیڤەلەرزەیە کو ئەم جار جار د دەنگ و باساندا گوهـ لێ دبین و دبینین، و دهێتە زانین ئەڤ تیڤکلە ستویراتییا وی پترە ژ نۆت کیلۆمتران و ژ کەڤرێن (بازلت)ینە، و ئەڤ کەڤرە رەقترین جۆرێ کەڤرانە، و د گەل ڤێ چەندێ ژی شەق دبن، و ئەڤ پەستانا د ناڤ عەردیدا کو کەڤرێن (بازلت)ی شەق دکەت ستویراتییا وی ژ نۆت کیلۆمتران پترە، ئەڤە لایەکە ژ رامانا: (إنَ اللهَ قويٌ)، خودێ دبێژیت: (إِنَّ اللَّهَ هُوَ الرَّزَّاقُ ذُو الْقُوَّةِ الْمَتِينُ) [الذاريات:٥٨]، ئانکو: ب راستی خودێیە رازق و خودان هێز و هێز موکم.

و هندەك زانایێن بیڤەلەرزان دبێژن: بیڤەلەرزەك ل چینێ رویدابوو ل سالا (١٥٥٦ز)، بوو ئەگەرێ مرنا (٨٣٠,٠٠٠) کەسان د چەند چرکەکاندا، و ل سالا (١٧٣٧ز) بیڤەلەرزەکێ ل هندێ رویدا، (١٨٠,٠٠٠) کەس بوونە قوربانی، و ل سالا (١٩٢٣ز) بیڤەلەرزەك ل یابان رویدا، بوو ئەگەرێ مرنا (١٠٠,٠٠٠) کەسان، و ل سالا (١٩٧٦ز) ل چینێ بیڤەلەرزەك چێبوو، بوو ئەگەرێ مرنا (١٠٠,٠٠٠) کەسان، و دیسا ل ئیتالیا (٣٥,٠٠٠) کەس بوونە قوربانی د چەند چرکەکاندا، خودێ دبێژیت: (يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمْ إِنَّ زَلْزَلَةَ السَّاعَةِ شَيْءٌ عَظِيمٌ) [الحج:١].

پسیار ژ زانەیەکێ مەزنێ بیڤەلەرزان کر: ((ئەرێ ئەم دشێین ب رێکا وی زانستێ پێشکەفتی یێ ل بەر دەستێ مە، بەری بیڤەلەرز روی بدەت بزانین، خۆ ئەگەر خۆلەکەك بیت؟ گۆت: نەخێر، بەس گەلەك گیانەوەرێن هەین دزانن ل پێشییا هەمیان کو دکەنە نموونە بۆ خشیمی و بێ عەقلییێ ـ کەر ـ بەری روی بدەت ب چارێك دەمژمێر هەست ب بیڤەلەرزێ دکەن، چونکی ئەڤ گیانەرە نە د راسپاردینە (مكلفة) وەکی مرۆڤی، و نە د ئارمانج کرینە ب بیڤەلەرزان، خودێ دبێژیت: (إِنَّا عَرَضْنَا الْأَمَانَةَ عَلَى السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَالْجِبَالِ فَأَبَيْنَ أَنْ يَحْمِلْنَهَا وَأَشْفَقْنَ مِنْهَا وَحَمَلَهَا الْإِنْسَانُ إِنَّهُ كَانَ ظَلُومًا جَهُولًا) [الأحزاب:٧٢]، ئانکو: (گەلی مرۆڤان) ب ڕاستی مە ئەمانەت (ئەڤ دینە و

فەرمانێت تێدا) دانا بەر عەرد و عەسمانان و چیایان (ب کەیفا خۆ بۆ خۆ هەلبژێرن، ئەگەر بڤێن راکەن و ئەگەر نەڤێن نە) نەڤیان راکەن و ژێ ترسیان، و مرۆڤی هەلگرت، ب راستی ئەو (بۆ خۆ) یێ ستەمکار بوو و یێ نەزان بوو (دویماهییا خۆ نەدزانی).

خودێ دبێژیت: ﴿إِذَا زُلْزِلَتِ الْأَرْضُ زِلْزَالَهَا﴾ [الزلزلة:١]، زَلْزَلَتْ: ئانکو لڤی ب لڤینەکا توند، و تێکچۆ، و هژیا ب هژیانا وێ یا مەزن، و دویماهییێ، کو پشتی وێ چو هژیانێن دی نینن، وی دەمی قیامەت رادبیت، و ئەڤ بیڤەلەرزێن ل عەردی روی ددەن ب تنێ ئەڤە نموونێن بچویک و تخویبداینە.

﴿وَأَخْرَجَتِ الْأَرْضُ أَثْقَالَهَا﴾ [الزلزلة:٢]، و ئەو مرۆڤە[1]، ئافراندییێ راسپاردییە کو هاتییە ئافراندن بۆ بەحەشتا پاناتییا وێ هندی عەرد و عەسمانان، چونکی ئەو رازی بوو ئێمانەتی هەلگریت، و خودێ هەمی تشتێن د عەرد و عەسماناندا بۆ بەردەست کرن، و کرە جهگرێ خۆ د عەردیدا، و ئەگەر عەقلێ وی بلندتر بوو ل سەر دلچۆنێن وی دێ رێزا وی د سەر یا ملیاکەتاندا بیت، و ئەگەر دلچۆنا وی ب سەر عەقلێ وی کەفت دێ رێزا وی د بن گیانەوەراندا بیت.

﴿وَقَالَ الْإِنْسَانُ مَا لَهَا﴾ [الزلزلة:٣]، ب حێبەتی و ب ترسڤە دێ بێژیت: ئەڤە چییە لێ روی دایی؟

﴿يَوْمَئِذٍ تُحَدِّثُ أَخْبَارَهَا﴾ [الزلزلة:٤]، هەرچی کارێن مرۆڤی ل سەر عەردی کرین ژ باشی و خرابییێ.

---

١- (طبري) د تەفسیرا خۆدا (٣٠/٢٦٥) دبێژیت: [وأخرجت الأرضُ: عەرد ئەوێن د زکێدا خۆدا ژ مریان دەردئێخیت زیندی، و مری د زکێ عەردیدا گرانییەکە بۆ عەردی... و ئبن عەباس دبێژیت: ئانکو مری] و (إبن کثیر) د تەفسیرا خۆدا (٤/٥٤٠) دبێژیت: (ئانکو دێ وان مرییێن د ناڤ خۆیا خۆدا هاڤێژیت، پتر ژ سەلەفەکێ ئەڤە یا گۆتی).

(بِأَنَّ رَبَّكَ أَوْحَى لَهَا) [الزلزلة:٥]، خودێ فەرمان ل عەردی کرییە، بشێت باخڤیت، و دەستویرییا وی دایە.

(يَوْمَئِذٍ يَصْدُرُ النَّاسُ أَشْتَاتاً) [الزلزلة:٦]، دێ مرۆڤ د ژێکڤەبوویی بن و ب تنێ بن، و کۆمکۆمە نابن، و ئەوێ ل سەر نەحەقییێ سەرناکەڤیت، و خۆسەپاندن و مەزنکرن نینە، خودێ دبێژیت: (الْيَوْمَ نَخْتِمُ عَلَى أَفْوَاهِهِمْ وَتُكَلِّمُنَا أَيْدِيهِمْ وَتَشْهَدُ أَرْجُلُهُمْ بِمَا كَانُوا يَكْسِبُونَ) [يس:٦٥]، ئانکو: ئەڤرۆ ئەم دێ دەڤێت وان مۆرکەین (کو دەڤێت وان بێنە گرتن و نەشێن باخڤن)، ڤێجا دەستێت وان دێ د گەل مە ئاخڤن، و پێیێت وان دێ شادەییێ دەن کا وان چ دکر.

خودێ دبێژیت: (لِيُرَوْا أعْمالَهُمْ (٦) فَمَنْ يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُ (٧)) [الزلزلة]، دا کارێن خۆ ببینن، یێ هندی گەردیلەکێ (تشتێ نەهێتە ژێکڤەکرن) کارێ باش کربیت دێ ئەنجامێ ڤێ چەندێ بینیت، (فَمَنْ يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُ (٧) وَمَنْ يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُ(٨)) [الزلزلة]، و یێ هندی گەردیلەکێ خرابی کربیت، دێ ئەنجامێن خرابییا خۆ بینیت، ئانکو: دێ هەردو جۆرێن مرۆڤان خەلات و سزایێ خۆ بینن.

و دشێین ل ڤێرە ئاماژە بکەین، و ئەم یێ د ئاخڤتنا ڤێ سۆرەتا کۆرتدا بۆ ڤەکۆلینەکا درێژ و مژدار و گەلەك گران و ب زەحمەت زانایێن جیۆلۆجیا گەهشتییێ د ماوێ وێدا کو پەیوەندییەکا موکوم یا پێکڤەگرێدایی یا هەی د ناڤبەرا بیڤەلەرز و ڤۆلکانان‌دا، ژ بەر کو بیڤەلەرز جارەکێ دورست دبن ب ئەگەرێ لڤینا تەنێن هەلکری یێن ئاگری، و پەستانا وان ل سەر تیڤکلێ عەردی، دێ بیڤەلەرز دورست بیت ژ ئەنجامێ تێکچۆنا تەنێن گەرم و گوڕی د ناڤ عەردیدا، و جارەکێ بیڤەلەرز دبیتە ئەگەرێ ڤولکانێ، ل سەر هەمییێ پەیوەندییەکا پێڤەگرێدایی د ناڤبەرا بیڤەلەرز و ڤولکانان‌دا یا هەی، پاشی زانایان ئاشکەراکر کو ئەو کەرستێن حەلیلیە و هەلکری یێن ڤولکان د ناڤ عەردیدا دهاڤێن کێشەکا جۆرەیی یا هەی گەلەکا بلندە، و دەمێ ئێکێ ژ وان ئەڤ ئایەتە

خواندی: (إِذَا زُلْزِلَتِ الْأَرْضُ زِلْزَالَهَا (١) وَأَخْرَجَتِ الْأَرْضُ أَثْقَالَهَا (٢))، کو ئەو تشتێن د زکێ عەردیدا یێن ڤولکان دهاڤێژیتە دەر سالۆخەت دکەت ب (الأثقال)، چونکی کێشا وێ یا جۆرەیی گەلەکا بلندە ژ بەر ڤێ چەندێ حێبەتیێ ئەو گرت.

ئەڤ پێکڤەگرێدانا د ناڤبەرا بیڤەلەرز و ڤولکاناندا، د ڤێ سۆرەتا کورتدا ئاماژەکا جوانە ژ خودێ بۆ هندێ کو ئافرێنەرێ گەردوونان ئەوە قورئان ئینایە خوارێ، ئەڤە راستییەکا دیارە، و ئەوە یێ کو سەد هزار ملیۆن مەجەرە چێکری، و یێ کو ئەڤ کلکدارە ئافراندی، و ئەو جهێن بلند و ئاسێ (کازار) و ئەڤ هەسار و ستێرە، و چێکەرێ گەردوونایە قورئان ئینایە خوار، و پێدڤییە تو بزانی کی فرێکەرە، ئەڤە گۆتارا کێیە؟ ئەو گۆتارا خودێیە چێکەرێ هەمی تشتان، و ڤەنجییا ئاخڤتنا خودێ ل سەر ئافراندییێن وی وەکی ڤەنجییا خودێیە ل سەر ئافراندییێن وی.

ئەو نیعمەتەکا مەزنە تو سپێدەهییان هشیار دبی، و تو دبینی عەرد یێ خۆجهە، و تو ڤێ نیعمەتێ نوزانی ب تنێ ئەگەر تە بیڤەلەرزەك دیت بیت چو نامینیت دل بپەڤن ژ بەر ترسا وێرانکرنێ، و خودێ سەرنجا مە بۆ ڤێ چەندێ دکێشیت، دبێژیت: (أَمَّنْ جَعَلَ الْأَرْضَ قَرَارًا) [النمل:٦١]، و ئەگەر ئەڤ خۆجهییە نەبا چو ئاڤاهی ل سەر عەردی نەدمان، و خۆشی و ئارامی یا ل وێ مالێ یا ب خۆجه بیت، و خودێ دبێژیت: (وَالْأَرْضِ ذَاتِ الصَّدْعِ) [الطارق:١٢]، و ژ تشتێن پێدڤی و د گەل عەردیدا بەردەوام دێ مینیت شەڤبوونە، کو ئەو ئالاڤێ ترساندنێیە، وەکی خودێ دبێژیت: (وَمَا نُرْسِلُ بِالْآيَاتِ إِلَّا تَخْوِيفًا) [الاسراء:٥٩]، ئانکو: ئەم موعجیزەیان ناهنێرین ئەگەر بۆ ترساندنێ نەبن. گوهداری و کەڤتنا بن فەرمانا خودێ بەری رویدانا گشتگر و سەرانسەر.

# بیڤەلەرزا قاهیرە

دەمێ مرۆڤ ل فرۆکێ سویار دبیت، چێدبیت هەست ب دودلیێ بکەت، و دلێ وی ئارام نەبیت، هەتا فرۆکە نەدانیتە فرۆکخانێ، و دێ بێژیتە هەڤالێ خۆ: سوپاس بۆ خودێ کو ئەم ب سلامەتین، و دەمێ مرۆڤ ب پاپۆرەکێ ل دەریایێ دچیت، و پێلێن دژوار رادبن، دێ تێکچیت و هەست ب ترسێ کەت، مرۆڤ یێ ئارام نینە ئەگەر ل سەر عەردی نەبیت، بەلێ مرۆڤێ باوەردار ئارام نابیت ئەگەر حەزکرنا خودێ ل سەر سلامەتییا وی نەبیت، ئەڤ عەردێ خۆجە و یێ راوەستیایی، چێدبیت ل بن پێت مە جار جار بلڤیت و بهەژیت، خودێ دبێژیت: (أَأَمِنتُمْ مَنْ فِي السَّمَاءِ أَنْ يَخْسِفَ بِكُمُ الْأَرْضَ فَإِذَا هِيَ تَمُورُ) [الملك:١٦]. ئانکو: ئەرێ ما هوین پشت راست بووینە ژ وی ئەوێ ل عەسمانی (مەخسەد خودێیە) کو هەوە د عەردیدا نەبەت خوارێ هەروەکی ب سەرێ قاروونی ئینایی و عەرد بلەرزیت.

هندەك زانایێن بیڤەلەرزان دبێژن: ((ئەگەر بیڤەلەرزا قاهیرە دەھ چرکان یا بەردەوام با، دا نیڤا خانییێن بازێرێ قاهیرە وێران کەت، و پتر ژ پێنج ملیۆنان دا مرن))، بەلێ خودێ دلۆڤانییەکا مەزن پێ بر، دێ چ مە پارێزیت ژ ئیزایا خودێ؟ ب تنێ دلۆڤانییا خودایێ مە، خانییەکێ چیمەنتۆی، یێ شەنگستێ وی کویر، ئاڤاکرنا وی یا بلند، گەرەنتی د چ مەترسییاندا نینە، ب تنێ حەزکرنا خودێ نەبیت سلامەتییێ بدەت، و ئەگەر حەزکرنا وی ئەڤ چەندە نەبیت دێ عەرد ل بن پێیان هژیێت.

ئاڤاهییەکێ کەڤن هەبوو ژ چاردە قاتان پتر بوو ب سەرێکدا هات، هەروەکی چیمەنتۆیەکێ هێرایی، ب بنیات، و ب مرۆڤێن وی، و ب ئامویرێن وی یێن کارەبێ، و ب

جوانکارییێن وی، و ب رائێخستنێن ویڤە، ئەڤە شیرەتەکا رۆهن و ئاشکەرایە، گەلەك نیشانێن هەین پێدڤییە ل سەر راوەستین.

ئەم دشێین بیڤەلەرزێ ب راڤەکرنەکا زانستی راڤە بکەین، زانایێن بیڤەلەرزان دبێژن: ((تیڤکلێ عەردی ڤێك دکەڤیت، و پەستان دکەڤیتە سەر، و هندەك جاران پەستان یا توندە تیڤکلێ عەردی دبەت و دویر دئێخیت ژ یێ ب رەخڤە، و دێ بیڤەلەرز روی دەت)).

ئەرێ ئەڤ راڤەکرنا زانستی بۆ بیڤەلەرزێ، راڤەکرنا ئایینێ خودایی رەت دکەت؟ نەخێر ب خودێ، کییە ئەگەرێ ئەگەران؟ ئەو خودێیە، ئەڤێ راڤەکرنا ئایینی بۆ بیڤەلەرزێ رەت دکەت، ئەڤ ئایەتا پیرۆزا قورئانێ ل سەر ب جە دئێت: ﴿إِنَّهُمْ كَانُوا إِذَا قِيلَ لَهُمْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ يَسْتَكْبِرُونَ﴾ [الصافات:٣٥]، ئانکو: هەر وەختێ دگۆتە وان: ژ بلی خودێ چو پەرستی نینن هێژای پەرستنێ بن، وان خۆ مەزن دکر [و باوەری نەدئینان].
و ئەڤ گۆتنا خودێ ژی ل سەر ب جە دبیت: ﴿وَإِنْ يَرَوْا كِسْفًا مِنَ السَّمَاءِ سَاقِطًا يَقُولُوا سَحَابٌ مَرْكُومٌ﴾ [الطور:٤٤]، ئانکو: ئەگەر ئەو گاور ببینن پارچەیەك یا ژ عەسمانی دادکەڤیت (هەر باوەرییێ نائینن) و دێ بێژن عەورە یێ کەڤتییە سەرێك).

بیڤەلەرزێ راڤەکرنەکا زانستی یا جوگرافی یا هەی، بەلێ ل ڤێرێ دەلیڤە نینە ئەم ب هویری ل سەر باخڤین، کو لڤینەکا د ناڤ عەردیدایە، وەکی پێلان د ناڤ تیڤکلێ عەردیدا چێدبن، تووشی پەستانەکا توند دبیت، شەقبوون دورست دبیت ل سەر عەردی، بیڤەلەرزا ئاسۆیی و یا ستوونی، بیڤەلەرزا هەی پێلێن وێ د بەرفرەهن، و دهێنە پیڤان ب پیڤەرێ (رێختەر) وەکی دهێتە زانین، بەلێ راڤەکرنا زانستی بۆ بیڤەلەرزێ راڤەکرنا ئایینی بۆ وێ رەت ناکەت، هویربینییێ د ڤێ ئایەتێدا بکەن، خودێ دبێژیت: ﴿قُلْ هُوَ الْقَادِرُ عَلَى أَنْ يَبْعَثَ عَلَيْكُمْ عَذَابًا مِنْ فَوْقِكُمْ أَوْ مِنْ تَحْتِ أَرْجُلِكُمْ أَوْ يَلْبِسَكُمْ شِيَعًا وَيُذِيقَ بَعْضَكُمْ بَأْسَ بَعْضٍ انْظُرْ كَيْفَ نُصَرِّفُ الْآيَاتِ لَعَلَّهُمْ يَفْقَهُونَ﴾

[الأنعام:٦٥]، ئانكو: بێژە: ئەو (خودێ) دشێت هنداڤی هەوە یان د بن پێیێت هەوەدا ئیزایەكی ب سەر هەوەدا بینیت، یان ژی هەوە ژێكڤەكەت و بكەتە دەستەك دەستەك، و هندەكان ژ هەوە ب هندەكان بئێشینیت، بەرێ خۆ بدێ كا ئەم چاوا نیشانان ب هەمی رەنگان ئاشكەرا دكەین، دا تێ بگەهن (خرابییا خۆ بهێلن و بۆ خۆ تۆبە بكەن)، و خودێ دبێژیت: (وَضَرَبَ اللَّهُ مَثَلًا قَرْيَةً كَانَتْ آمِنَةً مُطْمَئِنَّةً يَأْتِيهَا رِزْقُهَا رَغَدًا مِنْ كُلِّ مَكَانٍ فَكَفَرَتْ بِأَنْعُمِ اللَّهِ فَأَذَاقَهَا اللَّهُ لِبَاسَ الْجُوعِ وَالْخَوْفِ بِمَا كَانُوا يَصْنَعُونَ) [النحل:١١٢]، ئانكو: خودێ (خەلكێ) گوندەكی دكەتە نموونە، ژین و ژیارا خۆ تەنا و تەسەل دبۆراندن، و ژ هەمی رەخانڤە رزقەكێ بەرفرەه بۆ وان دهات، بەلێ شوینا شوكور و سوپاسییا خودێ بكەن، نیعمەت و كەرەمێت وی (یێت خودێ) نەئینانە بەر چاڤێت خۆ و نە شوكوراندن. خودێ ژی كراسێ برسێ و ترسێ كرە بەر وان و ژار و ژیر كرن، ژ بەر وان كار و كریارێت ئەوان دكرن.

خودێ گەلەك دلۆڤانی ب خەلكێ مسرێ بر، ژ بەر كو ل سالا (١٥٥٦ز) بیڤەلەرزەك ل چینێ رویدا، بوو ئەگەرێ مرنا (٨٣٠,٠٠٠) كەسان، و ل هندێ قوربانییێن بیڤەلەرزێ گەهشتنە (٣٠٠,٠٠٠) كەسان، هژمارێن گەلەك مەزنن، بەلێ خودێ دلۆڤانی یا ب مە بری و ئەم پێن هشیاركرین، و ئاماژە یا دایە مە ب چویڤی (بالعصا)، چونكی خودێ دبێژیت: (وَإِنْ مِنْ قَرْيَةٍ إِلَّا نَحْنُ مُهْلِكُوهَا قَبْلَ يَوْمِ الْقِيَامَةِ أَوْ مُعَذِّبُوهَا عَذَابًا شَدِيدًا كَانَ ذَٰلِكَ فِي الْكِتَابِ مَسْطُورًا) [الاسراء:٥٨]، ئانكو: نینە گوندەك (ژ گوندێت گاوران یان گونەهكاران) ئەگەر ئەم بەری رۆژا قیامەتێ د هیلاك نەبەین یان ژی بەرهنگاری ئیزایەكا دژوار نەكەین، ئەڤە د كتێبێدا (د دەپێ پارستیدا [لەوحێ مەحفووزدا]) یا نڤێسییە.

هەر جهەكی یان دەڤەرەكێ ئافرەتێن وان رویس دەركەڤن، و ریبایێ بخۆن، و ماف بهێنە بەرزەكرن، ئەگەر ئەڤ گونەهە كرن، و راستی داعویرا، دێ سزایێ وی دویماهییەكا

خراب بیت، و زار ئەبی هورەیرەی گۆت: پێغەمبەر ﷺ دبێژیت: ((اذا كانَ أمراؤكم خيارَكُمْ، وَأغنِياؤكُم سُمَحاءَكُمْ، وَأمورُكُمْ شُورىَ بَيْنَكُمْ، فَظَهرُ الأرْضِ خَيرٌ لَكُمْ مِنْ بَطنِها، وَإذا كانَ أمَراؤكُم شِرارَكُمْ، وَأغنياؤكُمْ بُخلاؤكُمْ، وَأمورُكُمْ إلى نِسائِكُمْ، فَبَطنُ الأرْضِ خَيرٌ لَكُمْ مِنْ ظَهرِها))[1]، ئانكو: ئەگەر مەزنێن هەوە بژارەیێن هەوە بن، و زەنگینێن هەوە مەردێن هەوە بن، و كاروبارێن هەوە ب مشێورەت بن د ناڤبەرا هەوەدا، سەر عەردی بۆ هەوە چێترە ژ بن عەردی، بەلێ ئەگەر مەزنێن هەوە خرابكارێن هەوە بن، و زەنگینێن هەوە قەلسێن هەوە بن، و كاروبارێن هەوە ب ئافرەتێن هەوە بن، بن عەردی بۆ هەوە چێترە ژ سەر عەردی.

ژ بەر ڤێ چەندێ خودێ دبێژیت: (وَمَا كَانَ رَبُّكَ لِيُهْلِكَ الْقُرَى بِظُلْمٍ وَأَهْلُهَا مُصْلِحُونَ) [هود:١١٧]، ئانكو: خودایێ تە نەئەو بوو یێ گوند ب ستەم و نەهەقی د هیلاك بربانە، و خەلكێ وان ب خۆ یێ قەنجیكار. و گۆتنا خودێ (وَمَا كَانَ رَبُّكَ)، ئانكو: ئەڤە مەحالە، و ئەڤە نە ژ مەیسمێ وییە، و ئەوە دبێژیت: (وَتِلْكَ الْقُرَى أَهْلَكْنَاهُمْ لَمَّا ظَلَمُوا وَجَعَلْنَا لِمَهْلِكِهِمْ مَوْعِدًا) [الكهف:٥٩]، ئانكو: ئەڤە ئەو گوندن ئەوێت مە د هیلاك برین دەمێ وان ستەم كری، و مە بۆ د هیلاكبرنا وان ژڤانەكێ ئاشكەرا دانابوو.

ل ڤێرە مرۆڤ یێ ب سلامەت نابیت ب تنێ د كاودانەكیدا نەبیت؛ ئەو ژی خودێ بۆ سلامەتییێ بدەت، و مرۆڤ ئێمن و رەحەت نابیت ب تنێ د كاودانەكیدا نەبیت؛ خودێ ئێمنی و رەحەتییێ بدەتێ، خودێ دبێژیت: (وَكَيْفَ أَخَافُ مَا أَشْرَكْتُمْ وَلَا تَخَافُونَ أَنَّكُمْ أَشْرَكْتُمْ بِاللَّهِ مَا لَمْ يُنَزِّلْ بِهِ عَلَيْكُمْ سُلْطَانًا فَأَيُّ الْفَرِيقَيْنِ أَحَقُّ بِالْأَمْنِ إِنْ كُنْتُمْ تَعْلَمُونَ (٨١) الَّذِينَ آمَنُوا وَلَمْ يَلْبِسُوا إِيمَانَهُمْ بِظُلْمٍ أُولَئِكَ لَهُمُ الْأَمْنُ وَهُمْ مُهْتَدُونَ (٨٢)) [الأنعام:٨٢]،

---

١ـ (الترمذي) (٢٢٦٦). ئەبو عیسا دبێژیت: ئەڤ فەرموودە یا غەریبە ئەم چو ژێ نوزانین، ب تنێ ژ فەرموودا (صالح المري) نەبیت و د فەرموودا ویدا تشتێن غەریب یێن هەین ب تنێ ئەو یێ هۆسایە كەس ل دویڤ ناچیت و ئەو مرۆڤەكێ چاكە.

ئانكو: ئەز چاوا ژ وان تشتان ئەوێت هوین دكەنە هەڤپشك بترسم؟! و هوین بێ ترس و بێی هەوە بەلگە و نیشانەك هەبیت هەڤپشكان بۆ خودێ چێ دكەن، ئەرێ كی ژ مە هێژاتری ئێمنییێیە ئەگەر هوین ئەو بن یێت دزانن؟!. ئەوێت باوەری ئینایین و ستەم و شرك تێكەلی باوەرییا خۆ نەكرین، ئەها ئێمنی (ژ ئیزایا خودێ) بۆ وانە و ئەون یێت هاتینە ڕاستەڕێكرن، ژ بەر ڤێ چەندێ ئەركە ل سەر مە ئەم پەنایا خۆ بۆ خودێ ببەین، و بزڤرین بۆ وی، و كەسێ بەختەوەر ئەوە یێ ب شیرەتا كەسانێن دی دكەت، و یێ خراب ب شیرەتێن كەسێ ناكەت ژ بلی خۆ نەبیت، و ئەو زیانێن پەیدابوویی ناهێنە گۆتن بەرامبەر بیڤەلەرزێن مەزن، و ئەڤە ئامازەدانە ب چویڤی، خودێ دبێژیت: (وَأَنِيبُوا إِلَى رَبِّكُمْ وَأَسْلِمُوا لَهُ مِنْ قَبْلِ أَنْ يَأْتِيَكُمُ الْعَذَابُ ثُمَّ لَا تُنْصَرُونَ (٥٤) وَاتَّبِعُوا أَحْسَنَ مَا أُنْزِلَ إِلَيْكُمْ مِنْ رَبِّكُمْ مِنْ قَبْلِ أَنْ يَأْتِيَكُمُ الْعَذَابُ بَغْتَةً وَأَنْتُمْ لَا تَشْعُرُونَ (٥٥)) [الزمر]، ئانكو: و ل خودایێ خۆ بزڤرن و تۆبە بكەن و خۆ بسپێرنە وی (ل بەر ئەمرێ وی ب تنێ د ڕاوەستای بن)، بەری ئیزا ب سەر هەوەدا بێت هنگی هاریكارییا هەوە نائێتەكرن. و هوین (گەلی بەندەیێت من) ل دویڤ ڤێ قورئانێ هەڕن (ئەحكامێت وێ ب جه بینن)، بەری ژ نیشكەكێڤە ئیزا ب سەر هەوەدا بێت و هەوە های ژ خۆ نە).

ئیزا ژ نیشكەكێڤە دهێت، ژ بەر ڤێ چەندێ ئەگەر مرۆڤ مێژوویا بیڤەلەرزان ل جیهانێ بخوینیت، دێ بینیت كو د گەلەك وەلاتاندا یێن روی داین، بەلێ ل ڤێرە تشتێ گرنگ ئەوە ئەم شیرەتان بۆ خۆ ژێ وەربگرین، و ئەم بۆ لایێ خودێ بزڤرین، و كاروبارێن خۆ رێك بێخین، و مالێن خۆ ل سەر رێبازا خودێ ئاڤا بكەین، بەلكی خودێ مە بپارێزیت، چو دڤەر نینن تووشی بیڤەلەرزێ نەبن، یان چو جاران تووشی بیڤەلەرزان نابن، و ل ڤی وەلاتی بیڤەلەرزەك رویدابوو بەری پێنجی سالان، و چو جهێن بانگدانێ د مزگەفتێن مەدا نەهێلان ئەگەر نەهەرفت بن، و ئەو گۆتنا دبێژیت: وەلاتێ مە نە ل سەر نەخشێ بیڤەلەرزایە ئاخفتنەكا زێدە و بێ رامانە، و كەسەكێ نەگۆتییە و دیار نەكرییە بۆ ماوەكێ درێژ كو بیڤەلەرزەكا ل قاهیرە چێبووی، و د گەل

ڤێ چەندێ ژ نیشکەکێڤە رویدا، و د گەل ڤێ چەندێ ئەگەر دەه چرکێن دی یا بەردەوام با دا نیڤەکا ئاڤاهیێن قاهیرە هەرفینیت، و دا پتر ژ پێنج ملیۆن مرۆڤ بنە قوربانی، بەلێ خودێ دلۆڤانی پێ بر.

و بزانن خودێ چێکەرێ ئەگەر و تشتێن دبنە ئەگەرە، و ئەوە کو عەرد و عەسمان گرتین، و دەمێ ڤیا دێ هەژینیت، و ئەگەران ژ کار ئێخیت، و ئەو ل سەر هەمی تشتی خودان شیانە.

# کەعبە مەلبەندێ هەردو جیهانێن کەڤن و نوییە

عەردێ هشکاتی ل دۆر مالا خودێ یا پیرۆز ب شێوەکێ رێك و پێك یێ لێکڤەکرییە، ئەڤ راستییە نویترین ڤەکۆلینێن زانستی یێن دوپاتکرییە د مەلبەندێ ڤەکۆلینێن گەردوونیدا ل ئێك ژ دەولەتێن عەرەبی، و بۆ ڤێ چەندێ ب کارئینانا ئامویرێ ژمێریاری د هژمارتنا دویراتییێن د ناڤبەرا مەکەها پیرۆز و هژمارەکا باژێرێن دکەڤنە رەخێن هەردو جیهانێن کەڤن و نوی.

و پشتی وان هژمارتنێن هاتینە کرن ل سەر ئامویرێ ژمێریاری هاتە سەلماندن کو دویرترین رەخێن عەردی ل ئەفریقیا و ئاسیا و ئەوروپا، ئەڤە (جیهانا کەڤنە)، دکەڤنە دویراتییا هەشت هزار کیلۆمەتران ژ مەکەهێ. باژێرێن رەخێن وان دویراتییا وان بۆ مەکەها پیرۆز هەشت هزار کیلۆمەترن، ڤێجا مەکەه دکەڤیتە ناڤەندا جیهانا کەڤن.

و سەبارەت رەخێن جیهانا نوی، ئەو ژی (کیشوەرێ ئوستڕالیا و کیشوەرێ ئەمریکا باکوور و باشوور، و کیشوەرێ بەستەلێ باشوور)، و هەمی رەخێن ڤان کیشوەران دکەڤنە دویراتییا سێزدە هزار کیلۆمەتران ژ مەکەهێ، و مەکەها پیرۆز ناکەڤیتە هەمبەر رویێ عەردی ژ لایێ دی یێ هشکاتی، بەلکو هەمی دەریایە، ئەو ژی زەریایا هێمنە، ل ڤێرە ل دویڤ ڤێ ڤەکۆلینا هاتییە کرن ل سەر ئامویرێ ژمێریاری دیار دکەت کو مالا خودێ یا پیرۆز ئەو مەلبەندێ ئەندازەیی یێ ناڤەراستە بۆ هشکاتییێ، خودێ دبێژیت: ﴿إِنَّ أَوَّلَ بَيْتٍ وُضِعَ لِلنَّاسِ لَلَّذِي بِبَكَّةَ مُبَارَكًا وَهُدًى لِلْعَالَمِينَ﴾ [ال عمران: ٩٦]، ئانکو: ب راستی ئاڤاهییێ ئێکێ یێ بۆ خەلکی (و پەرستنا خودێ) هاتییە دانان، ئەوە یێ ل مەکەهێ (هاتییە دانان) کو (جهەکێ) پیرۆزە (و تێر خێر و بێرە)، و جهێ راستەرێکرنێیە بۆ هەمی خەلکی، و ئەڤە ژ نیشانێن خودێ یێت ب بەلگەیە ل سەر مەزناهییا وی.

# عەردێ عەرەبان وەسا بوو و دێ زڤریتەڤە کەسکاتی و رویبار

ئەڤە زانایەکە ژ ناڤدارترین زانایێن جیۆلۆجیا، و یێ تایبەتمەند بوو د دەڤەرا دکەڤیتە د ناڤبەرا ئەفریقیا و گزیرتا عەرەبیدا چاڤ ب زانایەکێ موسلمان کەفت، ڤی زانایێ موسلمان پسیار ژێ کر: ((ئەرێ چ بەلگە ل بەر دەستێ تە هەنە کو عەردێ عەرەبان (گزیرتا عەرەبی) د سەردەمەکیدا بیستان و رویبار (شینکاتی) بوون؟ وی زانایی گۆت: ئەڤە ل دەڤ مە یا بەرنیاس و خویایە، ئەڤی تشتی زانایێن بسپۆر دزانن، ئینا گۆتە وی، چ بەلگە هەیە؟ گۆت: ((د گزیرتا عەرەبیدا جهێن گیرهە یێن رویبارا دهێنە تێبینیکرن د هندەک جهان، و گوندەکێ ڤەشارتی ل بن خیزی یێ هاتییە دیتن ل (الربع الخالي) و جهێن بووینە رۆخ (مُتحجّرَة) یێن تێدا، ل هندەک جهێن دی دەمێ لێگەریان کری قورمێن دارێن مەزن دیتن))، و ئەڤ چەندە هەمی دوپات دکەن کو ئەڤ عەردە جارەکێ بیستان و رویبار بوون، و دەڤەرا (الربع الخالي)؛ ئەڤ بیابانا هشك و رویت، د سەردەمەکیدا شینکاتی و رویبار بوون، و ئەڤە تشتەکێ خۆجهە ل دەڤ زانایێن جیۆلۆجیا ئەوێن شوینوارێن ڤێ چەندێ دیتین و ئەڤ تشتە یێ بۆ وان دوپات بووی، پاشی پسیارەکا دی ژێ کر: ((ئەرێ ل دەڤ تە چ بەلگە هەنە کو وەلاتێ عەرەبان دێ جارەکا دی شینکاتی و رویبار لێ پەیدا بن؟ ئینا گۆت: ئەڤ تشتە ژی ل دەڤ مە یێ هاتییە زانین. گۆت: بەلگە چییە؟ گۆت: تەنێن مەزن یێن جەمەدێ (بەستی) بەرەڤ باشوورێ عەردی دچن، و ئەڤە بوو ئەگەرێ زڤستانا گەلەك سار ل ئەوروپا و ئەمریکا بەری چەند سالان، و چۆنا ڤان تەنێن جەمەدێ بەرەڤ باشووری دێ ئاڤ و هەوایێ عەردی گوهۆرن، و ب گوهۆرینا سەقایێ عەردی، دێ هێلێن بارانێ هێنە گوهۆرین، و دێ ئەو رۆژ هێت کو عەردێ عەرەبان جارەکا دی بزڤریتەڤە بۆ شینکاتی و رویباران، ئینا ڤی زانایێ موسلمان گۆتە ڤی زانایێ جیۆلۆجی: دێ تە چ ئاخفتن هەبیت کو

زەلامەکی بەری هزار و چار سەد سالان گۆتییە: ((لا تقومُ الساعةُ حتى يَكْثرَالمالَ وَيَفيضَ حتى يَخرجَ الرجُلُ بزكاةِ مالِهِ فلا يَجِدُ أحَدا يَقْبَلُها مِنهُ وَحَتى تعُودَ أرضُ العَرَبِ مُروجا وأنهارا))[1]؟!، ئانکو: قیامەت نارابیت هەتا مال مشە و زێدە نەبیت بگەهیتە وی رادەی دەمێ کەسەك زەکاتا مالێ خۆ ددەت چو کەسان نابینیت زەکاتا وی وەرگرن، و هەتا عەردێ عەرەبان نەزڤریتەڤە بۆ شینکاتی و رویباران.

هویربینییا فەرموودێ، د پەیڤا (تعود)، ئانکو (ئەو یا هۆسا بوو)، و پەیڤا (تعود)، ئانکو (ئەو دێ بیتە)، ل ڤێرە پەیڤا (تعود)؛ رامان و مەرەما وێ د ڤێ فەرموودێدا و د گەل تامییا وێ، عەردێ عەرەبان شینکاتی و رویبار بوون و جارەکا دی شینکاتی و رویبار دێ پەیدا بن، ئەڤ فەرمووده یا سەحیحە، ئەڤ زانایێ بیانی حێبەتی بوو، چونکی ئەڤ راستییە یێن هاتینە زانین د ڤان سالاندا، ئەو چ کاودان بوو پێغەمبەرێ خودێ ﷺ ئەڤ راستییە زانی، کو ئەڤ چەندە پێدڤی ب ڤەکۆلینەکا درێژە، و ب وانەکا درێژە، و گەریانێن ب زەحمەتە د کویراتییێن بیابانێدا، و پێدڤی گەلەك لێگەریانایە، و ب ڤەکۆلینا سروشتێ سەقایێ عەردییە؟ خودێ دبێژیت: (وَمَا يَنْطِقُ عَنِ الْهَوَى (٣) إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْيٌ يُوحَى (٤)) [النجم]، ئانکو: ئەو ژ دەڤ خۆ و ژ دلخوازییا خۆ نائاخڤیت. و نائاخڤیت ئەگەر ژ وەحییێ نەبیت ئانکو قورئان ژ وەحییێ پێڤەتر نینە.

رەوانبێژییا پێغەمبەری ﷺ د ڤێ فەرموودێدا: ((لا تقومُ الساعةُ حتى يَكْثرَالمالَ وَيَفيضَ حتى... وَحَتى تعُودَ أرضُ العَرَبِ مُروجا وأنهارا)) و د پەیڤا (تعود)دا ئەڤ چەند چارە دبیت، ئەگەر گۆتبا: (حتى تصبح) رامانا ڤێ رابردوو نەدکەفتە د ناڤ ڤێ فەرموودێدا، و ئەگەر گۆتبا: (كانت) داهاتی نەدکەفتە تێدا، بەلێ پەیڤا (تعود) ب تنێ ئەڤە بوو یا پێغەمبەری ﷺ رابردوو و داهاتی کرینە تێدا، (وَمَا يَنْطِقُ عَنِ الْهَوَى (٣) إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْيٌ يُوحَى (٤)).

---

١. موسلم (١٥٧)، و ئەحمەد (٩٣٨٤) ژ زارێ ئەبی هورەیرە.

# پشکا پێنجێ

## ئاڤ

١- وَجَعَلْنَا مِنَ الْمَاءِ كُلَّ شَيْءٍ حَيٍّ

٢- پەیوەندی د ناڤبەرا ئاڤ و هەواییدا

٣- ئاڤ و تاییەتمەندییا ژێك هاتنەدەر و تێكچوونێ

٤- وَإِنْ مِنْ شَيْءٍ إِلَّا عِنْدَنَا خَزَائِنُهُ

٥- یاسایا پالدانا بەرەف سەری

٦- پەیوەندییا ئاڤێ ب رەنگێ کەڤرانڤە

٧- وَالْبَحْرِ الْمَسْجُورِ

٨- هَذَا عَذْبٌ فُرَاتٌ وَهَذَا مِلْحٌ أُجَاجٌ

٩- ناڤبڕا د ناڤبەرا دو دەریایاندا و نەتێکەلبوونا سویراتییا ئاڤەکێ ب شرینییا ئاڤا دی

١٠- رێککەفتنا ژمارەیی د قورئانا پیرۆزدا ( اَلبَرُّوالبَحرُ )

١١- تەوژمێن کەنداڤێ دەریایی

١٢- ئاڤا زەمزەم

# وَجَعَلْنَا مِنَ الْمَاءِ كُلَّ شَيْءٍ حَيٍّ

ئانكو: هەر تشتەكێ خودان رح مە یێ ژ ئاڤێ چێكری، ئەرێ د گەل ڤێ ژی هێژ ئەو باوەرییێ نائینن؟!.

ژیان ل سەر روییێ عەردی، ژیانا مرۆڤی، و گیانەوەری، و رووەكی، بنیاتێ وان ئاڤە، و ئاڤ ناڤبرەكێ ئێكانەیە كو خوێیان هەلدگریت، و كەرستێن خوارنێ یێن حەلیای تێدانە بۆ زیندەوەران، و ئەگەر ئاڤ نەبا ژیان ل سەر عەردی نەدبوو.

بەلێ كی ژ مە باوەر دكەت، كو د هەر چركەكێدا ب ڤەبرین، د هەر چركەكا دبۆریتدا شازدە ملیۆن تەننێن ئاڤێ دهێنە خوار ژ عەسمانی بۆ عەردی ل سەر ئاستێ گۆیا عەردی ب رێكا باران بارینێ، خودێ دبێژیت: (أَنَّا صَبَبْنَا الْمَاءَ صَبًّا) [عبس:٢٥]، ئانكو: مە ئاڤ ژ عەوران داریت.

ژ بەر بنیاتێ ژیانێ (ئاڤ)، د هەر چركەكێدا شازدە ملیۆن تەننێن ئاڤێ دهێنە خوار ژ عەسمانی بۆ عەردی، و ئەڤ كەڤتنا بارانان ئاڤێ خودێ (اللطیف) ئانكو دلۆڤان دیار دبیت، و ئەگەر ئاڤ ب شێوەكێ پێكڤە گرێدایی كەڤتبا سەر عەردی، دا هەمی تشتان تێبەت، و دا هەمی تشتان پویچكەت، و دا ژیانێ ب دویماهی ئینیت، بەلێ ب شێوێ چپكێن بچویك دهێنە خوار كو نەرماتی و دلۆڤانی و زانین یا تێدا.

من ژمارا سێیێ خواند، ئەو ژی دەڤەرێن چەروانی د وەلاتێ مەدا سوریا، ب ئەگەرێ هاتنا بارانێن زۆر ئەوێن ل سالا (١٩٨٨ز) بارین، ل ڤان دەڤەران گیایێ چەروانی شین بوو

ئەوێ پەز دخۆن، ئەگەر ئەڤ گیایە هاتبا کرین، دا دەه هزار ملیۆن لیرە بهایێ وی بن، چونکی ئەگەر ب خێرا ڤان بارانان نەبا دا ب ڤی پارێ زۆر ئالیکێ کرین.

دەمێ خودێ دبێژیت: (وَفِي السَّمَاءِ رِزْقُكُمْ وَمَا تُوعَدُونَ) [الذاريات:٢٢]، ئانکو: رزقێ هەوە و هەر تشتێ بۆ هەوە پێ دئێتە دان یێ ل عەسمانی، و رامانا ڤێ ئایەتێ ئەوە کو ئەڤ خوارنا ئەم دخۆین، ئەگەر ب هاتنا وان بارانێن ژ عەسمانی دهێن نەبا ئەڤ خوارنە نەدبوو، و بەرهەمەکێ وەسا ژ فێقی و دەرامەتی د وێ سالێدا هەبوو، مرۆڤی ئەڤ هزرە بۆ ڤێ نەدکر، دەمێ خودێ ددەت مرۆڤ حێبەتی دبیت!! و خودێیە (المُسَعِّرُ)[1]، تشتی ب بارانێن مشە زێدە دکەت، و دێ ب ڤێ چەندێ بەرهەم زۆر بیت، و بهایێن وان ئێنە خوارێ، خودێ دبێژیت: (وَفِي السَّمَاءِ رِزْقُكُمْ وَمَا تُوعَدُونَ)، و خودێ دبێژیت: (وَإِنْ مِنْ شَيْءٍ إِلَّا عِنْدَنَا خَزَائِنُهُ وَمَا نُنَزِّلُهُ إِلَّا بِقَدَرٍ مَعْلُومٍ) [الحجر:٢١]، ئانکو: چو تشت نینە (بەندە مفایی ژێ بکەن) ئەگەر ژێدەر و سەروکانییا وان ل دەڤ مە نەبیت، و ئەگەر ب ئەندازەیەکا دیارکری نەبیت ئەم نادەین و ناهنێرین).

خودێیە رزقدەر و خودان هێزا موکم، کو ژ شازدە ملیۆن تەننێن ئاڤێ د ئێك چرکەدا دکەتە باران دهێتە خوار، هەمبەر دەه هزار ملیۆن لیرایە ژ بهایێ ئالیکێ، ڤان ژماران گرۆڤێن هەی ژ لایێ باوەرداران، ئەڤە بەخشینا مەیە: (كُلًّا نُمِدُّ هَؤُلَاءِ وَهَؤُلَاءِ مِنْ عَطَاءِ رَبِّكَ وَمَا كَانَ عَطَاءُ رَبِّكَ مَحْظُورًا) [الاسراء:٢٠]، ئانکو: ئەم ژ دانا خودایێ تە ددەینە هەمیان و کەسێ ژێ بێ بار ناکەین، چ یێت ژیانا دنیایێ ڤیایین و چ ئەوێت ژیانا ئاخرەتێ ڤیایین، و چ ئەوێت هەردو ڤیایین و چ کافر و چ خودان باوەر، و دانا خودایێ تە ژ کەسێ یا ڤەگرتی نینە)، و خودێ دبێژیت: (فَلْيَنْظُرِ الْإِنْسَانُ إِلَى طَعَامِهِ (٢٤) أَنَّا

---

١. بۆچۆنێن جودا یێن هەین ل سەر دانەپالا ڤی ناڤی ب بال خودێڤە، و ئەوێن ددانن ژ ناڤێن خودێ، بۆ رامانا ڤی ناڤی دبێژن: خودێیە بهایێ تشتی زێدە و بلند دکەت، یان ژ کاریگەرییا وی یان ژ جهێ وی، و تشتی کێم دکەت و دئینیتە خوار، یان ژ کاریگەرییا وی، یان ژ جهێ وی. وەرگێر.

صَبَبْنَا الْمَاءَ صَبًّا (٢٥) ثُمَّ شَقَقْنَا الْأَرْضَ شَقًّا (٢٦) فَأَنْبَتْنَا فِيهَا حَبًّا (٢٧) وَعِنَبًا وَقَضْبًا (٢٨) وَزَيْتُونًا وَنَخْلًا (٢٩) وَحَدَائِقَ غُلْبًا (٣٠) وَفَاكِهَةً وَأَبًّا (٣١) مَتَاعًا لَكُمْ وَلِأَنْعَامِكُمْ (٣٢)) [عبس]، ئانكو: بلا مرۆڤ بەرێ خۆ بدەتە خوارن و ڤەخوارنا خۆ (و هویرك هزرا خۆ تێدا بكەت، كا چاوا دبیتە خوارن و دئێتە بەر دەستێ وی). مە ئاڤ ژ عەوران دارێت. و مە عەرد ب گل و گیا و شینكاتیڤە كەلاشت. مە دان و دەرامەت ژێ دەرئێخست (وەكی دەخلی و جەهی و برنجی، كو خوارنا سەرەكینە بۆ مرۆڤی). هەروەسا تری و زەرزەوات ژی. و زەیتوون و دارقەسپ ژی. جنیك و بیستانێت تێكرا ژی. و فێقی و چەرە ژی. سوود و مفا بۆ هەوە و تەرش و دەوارێت هەوە).

## مفایەك:

(ابن كثیر) د تەفسیرا خۆدا[1] بۆ ڤێ ئایەتێ دبێژیت: (وَجَعَلْنَا مِنَ الْمَاءِ كُلَّ شَيْءٍ حَيٍّ أَفَلَا يُؤْمِنُونَ)، ئانكو ئەو بەرێ خۆ ددەنە ئافراندییان كو تشت بۆ تشتی ل بەر چاڤێت وان روی ددەن، و ئەڤ چەندە هەمی بەلگەیە ل سەر هەبوونا چێكەری، بكەرێ ژێگرتی، خودان شیانە ل سەر تشتێ وی بڤێت:

د هەر تشتەكیدا نیشانەكا خۆ یا هەی    دسەلینیت كو خودێ ئێكە

و د تەفسیرا (الجلالین)دا[2]: ((و مە ژ وێ ئاڤا ژ عەسمانی دئێتە خوارێ و ئەوا ژ عەردی دزێت هەمی تشتێن زیندی یێ ژ ئاڤێ چێكرین، ژ رووەكی و ژ بلی وی، ئانكو ئاڤ ئەگەرێ ژیانا وییە، ئەرێ ما هێژ هوین باوەرییێ نائینن)).

---

١. تەفسیرا (ابن كثیر) (١٧٨/٣).

٢. تەفسیرا جەلالەین (٤٢٣/١).

# پەیوەندی د ناڤبەرا ئاڤێ و هەوایدا

دا بیرا خۆ ل ڤەنجیبا هەوای و ڤەنجیبا ئاڤێ بینین، و دا پەیوەندیبا د ناڤبەرا واندا دیار بکەین، چونکی ئەگەر ئەڤ پەیوەندییە نەبیت مرۆڤ ل سەر عەردی نەدبوون.

پەیوەندیبا د ناڤبەرا ئاڤ و هەوایدا، ئەوە کو هەوا هەلما ئاڤێ رادکەت، و نیشانا مەزن ئەوە کو هەوا هەلما ئاڤێ دهەلگریت ب رێژێن جودا جودا د گەل پلێن گەرمێ، بۆ نموونە، هەر مەترەکا چارگۆشە ژ هەوای د سفر پلەدا، پێنج گرامێن هەلما ئاڤێ دهەلگریت، بەلێ دەمێ هەوا گەرم دبیت و پلا گەرماتیبا وێ دگەهیتە بیست پلان، یان سیهان، نێزیکی سەد و سیه گرامان دهەلگریت.

ئەڤ جوداهیبا رێژا هەلگرتنا هەوای بۆ هەلما ئاڤێ ل دویڤ پلێن گەرمێ، ئەگەر ئەڤ چەندە نەبیت باران نابن، و ئەگەر باران نەبن، رووەك نابن، و ئەگەر رووەك نەبن گیانەوەر نابن، و ئەگەر گیانەوەر نەبن مرۆڤ نابن، چونکی ئاڤ بنیاتێ ژیانێیە، خودێ دبێژیت: (وَجَعَلْنَا مِنَ الْمَاءِ كُلَّ شَيْءٍ حَيٍّ) [الأنبياء: ٣٠].

چاوا خودێ ئاڤێ ب رێکا باران بارینێ ژ دەریایان دبەتە هەمی کیشوەران؟ ئەڤ چەندە ب تایبەتمەندیبا هەلگرتنا هەوای بۆ هەلما ئاڤێ ب رێژێن ژێك جودا د گەل پلێن گەرمێ دورست دبیت، ئەگەر مەترەکا چوارگۆشە یا هەوای ب رێکا شاریانێ و هەلبوونێ سەد و سیه گرامێن هەلما ئاڤێ هەلگریت، پاشی ئەڤ هەوایێ تژی هەلما ئاڤێ هاتە ڤەگوهاستن بۆ جهەکێ سار، دێ هەر زوی هەلما ئاڤێ چیت، و دێ هەوا ئەو هەلما زێدە ژ پێدڤیبا خۆ بەردەت، ب ئەگەرێ نزمبوونا پلێن گەرمێ، و ئەڤەیە رێکا هاتنا بارانێ.

تیشکا رۆژێ دکەڤیتە سەر رویبەرێن گەلەك بەرفرەھ یێن عەردی، ئەو ژی زەریا و دەریانە، چونکی رێژا وان نێزیکی سێ چارێکا عەردییە (٧١٪) ئاڤا ڤان زەریا و دەریایان دبیتە ھەلم، و ھەوا ڤێ ھەلێ دھەلگریت، و جوداییا پلێن گەرمێ د ناڤبەرا بیابانان و دەڤەرێن کەناری، و د ناڤبەرا ھێلا کەمەری و جەمسەریدا، ئەڤ جوداھییا مەزن د پلێن گەرمێدا تێکەلی بای دبن، و با ھەلا ئاڤێ دھەلگریت، و دەمێ ئەڤ ھەوایێ تژی ھەلا ئاڤێ دچیتە جھێن سار، دێ ئەو ئاڤا زێدەی پێدڤییا وێ بەردەت و بیتە باران.

کێ ئەڤ یاسایە رێکخستییە؟ کێ ئەڤ تایبەتمەندییە دایە ئاڤێ، کو ئەو ژی تایبەتمەندییا ھەلگرتنا ھەلا ئاڤێیە؟ کێ وەلێ کرییە کو ھەر پلەکا گەرمێ چەندییەکا سنوردار یا باران ھاتنێ ھەبیت؟ کێ وەلێ کرییە کو ھەر د پلەکا گەرمییێدا چەندەکا تخویبدایی ژ ھەلا ئاڤێ ھەبیت زێدە نابیت ئەوا ھەوا د ھەلگریت؟ د پلە سفردا پێنج گرامن، و د بیست پلەدا سەد و سیھ گرامن، و دەمێ گەرمی نزم بوو گەھشتە سفرێ دێ ھەوا ئەو چەندییا ھەلا ئاڤێ یا کو زێدە ژ چەندییا ھاتییە ھەلگرتن ھەلا ئاڤێ د پلە سفردا دێ باران ھێن.

ئەڤ راستییێن مە ب شێوەکێ گەلەك سادە بەحس کرین، چونکی باران ھاتن گەلەك ژ ڤێ چەندێ بەرفرەھترە، بەلێ ژ پێخەمەت دیارکرنا راستییێن سەرەکی، کو ئەڤ تایبەتمەندییا خودێ کرییە د ئاڤێدا، و ئەو تایبەتمەندییا خودێ کریە د ھەوایدا، و ئەو پەیوەندییا د ناڤبەرا واندا، و ئەو رووبەرێن مەزنێن ئاڤێ، کو خودێ کرینە د زەریایاندا، و ئەو تیشکا رۆژێ یا ئاڤێ دکەتە ھەلم، و ئەو بایێن کو ژ جوداییا پلێن گەرمێ چێ دبن، و عەور دبەنە عەردەکێ تێھنی، دێ وی عەردێ مری جارەکا دی ساخکەتەڤە، ئەڤە نیشانەکە ژ نیشانێن خودێ، و نیعمەتەکە ژ نیعمەتێن وی، (وَإِنْ تَعُدُّوا نِعْمَةَ اللَّهِ لَا تُحْصُوهَا) [ابراھیم:٣٤]. ئانکو: ئەگەر ھوین نیعمەت و کەرەمێت خودێ بھەژمێرن ھوین نەشێن بھەژمێرن (چونکی ھندی گەلەکن ب دویماھیك نائێن).

# ئاڤ و تايبەتمەندييا ژێك هاتنەدەر و تێكچوونێ

خودايێ پر زانا و شارەزا دبێژيت: (وَجَعَلْنَا مِنَ الْمَاءِ كُلَّ شَيْءٍ حَيٍّ أَفَلَا يُؤْمِنُونَ) [الأنبياء: ٣٠].

ئەڤە نيشانەكە، بەرگ تێرا ناكەن بۆ شرۆڤەكرنا وێ، بەلێ دێ لايەكێ كێم ژێ وەرگرين.

ئەو ئاڤا خودێ كرييە بنياتێ ژيانێ، زانا دبێژن: ئەگەر ئاڤ تايبەتمەندييەكا خۆ يا بچويك ژ دەست بدەت، دێ ژيان ب دويماهى ئێت ل سەر عەردى، ئەو چ تايبەتمەندييە؟ ئەو ژى دەمێ ئاڤ سار دبيت تێك دچيت، ئانكو گەرديلێن وێ نێزيكى ئێك دبن، وەكى هەر توخمەكێ دى يێ ل سەر رويێ عەردى، و مەرەم ژ توخمان، گاز، و شلەيان، و لەشێن رەق، و توخم پەيڤەكە ڤان هەمييان پێكڤە كۆم دكەت (گاز، شل، و لەشێن رەق)، ژ بەر كو هەر توخمەكێ خودێ چێكرى ب گەرمێ ژێك دئێتە دەر، و ب ساراتييێ تێك دچيت، و ئاڤ ژى ئێكە ژ وان، ئەگەر ئەم ئاڤێ ساركەين، و د پلا كەلاندنێدا بيت، و زێرەڤانييا قەبارێ وێ بكەين، ب ئاميرێن هەستدار، دێ تێك چيت، و دەمێ پلێن ڤێ ئاڤێ كێم دبن ژ سەدێ بۆ شێستێ، بۆ چلێ، بۆ سيهێ، بۆ بيستێ، بۆ دەهێ، بۆ پێنجێ، و دەمێ پلا ئاڤێ گەهشتە (+4) ل ڤێرە بەروڤاژى دبيت، دێ قەبارێ وێ زێدە بيت، و دێ ژێك ئێتەدەر، و ئەڤە بەروڤاژى ياساييێيە.

ڤى تشتى ئەم ب چاڤ دبينين، ئەگەر ئەم ئامانەكێ ئاڤێ دانينە د ئاڤ تەزينكێدا، و چاڤەرێ قەبارێ وێ بكەين، دێ بينين پشتى قەرسيبوونێ قەبارێ وێ يێ زێدەبووى، و

ئەگەر ڤەپاخەكێ شدیایی ل سەر بیت، دێ شكێت، ئەڤ تشتە یێ بەرچاڤە و ئەم دزانین، بەلێ چ پەیوەندییا ڤێ تایبەتمەندییێ ب هەبوونا ژیانێڤە هەیە؟ ئەگەر دەمێ ئاڤ دڤەرسی ڤەباریێ وێ بچویك ببا، و تیراتییا وێ زێدە ببا، دا دەریا سەر و بن بنە جەمەد، و دەمێ دەریا دڤەرسین، هەلم دورست نەدبوو، ل ڤێرە باران نەدهاتن، دا رووەك و گیانەوەر مرن، و دویڤدا مرۆڤ ژی نەدمان، ئەگەر ئاڤ بۆ ژێكهاتنەدەر و تێكچۆنێ وەكی توخمێن دی با یێن خودێ چێكرین، دا ژیان بەری ملیۆنەهان سالان ب دویماهی ئێت، بەلێ زێدەبوونا ڤەباریێ ئاڤێ و ژێكهاتنەدەرا وێ د ڤێ پلا گەرمییێدا (4+)، ئەڤ تایبەتمەندییە خودێ ئێخستییە د ناڤ ئاڤێدا، ئەڤەیە وەدكەت كو ژیان یا بەردەوام بیت ل سەر روییێ عەردی، دەمێ زەریا دبنە جەمەد، دێ ڤەباریێ وێ ئاڤا بوویە جەمەد زێدە بیت، و دەمێ ڤەباریێ وێ زێدە دبیت، تیراتییا وێ كێم دبیت، و دەمێ تیراتییا وێ كێم دبیت دێ جەمەد ب سەر ئاڤێ كەڤیت، ئەگەر ئەم بچینە زەریایێن هەردو جەمسەران، دێ بینین ڤەرسین یا ل تەخا سەرڤە، و د كویراتییا واندا ئاڤ یا شلە، و زیندەوەر ب شێوەكێ ئاسایی دهێن و دچن، هەروەكی ئەو ل جهەكێ دی دژین.

ئەرێ ئەڤ تایبەتمەندییا خودێ كرییە د ئاڤێدا تشتەكێ هلكەتنە (صدفە)یە؟ و ئەگەر ئەڤ تایبەتمەندییە نەبا كەس ژ مە نەدئاخڤت، بەلكو ژیان ل سەر عەردی نەدبوو.

هەر چەند مرۆڤ هزركرنێ د نیشانێن خودێدا ئەوێن كرینە د عەردیدا بكەت، دێ زانین كو ڤی گەردوونی ئافرێنەرەكێ مەزن یێ هەی، كو خودان زانینەكا مەزنە، و پر گوهلێبوون و دیتنە، و یێ ب هێزە، و دلۆڤانە، ئەڤ گەردوونە ڤێ چەندێ ل سەر دسەلمینیت، هەروەكی پێ نیشانێن رێڤەچۆنێنە.. ئەرێ عەسمانێ پر بورج و ستێر، و عەردێ خودان بەرفرەهی، ما نابنە بەلگە بۆ یێ زانا و شارەزا؟!.

## وَإِنْ مِنْ شَيْءٍ إِلَّا عِنْدَنَا خَزَائِنُهُ

خودێ د فەرموودەکا قودسیدا، دبێژیت: ((أصبَحَ عِبَادِي مُؤمِنٌ بِي وَكَافِرٌ، فأمَّا مَنْ قَالَ: مُطِرْنَا بِفَضْلِ اللهِ وَ رَحْمَتِهِ، فَذَلِكَ مُؤمِنٌ بِي وَكَافِرٌ بِالْكَوْكَبِ؛ وَأمَّا مَنْ قَالَ بِنَوْءِ كَذَا وَكَذَا فَذَلِكَ كَافِرٌ بِي، وَمُؤمِنٌ بِالْكَوْكَبِ))[1]، ئانکو: هندەك ژ بەندەیێت من باوەری یا ب من هەی و هندەك گاورن، هەرکەسێ بێژیت: باران ب کەرەم و دلۆڤانییا خودێ ل مە باری، ئەوی باوەری یا ب من هەی و کوفری ب ستێران کر؛ و یێ بێژیت: ژ بەر فلان ستێرێ و فلان ستێرێ ئەوی کوفری ب من کر و باوەری ب ستێران ئینا.

تشتێ هاتییە دوپاتکرن، ئەوە کو چەندییا رێژا هاتنا بارانان، ب رێژەکا سنوردارکری دهێت، وەکی ئەڤ دەنگ و باسە هاتییە زانین ژ لایێ بریکارێ گەردووناسی یێ ئەورۆپی کو دویرگەها عەسمانی یا ئەورۆپی ئەوا ب کارێ تیشکا ژێر سۆریدا رادبیت، ڤێ دویرگەهێ عەوورەك د عەسمانێ ژ دەرڤەدا ئاشکرا کر، د شیانێن ڤی عەووریدا بوو کو شێست جارکی زەریاییێن عەردی ب ئاڤا شرین پڕ بکەت د ئێك رۆژدا.

ئێك ژ زاناییێن گەردوونی دبێژیت: ((دویرگەهێ عەوورێن هەلێ دیارکرینە پتر ژ جهەکی د گەردوونیدا، ئەڤ عەوورە پاشی ئاشکرا کر کو کارگەهەکا مەزنا هەلا ئاڤێ بوو)) و ئەڤە راستگۆییەکە بۆ گۆتنا خودێ: ﴿وَإِنْ مِنْ شَيْءٍ إِلَّا عِنْدَنَا خَزَائِنُهُ وَمَا نُنَزِّلُهُ إِلَّا بِقَدَرٍ مَعْلُومٍ﴾ [الحجر: ٢١].

---

١ـ بوخاری (١٠٣٨)، موسلم (٧١).

و رامانا ڤایدەییا هاتنا بارانان بۆ تەمبیکرنێ یا د ڤێ گۆتنا خودێدا: ﴿وَلَوْ بَسَطَ اللَّهُ الرِّزْقَ لِعِبَادِهِ لَبَغَوْا فِي الْأَرْضِ وَلَكِنْ يُنَزِّلُ بِقَدَرٍ مَا يَشَاءُ إِنَّهُ بِعِبَادِهِ خَبِيرٌ بَصِيرٌ﴾ [الشورى:٢٧]، ئانكو: ئەگەر خودێ رزقێ هەمی بەندەیێت خۆ بەرفرەهـ کربایە (و هەمی زەنگین و بێ منەت کربانە)، دا هەمی د عەردیدا سەرداچن، و دا خۆ مەزن کەن، بەلێ ل ڤایدەیا (قەدارا) وی دڤێت رزقی دئینیتە خوارێ، ب راستی ئەو ل بەندەیێت خۆ شارەزا و ب ئاگەهە. و خودێ دبێژیت: ﴿وَأَنْ لَوِ اسْتَقَامُوا عَلَى الطَّرِيقَةِ لَأَسْقَيْنَاهُمْ مَاءً غَدَقًا (١٦) لِنَفْتِنَهُمْ فِيهِ وَمَنْ يُعْرِضْ عَنْ ذِكْرِ رَبِّهِ يَسْلُكْهُ عَذَابًا صَعَدًا (١٧)﴾ [الجن]، ئانكو: ئەگەر ئەوێت گاوربووین رێکا حەقییێ گرتبانە و موسلمان بووبانە، ئەم دا رزقێ وان بەرفرەهـ کەین. دا وان پێ بجەربینن و هەچییێ گوهدارییا خودایێ خۆ نەکەت، خودێ دێ وی ئێخیتە د ئیزایەکا بێ ڤەبرین و بێ ڤەهەسیاندا، و خودێ دبێژیت: ﴿وَلَوْ أَنَّهُمْ أَقَامُوا التَّوْرَاةَ وَالْإِنْجِيلَ وَمَا أُنْزِلَ إِلَيْهِمْ مِنْ رَبِّهِمْ لَأَكَلُوا مِنْ فَوْقِهِمْ وَمِنْ تَحْتِ أَرْجُلِهِمْ﴾ [المائدة:٦٦]، ئانكو: ئەگەر وان تەورات و ئنجیل و یا بۆ وان ژ خودایێ وان هاتییە خوارێ راگرتبایە و کار پێ کربایە، ب راستی دا د سەر خۆڕا و د بن خۆڕا و دا ل هنداڤی، خۆن ئانكو خودێ دا بۆ وان رێکان ساناهی کەت کو رزقی ژ عەرد و عەسمانان بخۆن.

نەزان و رەڤۆك خەلکێ عەردی دترسینن، جارەکێ ب کێمییا خوارنێ، و جارەکێ ب کێمییا ئاڤێ، و جارەکێ ب نێزیکبوونا نەمانا بیرێن پترۆلێ، ڤێجا دێ شەرا کەن، جارەکێ ژ بەر ئاڤێ، و جارەکێ شەر ژ بەر گەنمی، و نویترین ڤان شەران ژ بەر پترۆلێیە، و ژ وان بۆری، دەمێ خودێ کەرستەکێ کێم دکەت ئەڤە تەمبیکرنە، نە ژ نەشیانا وییە.

# یاسایا پالدانا بەرەف سەری

ئەڤ بارانێن خودێ قەدرێ مە ب وان گرتی، و ئەڤ بەفرێن خودێ کرینە قەنجی ل سەر مە، ژێدەرێ وان ل کیرێیە؟ ئەڤە پسیارەکا هویرە، ژ بەر کو خودێ فەرمانا مە دکەت بۆ بەرێخۆدانا ئەو تشتێن ل عەرد و عەسمانان هەین، خودێ دبێژیت: (قُلِ انْظُرُوا مَاذَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ) [یونس:١٠١]، ئانکو: بێژە: (گەلی گاوران) کا بەرێ خۆ بدەنە عەرد و عەسمانان کا چ تێدا هەیە؟

ژێدەرێ ئێکێ یێ باران دەریا و زەریانە، و رێژا ڤان ل سەر هەمی رویێ عەردی وەکی دهێتە زانین حەفتێ و ئێك ژ سەدێیە، ئانکو حەفتێ و ئێك رویێ عەردی ئاڤە و بیست و نەه هشکاتییە، ئەڤ ئاڤێن زۆر ژ کیڤە هاتینە؟

ل هندەك جهێن زەریایا هێمن کویراتییا وێ دگەهیتە پتر ژ دوازدە هزار متران، ئانکو دوازدە کیلۆمتران، ئەڤ رووبەرێن هندە بەرفرەهـ، ئەگەر کیشوەرێن ئاسیا، و ئەوروپا، و هەردو کیشوەرێن ئەمریکا، و ئوستورالیا، و ئەفریقیا، و جەمسەرێ باشووری، ئەگەر ئەڤ هەمی کیشوەرە ژ وەلات، و مرۆڤ، و دەشت و چیا و بیابانان، رێژا وان بیست و نەه ژ سەدێیە ژ رۆبەرێ عەردی، و یا مایی ئاڤە (دەریا و زەریا)، و ب کویراتییێن ژێك جودا، و کویراتییا هندەك جهان دوازدە هزار مترە، ئەڤ ئاڤە ژ کیڤە هاتییە؟

و ئەڤ سویراتییە ژ کیڤە هاتییە؟ هەتا نوکە ژی بیردۆزا سویراتییا دەریای بیردۆزەکا بەرزەیە کو نەگەهشتییە شرۆڤەکرنەکا دورست.

تشتەکێ دی، کێ دەریا وەلێ کرییە کو تژی ماسی بیت؟ ئەو عومبارەکە بۆ خوارنا مرۆڤان ب درێژاهی و چۆنا سەدە و چاخان، د دەریایاندا پتر ژ ملیۆن جۆرێن ماسییان یێن تێدا، و جۆر و هژمارێن ماسییان ناهێنە هژمارتن.

تشتەکێ دی، خودێ دەریا و زەریا کرینە رێك بۆ پەیوەندیکرنێ د ناڤبەرا کیشوەراندا، و روویێن وان د ناڤبەرا کیشوەراندا لێکڤەکرینە، ڤان هەمییان ڤەکۆلینێن درێژ یێن ل سەر هەین، بەلێ ل ڤێرە من دڤێت هەمبەر یاسایەکا سەرەکی د دەریاییدا راوەستم.

ئەڤ یاسایە دبێژیت: هەر لەشەکێ دکەڤیتە د ئاڤێدا هەمبەری هێزەکا پالدانێ دبیت ژ بنی بۆ سەری، ئانکو پالدانەکا ستوونی یا راست کو یەکسانی کێشا ئاڤێ بیت ل دویڤ قەبارێ ڤی لەشی.

تشتەکێ گران هەلگرە و بکە د ئاڤێدا، دێ هەست کەی کو نێزیکی نیڤەکا کێشا وی یا چۆی، هەروەکی هێزەك وی تشتی بەرەڤ سەری پال ددەت، یاسایەك ب ڤێ هێزێ رادبیت، ئەو هێزا پالدانا بەرەڤ سەری یەکسانی کێشا وێ ئاڤێیە ئەوا هندی قەبارێ ڤی لەشی، ئەگەر ئەڤ یاسایە نەبا ئەم نەدشییاین گەمیان د ئاڤێدا ب کار بینین، ب ڤێ یاسایێ ماسی دشێن د ناڤ ئاڤێدا بهێن و بچن، و دیسا ئەگەر ئەڤ یاسایا هێزا پالدانا بەرەڤ سەری نەبا، چو ماسی د دەریایاندا نەدبوون، ماسی د دەریایاندا ب ساناهی مەلەڤانییان دکەن، ژ بەر کو کێشا وان کێمترە ژ کێشا وێ ئاڤا ئەو شەق دکەن و تێڕا دچن، ژ بەر ڤێ چەندێ ماسی هەست ب هێزەکا پالدانا بەرەڤ سەری دکەت.

ئەگەر ئەڤ یاسایە نەبا پاپۆر نەدشییان ل سەر ئاڤا دەریا و زەریایان بچن، ژ بەر ڤێ چەندێ خودێ دبێژیت: (اللَّهُ الَّذِي سَخَّرَ لَكُمُ الْبَحْرَ لِتَجْرِيَ الْفُلْكُ فِيهِ بِأَمْرِهِ) [الجاثية:١٢]، ئانکو: خودێیە دەریا بۆ هەوە سەرنەرم کری، دا گەمی ب دەستویرییا وی تێدا بچن و بێن.

نویترین ژماره من خواندی، کو هندەك گەشتییێن پترۆلێ یێن هەین پتر ژ ملیۆن بەرمیلان هەلدگرن، بەری چەند سالان مە دبهیست حەفت سەد هزار تەن هەلدگرتن، و هەشت سەد هزار تەن، و نیڤ ملیۆن تەن، نویترین گەشتی پتر ژ ملیۆن تەنان ژ پترۆلێ هەلدگرن، ئەڤە وەکی بازێرەکییە کو پێلێن ئاڤێ شەق دکەت و دچیت، ژ ڤەنجییا کێیە؟ ب ڤەنجییا وێ هێزێیە یا خودێ کرییە د ئاڤێدا، ئەڤ یاسایە (پالدانا بەرەڤ سەری) ئێك ژ زانایێن رۆژئاڤا ئاشکراکربوو و ئەو ژی ئەرخەمیدسە.

خودایێ مە د گەلەك ئایەتاندا ئامازێ ب ڤێ یاسایێ دکەت.

ئایەتا ئێکێ: ﴿اللَّهُ الَّذِي سَخَّرَ لَكُمُ الْبَحْرَ لِتَجْرِيَ الْفُلْكُ فِيهِ بِأَمْرِهِ﴾ [الجاثية:١٢]، و ل سەر پشتا ڤان پاپۆران کەل و پەلان ژ خوارنێ، و ئامویران ڤەدگوهێزن ب رێکا زەریایان، کو ئەو وەکی چیایانە د دەریایدا، پاشی خودێ دبێژیت: ﴿وَلِتَبْتَغُوا مِنْ فَضْلِهِ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ﴾ [الجاثية:١٢]، ئانکو: دا هوین ژ کەرەما وی (خودێ) بازرگانییێ تێدا بکەن، و دا هوین سوپاسییا وی بکەن.

د ئایەتا دوویێدا ئامازێ ب ڤێ یاسایێ دکەت: ﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ الْفُلْكَ تَجْرِي فِي الْبَحْرِ بِنِعْمَةِ اللَّهِ﴾ [لقمان:٣١]، ئانکو: ما تو نابینی گەمی ژ کەرەم و دلۆڤانییا خودێ د دەریاییێدا دئێت و دچیت، ب کەرەما ڤێ یاسایێ (پالدانا بەرەڤ سەری).

ئایەتا سێیێ: ﴿وَمِنْ آيَاتِهِ الْجَوَارِ فِي الْبَحْرِ كَالْأَعْلَامِ﴾ [الشورى:٣٢]، ئانکو: ژ نیشانێت (مەزناتی و دەستهەلاتدارییا) خودێ، چۆن و هاتنا گەمییێت وەکی چیایانە د دەریاییێدا.

**ئایەتا چارێ: ﴿وَلَهُ الْجَوَارِ الْمُنْشَآتُ فِي الْبَحْرِ كَالْأَعْلَامِ﴾[1] [الرحمن:٢٤]، ئانكو: گەمییێت وەكی چیایان بلند، ئەوێت د دەریایێدا دئێن و دچن یێت وینە (ئانكو: خودێیە ڤان گەمییان د گەل مەزناتییا وان، ل سەر ئاڤێ ڕادگریت).**

**ئایەتا پێنجێ: ﴿وَالْفُلْكِ الَّتِي تَجْرِي فِي الْبَحْرِ بِمَا يَنْفَعُ النَّاسَ﴾ [البقرة:١٦٤]، ئانكو: گەمییێت د دەریایێدا دگەڕن، و مفای دگەهیننە خەلكی.**

**ئایەتا شەشێ: ﴿وَمَا يَسْتَوِي الْبَحْرَانِ هَذَا عَذْبٌ فُرَاتٌ سَائِغٌ شَرَابُهُ وَهَذَا مِلْحٌ أُجَاجٌ وَمِنْ كُلٍّ تَأْكُلُونَ لَحْمًا طَرِيًّا وَتَسْتَخْرِجُونَ حِلْيَةً تَلْبَسُونَهَا﴾ [فاطر:١٢]، ئانكو: (ئەڤ هەردو دەریایە وەكی ئێك نابن، ئەڤە یا خۆش و شرینە و ئەڤە یا زێدە سویرە (و نائێتە ڤەخوارن)، و ژ هەردوكان ژی هوین گۆشتەكی تەڕ دخۆن و هوین لۆلۆ و مەرجانان ژێ دەردئێخن، و هوین دكەنە بەر خۆ)، ئانكو ئەڤ (لۆلۆ و مەرجان)ە خودێ تایبەت بۆ هەوەیە هەی مرۆڤ، خودێ دبێژیت: ﴿وَتَرَى الْفُلْكَ فِيهِ مَوَاخِرَ لِتَبْتَغُوا مِنْ فَضْلِهِ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ﴾[2] [فاطر:١٢]، ئانكو: تو گەمییێت مەزن تێدا دبینی ئاڤێ شەق دكەن و دئێن و دچن، دا هوین ژ كەرەما خودێ رزقی بۆ خۆ پەیدا بكەن و بازرگانییێ پێ بكەن، و دا هوین شوكور و سوپاسییا وی بكەن.**

---

١. (ابن كثیر) د تەفسیرا خۆدا (٢٧٣/٤) دبێژیت: [كالأعلام، ئانكو وەكی چیایان د مەزناتییێدا، و د ناڤدا ژی جهێن كرین و فرۆتنانە، و جهێ پیشەیێن ڤەگوهاستی ژ وەلاتەكی بۆ وەلاتەكێ دی، و ژ هەرێمەكێ بۆ هەرێمەكا دی، ژ بەر كو د ڤێ چەندێدا باشییا خەلكی یا تێدا ب دەستڤەئینانا وان هەمی كەل و پەلێن پێدڤی دبنێ، و ژ بەر ڤێ چەندێ گۆت ـ ئانكو پشتی ڤێ ئایەتێ ـ (فبأي آلاء ربكما تكذبان) ئانكو: ڤێجا [گەلی مرۆڤ و ئەجنەیان] هوین كیژ نیعمەتا خودایێ خۆ درەو ددانن و پەسەند ناكەن].

٢ـ (ابن كثیر) د تەفسیرا خۆدا (٥٥٢/٣) دبێژیت: [وترى الفلك فيه مواخر، ئانكو دچن، و ئاڤێ شەق دكەن ب سینگێ خۆ، و ئەڤە پێشییا وێ یا كێلە وەكی سینگێ بالندەیە]، و (طبري) د تەفسیرا خۆدا: (١٢٣/٢٢) دبێژیت: [وترى الفلك فيه مواخر، خودێ دبێژیت: تو گەمییێن مەزن دبینی د هەمی وان دەریایاندا ئاڤێ ب سینگێ خۆ شەق دكەن، و ئەڤ چەندە ژی ئەگەر ئێك گەمی بیت دبیتە (ماخرة)، دبێژن (مخرت تمخر وتمخر مخرا) و ئەو ژی دەمێ ب سینگێ خۆ ئاڤێ شەق دكەن و دچن]. د گەل راستڤەكرنا كێم و سڤك.

ئەڤە ژ نیشانێن خودێنە، دەمێ تو تشتەکی ب کار دئینی کو هاتبیتە کرین ژ وەلاتەکێ دویر هزرا ڤان ئایەتان بکە، ئەگەر خودێ یاسایا پالدانا بەرەڤ سەری نەکربا د ئاڤێدا، پاپۆر نەدشیان ڤان کەل و پەلێن تو ب کار دئینی ڤەگوهێزی، ل ڤێرە ئەڤە نیشانەکە ژ نیشانێن بەلگەنە ل سەر مەزناهییا خودێ، (فَبِأَيِّ آَلَاءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ) [الرحمن:٢٥]، ئانکو: ڤێجا (گەلی مرۆڤ و ئەجنەیان) هوین کیژ نیعمەتا خودایێ خۆ درەو ددانن و پەسەند ناکەن.

# پەیوەندییا ئاڤێ ب رەنگێ کەڤرانڤە

ژ نیشانێن ئیعجازا زانستی ئەوا گرێدای ب ئاڤێڤە، خودێ دبێژیت: (أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ أَنْزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَخْرَجْنَا بِهِ ثَمَرَاتٍ مُخْتَلِفًا أَلْوَانُهَا وَمِنَ الْجِبَالِ جُدَدٌ بِيضٌ وَحُمْرٌ مُخْتَلِفٌ أَلْوَانُهَا وَغَرَابِيبُ سُودٌ (٢٧) وَمِنَ النَّاسِ وَالدَّوَابِّ وَالْأَنْعَامِ مُخْتَلِفٌ أَلْوَانُهُ كَذَلِكَ إِنَّمَا يَخْشَى اللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ الْعُلَمَاءُ إِنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ غَفُورٌ (٢٨)) [فاطر]، (ئانکو: ما تو نابینی ب راستی خودێ باران ژ عەسمانی داڕێت، و مە گەلەك فێقییێ رەنگ رەنگ پێ دەرئێخست (هەرچەندە ئێك ئاڤە بەلێ فێقی نەوەکی ئێکە)، و مە چیا ژی ب رێك و رێزێت سپی و سۆر و زێدە رەشێت رەنگ نەوەکی ئێك یێت چێکرین (ئانکو ژ بلی فێقی مە جوداهی یا ئێخستییە د چیایان ژیدا). و مە مرۆڤ و جانەوەر و کەوال و پێرە ژی هۆسا نەوەکهەڤ یێت چێکرین، ب راستی ژ بەندەیێت وی بەس زانا ب دورستی ژ خودێ دترسن، ب راستی خودێ یێ سەردەست و گونەهـ ژێبەرە).

جوداییا رەنگان سێ جاران د ڤێ ئایەتێدا هاتییە.

چێ دبیت مرۆڤ حێبەتی بیت ژ پەیوەندییا هاتنەخوارا ئاڤێ ژ عەسمانان و جوداییا رەنگێن چیایان، کورتییا ڤێ چەندێ ئەوە، ئاڤ ژ هەمی توخمان پتر یێ حەلبوویە و کارلێکەرە، و ئاڤ هۆکارێ کۆتاکەرە د رەنگکرنا چیایاندا، و چیا رەنگێن خۆ وەردگرن ژ رەنگێن پێکهاتەیێن وێ یێن کانزایی، و کانزا دهێنە رەنگکرن ل دویڤ ژەنگاتییا وان، و ئاڤێ پەیوەندی یا ب ڤێ ژەنگێڤە هەی، ژ بەر ڤێ چەندێ دێ بینین رەنگێن چیایان ئێك ژ هۆکارێن رەنگکرنا وان، و جوداییا رەنگێن وان ژ چیایێن رەش و سپی و سۆر، ئەڤ جوداییە بۆ ئاڤێ دزڤریت، ژ بەر ڤێ چەندێ خودێ دبێژیت: (أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ أَنْزَلَ

مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَخْرَجْنَا بِهِ ثَمَرَاتٍ مُخْتَلِفًا أَلْوَانُهَا وَمِنَ الْجِبَالِ جُدَدٌ بِيضٌ وَحُمْرٌ مُخْتَلِفٌ أَلْوَانُهَا وَغَرَابِيبُ سُودٌ﴾ [فاطر:٢٧].

چەند زانست پێش دكەڤيت لايەكى ژ لايێن ئيعجازا قورئانىٚ ب زانستى ئاشكرا دبيت، ژ بەر وێ ئێكێيە دا ئەم باش بزانين كو ئەوێ ئەڤ قورئانە ئينايە خوار، ئەوە يێ گەردوون ئافراندى، و ئەڤ رێككەفتنە د ناڤبەرا زانستى و وەحيێدا تشتەكێ ڤەبڕە، چونكى وەحى ئاخفتنا خودێيە، و ژ بەر كو گەردوون خودێ يێ ئافراندى، پێدڤييە د گەل زانستێ ب دورستى رێك بكەڤيت د گەل ڤەگوهاستنا دورست، ژ بەر ڤێ چەندێ بەردەوام ئەز دبێژم: راستى بازنەكە پێدڤييە هێلێن دورست د گەل رامانا دورست تێدا ئێكتر ببرن، و هێلێن عەقلێ خۆرست (ديار و ئاشكەرا) نەيێ هێجەتگر بيت د گەل هێلێن خۆرسكييا (فطرة) ساخلەم نەيا كرێت، و هێلێن دۆرهێلييا دورست نەيا سەختە، پێدڤييە ئەم باش بزانين كو ئەوێ گەردوون ئافراندى ئەوە يێ ئەڤ قورئانە ئينايە خوار، خودێ دبێژيت: ﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ أَنْزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَتُصْبِحُ الْأَرْضُ مُخْضَرَّةً إِنَّ اللَّهَ لَطِيفٌ خَبِيرٌ﴾ [الحج:٦٣]، ئانكو: ئەرێ ما تو نابينى، كو ب ڕاستى خودێ ئاڤێ ژ عەسمانى دئينيتە خوارێ ڤێجا عەرد پێ كەسك دبيت، ب ڕاستى خودێ زێدە هويربين و شارەزايە. ل ڤێرێ دلۆڤانييە، خودێ دبێژيت: ﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ أَنْزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَخْرَجْنَا بِهِ ثَمَرَاتٍ مُخْتَلِفًا أَلْوَانُهَا وَمِنَ الْجِبَالِ جُدَدٌ بِيضٌ وَحُمْرٌ مُخْتَلِفٌ أَلْوَانُهَا وَغَرَابِيبُ سُودٌ (٢٧) وَمِنَ النَّاسِ وَالدَّوَابِّ وَالْأَنْعَامِ مُخْتَلِفٌ أَلْوَانُهُ كَذَلِكَ إِنَّمَا يَخْشَى اللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ الْعُلَمَاءُ إِنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ غَفُورٌ (٢٨)﴾[1] [فاطر].

---

١. [الجُدّة: رێك، و كۆما وێ (جُدَد)؛ و گۆتنا خودێ: (جُدَدٌ بيض وحمر) ئانكو: رێكێن جوداييا رەنگێ چياى... (فراء) دبێژيت: الجُدَد: نەخشە و رێكن، د چياياندا چێ دبن، نەخشەيێن سپى و رەش و سۆر وەكى رێكان، ئێكا وێ دبێژنێ (جُدّة)]؛ (لسان العرب مادة جدد).

[الغرابيب: يێ گەلەك رەش، و كۆما وێ غرابيب)، النهاية في غريب الحديث (٣٥٢/٢).

(إِنَّمَا) ئاماژێ كورتكرنێ و ڤەبرینێ ددەت، ئانكو: ئەگەر داخوازا زانستی نەكەی چو رێك نابن كو تو ژ خودێ بترسی، و ئەگەر تە بڤێت ژ خودێ بترسی ب ترسینەكا راست پێدڤییە تو داخوازا زانستی بكەی، چونكی خودێ دبێژیت: (إِنَّمَا يَخْشَى اللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ الْعُلَمَاءُ)، ئانكو زانا بتنێنە ژ خودێ دترسن، و كەس ژ بلی وان نینە.

(ابن كثير) بۆ تەفسیركرنا ڤان دو ئایەتان دبێژیت[1]: ((خودێ ب هۆشداری دبێژیت ل سەر تەكووزییا شیانا وی د چێكرنا تشتێن هەمەرەنگێن جودا جودادا ژ ئێك تشت، و ئەو ئاڤە یا كو ژ عەسمانی دئێتە خوار، دەرامەتێ ڕەنگ جودا ژێ دەردكەڤیت ئانكو چێ دبیت، ژ زەر و سۆر و كەسك و سپی، و ژ بلی ڤان ژی ژ رەنگێن دەرامەتی، وەكی ئەو دهێتە دیتن ژ جۆرەییا رەنگ و تام و بێهنێن وان، وەكی خودێ د ئایەتەكا دیدا دبێژیت: (وَفِي الْأَرْضِ قِطَعٌ مُتَجَاوِرَاتٌ وَجَنَّاتٌ مِنْ أَعْنَابٍ وَزَرْعٌ وَنَخِيلٌ صِنْوَانٌ وَغَيْرُ صِنْوَانٍ يُسْقَى بِمَاءٍ وَاحِدٍ وَنُفَضِّلُ بَعْضَهَا عَلَى بَعْضٍ فِي الْأُكُلِ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِقَوْمٍ يَعْقِلُونَ) (بالرعد:٤])، ئانكو: د عەردیدا هندە پارچەیێت ب ڕەخێكڤە و نێزیكی ئێك (بەلێ نەوەكی ئێكن، ئەڤە یێ قەلەوە و ئەڤە نە) و جنیكێت تری و چاندنێ و دارقەسپێت وەكی ئێك (دو تا ژ ئێك بنێ دەركەڤتی) یێت هەین نەوەكی ئێك (هەر ئێك ل سەر بنێ خۆ)، یێت هەین هەمی ب ئێك ئاڤ دئێنە ئاڤدان، و ئەم خوارنا هندەكان ب سەر هندەكان دئێخین، ب ڕاستی ئەڤە هەمی (كو عەرد ب سەرێكڤەیە و نەوەكی ئێكە، و ئێك عەرد چەند ڕەنگێت شینكاتی ژێ دەردكەڤن، و گەلەك ڕەنگێت فێقی ل سەر ئاخەكێ شین دبن، و ب ئاڤەكێ دئێنە ئاڤدان بەلێ تام و ڕەنگێت وان ژێك جودانە)، نیشان و بەلگەنە بۆ وان ئەوێت تێ دگەهن و ئەقلێ خۆ ددەنە كاری، و گۆتنا خودێ: (وَمِنَ الْجِبَالِ جُدَدٌ بِيضٌ وَحُمْرٌ مُخْتَلِفٌ أَلْوَانُهَا)، ئانكو: و دیسا چیا ژی یێن چێكرین ب ڕەنگێن جودا هەر وەكی دهێنە بەرچاڤ و دیتن، ژ ڕەنگێ سپی و سۆر، و د هندەكێن

---

١. مەرەما من هەردو ئایەتێن: ٢٧-٢٨ ژ سۆرەتا فاطر.

واندا ریك یێن هەین، کو ئەو ژی رامانا (الجُدَدُ)یە، کۆما وێ دبیتە (جُدَّة)، ڕەنگێن وان دیسا د جودانە، و ئبن عەباس (خودێ ژ هەردویان رازی بیت): (الجُدَدُ: الطرائِقُ) ئانکو کۆما وێ (ڕێکن)... و (الغَرابیبُ): الجبالُ الطوالُ السودُ)، ئانکو: چیایێن درێژێن رەش، ئبن جەریر دبێژیت: و دەمێ عەرەبان ڕەنگێ گەلەکێ رەش سالۆخەت دکر دگۆتن: (أسودُ غِربیب)... خودێ دبێژیت: ﴿وَمِنَ النَّاسِ وَالدَّوَابِّ وَالْأَنْعَامِ مُخْتَلِفٌ أَلْوَانُهُ كَذَلِكَ﴾ [فاطر:٢٨]، ئانکو: مە مرۆڤ و جانەوەر و کەوال و پێرە ژی هۆسا نەوەکهەڤ یێت چێکرین.

ئانکو گیانەوەر ژی ژ هەمی ئەوێن ل سەر پێیان ب ڕێڤە دچن، و پەیڤا ﴿وَالْأَنْعَامِ﴾ ژی دیسا د جودانە، و مرۆڤ ژی هەنە بەربەری، و حەبەشی، و عەجەم یێت گەلەك د رەش، و سلافی، و رۆمی گەلەك سپینە، و عەرەب د ناڤبەرا هەردویاندا، و هندۆك ژی پێداترن، و ژ بەر ڤێ چەندێ خودێ د ئایەتەکا دیدا دبێژیت: ﴿وَاخْتِلَافُ أَلْسِنَتِكُمْ وَأَلْوَانِكُمْ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِلْعَالِمِينَ﴾ [الروم:٢٢]، ئانکو: جودایی و نەوەکهەڤییا زمان و ڕەنگێت هەوەیە، ب ڕاستی ئەڤە نیشانێت ئاشکەرانە (ل سەر مەزناتی و دەستهەلاتدارییا خودێ) بۆ مرۆڤێت زانا و تێگەهشتی، دیسا جانەوەر و کەوال و پێرە ڕەنگێن وان د جودانە، هەتا د رەگەزەکیدا، بەلکو د ئێك جۆردا ژی ڕەنگێن وان د جودانە، و هەتا د ئێك گیانەوەردا ژی دبیت بەلەکی (رەش و سپی) تێدا بیت، ئانکو ژ ڤی ڕەنگی و رەنگەکێ دی، و پاکی و بلندی بۆ باشترین و چێترین چێکەر... و ژ بەر ڤێ چەندێ خودێ پشتی ئەڤێ دبێژیت: ﴿إِنَّمَا يَخْشَى اللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ الْعُلَمَاءُ﴾، ئانکو: ب ڕاستی زانایێن خودێ دنیاسن ترسیانەکا راست و دورست ژ وی دترسن، چونکی هەر چەند نیاسینا ل سەر خودایێ مەزن و خودان شیان و پر زانا یێ سالۆخەتکری ب سالۆخەتێن تەکووزییێ، و یێ سالۆخەتێن باش و بلند ب ناڤ و باشناڤێن ویڤە، هەر چەند نیاسین ب وی تمام بوو، و زانین ب وی تەکووز بوو، دێ ترس ژ وی مەزنتر و پتر بیت))[1].

---

١- تەفسیرا (إبن کثیر) (٣/٥٥٤).

# الْبَحْرُ الْمَسْجُورُ

ژ مەزنترین نیشانێن حێبەتییێ د دەریا و زەریایاندا، ئەوە یا د قورئانێدا هاتی ل دەستپێکا سۆرەتا (الطور) د سالۆخەتکرنا دەریایدا ئەوا ئاگر پێڤە، خودێ دبێژیت: ﴿وَالْبَحْرِ الْمَسْجُورِ﴾ [الطور:٦]، ئانکو: سویند ب دەریایا تژی ئاڤ (یان یا رۆژا قیامەتێ دبیتە ئاگر).

خودێ سویند ب ڤێ دەریایێ دخۆت، و خودێ یێ بێ منەت و زەنگینە سویندێ بۆ بەندەیێن خۆ بخۆت، بەلێ دا دیتنا وان بۆ مەزناتییا سویندخواری (خودێ) ببەن، و پەیڤا (المسجور) د زمانیدا[1] ئەوە یا ئاگر پێڤە هەتا گەرم دبیت، ئاڤ و ئاگر دژی ئێکن و ل هەڤ ناگرن، چونکی هەبوونا ئێك ژ وان یادی ژ ناڤ دبەت، ژ بەر کو ئاگر ب ئاڤێ دهێتە ڤەمراندن، ل ڤێرە چاوا دەریا یا ب ئاگرە؟ هندەکا ژ وان گۆت: ئەرێ ما گەردا ئاڤێ ژ ئۆکسجین و هایدرۆجینی پێك ناهێت؟ و ئۆکسجین گازەکا هەلکرییە، و هایدرۆجین گازەکا هاریکارە بۆ سۆتنێ (هەلکرنێ)، ئەگەر خودێ ئەڤ پەیوەندییا سار د ناڤبەرا واندا ژێکڤە کربا، دا دەریا بیتە گومتلەکێ گوڕییێ، ئەڤە رامانەك، بەلێ زانایەکێ هەڤچەرخ دبێژیت: ((یا هاتییە دوپاتکرن کو د بنێ زەریایاندا ڤۆلکانێن هەین گوڕییێ دهاڤێن ژ جهێن دەرزدا))، و ئەڤە نیشانەکە ژ نیشانێن خودێ د ئافراندییێن ویدا، چونکی ئەگەر ئەڤ ئاگرە نەبا زیندەوەرێن د بنێ زەریایدا نەدشیان د ڤێ تاریاتییێدا بژین، زانایان د سالێن شێستاندا ل سەدێ بیستێ، ئانکو پشتی پتر ژ هزار و چار سەد سالان ژ هاتنە خوارا ڤێ قورئانێ دگۆتن: کو د هەمی زەریایاندا، و گەلەك ژ دەریایان بنێ وان ب ئاگرێ ڤۆلکانان یێ رۆهنە، و ئەڤە ئەو راستییە یا قورئانا پیرۆز ڤەگەراندی و ناڤلێنا ب ﴿الْبَحْرَ الْمَسْجُورَ﴾.

---

١. بزڤرە (لسان العرب، مادة سجر) دێ پتر مفایی بینی.

## هَذَا عَذْبٌ فُرَاتٌ وَهَذَا مِلْحٌ أُجَاجٌ

ژ نیشانێن خودێ یێن بەلگە ل سەر مەزناهییا وی ئەڤ سویراتییەیە یا ئەم د دەریایاندا دبینین، و زانا دبێژن: د هەر لیترەکا ئاڤا دەریایدا بیست و حەفت گرامێن خوێ یێن تێدا، و جیهان ب هەمیڤە د سالێدا پتر ژ پێنجی ملیۆن تەننان ژ خوێیا دەریای دمەزێخیت، و رێژا سویراتییێ د ئاڤا دەریایدا هەمبەر سێ و نیڤ ژ سەدێ ژ هەمی ئاڤا دەریاینە، بەلکو د هەر کیلۆمترەکا شەش پالۆدا (مکعب)، (و ئەو شەش پالۆیە رەخەکێ وێ کیلۆمترەکە) ژ ئاڤا دەریای سیه و چار ملیۆن تەننێن خوێ یێن تێدا.

ئەگەر خوێیا دەریای دەربێخن و هشك بکەن، و داننە سەر هشکاتییێ (عەردی) ـ ل سەر هەر پێنج کیشوەران ـ و چو جیهان نەهێلن کو مە خوێ لێ نە رەشاند بیت دێ ستویراتییا ڤێ خوێیا هشککری ل سەر هەمی هشکاتییێ گەهیتە سەد و پێنجی و سێ مەتران.

ئەو پسیارا سەرنجێ رادکێشیت: ئەڤ چەندییا مەزن یا خوێیا دەریای ژ کیڤە دهێت، کو ئەو کلۆرێ سۆدیومە؟ هندەك ژ وان دبێژن: ئەو خوێیا د دەریایاندا چار ملیۆن و نیڤ میلێن چار گۆشەنە، ئەڤ ژمارە هەمی د هویربینن ژ پەرتۆکێن زانستیدا ئینباینە دەر.

ئەڤ خوێیە ژ کیڤە هاتییە؟ چاوا هاتییە دانان د دەریایدا؟ گەلەك بیردۆزێن هەین، هندەك ژ وان دبێژن: کەڤرێن خوێ یێن د بنێ دەریایاندا هەین پرت پرت دبن، و حەل دبنە د ناڤ ئاڤێدا، و هندەکێن دی دبێژن: ئەگەرێ وێ ئاڤا رویبارایە، ئەڤ هەمی بیردۆزە کو هەول ددەن سویراتییا ئاڤا دەریای راڤە بکەن، دبینن رێك دهێتە گرتن ب

ئەگەرەكێ سادە (بچويك)، ئەو ژى كو د عەرديدا ژمارەكا مەزنا دەرياچێن شرين يێن هەين، و ئەگەر ئاڤا رويباران ب تنێ تێرا هندێ هەبيت بۆ سويركرنا ئاڤا دەريايان، بۆچى ئەڤ دەرياچێن مەزن تاما وان هەر ما شرين ـ و ئەو وەكى دەرياييێن بچويكن ـ سەدان مليۆن سالان، و راڤەكرنا ڤێ چەندێ چييە؟ هەتا نوكە ژى ئەگەرێ سويراتييا ئاڤا دەرياى مژدارەكا مەزنە، و ناهێتە راڤەكرن ب تنێ ب ڤان ئايەتان نەبيت، خودێ دبێژيت: ﴿وَهُوَ الَّذِي مَرَجَ الْبَحْرَيْنِ هَذَا عَذْبٌ فُرَاتٌ وَهَذَا مِلْحٌ أُجَاجٌ﴾ [الفرقان:٥٣]، ئانكو: ئەوە يێ هێلايى هەردو دەريا بگەهنە ئێك و بكەڤنە رەخێك، ئەڤە يا شرين و خۆشە، و ئەڤە زێدە يا سويرە (نائێتە ڤەخوارن). سوير نابيت؛ ئەگەر رويبار ژى برژنە سەر، و ئەگەر كەڤر ژى پرت پرت ببن، و ئەگەر د رێكا چۆنا رويباراندا چياييێن خوێ ژى هەبن، دێ دەريايا شرين هەر مينيت شرين.

خودێ دبێژيت: ﴿وَهُوَ الَّذِي مَرَجَ الْبَحْرَيْنِ هَذَا عَذْبٌ فُرَاتٌ وَهَذَا مِلْحٌ أُجَاجٌ﴾ [الفرقان: ٥٣]، و ئەڤ خوێيا زێدە سوير ژ چێكرنا خودێيە، و ژ شيانا خودێيە، ﴿وَجَعَلَ بَيْنَهُمَا بَرْزَخًا﴾ [الفرقان:٥٣]، و ئەڤە زێدەگافيێ ناكەت ل سەر يادى، و ئەگەر رويبارەكێ شرين برژيتە د دەريايەكێدا دێ دەهان، بەلكو سەدان كيلۆمتران چيت و دێ هەر مينيت يا شرين، چونكى د ناڤبەرا دو دەرياياندا ناڤبرەك (بَرْزَخاً) يێ هەى هەتا نوكە سروشتێ ڤێ ناڤبرێ يێ بەرزەيە ئانكو نەهاتييە زانين.

و سەبارەت ڤێ گۆتنا خودێ: ﴿وَجَعَلَ بَيْنَهُمَا بَرْزَخًا وَحِجْرًا مَحْجُورًا﴾[1] [الفرقان:٥٣]، و (الحجر) د ڤێ ئايەتێدا، ئەوە كو ناهێليت ماسييێن ئاڤا شرين بچن بۆ ئاڤا سوير، و بەروڤاژى.

---

١ـ (طبري) د تەفسيرا خۆدا (١٤/١٩) دبێژيت: [و مەرەم ژ ڤێ چەندێ ئەوە ژ نيعمەتا وى ل سەر چێكرييێن وى و مەزناهييا دەستهەلاتا وييە ئاڤا دەرياى يا شرين د گەل ئاڤا زێدە يا سوير يا دەرياى تێكەل دكەت، پاشى ناهێليت سويراتى ژ شرينييا ئاڤا شرين بگوهۆريت، و نەخۆش بكەت ب حەزكرن و قەدەرا وى

خودێ د سۆرەتا (الواقعة)دا دبێژیت: (أَفَرَأَيْتُمُ الْمَاءَ الَّذِي تَشْرَبُونَ (٦٨) أَأَنْتُمْ أَنْزَلْتُمُوهُ مِنَ الْمُزْنِ أَمْ نَحْنُ الْمُنْزِلُونَ (٦٩) لَوْ نَشَاءُ جَعَلْنَاهُ أُجَاجًا فَلَوْلَا تَشْكُرُونَ (٧٠)) [الواقعة]، ئانکو: ئەرێ ما هوین وێ ئاڤێ نابینن، یا هوین ڤەدخۆن؟!. ئەرێ هوین ژ عەوران دئینینە خوارێ یان ئەم؟.. و ئەگەر مە ڤیابایە دا وێ ئاڤێ تەحل و سویر (شۆر) کەین، ڤێجا بۆچی هوین سوپاسی و شوکورا خودێ ناکەن، ئەگەر حەز کر دێ زێدە سویر کەت وەکی ئاڤا دەریایان... ئەرێ ما هوین سوپاسییا خودێ ناکەن ل سەر ڤێ نیعمەتێ (کەرەمێ)؟!!

ئایەتا سێیێ، خودێ دبێژیت: (وَمَا يَسْتَوِي الْبَحْرَانِ هَذَا عَذْبٌ فُرَاتٌ سَائِغٌ شَرَابُهُ وَهَذَا مِلْحٌ أُجَاجٌ) [فاطر:١٢]، ئانکو: ئەڤ هەردو دەریایە وەکی ئێك نابن، ئەڤە یا خۆش و شرینە و ئەڤە یا زێدە سویرە (شۆرە) (و نائێتە ڤەخوارن).

گەلەك چیرۆك یێن هەین بەحسێ مرنا هزاران کەسان دکەن ژ تێهنادا یێن مرین د ئاڤا دەریایدا، چێدبیت پاپۆر بن ئاڤ بکەڤیت، و هندەك ژ سویارێن وێ ڤورتال ببن، و ل پاپۆرا رزگارکرنێ سویار ببن، بەلێ دێ ژ تێهنادا مرن، و ئەو ل سەر پشتا پاپۆرێ، خودێ دبێژیت: (وَمَا يَسْتَوِي الْبَحْرَانِ هَذَا عَذْبٌ فُرَاتٌ سَائِغٌ شَرَابُهُ وَهَذَا مِلْحٌ أُجَاجٌ وَمِنْ كُلٍّ تَأْكُلُونَ لَحْمًا طَرِيًّا وَتَسْتَخْرِجُونَ حِلْيَةً تَلْبَسُونَهَا وَتَرَى الْفُلْكَ فِيهِ مَوَاخِرَ لِتَبْتَغُوا مِنْ فَضْلِهِ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ) [فاطر:١٢]، ئانکو: ئەڤ هەردو دەریایە وەکی ئێك نابن، ئەڤە یا خۆش و شرینە و ئەڤە یا زێدە سویرە (شۆرە) (و نائێتە ڤەخوارن)، و ژ هەردوکان ژێ هوین گۆشتەکێ تەڕ دخۆن و هوین لۆلۆ و مەرجانان ژێ دەردئێخن، و دکەنە خەملا بەژنا خۆ و (تو) گەمییێت مەزن تێدا دبینی ئاڤێ شەق دکەن و دئێن و دچن، دا هوین

(خودێ)، داکو ئەڤ نەخۆشییا وێ زیانێ ل هەردویان نەکەت کو سویر بکەت، کو چو ئاڤێ نەبینن ڤەخۆن ل دەمێ پێدڤی پێ هەی، لەوا ئاڤبرەك دانایە د ناڤبەرا واندا، ئانکو ئاڤبرەکێ وەسا کو نەهێلیت هەر ئێك ژ وان یا دی خرابکەت و نەخۆش بکەت].

ژ کەرەما خودێ ڕزقی بۆ خۆ پەیدا بکەن و بازرگانییێ پێ بکەن، و دا هوین شوکور و سوپاسییا وی بکەن.

نیشانەکا دی، ئەڤ دەریایە نەدبوون بەلێ دەمێ خودێ عەرد چێکری کرنە ئاڤزێلێن مەزن بۆ عەردی، بەسی هندێیە کو هندەك زەریا کویراتییا وان پترە ژ دەھ کیلۆمتران، کێ ئەڤ ئاڤزێلە چێکرینە؟

ب راستی ئاڤزێلێن دەریایان و ئاڤا وێ و سویراتییا وێ و ماسییێن وێ و ئەو تیڤلێن لۆلۆیان تێدا و بەرێن گرانبھا نیشانن، و خودێ گەلەك نیشانێن کرینە د عەردیدا، و خودێ دبێژیت: (وَفِي الْأَرْضِ آيَاتٌ لِلْمُوقِنِينَ) [الذاريات: ٢٠]، ئانکو: د عەردیدا نیشان و بەلگە گەلەکن، بۆ وان ئەوێت هەقییێ پەسەند دکەن و پشتەڤانییا وێ دکەن.

# ناڤبڕا د ناڤبەرا دو دەریاياندا و نەتێکەلبوونا سويراتييا ئاڤەکێ ب شرينييا ئاڤا دی

دو ئايەتێن د قورئانا پیرۆزدا، ئێك يا د سۆرەتا (الرحمن)دا، و يا دويێ د سۆرەتا (الفرقان)دا، خودێ د يا ئێکێدا دبێژيت: (مَرَجَ الْبَحْرَيْنِ يَلْتَقِيَانِ (١٩) بَيْنَهُمَا بَرْزَخٌ لَا يَبْغِيَانِ (٢٠) فَبِأَيِّ آلَاءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ(٢١)) [الرحمن]، ئانکو: خودێ هەردو دەریایان (يا شرين و يا سوير) دگەهينيتە ئێك و تێکەلی ئێك نابن. ناڤبرەك يا د ناڤبەرا هەردويياندا، تێکەلی ئێك نابن. ڤێجا هوين كيژ نيعمەتا خودايێ خۆ درەو ددانن و پەسەند ناکەن.

زانا مانە حێبەتی د راڤەکرنا ڤێ ناڤبرێدا (البرزخ)، ل کيڤەيە؟ ئەرێ ئەو يا د ناڤبەرا دەريا سۆر و دەريا هنديدا؟ يان د ناڤبەرا دەريا سپی و دەريا رەشدا؟ يان د ناڤبەرا دەريا سپی و زەريا ئەتلەسيدا، ل دەڤ (جبل طارق)، ل کيڤەيە ئەڤ ناڤبرە؟ (مَرَجَ الْبَحْرَيْنِ يَلْتَقِيَانِ (١٩) بَيْنَهُمَا بَرْزَخٌ لَا يَبْغِيَانِ (٢٠) فَبِأَيِّ آلَاءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ(٢١)) [الرحمن].

تشتێ سەرنجا مرۆڤی رادکێشيت ئەوە هەر دەرياپەکێ پلا سويراتييا وێ يا جهگرە، نە کێم دبيت، و نە زێدە دبيت، د گەل هندێ ژی هەردو دەريا يێن پێکڤە، و چراتييەکا هەی نە کێم دبيت و نە زێدە، و ديسا گەرمی ژی يا جهگرە، و رەنگێ وێ ژی نائێتە گوهۆرين، و ئەگەر مرۆڤەك ل فرۆکەکێ سويار بيت، و ل عەسمانی بفريت، هنداڤ دەرتەنگێ (باب المندب)، يان هنداڤ دەرتەنگێ بسفۆری، يان هنداڤ دەرتەنگێ (جبل طارق) دێ بينی ئەڤ دەريايە تشتەکە، و يا دی تشتەکێ دييە.

زانایێن دەریایان دیت کو گەردیلێن ئاڤێ د دەریا سۆردا دەمێ د چۆنا خۆدا گەهشتنە هێلەکا وەهمی ل دەڤ (باب المندب) دێ زڤریتە دەریا سۆر، و گەردیلێن ئاڤا زەریایێ هندی دەمێ بەرەڤ دەریایێ سۆر دچیت دێ نزم بیت بۆ ژێرییێ ل دەڤ ڤی ناڤبری، و دێ زڤریتە زەریایێ هندی، و زەریایێ هندی د سەر دەریایێ سۆردا ناچیت، و دەریایێ سۆر تێکەلی زەریایێ هندی نابیت، چونکی: (بَيْنَهُمَا بَرْزَخٌ لَا يَبْغِيَانِ) [الرحمن:٢٠]، و هەر ئێك ژ وان چراتی و گەرمی و سویراتییا وان، نە زێدە دبیت و نە کێم، هەروەسا دەریا سپی د گەل دەریا سۆر، و دەریا سپی د گەل زەریایێ ئەتلەسی.

خودێ دبێژیت: (مَرَجَ الْبَحْرَيْنِ يَلْتَقِيَانِ (١٩) بَيْنَهُمَا بَرْزَخٌ لَا يَبْغِيَانِ (٢٠))، بەلێ ئەڤ ناڤبرە نە شویرهەیە، ئەو یێ نەرمە، و ئەڤ گەهشتنا د ئایەتێدا هاتی: (مَرَجَ الْبَحْرَيْنِ يَلْتَقِيَانِ)، ل سەر شێوێ پێلێیە.

و ئایەتا دووێ ئەوە د سۆرەتا (الفرقان)دا هاتی تشتەکێ دی یێ تێدا: (وَهُوَ الَّذِي مَرَجَ الْبَحْرَيْنِ هَذَا عَذْبٌ فُرَاتٌ وَهَذَا مِلْحٌ أُجَاجٌ وَجَعَلَ بَيْنَهُمَا بَرْزَخًا وَحِجْرًا مَحْجُورًا) [الفرقان: ٥٣].

د ناڤبەرا دو دەریایاندا؛ شرین و سویر؛ ناڤبرەك و نە تێکەلبوونا ئاڤا شرین و ئاڤا سویر، ژ بەر کو د هندەك رویبارێن ئەمریکادا چۆنا وان پترە ژ سێ سەد هزار مەترێن چارگۆشە د چرکەکێدا، و درژنە د زەریایێ ئەتلەسیدا، و چۆنا وان د دەریایێدا دگەهیتە هەشتێ کیلۆمتران، ئەڤ ئاڤا شرین د ناڤ ئاڤا سویردا دچیت، و د گەل ڤێ چەندێ تێکەلی ئێك نابن، و ناچنە د گەل ئێك، چونکی: (بَيْنَهُمَا بَرْزَخٌ لَا يَبْغِيَانِ)، و د ناڤبەرا ئاڤا شرین، و ئاڤا سویردا نە تێکەلی و نە چۆنا د گەل ئێك یا هەی، و (حِجْرٌ مَحْجُورٌ)، رامانا وێ ئەوە کو باراپتر ماسییێن ئاڤا شرین ناچنە د ئاڤا سویردا، و ماسییێن ئاڤا سویر ژی ناچنە د ئاڤا شریندا، و د ڤێ ناڤبرێدا وەکی پەرژانەکی یێ هەی بۆ ڤان ماسییان کو بچنە د ئاڤا سویردا، و وەکی پەرژانەکی یێ هەی بۆ وان ماسییان کو بچنە د ئاڤا

شریندا، ژ بەر کو د ناڤبەرا واندا ناڤبرەك و نەتێکەلییا هەردویان د گەل ئێکدا یا هەی: (وَهُوَ الَّذِي مَرَجَ الْبَحْرَيْنِ هَذَا عَذْبٌ فُرَاتٌ وَهَذَا مِلْحٌ أُجَاجٌ وَجَعَلَ بَيْنَهُمَا بَرْزَخًا وَحِجْرًا مَحْجُورًا).

ئەڤە ژ نیشانێن خودێ یێن بەلگەنە ل سەر مەزناهییا وی، ئانکو دەریا تێکەلی ئێك نابن، د گەل هندێ کو پێکڤە د گرێدانە، ئەرێ تو دشێی ئاڤا شرین و ئاڤا سویر بکەیە د پەرداغەکێدا و تێکەل نەبن؟ ئەرێ تو دشێی پشتی تێکەلبوونێ ژێکڤەکەی؟ ئەرێ تو دشێی وێ پشکا شرین ژ ڤی پەرداغی ڤەخۆی؟ ئەڤە تشتەکە د سەر شیانێن مرۆڤیدایە: (مَرَجَ الْبَحْرَيْنِ يَلْتَقِيَانِ (١٩) بَيْنَهُمَا بَرْزَخٌ لَا يَبْغِيَانِ (٢٠) فَبِأَيِّ آلَاءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ(٢١)) [الرحمن]، و دەمێ هندەك ژ ڤان زانایان زانی، و ئەو د سەرەخۆشییا ئاشکەراکرنێن خۆدا بوون بۆ ڤێ چەندێ، کو ئەڤ چەندە قورئانا پیرۆز ئاماژە یا ب ڤێ ئاشکەراکرنا زانستی دایی، ئەو ژی گۆتنا خودێیە: (مَرَجَ الْبَحْرَيْنِ يَلْتَقِيَانِ (١٩) بَيْنَهُمَا بَرْزَخٌ لَا يَبْغِيَانِ (٢٠) فَبِأَيِّ آلَاءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ(٢١)).

زانا مانە حێبەتی ژ ڤێ ئایەتێ، و دیسا ئاشکەراکربوو، کو د ناڤبەرا دو دەریایێن سویر و شریندا پەرژانەك یێ هەی ناهێلیت ئاڤێت وان تێکەلی ئێك ببن، و دیسا د ناڤبەرا دو دەریایێن سویردا، و ناڤبرێدا ناهێلیت ماسییێن د ئاڤا شریندا بچنە د ئاڤا سویردا، و بەروڤاژی، بەلکو هەر ئێك ژ ڤان دەریایان چراتی و پلا سویراتییێ و پێکهاتێن خۆ دپارێزیت، و ئەڤ پەرژانە نەیێ جهگرە، بەلکو ئەو یێ ب بزاڤە ب هۆکارێ بای، و بزاڤا هەلکێشان و داکێشانێ، و قورئانا پیرۆز ئاماژە ب ڤێ ئاشکەراکرنا دووێ یا دای، کو یێ ئێکێ دبێژیتێ: ناڤبڕ، و یێ دووێ: قەدەغەکری (حەرامکری)، خودێ دبێژیت: (وَهُوَ

الَّذِي مَرَجَ الْبَحْرَيْنِ هَذَا عَذْبٌ فُرَاتٌ وَهَذَا مِلْحٌ أُجَاجٌ وَجَعَلَ بَيْنَهُمَا بَرْزَخًا وَحِجْرًا مَحْجُورًا)[1] [الفرقان:٥٣].

و سروشتێ ڤان هەردو پەرژانان هێژ جهێ ڤەکۆلینێیە.

(طبري) دبێژیت: ((و ژ بۆ هندێیە کو ئەم شیانێن وی (خودێ) بزانین ب گرتن و پەرژانکرنا ڤێ خوێیا سویر ژ خرابکرنا ڤێ ئاڤا شرینا خۆش د گەل تێکەلبیا هەر ئێکێ بۆ یا دی.

و ئەگەر هەر ئێك ژ وان بچیتە د جهێ یا دیدا ل ڤێرە چو ڤەدەغەیەك نینە، و چو تشتێ حێبەتی ژێ نینە کو خەلکێ نەزان و بێ باوەر پێ هشیارکەن و بۆ وان بێژن، و ئەگەر هەمی ئەوێن خودایێ مە چێکری د حێبەتی، و مەزنترین سەربۆر و شیرەت و بەلگێن رەوا بن))[2].

---

١ـ و د تەفسیرا (طبري)دا (٢٥/١٩) زار موجاهدی: [(وجعل بينهما برزخاً)، دبێژیت: بەرزەخ ئەوە کو هەردو دگەهنە ئێك و تێکەلی ئێك نابن، و گۆتنا خودێ: (حِجْرَاً مَحْجُوراً)، ئانکو سویراتییا ڤێ تێکەلی شرینییا یا دی نابیت، و چو ژ وان ب سەر یا دیڤە ناچیت].

٢ـ تەڤسیرا (طبري) (٢٥/٩).

# رێككەڤتنا ژمارەیی د قورئانێدا (البَرُّ و البحرُ)

د قورئانا پیرۆزدا جۆر و رەنگێن ئێعجازێ یێن تێدا، ژ وان ژی ئێعجازا رەوانبێژی، و بیرکاری، و یاسایی، و نوچەیی (إخباري)، بەلێ تشتێ سەرنجا مرۆڤی رادکێشیت ئەڤ رێككەڤتنا ژمارەییە، و ژ وێ: پەیڤا (البَر [اليابسة]) ئانكو هشكاتی، سێزدە جاران یا د قورئانا پیرۆزدا هاتی[1]، و پەیڤا (البحر) ئانكو دەریا ـ ب شێوێ كت ـ سیه و سێ جاران یا د قورئانێدا هاتی[2]، د گەل هندێ پێغەمبەری ﷺ دەریا نەدیتییە، و چو تشت ژێ نەدزانی، ئەگەر ئەم وان ئایەتێن پەیڤا (البر) هشكاتی و یێن پەیڤا (البحر) دەریا تێدا هاتین كۆم بكەین، دێ ئەنجام بیتە چل و شەش ئایەت، یەكەیەكێ پێك دئینن ئەو ژی (البر) و (البحر)، ڤێجا ئەگەر ئایەتێن (البر) ل سەر ڤێ كۆیێ بێنە دابەشكرن رێژە ب دورستی دێ بیتە رێژا هشكاتییێ بەرامبەر ئاڤییێ ل سەر رویێ عەردی.

ب راستی ئەو رێژەیە (٧١٪) دەریایە، و (٢٩٪) هشكاتییە، و ئەگەر ئەم سێزدە دابەشی چل و شەش بكەین ژمارە دێ یەكسان بیت د گەل ڤێ رێژێ، ئەرێ ئەڤ ئاخڤتنە ئاخڤتنا مرۆڤانە؟ چاوا ب ڤێ هژمارا ئایەتێن هشكاتی د گەل ئایەتێن دەریایی هاتنە، و د گەل رێژا ئایەتێن هشكاتی بۆ كۆما ئایەتێن هشكاتی و دەریایی، چاوا ئەڤ رێژە هاتنە

---

١ـ ئەو ئایەت ژی ئەڤەنە: المائدة (٩٦)، الأنعام (٥٩)، (٦٣)، (٩٧)، يونس (٢٢)، الإسراء (٦٧)، (٦٨)، (٧٠)، النمل (٦٣)، العنكبوت (٦٥)، الروم (٤١)، لقمان (٣٢)، الطور (٢٨).

٢ـ ئەو ئایەت ژی ل دویف ئێك ب سۆرەتێن خۆڤە ئەڤەنە: البقرة (٥٠)، (١٦٤)، المائدة (٩٦)، الأنعام (٥٩)، (٦٣)، (٩٧)، الأعراف (١٣٨)، (١٦٣)، يونس (٢٢)، (٩٠)، إبراهيم (٣٢)، النحل (١٤)، الإسراء (٦٦)، (٦٧)، (٧٠)، الكهف (٦١)، (٦٣)، (٧٩)، (١٠٩ دو جاران)، طه (٧٧)، الحج (٦٥)، النور (٤٩)، الشعراء (٦٣)، النمل (٦٣)، الروم (٤١)، لقمان (٢٧)، (٣١)، الشورى (٣٢)، الدخان (٢٤)، الجاثية (١٢)، الطور (٦)، الرحمن (٢٤).

کو رێك بکەڤیت بۆ رێژا هشکاتی هەمبەر رێژا دەریایی؟ ئەڤە رەنگەکێ ئیعجازا قورئانا پیرۆزە، و ناڤێ ڤی رەنگێ ئیعجازێ پێ کرییە، ئیعجازا ژمارەیی.

و دیسا پەیڤا (الشهر) ئانکو هەیڤ، دوازدە جاران یا د قورئانێدا هاتی، ئانکو هندی هژمارا هەیڤێن سالێ، ئەرێ ئەڤە تشتەکێ (صدفة)یە؟ ئەرێ ئەڤە ژ چێکرنا مرۆڤانە؟ ئەرێ ئەڤە ئاخڤتنا مرۆڤایە؟ هەر چەند دەم دبۆریت، و زانست پێش دکەڤیت، و ڤەکۆلینێن زانستی بەرەف پێشکەفتنێ بچن، روویێن ئیعجازا قورئانا پیرۆز ئاشکەرا دبن کو بەری وی دەمی نەدهاتنە زانین.

ئەڤ قورئانە ئاخڤتنا خودێیە، و فەنجیبا ئاخڤتنا خودێ ل سەر ئاخڤتنا چێکرییێن وی وەکی فەنجیبا خودێیە ل سەر چێکرییێن وی، ئەڤ قورئانا پیرۆز، ئەو پەرتۆکەکا بریاردەرە، کو ئەم تێدا دگەهینە هەمی تاڤیکرنان، وی کەسی پیرۆزبیت ئەوێ سەرەدەرییێ د گەل دکەت، و پێ دکەتە رێکا ژیانا خۆ، و پێ ژێ وەردگریت، و پێ باوەرییێ پێ دئینیت، و پێ کار پێ دکەت، و قورئان زەنگینییە پشتی وێ هەژاری نینە، و بێی وێ زەنگینی نینە، و ئەو مەهدەرچییێ (شافع) مەهدەرچیکارە، و وەریسێ موکومێ خودێیە.

و دا ئەم بزڤرینەڤە ڤێ قورئانێ، کو ئەو ژێدەرێ ئێکێ یێ ئیسلامێیە، خودێ دبێژیت: ﴿إِنَّ هَذَا الْقُرْآنَ يَهْدِي لِلَّتِي هِيَ أَقْوَمُ﴾ [الاسراء: ٩]، ئانکو: ب ڕاستی ئەڤ قورئانە بەرێ مرۆڤی ددەتە وێ ڕێکێ یا ژ هەمییان ڕاستتر، و دبێژیت: ﴿فَمَنِ اتَّبَعَ هُدَايَ فَلَا يَضِلُّ وَلَا يَشْقَى﴾ [طه:١٢٣]، ئانکو: هەر کەسێ رێکا راستەڕێکرنا من بگریت، نە بەرزە دبیت و نە بەرهنگاری نەخۆشییێ دبیت، و دیسا خودێ دبێژیت: ﴿فَمَنْ تَبِعَ هُدَايَ فَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ﴾ [البقرة:٣٨]، ئانکو: هەر کەسێ ب دویڤ راستەرێکرنا من بکەڤیت (رۆژا قیامەتێ)، نە ترس بۆ هەیە و نە خەم دگەهیتێ.

رەنگێن ئیعجازا قورئانێ ناهێنە هژمارتن، ئەڤە هندەك بوو ژ ئیعجازا قورئانا پیرۆز.

# تەوژمێ کەنداڤێ دەریایی

دەمێ مرۆڤ دچیتە د ناڤ دەریایدا، ئەو جیکێن ئاڤێ یێن دمینن ب لەشێ ویڤە، چێ دبیت ئەو ئاڤ وێ گاڤێ گەهشتبیت، پشتی فۆناغەکا ب سالان ڤەکێشایی بڕی بیت، چونکی ئاڤا دەریا و زەریایان ب رێکا تەوژمان دچیت ژ هێلا کەمەری بۆ هەردو جەمسەران، و جارەکا دی ژ جەمسەران بۆ هێلا کەمەری، کو پتر ژ پازدە هزار کیلۆمەتران دبریت، ئەو ئاڤا ئەم دبینین د دەریایدا ئاڤەکە د گوهۆرینێدایە، دویراتیێن درێژ دبریت، هندەك ژ وێ ئاڤێ بەرەف باکووری دچیت، و هندەك بەرەف باشووری، و هندەك ژی بەرەف رۆژهەلاتی، و هندەك بەرەف رۆژئاڤای، ل ڤێرێ یاسایێن گەلەك ئالۆز یێن هەین کۆنترۆلا لڤین و رێرەوا ئاڤێ دکەن د زەریایاندا، تشتێ گرنگ بۆ مە ئەوە ئەم دیارکەین، ئەگەرێ ڤێ لڤین و چۆنا ئاڤێ د بنیاتدا کو تیشکا رۆژێ ئاڤێ گەرم دکەت د هێلا کەمەریدا، دێ ئاڤ ژێك هێتە دەر، و دێ ئاستێ وێ بلند بیت نێزیکی (٢٠سم)، و ئەڤ بلندبوونە دێ تەوژمی دورست کەت بەرەف باکووری، و ئاڤ ل هەردو جەمسەران سار دبیت، و د گەل ساربوونێ گران دبیت، و د گەل ساربوونا وێ دچیتە د کویراتیێن زەریایاندا، و دێ بەرەف هێلا کەمەری هێت، ل ڤێرە دیار دبیت کو تەوژمێن سەرڤەیا ئاڤێ و تەوژمێن کویر یێن هەین، ب ڤێ پێشەکییێ مە دڤێت ئەم بگەهینە هندێ کو ژ نیشانێن دبنە بەلگە ل سەر مەزناهییا خودێ، تەوژمێ کەنداڤییە، ئەڤ تەوژمە لەزاتییا وی هەشت کیلۆمتران د دەمژمێرەکێدا دچیت، ئەگەر پاپۆرەك چۆ د ناڤدا، و لڤینەرێن وێ ڤەمریان و ئەڤ پاپۆرە د دەمژمێرەکێدا هەشت کیلۆمتران دێ بریت بێی لڤینەرێن وێ کار بکەن.

پاناتییا ڤی تەوژمی، ژ هەشتێ کیلۆمەتران پتره، و کویراتییا وی چارسەد و پێنجی مەترن، و تیراتییا ڤی تەوژمی چار ملیۆن تەنێن ئاڤێ د ئێك خۆلەکدا، ئەڤ تەوژمە چ دکەت؟ سەد و سیە هزار تەنێن گومتلێن جەمەدێ د دەه رۆژاندا حەل دکەت ژ گومتلێن جەمەدا هەردو جەمسەران، ڤی تەوژمی گەلەك مفا یێن هەین کو ناهێنە هژمارتن، ئەڤ تەوژمە دمڤەرێن سار ل ئەوروپا دکەتە دمڤەرێن ناڤنجی، ئەو کەش و هەوایێ هین ل دەولەتێن ئەسکەندەناڤی ئەگەرێ وێ تەوژمێ دەریاییە.

هندەك تەوژم یێن هەین د کویراتییا دەریایاندا کو کویراتییا وان دگەهیتە سێ هزار مەتران، و ئەگەر لڤینەرێن نقوڤانان (غواص) ژ کار کەفتن، د ماوێ ڤان تەوژماندا دێ ژ جهەکی چنە جهەکێ دی، و دیسا ئەڤە تشتەکە سەرنجا مرۆڤی رادکێشیت.

بەلێ نیشانا دووێ یا بەلگە ل سەر مەزناهییا خودێ د ڤی بابەتیدا ئەوە: تەوژمەکی سار یێ هەی بەرەف کەنارێن ئەمریکا باشوور دچیت، دا بگەهیتە وەلاتێ پیرۆ، و چیلی، ئەڤ تەوژمە چ دکەت؟ ئەڤ تەوژمە کۆمێن مەزن ژ گیایێ دەریایی د گەل خۆ دئینیت، و ئەڤ گیایە هژمارێن مەزن ژ ماسییێن سێردین بەرەف خۆ دکێشیت، و ئەڤ ماسییە خوارنا دەهان ملیۆن بالندانە ئەوێن ل سەر کەنارێن ڤان دەریایان دژین، ناڤێ ڤان بالندان قەلا دەریاییە، ڤان بالندان پاشماوە یێن هەی، پاشماوێ ڤان بالندان دهێتە هژمارتن کەرستێ ئێکێ بۆ داهاتێ ڤان مللەتان، ئانکو باشترین جۆرێن دەرمانێن کیمیایی، ژ پاشماوێن ڤان بالندانە، پاشماوێن پێنجی ملیۆن بالندان ب ئامویرێن رامالینێ دبەن، و دهنێرنە گەلەك وەلاتێن جیهانێ، و ئەڤ گەل و مللەتێن ل سەر کەنارێن ئەمریکا باشوور، داهاتییێ وان یێ ئێکێ و دویماهییێ، پاشماوێن بالندانە یێن کو ماسییێن سێردین ب ڤان پاشماوان دژین، و ب تەخمینێن زانایان سالانە پتر ژ سێ ملیۆن تەنان ژ ڤان ماسیان دگرن، ژ بەر کو ئەڤ ماسییە ب ئەگەرێ وان گیایان دهێنە ڤان کەناران یێن ئەڤ تەوژمە د گەل خۆ دئینن، ئەڤە ژی ژ بۆ حیکمەتەکێیە کو خودێ یا ڤیای هەر جارەکێ رێرەوا ڤان تەوژمان بگوهۆریت، و دەمێ رێرەوا وان هاتە

گوهۆرین، ئەڤ خوارنە بۆ ماسیان ناهێت، دێ ماسی و بالندە مرن، و ل ڤی دەمی دێ ئەڤ مللەتە جار جار تووشی برسێن کوژەك بن، ب ئەگەرێ لاوازبوونا داهاتییێ وان، ئەرێ ما ئەڤە نیشانەکا بەلگە نینە ل سەر هندێ کو خودێ رزقدار و خودان هێزەکا موکومە؟ ئەڤ تەوژمە خودان هێزەکا موکوم دهاژۆت و دئینیت، و ئەڤ تەوژمە دهێت گیاییێن خوارنێ یێن تێدا، و ئەڤ ماسییە دهێن ب هژمارێن مەزن، دێ بالندە سێ ملیۆن تەنێن وان مەزێخن د سالێدا، و ئەڤ ماسییە خوارنا بالندانە، و بالندان پاشماوە یێن هەین، و پاشماوێن وان ژ بهاترین جۆرێن پیتێنەرانە (الأسمدة)، دهێنە هنارتن بۆ وەلاتێن جودا جودا، چو نامینیت دێ داهاتێ ڤان گەلان بیتە پاشماوێن بالندان، و ئەڤە ژ ئەگەرێ ڤی تەوژمێ سار کو دهێتە کەنارێن ئەمریکا باشوور.

هندەك وەسا دهژمێرن کو پتر ژ پێنجی ملیۆن بالندان ل ڤان کەناران دژین، دا ڤان تەنێن زۆرێن ماسیان بخۆن، و دا ڤان پاشماوان بهێلن کو دهێنە هنارتن بۆ پترینێ وەلاتێن جیهانێ، ئەڤە تەوژمێ کەنداڤی یێ گەرمە، و یێ دی تەوژمێ سارە، و ئەڤە تەوژمێ سەرڤەیە، و یێ دی تەوژمێ کویرە، و بزاڤا ئاڤێ د دەریایاندا بابەتەکێ هویربین و درێژ و مژدارە، و مە هندەك ژێ گۆت.

د هەر تشتەکیدا نیشانەك یا هەی د سەلمینیت کو ئەو (خودێ) ئێکە

کییە رزقێ ڤان ماسیان ددەت؟ و وان بالندان؟ خودێیە (جل جلالە)، و کییە ئەڤ پاشماوێن بالندان کرییە رزق بۆ مرۆڤان، و ل سەر داهاتەکێ مەزن دژین؟ ئەڤ رزقە ژ بال وی خودایێ رزقدەر و پڕ زانایە.

ئەگەر مە بڤێت بەرامبەر مەزناهییا خودێ راوەستین، ئەڤ گەردوونێ ل بەر مە، ب عەسمانێ خۆ، و عەردێ خۆ، ب دەریایێن خۆ، ب ماسییێن خۆ، ب کەش و هەوایێ خۆ، ب بالندەیێن خۆ، ب چیایێن خۆ، ب دۆلێن خۆ، ب گیاییێن خۆ، ب گیانەوەرێن خۆ، ب ئافراندنا مرۆڤی، ئەڤە کورتترین رێکە بۆ خودێ، و بەرفرەهترین دەرگەهە بۆ نیاسینا

وی، خوداێ دبێژیت: (سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الْآفَاقِ وَفِي أَنْفُسِهِمْ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ الْحَقُّ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ) [فصلت:٥٣].

## ئاڤا زمزم وەکی خوارنیٚ تێر دکەت، و دەرمانیٚ نەساخییە

## مَاءُ زَمزَمَ طعَامُ طُعمٍ، وَشِفَاءُ سُقْمٍ

پێغەمبەری ﷺ ئاڤا بیرا زەمزەم یا سالۆخەت کری دبێژیت: «إِنَّهَا مُبَارَكَةٌ، إِنَّهَا طعَامُ طُعْمٍ»[1]، ئانکو: ئەو یا پر خێرە، وەکی خوارنیٚ تێر دکەت، و د ریوایەتا ل دەڤ بەززاری ب سەنەدەکا دورست ژ زار (أبي ذر): (وَشِفاءُ سُقْمٍ)[2]، ئانکو: و دەرمانیٚ نەساخییە.

و ژ زاریٚ ئبن جەریج رحمه الله دبێژیت: من گوھ لیٚ بوو وی (پێغەمبەری) گۆت: ((خَيْرُ ماءٍ في الأرْضِ ماءُ زَمزَمَ... ))[3]، (ئانکو: ئاڤا زەمزەم چێترین ئاڤە د عەردیدا).

و ژ زاریٚ جابریٚ کوریٚ عەبدوللایی دبێژیت: من ژ پێغەمبەری ﷺ گوھ لیٚ بوو، گۆت: ((ماءُ زَمزَمَ لِمَا شُرِبَ لَهُ))[4]، ئانکو: ئاڤا زەمزەم بۆ وێیە یا بۆ دئێتە ڤەخوارن، و (الدار قطني) د سونەنا خۆدا ژ فەرمودا ئیبن عەباس (خودیٚ ژ وان رازی بیت) یا زێدەکری (مرفوعاً): ((فإنْ شَرِبْتَهُ تستشفي بهِ شَفَاكَ اللهُ، وإنْ شَرِبْتَهُ لِشِبَعِكَ أشْبَعَكَ اللهُ، وإنْ شَرِبْتَهُ لِيَقْطَعَ ظَمأَكَ قطعَهُ اللهُ، وَهوَ هَزْمَةُ[5] جِبْرِيلَ - أي: حفره - وَسُقْيَا اللهِ

---

1. ئیمام موسلم ژ (ابي ذر) ڤەگوهاستییە (٢٤٧٣).

2. (مسند البزار) (٣٩٢٩)، و مصنف (إبن أبي شيبة) (١٤١٣٢).

3. (الطبراني في الأوسط) (١٧٩/٤)، والكبير (٩٨/١١).

4. أخرجه إبن ماجه (٣٠٦٢)، و أحمد (١٤٨٩٢).

5. [جبريل ﷺ پیٚ خۆ لیٚ دا و ئاڤ زا، والهزمة: چالا د سینگیدا، و د سێڤیٚدا نەگەر ب دەستی بگڤێشی، (وهزمت)؛ بیرا ئاڤیٚ دەمیٚ دهێتە کۆلان] النهاية (٢٦٢/٥).

إسماعيلَ))[1]، ئانكو: ئەگەر تە ڤەخوار دا ساخ ببی خودێ دێ تە ساخ کەت، و ئەگەر تە ڤەخوار دا تێر ببی خودێ دێ تە تێر کەت، و ئەگەر تە ڤەخوار دا تێهنا تە بشکێت خودێ دێ تێهنا تە شکێنیت، و ئەو چالا جبریلییە و خودێ تێهنا ئیسماعیلی پێ شکاندی.

و ئیبن ماجە د (مناسك)ێدا ژ زارێ موحەممەدێ کورێ عەبدولرەحمان کورێ ئەبی بەکری گۆت: ((كُنتُ عِندَ ابنِ عَباسٍ جَالِساً، فجَاءَهُ رَجُلٌ فقالَ: مِنْ أينَ جئتَ؟ قالَ: مِنْ زَمْزَمَ، قالَ: فشَرِبتَ مِنهَا كَمَا يَنبَغِي؟ قالَ: وَكَيفَ؟ قالَ: إذا شَرِبتَ مِنهَا فاستقبلِ القِبلةَ، وَاذكرِ اسمَ اللهِ، وتنفسْ ثلاثاً، وتضَلعَ مِنهَا، فاذا فرَغتَ فاحمَدِ اللهَ عَزَّ وَجَلَّ، فإنَّ رَسُولَ اللهِ (صلى الله عليه وسلم) قالَ: إنَّ آيَةَ مَا بَيْنَنَا وَبَيْنَ المُنافِقِينَ إنَّهُمْ لا يَتضَلعُونَ مِنْ زَمْزَمَ))[2].

سەحابی و تابعی و گەلەك ژ زانایێن ئوممەتێ و خەلکێ ب گشتی تێر ژ ئاڤا زەمزەم ڤەدخوار، و دەمێ ڤەدخوار ئنیەتەکا دەستنیشانکری ل سەر دئینا، چونکی دوعا یا باشە ل دەمێ ڤەخوارنا ئاڤا زەمزەم، چونکی ئاڤا زەمزەم بۆ وێیە یا بۆ دئێتە ڤەخوارن، و یا ژ جابری هاتییە ڤەگوهاستن دەمێ ئاڤا زەمزەم ڤەدخوار دوعا دکر و دگۆت: (اللهُم إني أشرَبُهُ لِظمأ يَومَ القِيامةِ)[3]، ئانکو: خودایێ من ئەز وێ ڤەدخۆم ژ بۆ تێهنا رۆژا قیامەتێ.

---

١. سنن الدار قطني (٢٣٨).

٢. ئیبن ماجە (٣٠٦١).

٣. زاد المعاد (٣٩٣/٤).

دیسا یا ژ ئبن عەباس ﷺ هاتی دەمێ ئاڤا زەمزەم ڤەدخوار، دگۆت: (اللَّهُمَّ إِنِّي أَسأَلُكَ عِلماً نافِعاً، وَرِزقاً واسِعاً، وَشِفاءً مِنْ كُلِّ داءٍ)[1]، ئانكو: خودایێ من داخوازا زانینەكا ب مفا، و رزقەكێ بەرفرەه، و سلامەتییێ ژ هەمی دەردان ژ تە دكەم.

هندەك زانا دبێژن: ((ماءُ زَمزَمَ سَيِّدُ المِيَاهِ، وَأَشرَفُهَا، وَأَجَلُّهَا قَدراً، وَأَحَبُّهَا إِلى النُّفُوسِ وَأَغلَاهَا ثَمَناً، وَأَنفَسُهَا عِندَ النَّاسِ))[2]، ئانكو: ئاڤا زەمزەم سەرپشكا هەمی ئاڤایە، و ب رێز و پایە بلندترە، و خۆشڤیترە بۆ دەروونان و پربهاترە، و گرانبهاترە ل دەڤ خەلكی.

ئەڤە د سوننەتا (الصحيحة و الحسنة) و (الأثر) ل سەر ئاڤا زەمزەم، و ژ لایێ زانستی و شرۆڤەكرنێن وی یێن هویرڤە بۆ ئاڤا زەمزەم چنە؟

ل سالێن (١٩٧٣ و ١٩٨٠ز) شرۆڤەكرنێن كیمیایی ژ لایێ كۆمپانییێن جیهانی یێن مەزن و تایبەتمەندڤە بۆ ئاڤا زەمزەم هاتنە كرن، پاشی ئەنجامێن حێبەتی دەركەتن، كو ئاڤا زەمزەم یا ڤالایە ژ هەمی جۆرێن میكرۆبێن دبنە ئەگەرێ پیسبوونێ.

و ئاڤ دئێنە هەژمارتن كانزایی ـ و خەلك لێ خرڤەدبن دا بكرن ـ ئەگەر رێژا خوێیێن كانزایی تێدا ژ (١٥٠ـ ٣٥٠) ملگم بیت د لیترەكێدا، بەلێ ئاڤا زەمزەم رێژا كانزایان تێدا (٢٠٠٠)ملگم د لیترەكێدا، و ژ دیارترینێ ڤان خوێیێن كانزایی؛ كالسیۆم، سۆدیۆم، مەگنیسیۆم، پۆتاسیۆم، و ژ بلی ڤان ژی.

و ئاڤا زەمزەم دهێتە هژمارتن زەنگینترین ئاڤ ب توخمێ كالسیۆمی، كو رێژا وی د ئاڤا زەمزەمدا دگەهیتە (٢٠٠) ملگم د لیترەكێدا، پێغەمبەری (سلاڤ ل سە بن) راست یا گۆتی دەمێ دبێژیت: ((إِنَّها مُبَارَكَةٌ إِنَّها طَعَامُ طُعْمٍ))[3].

---

١ـ شرح العمدة (٥٥٤/٢).

٢ـ زاد المعاد (٣٩٢/٤).

٣ـ ژێدەر بەری نوكە یێ هاتییە دیاركرن.

و ڤەكۆلینێن زانستی یێن نوی سەلماندییە، كو ئێشێن دلی یێن شاخوینبەری (تاجي) ل دەڤ وان مرۆڤێن ئاڤا زەمزەم ڤەدخۆن كێم روی ددەن هەمبەر وان كەسێن ئاڤێن وەكی ڤان ڤەدخۆن، و پێغەمبەرێ خودێ ﷺ راست یا گۆتی دەمێ دبێژت: ((شِفَاءُ سُقْمٍ))[1].

و ئاڤ دبیتە گاز بۆ هەرسكرنێ دەمێ هەر لیترەكا وێ پتر ژ (٢٥٠) ملگم بیكاربۆن تێدا بن، و بەرنیاسترین ڤان ئاڤێن گازی ل جیهانێ ئاڤا كانییا (ئیڤیان)ـە ل فرەنسا، كو رێژا بیكاربۆنان تێدا دگەهیتە (٣٥٧) ملگم د لیترەكێدا، بەلێ ئاڤا زەمزەم رێژا بیكاربۆنان دگەهیتە (٣٦٦)ملگم د لیترەكێدا، پێغەمبەری ﷺ راست یا گۆتی، دەمێ دبێژیت: ((مَاءُ زَمْزَمَ لِمَا شُرِبَ لَهُ))[2].

هندەك زانایێن نوژداری دبێژن: ئاڤێن كانزایی چارەسەرییا گەلەك ژ نەخۆشییێن رۆماتیزم، و زێدەبوونا ترشییا مەعیدەی، و هناڤچۆنا بەردەوام، و هەرسكرنا ب زەحمەت دكەن، و ئەو خودان كارتێكرنەكا باشن، و د نەرم، و سەخبێركەرن بۆ كێمبوونا كانزایان د لەشیدا، و پێغەمبەرێ خودێ ﷺ راست یا گۆتی دەمێ دبێژیت: ((فَإِنْ شَرِبْتَهُ تَسْتَشْفِي بِهِ شَفَاكَ اللهُ، وَإِنْ شَرِبْتَهُ لِشِبَعِكَ أَشْبَعَكَ اللهُ، وَإِنْ شَرِبْتَهُ لِيَقْطَعَ ظَمَأَكَ قَطَعَهُ اللهُ))[3].

ئاڤا زەمزەم نەیا شرینە وەكی ئاڤێن دی یێن ڤەخوارنێ، ئانكو بەرەڤ سویراتییێڤە دچیت، مرۆڤ ئاڤا وەكی ڤێ یا سویراتی تێدا ناڤەخۆت، ئەگەر باوەری نەبیت ب بەرەكەتا وێ، ئانكو ڤەخوارنا وێ بەلگەیە ل سەر باوەرییا مرۆڤی.

و چێ دبیت خودێ ئاڤا زەمزەم شرین نەكربیت دا ئەو شرینییا د ناڤدا وەلێ نەئێت رامانا پەرستنێ بێتە ژ بیركرن دەمێ دئێتە ڤەخوارن، بەلێ تاما وێ هەر چاوا بیت یا

١. ژێدەر بەری نوكە یێ هاتییە دیاركرن.

٢. ژێدەر بەری نوكە یێ هاتییە دیاركرن.

٣. ژێدەر بەری نوكە یێ هاتییە دیاركرن.

پەسەندە، و پێغەمبەری ﷺ راست گۆتییە دەمێ دبێژیت: ((إِنَّ آيَةَ ما بَيْنَنا وَبَيْنَ المُنافِقِينَ إِنَّهُمْ لا يَتَضَلَّعُونَ مِنْ زَمْزَمَ))[1].

و نوکە پسیار بکەین: ئەو چ دەزگەهێن زانستی یێن بلند بوون ل سەر دەمێ پێغەمبەری ﷺ هەین، کو ئەڤ راستییێن حێبەتی ژ ئاڤا زەمزەم دابنە وی؟ و ئەو چ دەستەکێن ڤەکۆلینێ یێن تایبەتمەندن کو گەهشتبنە ڤان ئەنجامێن هویربین ژ ڤێ ئاڤێ؟ و چ جۆرێ تاقیگەهێن پێشکەڤتی بوون کو شرۆڤە کربن، و رێژا خوێیێن کانزایان دەرئەنجام کربن د ئاڤا زەمزەمدا ب هویربینییەکا مەزن، کو پێغەمبەری ﷺ پشت پێ بەستی د فەرموودێن خۆدا ل سەر ڤێ ئاڤا موبارەك؟ ئەو وەحییە، و پێغەمبەرێ خودێ ﷺ ژ دەڤ خۆ نەدئاخڤت، بەلکو ئەو وەحی بوو بۆ دهات.

ئیمام (إبن القیم) دبێژیت: ((من و ژ بلی من ئاڤا زەمزەم یا تاقیکری بۆ چارەسەرییێ، تشتێن حێبەتی هاتنە دیتن، و ئەز ژ چەند نەخۆشییان پێ چارەسەر بووم، و ئەز ژێ خلاس بووم ب حەزکرنا خودێ، و من ئەو ددیتن یێن نێزیکی نیڤ هەیڤێ ڤەدخۆن، یان پتر، و وان تێناتی نەددیت، و د گەل خەلکی وەکی ئێك ژ وان تەواف دکر، و گۆتە من چێ دبیت چل رۆژ مابن... و رۆژی گرتن، و چەند جارەکا تەواف کر))[2].

هیڤی ژ خودێ دکەین رۆژا قیامەتێ ئەم ژ برکا پێغەمبەرێ وی ڤەخۆین، ڤەخوارنەکێ ل رۆژا تێناتییا مەزن ئەم تێنی نەبین پشتی وێ چو جاران.

---

١- ژێدەر بەری نوکە یێ هاتییە دیارکرن.

٢- زاد المعاد (٤/ ٣٩٣). ب دەستکارییەکا کێم و سڤك.

# پشکا شەشێ

## رووەك

١- شوینەوارێن قورئانێ د موکومکرنا رەوشتێ رووەکیدا

٢- رووەکێن کارێ وان  عومبارکرنا ئاڤێ

٣- راکێشانا رووەکی

٤- کارگەهێن بەلگێ کەسك

٥- کەسکاتی د رووەکیدا

٦- تۆڤ و جۆرێن وان

٧- تۆڤ و خۆلبەرگرتنا هۆکارێن ژێکخوارنێ

٨- تیڤلێ گەنمی و مفایێن وی یێن ساخلەمییێ

٩- رەشرەشك

١٠- مفایێن زەنجەبیلێ

١١- قەسپ، گرنگییا وێ، و پێکهاتێن وێ

١٢- ريشالێن قەسپێ، مفایێن وێ، و توخمێن وێ یێن کانزایی

١٣-قەسپ بنیاتێ زارۆکبوونا ب ساناهییە

١٤- زەیتا زەیتوونێ

١٥-زەیتا زەیتوونێ سۆتەمەنییە بۆ لەشێ مرۆڤی

١٦- قوندك ( كولند )

١٧- شێلم خوارنە و دەرمان

١٨- تڤر

١٩- كەلەمی

٢٠- چایا كەسك و پەیوەندییا وێ ب وەرەمتنێن پیسڤە

٢١- فێقییێن ترش و پەیوەندییا وان ب وەرزێ زڤستانێڤە

٢٢- مۆز

٢٣- مەعدەنۆس و مفایێن وێ یێن ساخلەمییێ

٢٤- خەل

٢٥- سیواك و كاریگەرییا وی د میكرۆبـاندا

# شوینەوارێن قورئانێ د موکومکرنا رەوشتێ رووەکیدا

ڤەکۆلەرەکی ژ دەولەتەکا عەرەبی یا جیران کو یێ بەرنیاسە ل سەر هەردو ئاستێن عەرەبی و نیڤ دەولەتی ب ڤەکۆلینێن خۆ، و تایبەتمەندیا وی د زانستێ فەسیۆلۆجییا رووەکاندا و مامۆستایێ زانکۆییێیە، و وی سەنگا خۆ یا زانستی یا هەی، و یێ بەرنیاس بوو ب تاقیکرنێن خۆ یێن پێشەنگدا، و ئەو تاقیکرنا ئەم دێ بەحس کەین بەلکی هوین باوەر نەکەن، بەلێ ئەڤ تشتە دۆرهێلی (واقع) یێ سەلماندی، و ئەڤ گۆتنا خودێ ئەڤ چەندە یا دوپادکری: (تُسَبِّحُ لَهُ السَّمَوَاتُ السَّبْعُ وَالْأَرْضُ وَمَنْ فِيهِنَّ وَإِنْ مِنْ شَيْءٍ إِلَّا يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِ وَلَكِنْ لَا تَفْقَهُونَ تَسْبِيحَهُمْ إِنَّهُ كَانَ حَلِيمًا غَفُورًا) [الاسراء:٤٤]، ئانکو: هەر حەفت عەسمان و عەرد و هندی تێدا هەمی خودێ ژ کێماسییان پاقژ دکەن، و چو تشت نینن سوپاسییا خودێ ب پاقژی نەکەن، بەلێ هوین د تەسبیحا وان ناگەهن، ب راستی خودێ لەزێ ل جزایی ناکەت و یێ گونەهـ ژێبەرە، و خودێ دبێژیت: (أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ يُسَبِّحُ لَهُ مَنْ فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَالطَّيْرُ صَافَّاتٍ كُلٌّ قَدْ عَلِمَ صَلَاتَهُ وَتَسْبِيحَهُ وَاللَّهُ عَلِيمٌ بِمَا يَفْعَلُونَ) [النور:٤١]، ئانکو: ما تە نەزانییە هندی د عەرد و عەسماناندا هەی، و بالندەیێت چەنگ ڤەکری ل عەسمانان، هەمی تێکدا، خودێ ژ تشتێ نەهێژا پاقژ دکەن، و ب راستی هەر ئێکێ (ملیاکەتان، مرۆڤان، جانەوەران و گیانەوەران) نڤێژ و تەسبیحا خۆ یا زانی، و خودێ زێدە زانا و ب ئاگەهە ژ وێ یا ئەو دکەن، و دیسا خودێ دبێژیت: (هُوَ اللَّهُ الْخَالِقُ الْبَارِئُ الْمُصَوِّرُ لَهُ الْأَسْمَاءُ الْحُسْنَى يُسَبِّحُ لَهُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ) [الحشر:٢٤]، ئانکو: ئەوە خودایێ چێکەر و پەیداکەر و وێنە و رەنگ چێکەر، باشناڤ هەمی یێت وینە، هندی د عەرد و عەسماناندا هەین هەمی وی ژ کێماسییان پاقژ دکەن، و هەر ئەوە یێ سەردەست و کاربنەجهـ، و (ما) د ڤێ ئایەتێدا بۆ تشتێ عەقل نەیی (غیر عاقل)، و گۆتنا خودێ: (وَالنَّجْمُ وَالشَّجَرُ

**يَسۡجُدَانِ** (٦) [الرحمن:٦]. ئانكو: گل و گيا (يێ بێ بن) و دار (بۆ خودێ) سوجدەيێ دبەن (ئانكو ل بەر فەرمانا وينە).

**ئەڤ ڤەكۆلەرە دبێژيت: رووەك وەكى جورمێن عەسمانينە، و وەكى چێكرييێن دى يێن خودێيە هەست دكەت، و گوهـ لێ دبيت، و بەرسڤێ ددەت نەرێنى يان ئەرێنى بۆ دەوروبەرێن خۆ ژ كاريگەرييێن دەرەكى، ئەڤە كورتييا ڤەكۆلينێيە.**

**و درێژاهييا وێ ڤى ڤەكۆلەرى د باخێ كۆليژا زانستيدا تاقيكرنەك ل سالا (١٩٩٧ز) كر، وى چار خانييێن پلاستيكى يێن هندى ئێك دانان، و د هەمياندا جۆرەكێ گەنمى چاند، و د هەمييياندا هندى ئێك ئاخ كرێ، و دندكێن گەنمى ب كويراتييەكا هندى ئێك كرنە د ناڤ ئاخێدا، و چەندييەكا وەكى ئێك كيمياكرن، و هەمى وەكى ئێك ئاڤدان، ئانكو وى دڤيا ژ هەمى لايانڤە وەكهەڤ بن، پاشى ئێك ژ قوتابييێن خۆ ژێ گرت دا ڤان سۆرەتان ل سەر ئێك ژ خانييێن پلاستيكى بخوينيت، سۆرەتا (يس، فاتيحە، ئيخلاص، و ئايەتا كورسى) دو جاران د حەفتييێدا ل سەر خانييێ ئێكێ يێ پلاستيكى، و خانييێ دويێ قوتابييەكا دى ئينا كو رووەكێ بەرامبەر رووەكێن خانييێ دويێ بشكێنيت و ئازار دەت و تايێن وى ژێڤەكەت، و ئاخفتنێن رەق هەمبەر گۆتن، ئەڤە ژى دو جاران د حەفتييێدا، و قوتابييەكا دى راسپارد ب رووەكێن خانييێ سێيێڤە، كو ب لێدانا ڤان رووەكان راببيت، و ب ريچينيت، و تايێن وى ژێكڤە بكەت، و خانييێ چارێ رووەكێ وێ هێلا كو ب شێوەكێ سروشتى گەشێ بكەت، ئانكو ب شێوەكێ كورت، ڤان چار خانييێن گەنم تێدا چاندى، يێ ئێكێ سۆرەتێن قورئانێ ل سەر هاتنە خواندن، و يێ دويێ رووەكەك ل هەمبەر وان هاتە ئازاردان، و يێ سێيێ رووەكێن وێ ب خۆ هاتنە ئازاردان، و يێ چارێ هێلا دا ب سروشتى گەشێ بكەن، ئەنجام چاوا بوون؟**

**خانييێ چارێ پيڤەرە، و ئەڤ تاقيكرنە بەرى دەمەكى ژ كۆنگرێ زانستى هاتبووكرن، دەمێ هاتين ئەنجام هەلسەنگاندين كو زانايێن چەندين وەلاتان ل وێرێ ئامادەبوون،**

ئەرێ چ ئەنجام د کۆنگرێ زانستیدا هاتە نیشادان؟ ئەنجامێن ڤێ تاقیکرنێ ئەو بوون، کو رووەکێن قورئان ل سەر هاتییە خواندن د خانییێ ئێکێدا، درێژاهییا وان چل و چار ژ سەدێ زێدەتربوو ژ رووەکێ خانییێ چارێ کو ب شێوێ سروشتی مەزن ببوو، و ئەڤە پیڤەر بوو، و دەرامەتێ وێ ژی سەد و چل ژ سەدێ زێدەتر بوو، و خانییێ سێیێ کو رووەك هەمبەر وان هاتبوو ئازاردان، درێژاهییا وان سیه و پێنج ژ سەدێ کێم ببوو، و بەرهەمێ وێ هاتبوو خوار ئەو ژی هەشتێ ژ سەدێ بوو، و ئەڤە راڤەکرنا زانستییە بۆ بەرەکەتێ، دەمێ باوەردار چاندنێ دکەت و قورئان دهێتە خواندن ب دلەکێ نەرم و پاقژ، و بەردەوام زکرێ خودێ دکەت، ئەڤ خواندنا قورئانێ و زکر هەمبەر ڤی رووەکی دێ دەرامەتێ وی زێدەکەت.

ئەڤ زانایە دبێژیت: ((ئێك دۆنەما عەردی هزار و پێنج سەد کیلۆیان ددەت، و د شیاندایە کو چاردە تەنان بدەت ب ئایەتا پیرۆز: ﴿مَثَلُ الَّذِينَ يُنْفِقُونَ أَمْوَالَهُمْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ كَمَثَلِ حَبَّةٍ أَنْبَتَتْ سَبْعَ سَنَابِلَ فِي كُلِّ سُنْبُلَةٍ مِئَةُ حَبَّةٍ وَاللَّهُ يُضَاعِفُ لِمَنْ يَشَاءُ وَاللَّهُ وَاسِعٌ عَلِيمٌ﴾ [البقرة:٢٦١]، ئانکو: مەتەلا ئەوێت مالێ خۆ د رێکا خودێدا دمەزێخن وەکی مەتەلا دندکەکێیە حەفت گولی دابن، هەر گولییەکێ سەد دندك تێدا بن، و خودێ بۆ یێ بڤێت هندی دی لێ دکەت، و ب ڕاستی (د دلۆڤانی و کەرەما خۆدا) خودێ یێ بەرفرەھ و زانایە، و چێ دبیت ئەم یێ حێبەتی ببین کو ئەڤ رووەکە گوهدانا قورئانێ دکەت، و بەرسڤا وێ ددەت، هوین ب چ حێبەتی دبن؟ کو ئەو (قورئان) ﴿لَوْ أَنْزَلْنَا هَذَا الْقُرْآنَ عَلَى جَبَلٍ لَرَأَيْتَهُ خَاشِعًا مُتَصَدِّعًا مِنْ خَشْيَةِ اللَّهِ وَتِلْكَ الْأَمْثَالُ نَضْرِبُهَا لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ﴾[1] [الحشر:٢١]، ئانکو: ئەگەر مە ئەڤ قورئانە بۆ چیایەکی هنارتبایە، تو دا

---

١ـ (إبن کثیر) د تەفسیرا خۆدا (٣٤٤/٤) دبێژیت: ﴿لَوْ أَنْزَلْنَا هَذَا الْقُرْآنَ عَلَى جَبَلٍ لَرَأَيْتَهُ خَاشِعًا مُتَصَدِّعًا مِنْ خَشْيَةِ اللَّهِ﴾، ئانکو: ئەگەر چیای د وێ ستویراتی و رەقاتییا خۆدا د ڤێ قورئانێ گەهشتبا و هزرکرن کربا کا چ د ڤێ قورئانێدا هەیە دا خۆ چەمینیت و شەق بیت ژ ترسا خودێ، پا دێ یا چاوا بیت بۆ هەوە گەلی مرۆڤان ئەرێ دلێن هەوە نەرم نابن، و خۆ بچەمینن، و شەق شەق بن ژ ترسا خودێ، و هوین فەرمانا خودێ

(چیای) بینی ژ ترسێت خودێدا ترسگرتی و پەق پەقە، و ئەم ڤان نموونەیان بۆ مرۆڤان دیار دکەین دا هزرا خۆ تێدا بکەن، کی ژ وان نێزیکترە بۆ ژیانێ رووەك یان چیا؟

ئەڤ قورئانا پیرۆز یا بۆ پێغەمبەری ﷺ هاتییە خوار دا ببیتە رێباز بۆ مە، و مرۆڤێ کو قورئان بۆ هاتییە خوار پشتا خۆ یا دایێ، بەلێ رووەك بەرسڤا وێ ددەت، خودێ دبێژیت: ﴿تُسَبِّحُ لَهُ السَّمَوَاتُ السَّبْعُ وَالْأَرْضُ وَمَنْ فِيهِنَّ وَإِنْ مِنْ شَيْءٍ إِلَّا يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِ وَلَكِنْ لَا تَفْقَهُونَ تَسْبِيحَهُمْ إِنَّهُ كَانَ حَلِيمًا غَفُورًا﴾ [الاسراء:٤٤]. و دبێژیت: ﴿لَوْ أَنْزَلْنَا هَذَا الْقُرْآنَ عَلَى جَبَلٍ﴾ - نە ل سەر رووەکێ زێندی - ﴿لَرَأَيْتَهُ خَاشِعًا مُتَصَدِّعًا مِنْ خَشْيَةِ اللَّهِ وَتِلْكَ الْأَمْثَالُ نَضْرِبُهَا لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ﴾ [الحشر]، و خودێ دبێژیت: ﴿وَالنَّجْمُ وَالشَّجَرُ يَسْجُدَانِ (٦) وَالسَّمَاءَ رَفَعَهَا وَوَضَعَ الْمِيزَانَ (٧)﴾ [الرحمن].

ئەگەر ئەڤە سەروبەرێ رووەکی بیت د گەل قورئانا پیرۆز، ئەرێ ما یا بەر عاقلە ژ ڤی مرۆڤی، کو ئەو چێکرییێ ب قەدر و رووماتە، و راسپاردییێ ئێکێیە کو ژ ڤێ قورئانێ یێ غافل بیت، ئەوا بەرێ مرۆڤی ددەتە وێ رێکا ژ هەمییا راستر، هەتا ل سەر موسلمانان گۆتنا خودێ دبیتە راست: ﴿وَقَالَ الرَّسُولُ يَا رَبِّ إِنَّ قَوْمِي اتَّخَذُوا هَذَا الْقُرْآنَ مَهْجُورًا﴾[الفرقان:٣٠]، ئانکو: پێغەمبەری گۆت: خودێوۆ، ب راستی ملەتێ من ژ ڤێ قورئانێ یێت دویر کەڤتین، و دەست یێت ژێ بەردایین.

---

گەهشتن، و هزرێن خۆ د پەرتۆکا ویدا کرن، و ژ بەر ڤێ چەندێ خودێ دبێژیت: ﴿وَتِلْكَ الْأَمْثَالُ نَضْرِبُهَا لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ﴾].

# رووەکێن کارێ وان عومبارکرنا ئاڤێ

هندەك رووەك د بیابانێدا کارێ وان یێ سەرەکی عومبارکرنا ئاڤێیە، رێڤینگ د بیابانێدا چ پێدڤییە؟ ب پلە ئێك پێدڤی ب ئاڤێیە، هندەك رووەك د جهێن رویت و هشکدا دشێن پتر ژ سێ هزار لترێن ئاڤێ عومبار بکەن، ل ڤێرە مرۆڤ یان گیانەوەر دشێن پێدڤییا خۆ ژ ئاڤێ ب دەست خۆ بێخن دەمێ هندەك ژ تایێن وان دبرن و ئاڤا زەلال و شرین ژێ دئێتە دەر د ڤان رووەکاندا کو هاتییە ئافراندن تایبەت بۆ تە ـ هەی مرۆڤ ـ د رێکا تەدا، ئەڤ رووەکە چەندەکا مەزن ژ ئاڤێ عومبار دکەت د هندەك جهێن خۆ یێن تایبەتدا، ئەڤ جهە یێن د نیڤا تایێت واندا، وەکی ئیسفەنجییە، و ئەڤ عومبارکرنا ئاڤێ هندەك جاران دگەهیتە سێ هزار لترا د وەرزێ هشکاتییێدا، ئەڤە ئافراندنا خودێیە، و ئافراندنەکا تمامە، پێدڤییێن مرۆڤی پێ چارە دبن، بەلێ خرابکاری؛ ئەوە دەمێ ئەم دارستانان دبرین، و بیابانێ خراب دکەین، و دەمێ ئەم ئاڤ و کەش و هەوای پیس دکەین ئێش دەردکەڤن، و کاودانێن نەدورست دیار دبن.

بابەتێ پیسبوونێ بابەتەکێ مەترسیدارە، دکەڤیتە بن گۆتنا خودێ: ﴿وَإِذَا تَوَلَّى سَعَى فِي الْأَرْضِ لِيُفْسِدَ فِيهَا وَيُهْلِكَ الْحَرْثَ وَالنَّسْلَ وَاللَّهُ لَا يُحِبُّ الْفَسَادَ﴾ [البقرة:٢٠٥]، ئانکو: هەر گاڤەکا پشت دا هەوە، و ژ دەڤ هەوە چۆ د عەردیدا دگەڕیت، دا خرابییێ تێدا بکەت، و دەرامەت و رەڤێژێ پویچ و وێران بکەت، و خودێ حەژ پویچاتی و وێرانکرنێ ناکەت.

# راکێشانا رووەکی

رووەك دهێتە راکێشان بۆ رۆناهییێ، ئەگەر ئەم رووەکەکێ دانینە د ژوورەکێدا، و ڤێ ژوورێ پەنجەرەك هەبیت، دێ بینین سەمتا تایێن ڤی رووەکی، و بەلگێن وی، بۆ پەنجەرێ دچن یا رۆناهی تێرا دهێت، بەلێ تشتێ ژ ڤێ هویربینتر ئەوە بەلگێن دارا ب شێوەکێ رێکخستی یێ جوان هەمی پێکڤە سەمتا وان دکەڤیتە تیرۆژکا رۆژێ، کێم جاران بەلگێن دارا دچنە د ناڤێکرا، و ئەگەر چۆنە د ناڤێکرا ژی یا کێمە، و دێ بەلگێن دارا هەمی بەرێ خۆ دەنە تیرۆژکا رۆکێ، کێ ئەڤ تایبەتمەندییە کرییە د رووەکیدا؟ (ءَإِلَهٌ مَعَ اللهِ) [النمل:٦٣]. ئانکو: ئەرێ پەرستییەکێ دی د گەل خودێ هەیە (کو هوین بپەرێسن، یان ژی ب تنێیە ڤی کاری دکەت.

تشتەکێ دی: ئەگەر رووەکەکێ ب شێوەکێ ئاسۆیی بکەینە د بۆرییەکێدا، دێ رهێن وێ بەرەڤ خوارێ چن، و تایێن وێ بەرەڤ سەری، ژ بەر کو رە بەرەڤ ئاڤ و شهێ دچن، و تایێن رووەکی بەرەڤ رۆژێ و هەوای دچن، چونکی رهێن رووەکان بەرەڤ ئاڤێ دچن، کێ وەل ڤی رووەکی کرییە کو پشکەکا وی بەرەڤ تیشکا رۆژێ بچیت، و پشکەکا دی بەرەڤ عەردی (ءَإِلَهٌ مَعَ اللهِ).

کارەکێ دی: هندەك دارێن هەین درێژاهییا رهێن وان دگەهیتە سیە متران و ل ئاڤێ دگەرن، کێ ئەڤ تایبەتمەندییە کرییە د رووەکیدا؟ قورم بەرەڤ سەری دچیت، و رە بەرەڤ خوارێ، ئەگەر ئاڤ ل رەخەکێ رهێن وێ نەمینیت، دێ رهێن ڤی لای بەرەڤ رەخێ دی یێ ب ئاڤڤە چن، و ئەو د ژێر ئاخێرا، و ئەگەر قورم بەرەڤ سەری بچن، و

رۆناهی ل جهێ دی بیت، دێ تایێن وێ بۆ رۆناهییێ چن، و پسیار: ئەرێ کەرستە یێ ب عاقلە؟

ئەڤ دیاردا رووەکی ب تنێ سەرنجێ رادکێشیت، دیاردا راکێشانا بەرەف رۆناهییێ، و راکێشانا رهان بەرەف عەردی، و یا تایێن وێ بەرەف عەسمانی (رۆژێ)، و راکێشانا بەرەف ئاڤێ، نیشانەکە ژ نیشانێن بەلگەیە ل سەر مەزناهییا وی.

دیاردەکا هەی د رووەکیدا مەزناهییا خودێ دوپات دکەت، ئەو ژی دەمێ رووەك تێهنی دبیت پێدڤییە ئاڤێ ژ رهان وەربگریت، بەلێ ناوەرگریت ب تنێ ژ بەلگان نەبیت، و پشتی ئاڤا بەلگان وەردگریت، ئاڤا تایان وەردگریت، و پشتی ئەڤە ژی وەرگرت، دێ ئاڤا چەقان وەرگریت، و پشتی ئەڤە ژی وەرگرت دێ ئاڤا قورمی وەرگریت، و پشتی ئاڤا قورمی وەردگریت دێ ئاڤا رهان وەرگریت، کو دویماهیك ئاڤە وەردگریت دەمێ رهێن وی نەهاتبنە ئاڤدان، چێ دبیت جۆتیاری ئاڤدانا وێ گەلەك رۆژان ژ بیر کربیت، و ل دویماهییێ ئاڤا رهان ژی نامینیت دێ رووەك هشك بیت و مریت.

چ حیکمەتەك ل پشت ڤێ یاسایێ هەیە؟ ﴿قُلِ انْظُرُوا مَاذَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَا تُغْنِي الْآيَاتُ وَالنُّذُرُ عَنْ قَوْمٍ لَا يُؤْمِنُونَ﴾ [یونس:١٠١].

هەمی تشتێن د عەردیدا مەزناهییا خودێ و شەهرەزایی و زانین و دلۆڤانی و قەنجییا خودێ دسەلمینن.

# کارگەهێن بەلگێ کەسک

د وەرزێ بهارێدا، کەسەك نینە ب چاڤێن خۆ ئەو کەسکاتییا د ڤی وەرزیدا هەی نەدیت بیت، کو جوانی تێدا نوی دبیتەڤە، چونکی داروبار ب گول دکەڤن و دبشکفن و هندەك ژ وان بەلگان ددەن، و رووەك، و عەرد رازێرکەکا کەسکە، ئەرێ مە هزرا خۆ د ڤێ ئایەتێدا کرییە یا کو خودێ ئاماژێ ب ڤێ چەندێ ددەت؟ خودێ دبێژیت: (وَهُوَ الَّذِي أَنْزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَخْرَجْنَا بِهِ نَبَاتَ كُلِّ شَيْءٍ فَأَخْرَجْنَا مِنْهُ خَضِرًا نُخْرِجُ مِنْهُ حَبًّا مُتَرَاكِبًا وَمِنَ النَّخْلِ مِنْ طَلْعِهَا قِنْوَانٌ دَانِيَةٌ وَجَنَّاتٍ مِنْ أَعْنَابٍ وَالزَّيْتُونَ وَالرُّمَّانَ مُشْتَبِهًا وَغَيْرَ مُتَشَابِهٍ انْظُرُوا إِلَى ثَمَرِهِ إِذَا أَثْمَرَ وَيَنْعِهِ إِنَّ فِي ذَلِكُمْ لَآيَاتٍ لِقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ) [الأنعام:٩٩]. ئانکو: ئەوە (خودێیە) باران ژ عەسمانی (ژ عەوران) ئینایە خوار، و مە ب وێ ئاڤێ زیلك و بستیکا هەمی تشتان دەرئێخستییە، و مە شینکاتی ژێ دا، و ژ وی شینکاتی دندکێت پێکڤە و ل سەرێك دەردئێخین، و مە (ب وێ ئاڤێ) دارڤەسپ ژی دەرئێخستینە، و ژ گولییا وێ، ئویشی ییێت پێدا شۆڕ و بەردەست دەردئێخین، و مە (ب وێ ئاڤێ) ڕەز و باغ ژی دەرئێخستینە، ژ تری و زەیتوون و هناران، ییێت وەکی ئێك و نەوەکی ئێك (تەمەتی ئێك و ئێك ڕەنگ و نەئێك تام)، بەرێ خۆ بدەنە بەرێ وێ وەکی دەردکەڤیت و دگەهیت (کا چاوا بشکۆژکەکا بچویك و هەتا مەزن دبیت و دگەهیت). ب ڕاستی د ڤاندا نیشانێت هەین بۆ ییێت باوەری هەین.

عەرد کەسك ببیت، و ئەڤ دارە جوانییا خۆ نوی بکەتەڤە، و جۆرێن گولان شین ببن، ئەڤە ژ نیشانێن خودێنە، دیسا خودێ دبێژیت: (فَلْيَنْظُرِ الْإِنْسَانُ إِلَى طَعَامِهِ (٢٤) أَنَّا صَبَبْنَا الْمَاءَ صَبًّا (٢٥) ثُمَّ شَقَقْنَا الْأَرْضَ شَقًّا (٢٦) فَأَنْبَتْنَا فِيهَا حَبًّا (٢٧) وَعِنَبًا وَقَضْبًا

(٢٨) وَزَيْتُونًا وَنَخْلًا (٢٩) وَحَدَائِقَ غُلْبًا (٣٠) وَفَاكِهَةً وَأَبًّا (٣١) مَتَاعًا لَكُمْ وَلِأَنْعَامِكُمْ (٣٢)) [عبس]، ئانكو: بلا مرۆڤ بەرێ خۆ بدەتە خوارن و ڤەخوارنا خۆ (و هویرك هزرا خۆ تێدا بكەت، كا چاوا دبیتە خوارن و دئێتە بەر دەستێ وی). مە ئاڤ ژ عەوران دارێت. و مە عەرد ب گل و گیا و شینكاتیڤە كەلاشت. مە دان و دەرامەت ژێ دەرئێخست (وەكی دەخلی و جەهی و برنجی، كو خوارنا سەرەكینە بۆ مرۆڤی). هەروەسا تری و زەرزەوات ژێ. و زەیتوون و دارقەسپ ژێ. و جنیك و بیستانێت تێكرا ژێ. و فێقی و چەرە ژێ. سوود و مفا بۆ هەوە و تەرش و دەوارێت هەوە.

ئەوێ د وەرزێ بهارێدا دچیتە سەیرانێ، چو هزرا تێدا ناكەت ب تنێ خۆشییێ ب دیمەنێن جوان دبەت، بێی كو بیرئینان و تەسبیحا خودێ بكەت، و بێی كو ڤی وەرزی ببینیت نیشانەكا مەزنا بەلگە ل سەر مەزناهییا خودێ، ئەو مرۆڤەكێ غافلە ژ قورئانا پیرۆز، ئەڤە ئایەتەكا پیرۆزە كو سەرنجا مرۆڤی رادكێشیت، خودێ دبێژیت: (الَّذِي جَعَلَ لَكُمْ مِنَ الشَّجَرِ الْأَخْضَرِ نَارًا فَإِذَا أَنْتُمْ مِنْهُ تُوقِدُونَ) [یس: ٨٠]. ئانكو: ئەوێ (خودێیە) بۆ هەوە ژ دارا شین ئاگر دایی، ڤێجا هوین ئاگری پێ هەلدكەن.

چێ دبیت ئێك پسیاركەت: ئەڤ دارا كەسك ناهێتە سۆتن، ب تنێ ئەگەر یا هشك نەبیت، ما چاوا خودێ ئاماژە كرییە كو ژ دارا كەسك ئاگر دورست دبیت؟ (الَّذِي جَعَلَ لَكُمْ مِنَ الشَّجَرِ الْأَخْضَرِ نَارًا فَإِذَا أَنْتُمْ مِنْهُ تُوقِدُونَ).

زانایان ئاشكرا كر، كو خانەكا كەسك، رادبیت ب دورستكرنا بیست ئاوێتێن ئەندامی د خۆلەكەكێدا، دەمێ تووشی تیشكا رۆژێ دبیت، رووەك ئاڤێ ڤەدخۆت، و هندەك كەرستێن كانزایی، و هندەك كەرستێن ئەندامی، و گازا ژ هەمیا پتر وەردگریت گازا رەژوییێیە ($CO_2$)، كو ئەڤە ب پێكهاتییا چێبوونا رووەكی رادبیت، و ئاڤاكرنا رووەكی نەیا وەسایە وەكی مرۆڤ تێ دگەهیت، كو ژ ئاخێ دهێت، بەلێ گەشەكرن و ئاڤاكرنا وێ دهێت ژ كارگەهەكا مەزن كو خودێ یا كرییە د بەلگێن كەسكدا، وەكی خودێ دبێژیت:

(الَّذِي جَعَلَ لَكُمْ مِنَ الشَّجَرِ الْأَخْضَرِ نَارًا فَإِذَا أَنْتُمْ مِنْهُ تُوقِدُونَ)، ئەڤ ئایەتە ئاماژەیە بۆ ڤێ چەندی، ئەگەر بەلگێن کەسک نەبان د رووەکاندا دار چێ نەدبوو، ئەڤ سالۆخەتە یێ گرێدایە د گەل رووەکی ب پێکڤەگرێدانەکا هەبوونێ، و ئەگەر هۆکارێن دورستبوونێ نەبان ئەوێن د بەلگێ کەسکدا دورست بن، دەمێ کو تووشی تیشکا رۆژێ و هەوای دبیت، رووەك نەدبوون، ئەگەر ئەم رووەکەکێ د تاریاتییێدا بچینین شین نابیت، ژ بەر کو ئەگەر ل بەر رۆژێ نەبیت گەشێ ناکەت، ئەو دارێن بلند و رهێن مەزن کو کێشا وان ب تەننانە، ئەڤە ژ ئەنجامێ کارلێکرنەکا گەلەك هویربین یێن چێ بووین، کو د بەلگێن داراندا دورست دبن.

ئەڤ پسیارە دهێتە کرن، چاوا خودێ گۆتیە: (الَّذِي جَعَلَ لَكُمْ مِنَ الشَّجَرِ الْأَخْضَرِ نَارًا فَإِذَا أَنْتُمْ مِنْهُ تُوقِدُونَ).

دارا کەسك ناهێتە سۆتن، دارا هشکە دهێتە سۆتن، بەلێ ئاماژەیە کو ئەڤ دارە نابیتە دار، ئەگەر خودێ ئەڤ چەندە نەکربانە د ڤێ دارێدا، هەر خانەکا د بەلگەکیدا کارگەهەکە، کەرستێن ئەندامی کو دبنە هاریکار بۆ گەشەکرنا رووەکی، و د زێدەبوونا قەبارێ وێدا، ئەڤە نیشانەکە ژ نیشانێن خودێ.

و یا ژ پێغەمبەری ﷺ هاتییە ڤەگوهاستن دبێژیت:

((إنَّ اللهَ أمَرَني أن يَكونَ نُطقي ذِكراً، وَصَمتي فِكراً، ونَظرِي عِبرَةً))[1]، ئانکو: فەرمان یا ل من هاتییە کرن بێدەنگییا من هزرکرن بیت، و ئاخفتنا من زکر بیت، و دیتنا من سەربۆر بیت، ئەگەر مرۆڤی سەیران کر، بلا مرۆڤ یێ غافل نەبیت ژ نیشانێن خودێ، خودێ دبێژیت: (وَكَأَيِّنْ مِنْ آيَةٍ فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ يَمُرُّونَ عَلَيْهَا وَهُمْ عَنْهَا مُعْرِضُونَ)

---

١- (القضاعي) د (مسند الشهاب)دا ١١٥٩ یا ڤەگێرایی، و (الذهبي) د (ميزان الإعتدال)دا (١٥١/٦) دبێژیت: ((ئەڤە فەرموودەکا ب زەحمەتە))، و (قرطبي) د تەفسیرا خۆدا بەحس کرییە (٣٤٦/٧).

[يوسف:١٠٥]، ئانكو: چەند گەلەكن ئايەتێت خودێ د عەرد و عەسماناندا ئەوێت ئەو د بەرڕا دبۆرن، و روییێ خۆ ژێ وەردگێرن.

ئەڤ دارا مرۆڤ ل زڤستانێ دبینیت دارەكا هشك، پاشی بهار دهێت دێ بینی كولیلك دان، ئەڤ كولیلكە ژ كیڤە دهێن؟ پشتی ڤان گولان بشگۆژ دهێن، و پشتی بشگۆژان بەلگ دهێن، ئەڤە كارێ كێیە؟ و دەستێ كێیە؟

و دەمێ تە بنەكێ گیای ل بیابانێ دیت ب تنێ یێ شین بووی و بلند بووی پسیارێ ژێ بكە كێ تو شین و بلند كرییە؟

كێ وەل تە كرییە گەشە ببی؟ (انْظُرُوا إِلَى ثَمَرِهِ إِذَا أَثْمَرَ وَيَنْعِهِ إِنَّ فِي ذَلِكُمْ لَآيَاتٍ لِقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ)(١) [الأنعام:٩٩]، ئانكو: بەرێ خۆ بدەنە بەرێ وێ وەكی دەردكەڤیت و دگەهیت، (كا چاوا بشكۆژكەكا بچویك و هەتا مەزن دبیت و دگەهیت). ب ڕاستی د ڤاندا نیشانێت هەین بۆ یێت باوەری هەین.

---

١. (قرطبي) د تەفسیرا خۆدا (٥٠/٧) دبێژیت: [خودێ هۆشدارییێ ددەت ب گوهۆرینا وێ ژ كاودانەكی بۆ كاودانەكێ دی و وێ دگوهۆریت و دئینیتە هەبوونێ پشتی كو نە ل سەر نێكتاپەرستییا خودێ و تەكووزیا شیانا خۆ، كو وێ چێكەرەكێ خودان شیانێ زانا یێ هەی، و ئەڤە رۆژا رابوونێ (البعث) دسەلمینیت كا چاوا رووەك پشتی هشكبوونێ شین دبیت، جەوهەری دبێژیت: (ینع الثمر، و ینع ینعا، وینیعا، و ینوعا)، ئانكو: گەهشت ب رامانا دەمێ بەرێ وان دگەهیت].

# کەسکاتی د رووەکیدا

دبێژن: مەزنترین کارگەهـ مرۆڤی چێکری ناگەهیتە ئاستێ وێ چەندێ یا کو د ناڤ بەلگێ کەسکدا دهێتە کرن، چ د بەلگیدا هەیە؟

د بەلگیدا کەرستەك یێ هەی دبێژنێ کەرستێ کەسك (کلۆرۆفیل)، ئەگەر ئەڤ کەرستە تووشی تیشکا رۆژێ بوو گەردیلێن کەسك دێ ئێنە گوهۆرین و بنە کارلێکێن گەرمییێ، دێ گەردیلێن وێ ئاڤا د بەلگیدا کەنە دو پشك، و دەمێ گەردیلێن ئاڤێ د بەلگیدا پارچەکرن، دێ بنە ئۆکسجین و هایدرۆجین، و دەمێ مرۆڤ ب ئامویرێن خۆ یێن کەرستەیی گەردیلێن ئاڤێ دکەنە ئۆکسجین و هایدرۆجین، پێدڤی ب وزەکێ هەیە کو ئاڤێ بکەلینن ب دو هزار و پێنج سەد پلە، و مرۆڤ بەردەوام ئۆکسجینی هەلدکێشیت، و دیسا رووەك، و گیانەوەر، پا چاوا رێژە دمینیت یا جهگر؟

هندەك ئامارێن زانستی دبێژن: ئەو هەمی کەسکاتییا د عەردیدا سەد بلیۆن تەنێن ژ رەژوییێ د گەل بیست و پێنج بلیۆن تەنێن ژ هایدرۆجینی دکەنە خوارن، و دکەنە سەد بلیۆن تەنێن ئۆکسجینی، ژ بەر کو دا هەوا بمینیت رێژەکا سیستەمی ژ ئۆکسجینی و ئازۆت و گازا رەژوییێ ($CO_2$).

تشتەکێ نەلڤە کو ئەو وزا ژ هۆکارێن وان شیکارییێن کەسکاتییێ یەکسانی دەهـ جارکی یا وێ وزێیە یا مرۆڤ د هەمی جیهانێدا وەردگریت، ئانکو ئەو هەمی وزا کەسکاتی د دارستان و رووبەرێن کەسکاتییێ د جیهانێدا بەرهەم دئینیت هەمبەر دەهـ جارکی وێ وزێیە یا مرۆڤ پێدڤی پێ و وەردگریت د هەر سالەکێدا، بەلگێن ئێك دارا ژییێ وێ یێ ناڤنجی بیت، د هەر دەمژمێرەکێدا کیلۆیەکا کەرستێن خوارنێ چێ دکەت، و ڤی

ئەنجامێ خوارنێ د شەڤێدا دگوهۆریت بۆ شەکرا رووەك دخۆن، یان دێ عومبارکەت ل سەر شێوێ نشایەکا یەدەك د رووەکیدا، خودێ دبێژیت: (الَّذِي جَعَلَ لَكُمْ مِنَ الشَّجَرِ الْأَخْضَرِ نَارًا فَإِذَا أَنْتُمْ مِنْهُ تُوقِدُونَ) [يس: ٨٠].

پەیڤا (الْأَخْضَرِ) رامانا کەسکاتییێ ددەت، چونکی ئەڤ بەلگە ب هەر دارەکێڤە، کارگەهەکا مەزنە، کارەکێ مەزن ئەنجام ددەت، مرۆڤ نەشێت هزر تێدا بکەت.

# تۆڤ و جۆرێن وان

خودێ ب زانینا خۆ یا بلند تۆڤ کره بنیاتێ شینبوون و چێبوون و زێدەبوونا رووەکی، د تۆڤیدا جیهانەکا مەزن یا هەی، ئەگەر بزانین دێ ترس کەڤیتە د دلێن مەدا.

تۆڤك د گویزا هندێ یا مەزندا قەبارێ وێ دیار دبیت، کو ئەو ب خۆ تۆڤکەکە دبیتە گەلەك تۆڤك کو هژمارا وان د گرامەکێدا دگەهیتە حەفتێ هزار دندکان، وەکی تۆزێنە، بەلێ تشتێ وەکهەڤ د هەمی تۆڤاندا ئەوە د ناڤ هەر تۆڤەکیدا بوونەوەرەکێ زێندی یێ هەی، ئەو ژی نافکا تۆڤییە (الرُّشَيمُ)، ڤی زیندەوەری خوارنەکا دورستکری و دەستنیشانکری و هەڤسەنگکری یا هەی، و ئەگەر تە بڤێت تشتەکی ژێ بزانی هندەك دندکێن فاسولیا، یان نۆکا بینە و دانە سەر پەمبییەکێ تەر، و بەرێ خۆ بدەیێ و دویڤچۆنا وی بکە کا چاوا ئەڤ (الرُّشَيمُ) زیندی دبیتە قورمەکێ بچویك، و پاشی رهێن بچویك، و قەبارێ نۆکێ تێرا ڤی (الرُّشَيمُ) هەنە هەتا دبنە رە کو ئەڤ رهە بشێت خوارنێ ژ ئاخێ بمێژیت.

و تشتێ کو عەقلان دکێشیت ئەوە ڤان تۆڤان چەندین جۆر یێن هەین، هندەك ژ وان ب پەرن، د گەل بای ب دویراتییا سەدان کیلۆمتران دفرن، ئەڤە کەسکاتییێ ژ دەڤەرەکێ بۆ دەڤەرەکا دی ڤەدگوهێزن، دا کو چاندنەکا سروشتی ل جهەکێ ب شە چێ ببیت، پاشی دێ داروبارێن جوان ل ڤی جهی شین بن، و هندەك ژ ڤان تۆڤان مەمیلە (پەرێن هویر) یێن هەین وەکی مەمیلێن سۆفی، دیسا ل هەوای دفرن، بەلێ بۆ دویراتییێن کورت، و ئەوێن هاتینە چێکرن داکو بهێنە ڤەگوهاستن بۆ دەربازبوونا کیشوەران، و سەدان

کیلۆمتران دبرین، و پەر یێن هەین، بەلێ ئەوێن هاتینە چێکرن بۆ دویراتیێن کورت وان مەمیلە (زغابات) یێن هەین وەکی یێن هرییێ.

و جۆرەکێ دی یێ تۆڤی یێ هەیی کویف یێ هەی کو ئاڤ کارتێکرنێ لێ ناکەت، ب رێکا رویباران و جۆیان دهێتە ڤەگوهاستن، کو د کویفکرینە ب کویفەکێ پەیتێ گرتی، دا تەراتیێا ئاڤێ کارتێکرنێ لێ نەکەت د گەشەبوونا (الرُّشَيمُ)دا.

و جۆرەکێ دی یێ تۆڤان، یێ ب ستریە، ب پویتێ هندەك گیانەوەرانڤە دنویسن، دا بێنە ڤەگوهاستن ژ جهەکی بۆ جهەکێ دی، و جۆرەکێ دی، کەرستەکێ وەکی سیکۆتینی یێ هەی، ب پێیێن هندەك بالندانڤە دنویسیت، داکو بهێتە ڤەگوهاستن د ماوێ مشەختبوونا واندا، ژ دەڤەرەکێ بۆ دەڤەرەکا دی.

و جۆرەکێ دی یێ هەی، یێن د تیڤلەکیدا، د هندەك کاودانێن سروشتیدا دپەقیت، و دەمێ دپەقیت تۆڤێ وی دوەریت.

و جۆرەکێ دی، نەخاسمە تۆڤێن جهێ چەروانان، یێن د ناڤ دزدانکەکێدا، و ئەڤ دزدانکە یا ل سەر دارکەکێ وەکی بورغییێدا، و دەمێ ئەڤ دارکە دکەڤیتە عەردی، دێ ب هاریکاریا بای بژنە عەردی، و ب رێکا ڤی دارکێ وەکی بورغی دێ چنە د ناڤ ئاخێدا، و ئەڤە بێی دەستکاریکرنا مرۆڤی ئێکسەر دورست دبیت.

تشتێ جهێ حێبەتییێ ئەوە، هندەك رووەکێ د بیاباناندا شین دبن، یان د دەشت و چۆلاندا، درێژاهیا رهێن وان دگەهیتە هەڤدە مەتران بەرەف کویراتیا عەردی، دا شهێ ژێ بمێژیت.

ئەڤەیە چێکرنا خودێ، د جهێن هشك، د جهێن کێم باران، ژ بەرکو ڤان جهان پێدڤی ب رووەکێن خۆ ل بەر هشکاتییێ بگرن هەیە، رهێن وان خودان کاودانەکێ تایبەتن، پتر ژ هەڤدە متران دچنە د کویراتیا ئاخێدا، دا شهێ ژ عەردی وەربگرن، ڤان رووەکان

مەمیلە (زغابات) یێن هەین شهێ ژ هەوای وەردگرن، ﴿هَذَا خَلْقُ اللَّهِ فَأَرُونِي مَاذَا خَلَقَ الَّذِينَ مِنْ دُونِهِ﴾ [لقمان:١١]، ئانكو: ئەڤەیە دان و چێكرنا خودێ، ڤێجا كا بێژنە من ئەڤێت هوین شوینا خودێ دپەرێسن، چ داییە و چ چێ كرییە؟ (نەخێر وان چو نەداییە و چو چێ نەكرییە).

تۆڤێن هەین پەر یێن پێڤە، و تۆڤێن هەین مەمیلە یێن هەین، و یێن هەین تیڤل یێ ل سەر دا ئاڤ كارتێكرنێ لێ نەكەت، و یێن هەین ب ستری، و یێن هەین كەرستەكێ وەكی سیكۆتینی یێ پێڤە، و یێن هەین د ناڤ كیساندا كو هندەك جاران دپەقن، و هندەك تۆڤێ هەی دەمێ شینبوونێ رهێن خۆ گەلەك د ناڤ عەردیدا داتهێلن دا شهێ وەربگرن.

تۆڤ ب تنێ نیشانەكا مەزنە ژ نیشانێن خودێ ل سەر مەزناهییا وی.

# تۆڤ و خۆلبەرگرتنا هۆكارێن ژێكخوارنێ

ژ نیشانێن خودێ كو بەلگەنە ل سەر مەزناهییا وی، دێ تو عەردێ رویت بینی، و عەردێ هشك و نەزێدەتر، و دێ سال سەردا بۆرن، حەفت یان دەھ سالان، مرۆڤ چو تشتان نابینیت ژ بلی خیزی یان ئاخێ، و دەمێ بارانێن دژوار دهێن رووەك دێ شین بن، و دێ گول چێ بن، و دێ گیا سەركەڤیت و شین بیت، ئەرێ ما ئەڤ پسیارە ناهێتە سەر هزرا تە: ئەڤ دەھ سالێن عەرد پێ رویت، تۆڤ ژ كیڤە هاتییە، و ئەڤ رووەكە شین بووینە؟ پسیارەكا ئاراستەكرییە، كەسێ چو تۆڤ ل ڤی جهی نەچاندییە، كو عەرد پێ هاتییە گوهۆرین ژ عەردەكێ رویت و هشك بۆ بەهەشتەكا كەسك، كێ تۆڤ ل ڤی جهی دایە؟ و ئەگەر بەری دەم تۆڤ هاڤێت بیتێ بۆچی ئەڤ تۆڤە نەمرینە؟ ل ڤێرێ پسیارە، و ل ڤێرێ نیشانە.

د دەمەكیدا كەڤرێن رەق یێن دژوار كارتێكرن ب رویتاهییێ (التعرية) لێ دبیت: و كارتێكرنێن رویتاهییێ ژی: بایە، و بارانن، و گەرمە، ڤان كەڤران دكەنە ئاخ، ئەڤ هۆكارێن ژێخوارنێ هەمان كاریگەری ل چیایان و جهێ چۆنا رویباران یا هەی، و ئەڤ تۆڤێ خودێ دایە د عەردیدا ئەرێ هۆكارێن ژێخوارنێ كارتێكرنێ لێ ناكەن؟

زانا دبێژن: ((تۆڤ وەسا یێ هاتییە دورستكرن كو یێ پاراستی بیت ژ هۆكارێن ژێخوارنێ))، و ئەگەر د گەل ئاخێ بیت، و تو ب چاڤ نەبینی، و ل هەمبەر گەرمێ، بایێن ب هێز، كەش و هەوایێ نەخۆش، دێ ئەڤ تۆڤە پاراستنێ ل سەر ژیانا (الرشيم)ا خۆ كەت، و پاراستنا وی تیڤلێ تەنك ل دۆر (الرشيم)ێ كەت، و پاراستنا رە و قورمان دێ كەت، و پاراستنا كیسێ خوارنێ دێ كەت ب سالێن درێژ، پشتی ڤان سالان باران دێ هێن، و عەردی كەسك كەن، و كولیلك شین بن، ئەڤە هەمی ل كیڤە بوون؟ ئەڤە هەمی

د تۆڤیدا بوون کو خودێ وەسا پێ چێ کری د پاراستی بن ژ هۆکارێن ژێخوارنێ کو ئەڤ هۆکارە کارتێکرنێ د کەڤراندا دکەن.

نموونەکا نێزیك، و گەلەك نێزیك؛ خودێ ترشەك پێ کرییە د مەعیدەیدا ژ دژوارترین ترشێن کاریگەرە، ئەو ژی ترشێ کلۆرێ ئاڤێیە، دەمێ تو گۆشتەکێ چر دخۆی، ئەڤ ترشێ د مەعیدەیدا دێ کەتە شلە وەکی شیری، و هندەك تاقیکرن پێن هاتینە کرن، ئەگەر پارچەکا گۆشتێ چر داننە د تەپەکا کون کوندا، و بدەنە هندەك گیانەوران وەك خوارن، و پشتی گیانەوەری ڤەدکوژن، و وێ تەپێ بینن زانا ئەو گۆشتێ کو بەری دەم تێدا نابینن، چونکی شلەیێن هەرسکرنێ پێن هاتینە هاڤێتن بۆ سەر تەپا ئاسنی، و گۆشت پێ حەل بووی، چاوا دبینی، کریارا شلەیێن هەرسکرنێ بنیاتێ بزاڤا میکانیکینە، یا بنیاتێ وێ شلەیێن کیمیایینە؟ هەردونە، بەلێ ئەگەر خوارن ب زەحمەت کەفت ل سەر هەرسکرنا میکانیکی دێ شلەیێن کیمیایی هێن ڤێ خوارنێ کەنە کیلۆس، و کیلۆس شلەیە، و هەمی ئەو خوارنێن تو دخۆی چەند پێ رەق بیت، ب کارێ ڤان ترشان، دێ بیتە شلەیەکێ ساناهی پێ باش بۆ مێتنێ، و د گەل ڤێ چەندێ گەلەك جۆرێن تۆڤان دهێنە خوارن د گەل ڤێقییان دەردکەڤن وەکی خۆ، و هۆکارێن میکانیکی د مەعیدەیدا، و هۆکارێن کیمیایی نەشێن کارتێکرنێ لێ بکەن، و ئەڤە نیشانەکە ژ نیشانێن خودێ، و خودێ وەسا تۆڤ چێکرییە پێ پاراستی بیت ژ هەر کارتێکرنەکا میکانیکی و کیمیایی، ئەڤە نیشانەکە ژ نیشانێن خودێ، و ژ بیر نەکەن کو زانایان د ئەهرامێن مسرێدا هندەك گەنم ئینا دەر بەری شەش هزار سالان هاتبوو عومبارکرن، ئینا ئەڤ گەنمە چاند شین بوو! ئەڤ (رُشَیْم)ێ بچویك و هەستیار کو خودێ ژیان یا کرییە تێدا، و تیڤلەکێ تەنك داییێ، و خوارنا وی یا د ڤی تیڤلیدا، و ڤورمکەك و رهکەکێ دایێ، ئەڤ ژیانا هویربینا جوان خودێ کرییە د (رشیم)یدا بۆ ماوێ شەش هزار سالان ما بێی کو زیانەك بگەهیتێ، خودێ دبێژیت: (هَذَا خَلْقُ اللَّهِ فَأَرُونِي مَاذَا خَلَقَ الَّذِينَ مِنْ دُونِهِ بَلِ الظَّالِمُونَ فِي ضَلَالٍ مُبِينٍ) [لقمان:١١].

# تيڤلىٚ گەنمى و مفايێن وى يێن ساخلەمييىٚ

خودىٚ گەنم يىٚ كرييە خوارنەكا تمام بۆ مرۆڤان، بەلىٚ ب چاڤدێرييا خودىٚ، زێدەبارى هندىٚ ئەڤ دەرامەتە خودىٚ وەسا يىٚ چێكرى كو د هەمى جهێن عەرديدا شين ببيت، گر و دەشت و چيا و دۆلان، و دەڤەرێن گەرم و سار و ناڤنجى شين ببيت، و هەر دەمەكىٚ ل سەر رويىٚ عەردى گەنم شين دبيت، بەلىٚ داهێنان و چێكرنا خودىٚ بۆ ڤى دەرامەتى يىٚ كرييە خوارنەكا تمام، گەنمى تيڤلەكىٚ سەرڤە يىٚ هەى كێشا وى (٩٪)يە ژ كێشا دندكا گەنمى. و تەخەكا دى يا هەى دكەڤيتە بن تيڤلىٚ سەرڤە (دەرەكى) كەرستەكىٚ (ئازۆت)ى يىٚ تێدا و كێشا وى ژى ژ (٣٪) ژ كێشا دندكا گەنمى پتر نينە، و پشتى ڤىٚ تەخىٚ ژى (رشيم) دهێت كو ئەو زيندەوەرە يىٚ شين دبيت دەمىٚ مەرجێن شينبوونىٚ هەبن، و كێشا وى ژ (٤٪) نابۆريت ژ دندكا گەنمى، و چل و هەشت ژ سەدىٚ نشايەكا بىٚ زەغلە، ئەم چ دكەين؟ ئەم تيڤلىٚ وى سەردا دئينين، و پەردىٚ وىٚ ژى، و بۆ مە چو نامينيت ب تنىٚ نشايەكا بىٚ زەغل، و ئەڤ تيڤلىٚ گەنمى شەش ڤيتامينێن تێدا هەين ب١، ب٢ ... ب٦، و ڤيتامينێن دى د ڤى تيڤليدا، و د ڤى تيڤكليدا كەرستەكىٚ فوسفۆرى يىٚ هەى كو ئەڤە خوارنەكە بۆ مێشكى و دەماران، و د ڤى تيڤليدا ئاسنىٚ هەى هێزەكىٚ ددەتە خوينىٚ، و هاريكارييا وەرگرتنا ئۆكسجينى ژ سيهان دكەت، و د ڤى تيڤليدا كالسيۆم يا هەى، و كالسيۆم كەرستەكىٚ سەرەكييە بۆ دورستبوونا هەستييان، و ددانان ب هێز دئێخيت، و ديسا سيليكۆن، كو ئەڤە موييان ب هێز دئێخيت، و هێزىٚ و تەيسينىٚ ددەتىٚ، و ديسا يود يىٚ د ڤى تيڤليدا هەى، كو ئەڤە كارىٚ رژينا پەريزادىٚ چالاك دكەت، و ديسا پۆتاسيۆم، و سۆديۆم، و مەگنيزيۆم يێن تێدا، ئەڤ كانزايە هەمى دچنە د ناڤ چێكرنا شانان، و شلەيێن هەرسكرنىٚ، و ئەم تيڤلى ژ دندكا گەنمى

ڤەدكەين، و دهاڤێژینه بەر گیانەوەران، و ڤێ نشایا زەلال ئەم دخۆیین، وەکی نوژداران سالۆخەتکری ئەو وەکی غریبەکێیه بۆ مەعیدەی، و ئەو ب ڤێ چەندێ یێ سالۆخەتکری، بەلێ داهێنانا خودایی د چێکرنا ڤی تیڤلیدا کو مفایێن خۆ یێن هەین ئەو ژ بەر کو ئەم گەنمی ب تیڤلڤه بخۆیین، دا ئەم مفای ژ ڤی کەرستەی وەرگرین ئەوێ خودێ کرییه د تیڤلێ گەنمیدا.

ئەگەر ڤی تیڤلی د ناڤ ئاڤێدا بکەلینن یا باشه بۆ تەناکرنا کوخکی، و پەرسیڤی، و دەمێ ئەڤ ئاڤا کەلاندی دهێته ڤەخوارن دبیته گرتنەك بۆ هناڤچۆنێ د رویڤیکاندا، و دەرمانەکه بۆ برینێن مەعیدەی، و بۆ زکچۆنێ، و ئەو خوارنەکه بۆ پیستی، و پارستنەکه بۆ پیستی ژ نەخۆشییێن وی، و ل بەراهییا وان بیرۆڤ.

ژ بەر هندێ دەمێ ئەم دخۆیین وەکی خودێ دڤێت ئەم بخۆین، و دەمێ ئەم سوننەتا پێغەمبەری ﷺ ب جه دئینین د خوارنێدا مه ساخلەمییا خۆ گرەنتی کر، و دویرکەڤتین ژ نەخۆشییان.

زار ئەبی حازم دبێژیت: ((سَأَلْتُ سَهْلَ بْنَ سَعْدٍ فَقُلْتُ: هَلْ أَكَلَ رَسُولُ اللهِ (صلى الله عليه وسلم) النَّقِيَّ؟ فَقَالَ سَهْلٌ: مَا رَأَى رَسُول اللهِ (صلى الله عليه وسلم) النَّقِيَّ مِنْ حِينَ ابْتَعَثَهُ اللهُ حَتَّى قَبَضَهُ اللهُ، قَالَ: فَقُلْتُ: هَلْ كَانَتْ لَكُمْ فِي عَهْدِ رَسُولِ اللهِ (صلى الله عليه وسلم) مَنَاخِلُ؟ قَالَ: مَا رَأَى رَسُولُ اللهِ (صلى الله عليه وسلم) مُنْخَلاً مِنْ حِينَ ابْتَعَثَهُ اللهُ حَتَّى قَبَضَهُ اللهُ، قَالَ: كَيْفَ كُنْتُمْ تَأْكُلُونَ الشَّعِيرَ غَيْرَ مَنْخُولٍ؟ قَالَ: كُنَّا نَطْحَنُهُ، وَنَنْفُخُهُ فَيَطِيرُ مَا طَارَ، وَمَا بَقِيَ ثَرَّيْنَاهُ فَأَكَلْنَاهُ))[1]، و یا د (أثر)ێدا هاتی ئێکەم بیدعه موسلمانان ئینایه دەر پشتی مرنا پێغەمبەری ﷺ مۆخلکرنا هویرکی بوو.

---

١ـ بوخاری (٥٠٩٧)، ئبن ماجه (٣٣٣٥).

# رەشرەشك

ژ بەلگەیێن پێغەمبەربوونێ د فەرموودا پێغەمبەریدا کو دبێژنێ د بەر زانستیڕا کرن (السبق العلمي) ئانکو بەری زانست ئاشکەرا بکەت، د سەحیحا بوخاریدا هاتییە، زار ئەبی هورەیرەی کو پێغەمبەر ﷺ دبێژیت: ((عَلَيكُمْ بِهَذِهِ الحَبَّةِ السَّوْدَاءِ، فَإِنَّ فِيهَا شِفَاءً مِنْ كُلِّ دَاءٍ إِلَّا السَّامَ))، و پەیڤا (السام): مرنە[1]. ئانکو: رەشرەشکێ بخۆن، دەرمانێ هەر دەردەردەکی یێ تێتا مرن تێ نەبیت.

ئەڤە فەرموودەکا سەحیحە، و پێغەمبەر ﷺ ژ دەڤ خۆ نائاخڤیت، بەلکو ئەوا پێ دئاخڤیت ئەو وەحییە بۆ هاتی، و چاوا زانایێن بەرێ ئەڤ فەرموودە راڤە دکر؟

د (الفتح الباري)دا یا هاتی د شرۆڤەکرنا (مِنْ كُلِّ داءٍ)دا دبێژیت: ئەوە ژ گشتییە کو مەرەم پێ تایبەتییە، چونکی نە د سروشتێ تشتەکێ ژ رووەکییە کو هەمی چارەسەری تێدا بن، ئانکو نەیا بەرئاقلە رەشرەشك دەرمانێ هەمی نەخۆشییان بیت، بەلکو مەرەم پێ ئەوە کو چارەسەرییە ژ هەر نەخۆشییەکا ژ شهێ چێ دبیت، و ئەبو بەکر بن ئەلعەرەبی دبێژیت: هنگڤین نێزیکترە ژ رەشرەشکێ بۆ دەرمانێ هەمی نەخۆشییان، کو چارەسەرییا نەخۆشییان یا تێدا، و د گەل ڤێ چەندێ هندەك نەخۆشی یێن هەین ئەگەر نەخۆشی هنگڤین خوار دێ زیانێ پێ بینیت، و ئەگەر مەرەم د گۆتنا خودێدا ل سەر هنگڤینی: (فيه شفاء للناس) مەرەم باراپترە، و ئەوا د رەشرەشکێدا بۆ وێ چەندێ ئێکەمینە))[2]، و ئەو هنگڤینێ خودێ ل سەر گۆتی: (فِيهِ شِفَاءٌ لِلنَّاسِ) [النحل:٦٩]

---

١ـ بوخاری (٥٣٦٤)، و موسلم (٢٢١٥)، و (الترمذي) (٢٠٤١)، و گۆتن یا وییە.

٢ـ فتح الباري (١٠/١٤٥).

ناگەهیتە ڤێ چەندێ (کو دەرمانێ هەمی نەخۆشییان بیت)، و خودێ نەگۆتییە: (فِيهِ الشِفَاءٌ لِلناسِ)، و ئەو دەقەکێ قورئانێیە، هۆسا فەرمووده یا هاتییە شرۆڤەکرن.

دو زانایێن مەزن ژ زانایێن نوژدارییێ هاتن کو د پێشکەفتیترین زانکۆیێن جیهانیدا کار دکرن، ڤان هەردو زانایان ئاشکرا کر کو رەشرەشك کۆئەندامێ بەرگرییا لەشی ب هێز دئێخیت د مرۆڤیدا، و کۆئەندامێ بەرگرییێ یێ گرێدایە ب هەمی نەخۆشییانڤە، نەخاسمە یێن میکرۆبی و پەنجەشێرێ؛ هەر دەمێ کۆئەندامێ مرۆڤی یێ بەرگرییێ یێ ب هێز بیت، دێ شیانێن مرۆڤی زێدەتر بن بۆ بەرهنگاربوونا نەخۆشییان کو بنیاتێ ڤان نەخۆشییان یێ میکرۆبی بیت، و نەخۆشییێن بنیاتێ وان یێ بەرگری بیت.

ئەڤ زانایە گەهشتنە هندێ ب رێکا تاقیکرنێ کو خوارنا هەر گرامەکا رەشرەشکێ رۆژێ دو جاران بۆ ماوێ چار حەفتییان، دێ کار و چالاکییێن خانێن لیمفی (٥٥٪) زێدەکەت، ئەڤ خانێن لیمفی کو ماددەکێ دژایەتیکرنێ دورست دکەن دژی میکرۆبان، ل ڤێرە خوارنا رەشرەشکێ دێ چالاکییا ڤان خانان زێدەکەت کو کارێ وان کوشتنا میکرۆبایە، و راسپاردینە ب چێکرنا پلازمایا هەڤدژ، چەکێ میکرۆبی، چالاکیا وان پێنجی و پێنج ژ سەدێ زێدە دبیت.

و گەلەك ڤەکۆلینێن هاتینە کرن ل سەر رەشرەشکێ، ژ وان کو د رەشرەشکێدا فۆسفات، و فسفۆر، و زەیت یێن تێدا ب رێژا بیست و هەشت ژ سەدێ، ئەڤ زەیتە نهێنییا رەشرەشکێ دهەلگرن، و د ڤان زەیتاندا هەڤدژێن چالاك یێن تێدا هەین، و هەڤدژێن بۆ ڤایرۆسان، و میکرۆبان، و کەرستێن هەڤدژ بۆ پەنجەشێرێ یێن تێدا، و هۆرمۆنێن هێزکەر یێن تێدا، و رێخۆشکەرن بۆ هاتنا میزێ و زەرکێ، و ئەنزیمێن هەرسکری، و هەڤدژێن ترشییێ، و کەرستێن تەناکەر و هۆشدارکەر د ئێك دەمدا، و پێغەمبەر ﷺ ژ

دەڤ خۆ نەدئاخڤت، و خودێیە ئەڤ چەندە بۆ گۆتی ب رێکا وەحیێ، دبێژیت: ((عَلَيْكُمْ بِهَذِهِ الحَبَّةُ السَوْدَاء، فَإِنَّ فِيهَا شِفَاءٌ مِنْ كُلِّ دَاءٍ إِلَّا السَّامَ))، و پەیڤا (السَّامُ): مرنە[1].

گەلە خەلکی ئەڤ رەشرەشکە یا ب کار ئینای، و یا دیتی ئەنجامێن گەلە باش یێن ژێ دەرکەڤتین، و پتر ژ پێنجی نەخۆشییان رەشرەشك دبیتە هاریکار د چارەسەرییێن واندا، ژ وان: نەخۆشییێن پیستی، و یێن رویڤیکان، و دەمارێ، و بۆرییێن خوینێ، و دلی، و خوین بەران، و ئەگەر رەشرەشك دەرمان نەبیت پاراستنە، و د سەر ڤێ هەمییێڕا ئەڤە شیرەتا پێغەمبەرییە ﷺ: ((عَلَيْكُمْ بِهَذِهِ الحَبَّةُ السَوْدَاء، فَإِنَّ فِيهَا شِفَاءٌ مِنْ كُلِّ دَاءٍ إِلَّا السَّامَ))، و پەیڤا (السَّامُ): مرنە.

و د هندەك کۆنگرێن دەرمانسازی یێن جیهانیدا، کو کۆنگرێ وان یێ بیست و سێیێ بوو ڤەکۆلینەك پێشکێش کر ناڤەرۆکا وێ کو شونیز یان رەشرەشك هاریکارە د کێمکرنا پەستانا خوینێدا، و ئەم دزانین بلندبوونا پەستانێ نەخۆشییەکا ب مەترسییە، و هەتا نوکە نوژدار ئەگەرێن دورست یێن ڤێ نەخۆشییێ نوزانن.

و ل مسرێ ڤەکۆلینەك هاتە پێشکێشکرن بۆ زانکۆیێ ل سەر رەشرەشکێ، پشتی تاقیکرنێن هویربین ب رێکا چاندنا میکرۆبان د وان ژینگەهێن ئەڤ رەشرەشکە تێدا، ژ حەلکرییێ وێ، یان هویرکێ وێ، یان شێوەکێ دی یێ وێ، و دیت کو ڤێ رەشرەشکێ گەشەکرنا میکرۆبان د وی جهێ ئەو تێدا راوەستاند.

دیسا ڤەکۆلینا سێیێ ل سەر رەشرەشکێ پێشکێش کرن، کورتییا وێ کو دەرمانەکێ چالاکە بۆ بێنتەنگییا بەربەلاڤ (رەبوو)، و نوژداران هەتا نوکە ب دورستی جهێ هاتنا وێ، و چارەسەرییا وێ نەزانییە.

---

١- ژێدەر بەری نوکە یێ هاتییە دیارکرن.

و زانایێن عەرەب ئەوێن ل سەر نوژدارییێ نڤیسین، وەكی ئیبن سینا د پەرتۆكا خۆدا (القانون)، ئەڤ پەرتۆكە ژ ناڤدارترین پەرتۆكێن نوژدارییێنە، و ئیبن سینای دیت كو رەشرەشك هەڤدژە بۆ پەرسیڤی، و یا باشە بۆ هاتنا میزێ، و بەركان د گولچیسك و میزلدانكێدا پرت پرت دكەت، و یا باشە بۆ هاتنا شیرێ دایكێ، تەناكەرە بۆ سەرئێشێ، و ئەو ڤنێرییێن (پرسكێن) د پیستیدا دهێن دبەت.

و چێدبیت دەمەك بهێت خەلك تشتەكێ دی ل سەر رەشرەشكێ ئاشكەرا بكەت، ژ بەر ڤێ چەندێ پێدڤییە ئەم شیرەتێن پێغەمبەری ﷺ وەربگرین، وەكی دبێژیت: ((عَلَيْكُمْ بِهَذِهِ الحَبَّةِ السَّوْدَاءِ))، و (علیكم) ل ڤێرە ناڤێ كارێ فەرمانییە ب رامانا (افعلوا)، ئانكو وێ بخۆن، ((فَإِنَّ فِيهَا شِفَاءً مِنْ كُلِّ دَاءٍ إِلَّا السَّامَ))، و پەیڤا (السَّامُ): مرنە[1].

---

[1] - ژێدەر بەری نوكە یێ هاتییە دیاركرن.

# مفايێن زەنجەبیلێ

نوژدارەك[1] ب کۆمکرنا وان ئایەتێن قورئانێ رابوو یێن ناڤێ گیایان تێدا هاتین، وی دیت ناڤێ سێیان ژ جوینا بهاراتان بوو، یێ د قورئانا پیرۆزدا هاتی:

کەرستێ ئێکێ: زەنجەبیل، وەکی د گۆتنا خودێدا هاتی: ﴿وَيُسْقَوْنَ فِيهَا كَأْسًا كَانَ مِزَاجُهَا زَنْجَبِيلًا﴾ [الانسان:١٧]، ئانکو: ئەڤ خودان باوەرە د بەحەشتێدا ژ پەرداغەکی ڤەدخۆن، تێکەلی زەنجەبیلێیە.

و کەرستێ دووێ: مسك بوو.. خودێ دبێژیت: ﴿خِتَامُهُ مِسْكٌ وَفِي ذَٰلِكَ فَلْيَتَنَافَسِ الْمُتَنَافِسُونَ﴾ [المطففين:٢٦]، ئانکو: دویماهییا وێ ڤەخوارنێ تاما مسکێ ددەت، بلا هەڤڕك هەڤڕکییێ ئەها بۆ ڤێ بکەن.

و یێ سێیێ کافوور: د گۆتنا خودێدا: ﴿إِنَّ الْأَبْرَارَ يَشْرَبُونَ مِنْ كَأْسٍ كَانَ مِزَاجُهَا كَافُورًا﴾ [الانسان:٥]، ئانکو: بێ گۆمان مرۆڤێت قەنج و خودان باوەر، دێ ژ پەرداغەکا تێکەلی کافوورێ ڤەخۆن.

و ئاخڤتنا ڤێرێ ل سەر زەنجەبیلێ، ڤی نوژداری هەمی پەرتۆکێن کەڤنێن نوژداری ل سەر زەنجەبیلێ خواندن، و حەفت ڤەکۆلینێن زانستی د ناڤەندێن زانستی یێن ب ناڤ و دەنگ ل جیهانێ یێن دەرکەفتین، وی د گۆتارا خۆدا ئاماژە ب ناڤێن وان ڤەکۆلینان دا یێن ل سەر ڤی بابەتی دەرکەفتین، و تشتێ سەرنجا مرۆڤی رادکێشیت:

---

١ـ دکتۆر نەزار ئەلدەقر، پەرتۆکا: روائع الطب الإسلامي، القسم العلاجي الجزء الأول ص ١٤٤-١٤٦.

زەنجەبيل وەكى د پەرتۆكێن نوژدارى يێن كەڤندا هاتى؛ گەرماتييەكە بۆ لەشى، هاريكارە بۆ حەلكرنا خوارنێ، نەرماتييە بۆ زكى، پاقژكەر و ب هێزكەرە، و زەنجەبيل يا ب مفايە بۆ كولبوونا گەريێ، و بێ هۆشكەرەكێ ب هێزە بۆ كولبوونا گەهان، و بێهۆشكەرەكێ ب هێزە بۆ زكئێشێ، و دژى ڤەرەشيانێيە، و ئاڤا وێ يا ژ بەر دمينيت دەرمانەكێ باشە بۆ نەخۆشييێن چاڤان، ئەڤە هەمى يێت د پەرتۆكا كەڤندا هاتين.

و د ڤەكۆلينێن نويدا ئەوێن زانايان كرين، ڤان زانايان نەزانى بوو كو ئەڤ كەرستە يا د قورئانا پيرۆزدا هاتى، گۆتن: زەنجەبيل دلى و هەناسێ ڤەژين دكەت، و هێزە بۆ پەيتكرنا ماسولكێن دلى، ئانكو هەمبەرى كەرستێ (ديكۆكسين)ێيە، و زەنجەبيل دەمار و ماسولكان فرەھ دكەت، وەناكەت پەركێن خوينێ كۆم ببن، ل ڤێرە: زەنجەبيل خوينێ رۆن دكەت، و يا ب مفايە بۆ نەخۆشييێن جەلتا مێشكى و دلى و دژى مەهينا خوينا دەست و پێيانە، و بلندبوونا پەستانا خوينێ دئينيتە خوار، و ديسا كۆلسترۆلى كێم دكەت.

بۆچى ئەڤ رەگەزە د قورئانا پيرۆزدا هاتييە؟ ئەرێ زەنجەبيلێ ئەڤ هەمى باشييە هەنە؟ و ئەڤێ ئەز بۆ هەوە دبێژم هندەك ژ وێ گۆتارا درێژە كو بەرى نوكە ل سەر مفايێن زەنجەبيلێ هاتييە گۆتن.

و ئەڤ رەگەزە (زەنجەبيل) د هەمان دەمدا خوين بەر و خوين هێنەران بەرفرەھ دكەت، و هێزكەرەكە بۆ ماسۆلكا دلى، و كۆلسترۆلى كێم دكەت، و پەستانێ دپارێزيت، خوينێ رۆهن دكەت، و كارتێكرنەكا ئەرێنى د چارەسەرييا كولبوونا گەهاندا دكەت، ئەڤە ژ حێبەتييێن چێكرييێن خودێيە.

(إبن القيم) ئەلجوزى دبێژيت: ((زەنجەبيل گەرمكەرەكا هاريكارە بۆ هەرسكرنا خوارنێ، نەرمكەرەكە بۆ زكى نەرمكرنەكا ناڤنجى، يا ب مفايە ژ گرتنێن مێلاكێ ئەوێن رێگرييا سەرمايێ و شهێ دكەن، و ژ تاريياتييا ديتنێ ئەوا ژ شهێ روى ددەت، خوارن و كلدان،

هاریکاره بۆ کارێ سێکسی، و حەلکەرەکە بۆ بایێ د رویڤیك و مەعیدەیدا چێ دبیت، و ب گشتی یا باشە بۆ مێلاك و مەعیدەی یێن سەروبەرێ وان یێ سار و نەخۆش))[1].

و د ڤی گەردوونیدا هەمی تشت یێن هەین، و باشترین دەرمان ئەوە یێ رووەکی بیت، چونکی چو کاریگەرییێن خراب نینن، و باراپتر ئەو دەرمانێن ئەم ب کار دئینین دەرمانێن کیمیایینە ب تنێ لایەکێ مفایی دگەهینیت، و لایەکێ دی خرابیێ دگەهینیتە مرۆڤی، و ئەگەر تو خواندنەکا بەرفرەها زانستی بۆ گیایان بکەی دێ بینی مفایەکێ تێدا بێی کارتێکرنێن خراب.

---

١. (الطب النبوي) بپ (٢٤٦)، و بەرێ خۆ بدە (زاد المعاد) (٣١٩/٤).

# قەسپ، گرنگییا وێ، و پێکهاتێن وێ

زار ئیبن عومەر گۆت: پێغەمبەرێ خودێ ﷺ دبێژیت: ((إنَّ مِنَ الشَّجرِ شَجرَةً لا يَسقطُ ورَقُهَا وإنَّها مَثلُ المُسلِمِ فحَدّثوني مَا هِيَ؟)) فوَقعَ النَّاسُ فِي شَجرِ البَوادِي، قالَ عَبْدُاللهِ : ووَقعَ فِي نَفْسِي أنَّهَا النَّخْلَةُ، فاستحْيَيتُ، ثمَّ قَالُوا: حَدِّثنَا مَا هِيَ يا رَسُولَ اللهِ؟ قالَ: ((هِيَ النَّخلَة))[1]، ئانکو: ((دارەك ژ داران بەرلگێن وێ ناوەریێن و ئەو وەکی موسلمانییە بێژنە من ئەو چ دارە؟)) خەلکێ هزرا خۆ د دارێن دەشتاندا کرن، عەبدوللایی گۆت: هاتە سەر هزرا من کو دارقەسپە، بەلێ من شەرم کر، پاشی گۆتن: ئەی پێغەمبەرێ خودێ کا بۆ مە بێژە ئەو چ دارە؟ گۆت: ((دارقەسپە)).

کۆنگرەك ل وەلاتەکێ قەسپان دهنێریت هاتە گرێدان، و ڤەکۆلینەك تێدا هاتە پێشکێشکرن کو پێکڤەگرێدانەك چێکربوو دارقەسپ وەکی مرۆڤی لێکربوو، و گۆت: قورمێ وێ وەکی مرۆڤی یێ راوەستیایە، و نێر و مێیێ یێن هەین، و بەری نادەت ئەگەر نەهێتە ئاڤزکرن (تەلقیحکرن)، و ئەگەر سەرێ وێ بڕی دێ مریت، و ئەگەر دلێ وێ تووشی ڤێککەڤتنەکێ بوو ژ ناڤ دچیت، و ئەگەر تایێ وێ بڕی نەشێت قەرەبوو بکەت، ب تەمامی وەکی مرۆڤی، و دار قەسپ یا دەرپۆشکرییە ب گیایەکێ هشك وەکی پرچا مرۆڤی، د جیهانێدا پتر ژ نۆت ملیۆن دارقەسپان یێن هەین، خوارنێ پێشکێشی مرۆڤی دکەن، و نەخاسمە رۆژیگران د رەمەزانێدا چونکی مفایێ وێ مەزنترە.

---

١ـ بوخاری (٦١)، موسلم (٢٨١١)، (الترمذي) (٢٨٦٧).

هندەك زانا دبێژن: رۆژی بارێ كۆئەندامێ زفرۆكا خوینێ سڤك دكەت، دل و لۆلەیێن خوینێ، چونكی رێژا قەلەوییێ و ترشی د خوینێدا دئینیتە خوارێ بۆ نزمترین ئاست، ئەڤە وەدكەت كو مرۆڤی ژ رەقبوونا خوین هێنەران و ئێشانێن گەهان دپارێزیت.

و رۆژی بهێنڤدانەكە بۆ هەردو گولچیسكان، و كۆئەندامێ دەرهاڤێژتنا بەرمایكان، ژ بەر كو ئەنجامێن دەربرینا خۆراكی كێم دكەت، و شەكرا مێلاكێ ب بزاڤ دئێخیت، و د گەل وی دوهنێ عومباركری ل بن پیستی ب بزاڤ دئێخیت، و د گەل وی دیسا پرۆتینێن ماسۆلكان ژی ب بزاڤ دئێخیت، ل ڤێرە رۆژییێن رەمەزانێ دبیتە خۆلەكا پاراستنێ یا سالانە، ژ گەلەك نەخۆشییان دپارێزیت، و دیسا خۆلەكا چارەسەرییێیە سەبارەت هندەك نەخۆشییان، زێدەباری كو ژ نەخۆشییێن پیراتییێ دپارێزیت، كو ژ زێدەهییا وەستاندنا ئەندامەتییێ چێ دبیت، و یا ژ پێغەمبەری ﷺ هاتییە ڤەگوهاستن: ((صُومُوا تصِحُّوا))[1]. ئانكو: ب رۆژی بن دێ د ساخلەم بن.

ژ بەر ڤێ چەندێ پێغەمبەری ﷺ د رەمەزانێدا فتارە ب قەسپێ دكر، و زار ئەنەسێ كورێ مالكی گۆت: ((كان النبي (صلى الله عليه وسلم) يُفطِرُ قبلَ أن يُصَلِّي علَى رُطباتٍ، فإنْ لمْ تكُنْ رُطباتٌ فتمَيَراتٌ، فإنْ لمْ تكُنْ تمَيَراتٌ حَسَا حَسَواتٍ مِنْ ماءٍ))[2]، ئانكو: پێغەمبەری ﷺ فتارە ب روتەبان دكر بەری نڤێژێ بكەت، و ئەگەر روتەب نەبان ب قەسپان دكر، و ئەگەر قەسپ نەبان چەند فرەكێت ئاڤێ ڤەدخوارن.

و زار (سَلْمَانُ بِنْ عَامِرِ الضَّبِّيِّ) ژ پێغەمبەری ﷺ گۆت: ((إذا أفطرَ أحدُكُمْ فليَفطِرْ علَى تمرٍ فإنَّهُ برَكَةٌ، فإنْ لمْ يَجِدْ تمَراً فالمَاءُ، فإنَّهُ طهُورٌ))[3]، ئانكو: دەمێ ئێك ژ هەوە فتارێ

---

١. كشف الخفاء (١٤٥٥)، و فيض القدير (٢١٢/٤).

٢. (الترمذي) (٦٩٦)، و ئەبو داوود (٢٣٥٦)، و ئەحمەد (١٢٦٩٨).

٣. (الترمذي) (٦٥٨)، و ئبن ماجة (١٦٩٩).

دکەت بلا ب قەسپێ بکەت ب راستی ئەو بەرەکەتە، و ئەگەر چو قەسپ نە دیتن بلا ب ئاڤێ بکەت، چونکی یا پاقژە.

و قەسپا رۆژیگر دخۆت د گەل ئاڤێ حەفتێ و پێنج ژ سەدێ پشکا خوارنا وێ کەرستێن شکەرا یەکینە (أُحاديةٌ)، هەرسکرنا وێ یا ب سناهییە، ب لەز دبیتە وزە، ب پلەکا کو شەکر ژ دەڤی دچیتە ناڤ خوینێ د ماوێ کێمتر ژ دەھ خۆلەکاندا، و هەر د وێ گاڤێدا مەلبەندێ هەستپێکرنێ هۆشدارییێ ب تێربوونێ ددەت د کۆما دەمارگێریدا، و دێ رۆژیگر هەست ب بەسکرنێ کەت، و دەمێ دچیتە سەر خوارنێ دێ ب ناڤنجی خۆت، هەروەکی د رۆژێن دیدا (نەیێن رۆژیگرتنێ)، بەلێ کەرستێن قەلەو هەرسکرن و مێتنا وان پتر ژ سێ دەمژمێران ڤەدکێشیت.

و مرۆڤێ رۆژیگر چەند خوارنا قەلەو بخۆت هەست ب تێربوونێ ناکەت، بەلێ دێ هەست ب تژیبوونێ کەت، و جوداییەکا مەزن یا هەیی د ناڤبەرا تێربوون و تژیبوونێدا، تێربوون هۆشدارییێ ددەتە مەلبەندێ برسێ د کۆما دەمارگێریدا، و دەمێ ڤی مەلبەندی هۆشداری دا دێ مرۆڤ هەست ب تێربوونێ کەت، و ئەگەر د مەعیدێ ویدا گەلەك خوارن تێدا نەبیت، و سەبارەت هەستکرنا تژیبوونا مەعیدەی ئەو تشتەکێ دیە.

و پێغەمبەری ﷺ فتارە ب قەسپان دکر، و نڤێژا مەغرەب دکر، پاشی دروینشتە سەر خوارنێ، و ئەو کەسێ سوننەتا پێغەمبەری ﷺ ب جه نەئینیت د فتارا خۆدا دێ گەلەك خێر د رۆژیا ویدا ژێ چن، ژ لایێ ئایینی، و ساخلەمی، و دەروونیڤە.

و ئەڤە ژ بەلگەیێن پێغەمبەربوونا پێغەمبەرینە ﷺ، هەتا رۆژێن فتارەکرنێدا هندەك زانا دبێژن: پێدڤییە بەری خوارنێ وی فێقی بخۆی یێ شەکرێن یەکی تێدا چونکی باراپتر خوارنێ کەرستێن قەلەوییێ یێن تێدا، و ئەڤە هزرکرنەکە ل دویف گۆتنا خودێ، دەمێ سالۆخەتێ خەلکێ بەحەشتێ دکەت: ﴿وَفَاكِهَةٍ مِمَّا يَتَخَيَّرُونَ (٢٠) وَلَحْمِ طَيْرٍ

مِمَّا يَشْتَهُونَ (٢١)) [الواقعة]، ئانكو: فێقییێ دڤێت (ل سەر وان دگێڕن). و گۆشتێ بالەفرێ دلێ وان بچیتێ (ل سەر وان دگێڕن).

(إبن القيم) دبێژیت: ((د فتارەكرنا پێغەمبەریدا ﷺ ب قەسپێ، یان ئاڤێ هزركرنەكا گەلەكا باش و جوان بوو، ژ بەر كو رۆژی مەعیدەی ڤالا دكەت ژ خوارنێ، و ئەو كەرستە بۆ مێلاكێ ناچن یێن وەردگریت، و بۆ ڤالاتی و ئەندامان دهنێریت، و شرینایی لەزترین تشتە بگەهیتە مێلاكێ، و خۆشترین تشتە بۆ وێ، و نەخاسمە ئەگەر یا تەڕ بیت، و دێ گەلەك وەرگریت، و دێ ئەو ب خۆ مفایی ژێ وەرگریت، و ڤالاتی، و ئەگەر نەبوون ب كێمەكا قورچێن ئاڤێ دێ گوڕییا مەعیدەی ڤەمرینیت، و گەرماتییا رۆژییێ، پاشی دێ بەرێ وی كەڤتە خوارنێ، و ب دلچۆن دێ خۆت))[1].

و ئەڤ قەسپە ژ كەرستێن پرۆتینی یێن سەخبێركەر بۆ شانان، و ژ رێژەیەكا كێما دوهنی پێك دهێن، و پێنج جۆرێن ڤیتامینان یێن د قەسپێدا، ئەوێن لەشی پێدڤی پێ هەی، دیسا هەشت كانزایێن سەرەكی یێن د قەسپێدا، و سەد گرامێن قەسپان رۆژانە ژ نیڤێ هەتا پێنجێكا پێدڤییا لەشی ژ كانزایان یێن تێدا، و د قەسپێدا دیسا دوازدە ترشێن ئەمینی یێن تێدا، و كەرستێن نەرمكەر و تەناكەر یێن تێدا، و پێنجی نەخۆشییێن هەی ئەگەرێ وێ قەڤزبوونە، و قەسپ پاراستنە ژ قەڤزبوونێ، و شوینوارێن ئەرێنێ یێن هەین د پاراستنا كێم خوینێدا، و بلندبوونا پەستانێ، و هاریكارە بۆ خۆلێكدانا شكەستنا هەستییان، و یا نەرمكەر و تەناكەرە، و ڤەكۆلینێن زانستی سەلماندییە، كو قەسپ ب میكرۆبان ب هەمیڤە پیس نابیت، چونكی تیرییا بلندا شەكرێ ئاڤا میكرۆبان دمێژیت، و ئەڤ باشییە هەمی هندەك زانایان یێن هژمارتی چل و حەفت توخمن یێن د قەسپەكا مرۆڤ دخۆت، و تو نوزانی لەش چ مفایی ژێ وەردگریت.

---

١. زاد المعاد (٣١٢/٤).

و زار عاییشایێ گۆت: پێغەمبەر ﷺ دبێژیت: ((یا عائِشَةُ بَیْتٌ لا تَمْرَ فیهِ جِیاعٌ أَهْلُهُ، یا عائشةُ بیتٌ لا تَمْرَ فیهِ جِیاعٌ أَهْلُهُ، أَوْ جاعَ أَهْلُهُ))، قالَها مَرتَیْنِ، أَوْ ثَلاثاً[1]، ئانکو: ((هەی عائیشا ئەو مالا قەسپ تێدا نەبن مرۆڤێن وێ د برسینە، هەی عائیشا ئەو مالا قەسپ تێدا نەبن مرۆڤێن وێ د برسینە، یان مرۆڤێن وێ برسیبووینە))، دو جاران، یان سێ جاران گۆت.

باشترین دەرمان ئەوە خوارن بیت، و باشترین خوارن ژی ئەوە دەرمان بیت.

(إبن القیم) ل دۆر قەسپێ دبێژیت: ((ئەو پتر هەمی دەرامەتی خوارنە بۆ لەشی، کو گەرماتییەکا تەڕ یا تێدا، و خوارنا وێ ب لەخرینی دێ کرمان کوژیت، ژ بەر کو د گەل گەرما وێ هێزەکا تریاقی (دەرمانەکێ دژی ژەهرێ) یێ تێدا، و ئەگەر بەردەوام ب لەخرینی هاتە ب کارئینان دێ کەرستێ کرمان سڤك کەت، و لاواز کەت، و کێم کەت، یان دێ وی کوژیت، و قەسپ فێقی و خوارن و دەرمان و ڤەخوارن و شرینییە[2].

١ـ موسلم (٢٠٤٦).

٢ـ زاد المعاد (٢٩١/٤)، و بەرێ خۆ بدە (الطب النبوي، ص٢٢٥).

# ریشالێن قەسپێ، مفاییێن وێ، و توخمێن وێ یێن کانزایی

ب راستی نوژدار د حێبەتییەکا توندانە ژ بلنبدوونا رێژێن نەخۆشییێن پیس و گران د ڤان سالێن دویماهییێدا، و باراپتر هزر بۆ هندێ دچن کو ئەڤە پالدانەکە بۆ گوهۆرینا چێکرنا خودێ، و دەمێ ئەم دزڤرین بۆ ژیانا سروشتی ئەوا کو خودێ فەرمان ل مە کری، و بۆ مە وێنەکری، و چێکری ژ بەر کو ئەم بژین ب ژیانەکا تژی ساخلەمی و بەختەوەری، و ئەم دێ ژیانەکا پاقژ و خۆش ژین و ژ بەر ڤێ چەندێ دڤێت ئەم بزڤرینە بنیاتان.

و هندەك نەخۆشییێن گران و مەترسی یێن هەین جڤاکێن رۆژئاڤا پێ دنالن، کو بنیاتێ خوارنا وان خوارنەکا موخلکرییە، و دەمێ خوارنا مرۆڤی ریشالە (ألیاف) تێدا نەبن خوارنا وی یا ب مفا نابیت، و د هەر سەد گرامێن قەسپادا هەشت گرام و نیڤ ریشالە یێن تێدا، ئەڤ ریشالە بەرگرییا قەڤزییێ دکەن، و قەڤزی نیشانە بۆ پێنجی نەخۆشییان، و ئەڤ ریشالە بەرگرییا وان دوهنان دکەن یێن کو شاخوینبەرێ دگرن، کو ل ڤی دەمی نەخۆشییا ئێکێ دهێت، و قەسپێ ئەڤ مفایێن مەزن یێن هەین.

سۆدیۆم گەلەك کێم یا د قەسپێدا هەی، ئانکو هەر سەد گرامان پێنج ملیگرامێن سۆدیۆمێ یێن تێدا، بەلێ یا زەنگینە ب پۆتاسیۆم و مەگنیزیۆمێ، و هەر سەد گرامێن قەسپان نیڤا پێدڤییا لەشی ژ پۆتاسیۆمێ یا تێدا، و پێنجێکا پێدڤییا لەشی ژ مەگنیزیۆمێ، هۆسا قەسپ یا کێمە ژ وی توخمێ دبیتە ئەگەرێ بلندبوونا پەستانا خوینێ، کو دبیتە ئەگەرێ مەیینا خوینێ د مێشکیدا، و جەلتە د خوینێدا، و د گەل نزمبوونا پەستانا خوینێ مرۆڤ ب ساخلەمییەکا تەنا و خۆش دژیت.

و د سەد گرامێن قەسپاندا ئێك بۆ شەش مليگرامێن ئاسنى يێن تێدا، و مرۆڤى گەلەك پێدڤييا ب ڤى توخمى هەى، و كاريگەرييەكا مەزن يا د ناڤ خوينێدا هەى، و د هندەك چالاكييێن پێدڤى د لەشيدا، و د سەد گرامێن قەسپاندا سێكا پێدڤييا مرۆڤى ژ ڤيتامين ( ب٢) يا تێدا، و ئەڤ ڤيتامينە گەلەكێ سەرەكييە د هندەك هاوكێشێن چالاكى د لەشيدا، و د فەرموودا پێغەمبەريدا ﷺ يا هاتى د سالۆخەتكرنا قەسپێدا كو نەخۆشييێ دبەت، و نەخۆشى تێدا نينن.

هيڤى و داخوازێ ژ خودێ دكەم كو ئەم بزڤرينە خوارنا سروشتى ئەوا بۆ مە هاتييە چێكرن دا ئەم خۆشييێ ب ساخلەمييا خۆ ببەين، ئەوە سەرێ مالێ مە د دنياييێدا، و ئەڤ خوارنا كو بۆياغێن كيميايى تێدا كەڤتينە سەرێك، چێ دبيت هندەك ژ وان پەنجەشێرى بن، يان ئەگەرێ هندەك نەخۆشييێن گران بيت، و پێدڤييە ل سەر مە خۆ ژێ بدەينە پاش، و هەمى تشتێ ڤى سەردەمى گوهۆرين د چێكرنا خودێدا يا تێدا، و مەترسى و دويماهييێن نەخۆش و ب زيان، و ل سەر مرۆڤييە بهێليت، و بزڤريت بۆ بنياتێ سروشتێ تشتى (الفِطرَة).

# قەسپ بنیاتێ زارۆکبوونا ب ساناهییە

د وان ئایەتێن قورئانێدا یێن ل سەر چیرۆکا مەریەمێ دئاخڤن، سێ پەیڤن، زانستێ نوژدارییا نوی ئاشکرا کرییە کو بنیاتێ زارۆکبوونا ب ساناهییە، خودێ د گەل مەریەما کچا عیمرانی دئاخڤیت: (فَكُلِي وَاشْرَبِي وَقَرِّي عَيْنًا فَإِمَّا تَرَيِنَّ مِنَ الْبَشَرِ أَحَدًا فَقُولِي إِنِّي نَذَرْتُ لِلرَّحْمَنِ صَوْمًا فَلَنْ أُكَلِّمَ الْيَوْمَ إِنْسِيًّا) [مريم: ٢٥-٢٦]، ئانکو: ڤێجا (وان ڕوتەبان) بخۆ و (وێ ئاڤێ) ڤەخۆ، و چاڤێت تە بلا (ب وی بچویکی کو عیسایە) ڕۆن و گەش ببن، و بلا دلێ تە پێ خۆش ببیت، و ئەگەر تە مرۆڤەك دیت، بێژە: ب ڕاستی من بۆ خودایێ دلۆڤان نەزرا دایێ ئەز ژ خەلکی یا ب ڕۆژی بم و نەئاخڤم، ڤێجا ئەڤرۆ ئەز چو مرۆڤان نائاخێڤم.

و پەیڤا: (قَرِّي عَيْنًا) زانایان دەرێخست و ئاشکراکر د ڤێ ئایەتێدا ڕەوشا دەروونی یا ژنا ب دوگیان بەری بوونێ، پەیوەندییەکا موکم یا هەی ب ساناهییا زارۆکبوونێڤە، دەمێ ژنا دوگیان یا ئارام بیت، کو چو ئارێشە د مالدا نەبن، و زەلامێ وێ یێ هاریکار و ڕێزێ لێ دگریت بەری زارۆکبوونێ، ئەڤە هۆکارەکێ سەرەکییە کو ب ساناهی زارۆك ببیت، بەروڤاژی وێ، هەر تێکچۆنەکا دەروونی، و لێککەفتنێن د ناڤبەرا ژن و مێراندا، و ژن نێزیکی زارۆکبوونێ ببیت، ئەڤ چەندە دێ بوونێ ب زەحمەت ئێخیت، ئەڤ چەندەیە زانایان دەرئێخستی و دیارکری، د گۆتنا خودێدا: (فَكُلِي وَاشْرَبِي وَقَرِّي عَيْنًا).

و ژ بۆ زانینەکا مەزن خودێ گۆتییە: (فَكُلِي وَاشْرَبِي وَقَرِّي عَيْنًا)[1].

ژ سەیرترین ئاشکراکرنێن زانستی د روتەبێدا کەرستەك یێ هەی دبیتە هاریکار بۆ هاتنەئێکا خلۆلەهییا رەحمی، و قەبارێ وی زێدە دبیت د دەمێ دوگیانییێدا ژ (٢.٥) سم[٣] بۆ (٧٥٠) سم[٣]، و ئەڤ کۆرپەلە، و ژێریا وی مالبچویك، و مالبچویك یێ گرێدایە ب لۆلەیێن خوینێ یێن دایکێڤە، و دەمێ زارۆك دهێتە خوارێ ژ رەحمێ دایکێ، و مالبچویك دویڤدا دهێت، ئەڤ لۆلەیێن خوینێ دهێنە بڕین، ئەگەر ئەڤ دەمارە بمینە ڤەکری، دێ خوینا دایکێ چیت و دێ مریت، ژ بەر ڤێ چەندێ خودێ وەسا ب شارەزایی یێ چێکری کو رەحم ب پلەکا توند بهێتە ئێك، هەتا وەسا رەق ببیت وەکی کەڤری، و دەمێ داپیرك دەستێ خۆ ددانیتە سەر رەحمی و دبینیت یێ رەقە، دێ پشت راست بیت کو ئەڤ زارۆکبوونە یا دورستە، و هاتنەئێکا توندا رەحمی هەمی خوینبەرێن ڤەکری دگریت، و ب ڤێ چەندێ خوین چۆن (نزیف) دراوەستیت، و د قەسپێ و روتەبێدا کەرستەکێ هەی هاریکارییا هاتنەئێکا رەحمی دکەت، ژ بەر ڤێ چەندێ پەیڤا روتەب یا هاتی د ئایەتا ژانا زارۆکبوونێ: (وَهُزِّي إِلَيْكِ بِجِذْعِ النَّخْلَةِ تُسَاقِطْ عَلَيْكِ رُطَبًا جَنِيًّا (٢٥) فَكُلِي)، ئانكو: قورمێ دارقەسپێ ب نك خۆڤە بهەژینە، (رطب)ێت تەڕ و گەهشتی دێ ب سەر تەدا وەریێن (و دا بزانیت خودێ کەرەما د گەل کری و خەمێت وێ سڤك ببن کانییا ئاڤێ ل دەڤ دەرئێخست و جۆك ژێ دچۆ، و قورمێ دارا هشك شینکر و ئینا بەری، و ب هەژیانا وێ و ئەو ب خۆ یا لاواز، (رطب) ژێ وەراندن). ڤێجا (وان ڕوتەبان)

---

١. (قرطبي) د تەفسیرا خۆدا (٩٦/١١) دبێژیت: [الربیع بن خثیم دبێژیت: نینە ژ روتەبێ باشتر بۆ وێ ژنا ژ نوی زارۆك بووی، و ئەگەر خودێ زانیبا تشتەکێ دی ژ روتەبێ باشتر یێ هەی بۆ ژنا ژ نوی زارۆك بوویی دا مەریەمێ پێ خوارن دەت، و ژ بەر ڤێ چەندێ دبێژن: قەسپ داب و نەریت بوو ل وی دەمی... و دبێژن: ئەگەر زارۆکبوونا ژنێ ب زەحمەت کەڤت ژ روتەبێ باشتر نینە بۆ وێ، و بۆ نەخۆشی ژ هنگڤینی باشتر نینە].

بخۆ و (وێ ئاڤێ) ڤەخۆ، و چاڤێت تە بلا (ب وی بچویکی کو عیسایە)ڕۆن و گەش بن، و بلا دلێ تە پێ خۆش بیت.

د روتەبێدا کەرستەك یێ هەی دبیتە هاریکار بۆ ڤەمالینا بەرمایکێن خوارنێ د رویڤیکێن ستویردا، کو کەرستەکێ پاقژکەر و نەرمکەرە، چو ژنێن دوگیان نینن نوژدار وێ ئاگەهدار نەکەت کو رویڤیکێن وێ خالی بن ژ هەمی تشتان، داکو رویڤیکێن تژی نەبنە ئاستەنگ دەمێ زارۆك ژ رەحمی دەردکەڤیت، د روتەپێدا کەرستەك یێ هەی ناهێلیت خوین هاتن دورست بیت، و روتەب پاقژکەرە بۆ رویڤیکان، و نەرم دکەت، و نەخاسمە رویڤیکێن ستویر.

تشتەکێ دی، ژانێن زارۆکبوونێ کریارەکا ب زەحمەتە، و دل هندەك جاران لێدانێن وی زێدە دبن بۆ سەد لێدانان د خۆلەکەکێدا، یان ژ هەشتێ لێدانان بۆ سەد و هەشتێ لێدانان د خۆلەکەکێدا، دا بەرسینگێ ڤان تێکچۆنێن توند بگریت، و دل پێدڤی ب خوارنێیە، و بزاڤێن ماسۆلکان دیسا پێدڤی ب خوارنێیە، ژ بەر ڤێ چەندێ ڤەسپ پتر ژ دەه خۆلەکان ڤەگوهاستنا وێ ڤەناکێشیت ژ دەڤی ئێکسەر بۆ ناڤ خوینێ، و ئەو ساناهیترین کەرستەیە بۆ هەرسکرنێ، و خوارنێ بگوهۆریت بۆ وزێ.

ئەڤ ڤەسپە گەلەکا تیرە، و پێدڤی ب شلەکێ هەیە داکو د ناڤدا حەل ببیت، دا ب ساناهی بکەڤیت بۆ مێتنێ: (فَكُلِي وَاشْرَبِي) [مریم:٢٦].

بۆچی مرۆڤ تێهنی دبیت دەمێ تشتەکێ شرین دخۆت؟ ئەڤەیە بنیاتێ دورستبوونا وێ یێ کارمەندییێ، و ژ بەر کو شرینی پێدڤی ب ژێکڤەبوونێیە، و د شلەیدا حەل ببیت، و دا کو حەلکرنا وێ ب ساناهی بکەڤیت، ژ بەر ڤێ چەندێ ئاڤ یا فەرە بۆ وێ ژنا دوگیان یا نێزیکی دەمێ زارۆکبوونێ، و رەوشا وێ یا دەروونی توخمەکێ سەرەکییە د زارۆکبوونێدا، و خوارنا ژنا دوگیان دڤێت چار تشت تێدا بن، کەرستەك هاریکار بیت بۆ تێکچۆنا رەحمی، و کەرستەك نەهێلیت خوین چۆن دورست بیت، و کەرستەك

رویفیکان پاقژ و نەرم بکەت، و کەرستێن دی خوارنەکا دەم کورت بدەن، و ساناهیترین رێك[1].

ئەڤ قورئانا پیرۆز، ئەڤە ئاخفتنا خودایێ گشت جیهانانە، چەند پەیڤەکن د چیرۆکەکێدا، بەلێ ئەگەر تو ل سەر راوەستی دێ تشتێن حێبەتی بینی: (وَهُزِّي إِلَيْكِ بِجِذْعِ النَّخْلَةِ تُسَاقِطْ عَلَيْكِ رُطَبًا جَنِيًّا (٢٥) فَكُلِي وَاشْرَبِي وَقَرِّي عَيْنًا).

ژنا دوگیان پێدڤییە خوارنەکا تایبەت، و ڤەخوارنەکا تایبەت، و تەناهییەکا دەروونی هەبیت.

ئەڤە د چەند ئایەتەکێن قورئانێدا، و هەر چەند زانست بەرەڤ پێش دچیت، ئاشکرا دبیت کو ئەڤ ئاخفتنە یێن خودایێ جیهانێنە، و ئاخفتنا ئافرێنەرێ گەردوونانە، و نەئاخفتنا مرۆڤییە.

---

١- (ابن القیم) د (زاد المعاد)دا (٣١٢/٤) دبێژیت: سروشتێ روتەبێ وەکی سروشتێ ئاڤێیە، یا گەرمە ب شهە، مەعیدێ سار بهێز دئێخیت و یا گونجاییە بۆ وێ... و جۆتبوونێ زێدە دکەت (إخصاب)، و ئەو کەسێن هەستێن سار هەی خۆش دکەت و گەلەك خوارنێ ددەتێ، و ژ مەزنترین ڤێقییێن گونجایە بۆ خەلکێ مەدینێ، و ژ بلی وەلاتێن دی کو ڤێقییێ وانە، و ژ مفاترینانە بۆ جەستەی].

# زەیتا زەیتوونێ

ل سالا (١٩٨٦) ئێکەم ڤەکۆلینا بابەتی ل سەر کاریگەرییا زەیتا زەیتوونێ د کێمکرنا کۆلیسترۆلا د خوینێدا دەرکەڤت، و ڤەکۆلینەکا دی ل دویڤدا ئاشکەراکر کو نەخۆشییێن خوینبەرێن دلی، و گرتنا ماسۆلکا دلی یا کێم بوو و بەلکو هەروەکی نەبیت د گزیرتا (کریت)دا، چونکی خەلکێ ڤێ گزیرتێ چەندییێن مەزن ژ زەیتا زەیتوونان دخۆن، و پێغەمبەر ﷺ د فەرموودەکا سەحیحدا دبێژیت: ((كُلُوا الزيتَ فإنهُ مُبارَكٌ، و ائتدِمُوا بهِ، وادَّهِنوا بهِ، فإنهُ يَخرُجُ مِنْ شجرَةٍ مُبارَكَةٍ))[1]، ئانکو: زەیتێ بخۆن ئەو یا پر بەرەکەتە، و تێکەلییا وێ بکەن، و خۆ پێ دوهن بدەن، ب راستی ئەو ژ دارەکا موبارەك دەردکەڤیت.

بەری نێزیکی دەھ سالان هەمی نوژداران ئەو کەسێ کۆلیسترۆلا خوینا وی یا بلند نەدهێلا زەیتا زەیتوونان بخۆت، و نوکە بەروڤاژی ڤێ چەندێ ئاشکەراکر، ژ بەر کو زەیتا زەیتوونان رێژا کۆلیسترۆلا ب زیان د لەشیدا کێم دکەت، و کۆلیسترۆلا ب مفا بلند دکەت.

و زەیتا زەیتوونان ساناهیترین جۆرێن زەیتایە بۆ هەرسکرنێ، و سەنگەکا پاراستنێ یا تێدا، و یا چارەسەری و خوارنێ، و نوژدار نوکە ل سەر هندێ ئێکن کو ڤێ زەیتێ کارتێکرنەکا چارەسەرییا حێبەتی یا هەی، ژ ڤێ کارتێکرنێ کو دشێن ب کار بینن بۆ

---

١. سنن الدارمي (٢٠٥٢) ژ زار ئەبی ئوسەیدێ ئەنساری، و ئیبن ماجە یا ژ ئبن عومەر دەرئێخستی (٣٣١٩).

نزمکرنا پەستانا بلند، و ب کار دئێت بۆ نەخۆشییا شەکرێ، و بۆ پاراستنا خوینبەر و لۆلەییێن خوینێ ژ رەقبوونێ، و ڤەمانا کەرستێن دوهنی ب دیوارێن وانڤە.

و شیکارییێن هویربین دیارکرییە کو هەر سەد گراما زەیتا زەیتوونان گرامەکا پرۆتینان تێدایە، و یازدە گرامێن قەلەوییێ، و دیسا پۆتاسیۆم، و کالسیۆم و مەگنیزیۆم و فسفۆر و ئاسن و سفر و گۆگرد و دیسا ریشالە یێن تێدا، و یا زەنگینە ب گرنگترین وان ڤیتامینێن گرێدای ب پێکهاتێ خانان و چالاکییا وانڤە، و یێن گرێدای ب سێکسیڤە، و ساخلەمیا هەستییان، و ئەڤ زەیتە خوارنەکە بۆ مێشکی، و خوارنەکە بۆ زارۆکان، و کارتێکرن د پرت پرتکرنا بەرکێن زراڤی و میزلدانکێدا یا هەی.

ئەڤە هەمی ڤەکۆلینێن زانستی بوون کو هاتبوونە پێشکێشکرن د کۆنگرێن زانستیدا، سەلماند کو پێغەمبەر ﷺ ژ دەڤ خۆ نەدئاخڤت، بەلکو ئەو وەحی بوو بۆ دهات.

کەرستەکێ د زەیتا زەیتوونێدا هەی ناهێلیت خوین ب قەرسیت، و ئەڤ زەیتا پێغەمبەری ﷺ ل سەر گۆتی: ((كُلوا الزيتَ، و ائتدِمُوا بهِ، وَادَّهِنوا بهِ))[1]، و کاریگەرییەکا باش یا هەی بۆ کولبوونێن پیستی، و بۆ هندەک نەخۆشییێن پیستی، و کاریگەرییەکا باش و ب مفا یا هەی هەتا بۆ ب کارئینانا دەرڤەییا لەشیدا، پێغەمبەر ﷺ ژ دەڤ خۆ نائاخڤیت، و مرۆڤێ باوەردار دزانیت کا دێ چ خۆت، پێدڤییە کەرستێن قەلەوییێ هەبن، یان دێ ب مفا کریت، و یان دێ ب زیان کریت.

من ئەڤ بابەتە گۆت چونکی بارا پتر مرۆڤان ـ بەری دیارکرنەکا راست بۆ بهێت ژ لایێ خودایێ وانڤە، و بەری بزانن کو ئەڤ ئایینە تامییەکا رەهایە، و دورستییەکا رەهاییە ـ هزر دکەن گۆتنێن نوژدارێن کو نەگەهشتینە قویناخا پێگەهشتنێ د زانستێ واندا، و باراپتر مرۆڤان ددەنە پاش ژ خوارنا ڤێ زەیتێ کو ژ دارەکا پیرۆز دەردکەڤیت، هزر دکەن کو ئەڤ گۆتنە د دورستن د گەل وێ چەندێ بەروڤاژییە بۆ فەرموودا پێغەمبەری ﷺ.

---

1. ژێدەر بەری نوکە یێ هاتییە دیارکرن.

د ڤەکۆلینەکا زانستی یا هویربیندا یا هاتییە سەلماندن کو ئەڤ زەیتە ژ گرنگترین پێدڤییانە بۆ لەشێ مرۆڤی، چونکی ئاڤ یا تێدا، دیسا پرۆتین و دوهن، و کاربۆهیدرات و کلس و فسفۆر و سۆدیۆم و پۆتاسیۆم و ڤیتامین (ب)، و فسفۆر خوارنێ ددەتە مێشکی، و بیردانکێ بهێز دئێخیت، و دەماران چالاك دکەت، و دبیتە هاریکار بۆ ڤەمانا کلسێ د هەستیاندا، و کاربۆهیدرات وزێ و گەرمکرنێ و بزاڤێ ددەن، و ڤیتامین (ب) پەیوەندی یا ب تۆڤێ چێبوونا زارۆکانڤە هەی (الاخصاب) و پەیوەندی ب نەخۆشییێن چاڤان و نەخۆشییێن گەهان و کولبوونێن ماسۆلکان، و تێکچۆنا هەڤسەنگییا دەمارگیرییێڤە هەی، و ئەو ناهێلیت خوین مەیین چێ ببیت، و وەریانا پرچێ، و مەزنبوونا پرۆستاتان، و هەول ددەت خوریك ل سەر دێمێ مرۆڤی دورست نەبن، و سۆدیۆم رۆلەکێ گرنگ یێ هەی د پلازمایا خوینێدا، و پۆتاسیۆم یا فەرە بۆ دەماران و دلی، و خوینبەران، و ماسۆلکان، و هەر چەند مرۆڤ ب ناڤ سالڤە دچیت وی گەلەك پێدڤی یا ب پۆتاسیۆمێ هەی، و ئاسن کێمییا وی دبیتە ئەگەرێ کێم خوینییێ، و کالسیۆم ژ بۆ چێکرنا هەستیانە بۆ مرۆڤی، و نەخاسمە بۆ زارۆکان، و ڤان هەمی کانزایان دێ بینین د زەیتا زەیتوونێدا، زێدەباری دوهنان، و پرۆتین و ئاڤ، و ئەو چییە دبیتە ئەگەرێ کێمبوونا ڤان کەرستان د لەشیدا؟ ئەو تشتێ دبیتە ئەگەرێ داکەڤتنا چالاکییا هزری و لاوازییا بیردانکێ و سستییا لەشی و لەزاتییا وەستیانێ، و هەستدارییێ (الحساسیة) بۆ ساراتییا د تبل و دەست و پێیاندا، و قەڤزبوون، و لاوازییا دلچۆنا خوارنێ، و گیرۆبوونا چێبوونا برینان، و خوریانا پیستی، و کرمیبوونا ددانان، و لڤین د پشتا چاڤاندا، و کوژییێن دەڤی، و فرکگرتنا (تێکچۆن) د ماسۆلکاندا د شەڤێدا، و نڤستنەکا نە یا تەنا، و ئێشانێن د گەهاندا، کێمییا ڤان کەرستان ل دەڤ مرۆڤی ئەوێن د زەیتا زەیتوونێدا هەی ئەڤ کێمییە دبیتە ئەگەرێ ڤان نەخۆشییان هەمیان.

ئەڤ زەیتە کارەکێ نەرم و باش یێ هەی، دهێتە ب کارئینان وەك چارەسەری بۆ قەڤزبوونێ، روییێن کولبوویی نەرم دکەت، ب کار دئینن د نەرمکرنا تیڤلێن (کەڤشك) پیستی، و پیراتییێ گیرۆ دکەت، و تخویبەکی بۆ بەلاڤبوونا وێ ددانیت.

و ل سالا (١٩٩٠) ڤەکۆلینەکا زۆر هاتە کرن، ب ڤێ چەندێ سەلماند کو زەیتا زەیتوونێ پەستان و شەکرا خوینێ سڤك دکەت، و دیسا کۆلیسترۆلا د خوینێدا سڤك دکەت، و رێژا پەستان و شەکر و کۆلیسترۆلێ ل دەڤ وان کەسێن زەیتا زەیتوونێ دخۆن گەلەك یا کێمە بەراورد د گەل ئەوێن نەخۆن، و ئەڤ ڤەکۆلینە هاتبوو تاقیکرن ل سەر سەد هزار کەسان.

و د پەیجەکێ زانیاریدا ئەز ب سەر راستییەکا گەلەك هویربین هلبووم، ئەو ژی زانایێن بریتانی گەهشتنە بەلگەیێن نوی کو مفایێن پاراستنێ بۆ زەیتا زەیتوونێ سەلماندییە د چارەسەرییا پەنجەشێرا رویڤیکاندا، کو سالانە بیست هزار دبنە قوربانی وێ ل بریتانیا ب تنێ، و د جیهانێدا ژمارەکا مەزن یا هەی بۆ وان کەسێن تووشی ڤێ نەخۆشییێ بووین.

و هندەك ڤەکۆلەرێن دی دیت زەیتا زەیتوونێ تێکارکرنێ د گەل ترشێ مەعیدەی دکەت، و ناهێلیت تووشی نەخۆشییا پەنجەشێرێ ببیت.

و توشبوون ب ڤێ نەخۆشییێ (پەنجەشێر)ێ یا بەربەلاڤە ل بیست و هەشت وەلاتێن جیهانێ، باراپتر ئەڤ وەلاتە دکەڤنە ئەوروپا و ئەمریکا و بەرازیل و کۆلۆمبیا و کەنەدا و چینێ، و بۆ ڤەکۆلەران دیار بوو کو هۆکارێن خوارنێنە دبنە ئەگەرێ تووشبوونا کەسان ب ڤێ نەخۆشییێ، و ئەڤ رێژە گەلەك د کێمن ل دەڤ وان کەسێن زەرزەوات و دان و دکاکی (حبوب) دخۆن.

و پشتی دویڤچۆنەکا گەلەکا هویربین دیت کو خوارنا گەلێن رۆژهەلاتا ناڤەراست باشترین خوارنە د جیهانێدا، چونکی د هەژارن، و ژ بەر کو پشت بەستنا وان ب تمامی

یا ل سەر زەرزەواتان، تو شەربەتەکا ڤوتیبەندکری (معلبات) ل دەڤ وان نابینی، و ئەڤ کەرستێن سیلیلۆزی کو ئەڤە بنیات و پتریا زەرزەوات و فێقییە کریارا هەرسکرنێ ب لەز دئێخیت، و کۆلیسترۆلا زێدە دمێژیت، و ماوێ ڤەمانا خوارنێ د رویڤیکاندا کێم دکەت، و ویڤدا ژی زەیتا زەیتوونێ خوارنەکا سەرەکییە د ڤان وەلاتاندا، و پرۆتینا رووەکی یا ژ هەمیا باشتر و خۆشتر ل دەڤ وان وەکی نۆکێ و فۆلێ دیسا ئەڤە باشترین جۆرێن پرۆتینانە، و سەبارەت وان نەخۆشییێن مەترسی د وەلاتێن گەلەك زەنگیندا دگەهیتە هەشت جارکی، چونکی د زەنگینن، و گۆشتی گەلەکێ دخۆن.

و د ڤێ دویڤچۆنێدا دیسا دیت کو مەترسییا تووشبوونێ ب نەخۆشییێن رویڤیکان کێم دبن د گەل خوارنا دانێن خوارنێ یێن زەنگین ب زەیتا زەیتوونێ، بەلێ مفایێن زەیتا زەیتوونێ نە ب تنێ پاراستنە ژ نەخۆشییێن دلی، بەلکو پاراستنە ژ گەلەك نەخۆشییان، و هندەك ژ وان نەخۆشییان د ڤێ ڤەکۆلینێدا دیارکرن، و ژیبیێ مرۆڤی وەکی هندەك نوژدار دبێژن یا ب ژیبیێ خوینبەرێن ویڤە گرێدایە، و زەیتا زەیتوونێ ئێك ژ خوارنێن سەرەکییە د پاراستنا نەرماتییا خوینبەراندا.

خودێ د قورئانا پیرۆزدا ناڤێ وێ کرییە دارا پیرۆز، ((كُلوا الزيتَ فإنهُ مُباركٌ، وائتدِمُوا بهِ، وادَهِنوا بهِ، فإنهُ يَخرُجُ من شجرةٍ مباركةٍ))[1].

و ئەو گۆتارێن بەلاڤ دکەن، و هۆشدارییێ ددەن ژ زەیتا زەیتوونان نەگۆتارێن زانستینە، چونکی سەر ب کارگەهێن چێکرنا زەیتێڤەنە کو دەولەتێن زەنگین بەرهەم دئینن، و ژ بەر کو دا بەلاڤ بیت و کرین بکەڤیتە سەر بەرهەمێ وان، و دا بەرێ خەلکی ژ زەیتا سەرەکی وەرگێرن ڤان گۆتاران بەلاڤ دکەن، و ئەم د هشیار بین ژ ڤێ خەلەتییێ، و ڤێ درەوێ هەتا د گۆتارێن زانستیدا.

---

١. ژێدەر بەری نوکە یێ هاتییە دیارکرن.

من ئەڤ راستییە دیارکر دا بۆ هەوە راستیبیا گۆتنا خودێ د قورئانا پیرۆزدا ئاشکەرا بکەم: (اللَّهُ نُورُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ مَثَلُ نُورِهِ كَمِشْكَاةٍ فِيهَا مِصْبَاحٌ الْمِصْبَاحُ فِي زُجَاجَةٍ الزُّجَاجَةُ كَأَنَّهَا كَوْكَبٌ دُرِّيٌّ يُوقَدُ مِنْ شَجَرَةٍ مُبَارَكَةٍ) [النور:٣٥]، ئانکو: خودێ ڕۆناهیبیا عەرد و عەسمانانە (ئانکو ئەوە یێ عەرد و عەسمان ڕۆن کری)، مەتەلا ڕۆناهیبیا خودێ (د دلێ بەندەیێ خودان باوەردا) وەکی کولەکەکێیە (د دیواریڕا و یا نەڤەکری) و چرایەك تێدا بیت، ئەو شویشە هند یا زەلال بیت، هەروەکی ستێرەك ژ رۆژێ، و ئەو چرا ب زەیتا دارەکا پیرۆز هەلببیت (کو دارا زەیتوونێیە).

و زار عومەرێ کورێ خەتابی ﷺ گۆت: پێغەمبەر ﷺ دبێژیت: ((كُلوا الزيتَ وَادهِنوا بِهِ فإنهُ مِنْ شَجرةٍ مُباركةٍ))[1].

ئەرێ مانە ئەڤ ڤەکۆلینا زانستی ل دۆر پێکهاتێن زەیتا زەیتوونێ، و ل دۆر وان هەمی مفایێن ئەڤ کانزایە ب جھ دئینن د لەشێ مرۆڤیدا بەلگەیە ل سەر پێغەمبەربوونا پێغەمبەری ﷺ؟

پێدڤییە ئەم گۆتنێن مرۆڤێن چام و رەڤۆك نەوەرگرین، و ئەڤە هندەك راستییان دزانن، و هەمی راستییان نوزانن، دیسا پێدڤییە ئەم خۆ پشت راست کەین کا ئەڤ گۆتارە یا زانسییە، یان ئارمانجا وێ دابینکرنا ب دەستڤەئینانا فایدەکێ زۆرە بۆ لایەنەکێ ئابۆری، و جوداییەکا مەزن د ناڤبەرا ڤان دو کاودانانداندا یا هەی.

---

١- (الترمذي) (١٨٥١)، و ئبن ماجە (٣٣١٩)، و نەسائی (٦٧٠١).

# زەیتا زەیتوونێ سۆتەمەنییە بۆ لەشێ مرۆڤی

خودایێ مە زەیتا زەیتوونێ ناڤێ وێ ب سۆتەمەنی ئینایە، خودێ دبێژیت: ﴿يُوقَدُ مِنْ شَجَرَةٍ مُبَارَكَةٍ﴾ [النور:٣٥]، ئانکو: ب زەیتا دارەکا پیرۆز هەلببیت (کو دارا زەیتوونێیە)، و رامانا کو ئەو ب خۆ سۆتەمەنییە، سۆتەمەنییە بۆ لەشێ مرۆڤی.

زانایان ئاشکرا کرییە کو د هەر گرامەکا زەیتا زەیتوونێدا هەشت گەرمۆکە یێن تێدا، دەمێ مرۆڤ سەد گرامان دخۆت، هەر وەکی وزا هەشت سەد گەرمۆکان وەرگرتی، ئانکو نیڤا پێدڤییا مرۆڤی یا رۆژانە ژ خوارنێیە.

و تشتێ سەرنجا مرۆڤی رادکێشیت ئەوە خودێ ئەڤ زەیتە تایبەتمەندییەکا کرییە تێدا، کو ئەو کەرستەکێ ڤەلەوییە نەیێ تژییە، ئانکو ئەڤ زەیتە گەردیلێن دوهنی یێن د ناڤ خوینێدا دبەت، و زەیتا زەیتوونێ ناهێلیت دوهن د دیوارێن بۆرییێن خوینێدا ڤەمینیت.

هندەك نوژدار دبێژن: ((ژییێ مرۆڤی یێ ب ژییێ لۆلەیێن خوینێڤە گرێدایە))، و ژ نەخۆشییێن مەترسیدار، نەخۆشییا رەقبوونا لۆلەیێن خوینێیە، و ڤەمانا کەرستێن دوهنی ب دیوارێن لۆلەیێن خوینێڤە، ژ بەر کو دێ ئەڤ لۆلەیە تەنگ بن و خوین ب سروشتی ناهێت و بچیت، و دێ دل وەستیت.

و تشتێ هویربین خودێ ئەڤ زەیتە کرییە کەرستەکێ نەرمکەر بۆ لۆلەیێن خوینێ، و کەرستەکە وان دوهنێن ب دیوارێن لۆلەیێن خوینێڤە نیستی رادمالیت، و وەل ڤێ زەیتێ کرییە کو کەرستەکێ دوهنی نە یێ تێر بیت، بەلێ زەیتا گیانەوەری یا تێر

دمینیته د ناڤ خوینێدا، و دشێت د گەل خەوا درێژ ب دیوارێن لۆلەیێن خوینێڤە بنیسیێت، دێ بیتە ئەگەرێ تەنگبوونا لۆلەیێن خوینێ، و رەقبوونا وان، ژ بلی هندەکێن دی کو دبنە ئەگەرێ مەترسییێن دلی، خودێ دبێژیت: (وَشَجَرَةً تَخْرُجُ مِنْ طُورِ سَيْنَاءَ تَنْبُتُ بِالدُّهْنِ وَصِبْغٍ لِلْآكِلِينَ) [المؤمنون:٢٠]، ئانکو: مە (ب وێ ئاڤێ) دارەك دا، ل چیایێ (طور سیناء) شین دبیت (کو زەیتوونە)، و فێقیێ وێ دبیتە روین و پێخوارن بۆ یێ بڤێت بخۆت.

و د ئایەتا دوویێدا خودێ دبێژیت: (اللَّهُ نُورُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ مَثَلُ نُورِهِ كَمِشْكَاةٍ فِيهَا مِصْبَاحٌ الْمِصْبَاحُ فِي زُجَاجَةٍ الزُّجَاجَةُ كَأَنَّهَا كَوْكَبٌ دُرِّيٌّ يُوقَدُ مِنْ شَجَرَةٍ مُبَارَكَةٍ زَيْتُونَةٍ لَا شَرْقِيَّةٍ وَلَا غَرْبِيَّةٍ يَكَادُ زَيْتُهَا يُضِيءُ وَلَوْ لَمْ تَمْسَسْهُ نَارٌ نُورٌ عَلَى نُورٍ يَهْدِي اللَّهُ لِنُورِهِ مَنْ يَشَاءُ وَيَضْرِبُ اللَّهُ الْأَمْثَالَ لِلنَّاسِ وَاللَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ) [النور:٣٥]، ئانکو: خودێ رۆناهییا عەرد و عەسمانانە (ئانکو ئەوە یێ عەرد و عەسمان رۆنکری)، مەتەلا رۆناهییا خودێ (د دلێ بەندەیێ خودان باوەردا) وەکی کولەکەکێیە (د دیواریرا و یا نەڤەکری) و چرایەك تێدا بیت، ئەو شویشە هند یا زەلال بیت، هەروەکی ستێرەك ژ رۆژێ، و ئەو چرا ب زەیتا دارەکا پیرۆز هەل ببیت (کو دارا زەیتوونێیە)، و ئەو دارە نە هەردەم بەرۆژە و نە هەردەم نزار (ئانکو نە رۆژ لێ ددەت هەمی وەختان، و نە ل بەر سیبەرێیە هەمی وەختان)، نێزیکە زەیتا وێ رۆناهییێ بدەت، خۆ ئەگەر ئاگر ژی ڤێ نەکەڤتبیت (ئانکو دلێ خودان باوەر یێ رۆنە، ب وێ رۆناهییا خودێ کرییە تێدا، ب راستەرێکرنا خودێ کارێ خۆ دکەت، بەری زانین بۆ بێت، و گاڤا زانین بۆ هات رۆناهییا وی زێدەتر لێ دئێت، ڤێجا رۆناهی دکەڤتە سەر رۆناهییێ) رۆناهی ل سەر رۆناهییێیە، یێ خودێ بڤێت راستەرێ دکەت، و بەرێ وی ددەتە رۆناهی و هیدایەتا خۆ، و خودێ نموونەیان بۆ مرۆڤان دئینیت و دیار دکەت، و خودێ ئاگەهـ ژ هەمی تشتان هەیە.

زانا ل سەر ڤان دو ئایەتان راوەستیان، بەرامبەر ڤێ دارا پیرۆز، دارا زەیتوونێ، و ل دۆر زەیتا وێ کو دهێتە هژمارتن کەرستێ ئێکێ یێ دوهنی د ژیانا مرۆڤیدا.

هندەك زانایان هزرکر ژ بەر نەزانین و نەسەرهلبوونا وان، یان ژ بەر نەدویفچۆنا وان بۆ ڤێ دارا خێر و بێر، کو ئەو کەرستێن ئەڤ دارە بەرهەم دئینیت ب زیانن، بەلێ قورئانا پیرۆز و سوننەتا پێغەمبەری ﷺ ب شێوەکێ دی دیار کرییە.

و ڤەکۆلینێن زانستی یێن دورست سەلماندییە کو بەری چەند سالان دەرکەڤتینە کو زەیتا ڤێ دارێ سۆتەمەنییە بۆ مرۆڤی، و ئەڤ زەیتە وزەکا نموونەیە بۆ مرۆڤی.

دیسا زانایێن خوارنێ جودایی د ناڤبەرا ترشێن دوهنی یێن تژی و نە یێن تژیدا کرییە، و هندەك کەرستێن قەلەو و تژی و ئەڤە د مینە د ناڤ خوینێدا، و چێدبیت بکەڤنە سەرێك ب دیوارێن خوینبەرانڤە، دێ بنە ئەگەرێ تەنگبوونا وان، و کەرستێن دوهنی یێن تژی ب زیانن بۆ مرۆڤی، بەلێ کەرستێن دوهنی یێن نەتژی دێ هەڤسەنگ بن دەمێ جۆرێن دوهنی یێن مایی دبەت، و زانایان زەیتا زەیتوونێ سالۆخەت کر کو ئەو ترشێن دوهنی یێن نە تژینە، مفایی دگەهیننە لەشی، و ناهێلن گیرهە و ڤەماییێن دوهنی د دیوارێن خوینبەرانڤە بمینن، بەروڤاژی ترشێن دوهنی یێن تژی کو د باراپتری زەیتێن گیانەوراندا هەی، و ئەڤ زەیتێن گیانەوەری یێن تژی دبنە ئەگەرێ رەقبوونا خوینبەران، و لاوازییا دلی، ژ بەر ڤێ چەندێ نوژدار شیرەت دکەن کو مرۆڤ رۆژانە کەفچکەکی ژ زەیتا زەیتوونێ بخۆت دا یێ پاراستی بیت، و دا چارەسەر بیت ب وێ ژ رەقبوونا خوینبەران، و ئەڤ زیتە زکی خۆش دکەت، و ئێشانێن وی تەنا دکەت، و کرمان دەردئێخیت، و باراپتر دوهنێن گیانەوەران مەعیدەی نەخۆش دکەن، ب تنێ زەیتا زەیتوونێ نەبیت، ئەڤە پێتی و ددانان ب هێز دکەت، و پیستی نەرم دکەت، و ئەو ترشەکێ دوهنی یێ نە تژییە، و ناڤەمینیت ل سەر دیوارێن رویڤیکان، و نابیتە ئەگەرێ تەنگبوونا خوینبەران، و نە رەقبوونا وان، ئەڤە رامانا گۆتنا خودێیە: (وَشَجَرَةً

تَخْرُجُ مِنْ طُورِ سَيْنَاءَ تَنْبُتُ بِالدُّهْنِ وَصِبْغٍ لِلْآكِلِينَ) [المؤمنون: ٢٠]، و گۆتنا خودێ: (يُوقَدُ مِنْ شَجَرَةٍ مُبَارَكَةٍ زَيْتُونَةٍ لَا شَرْقِيَّةٍ وَلَا غَرْبِيَّةٍ) [النور: ٢٠]، و د ئايەتا سيێدا: (وَالتِّينِ وَالزَّيْتُونِ) [التين: ١]، ئانكو: سويند ب وى جهێ تێر هەژير، و ب وى جهێ تێر زەيتوون (دو جە بوون ئێك ل شامێ بوو، و ئێك ل قودسێ).

و د فەرموودەكا سەحيحدا ژ زارێ پێغەمبەرى ﷺ: ((كُلوا الزَّيتَ فإنَّهُ مُبارَكٌ، وَ ائتَدِمُوا بِهِ، وادَّهِنوا بهِ ؛ فإنَّهُ يَخرُجُ مِنْ شَجَرةٍ مُبارَكَةٍ))[1].

و هەر چەند زانست بەرەف پێش بچيت نێزيكى وان راستييان دبيت يێن د قورئانێ و سوننەتێدا هاتين، و هەر چەند ژ قورئان و سوننەتێ دويركەڤيت ئەڤە بەلگەيێ پاشڤەمانا وييە، و بەلگەيێ كێماسييا وييە، و ژ رێ دەركەڤتنا وى ژ وێ راستييێيە ئەوا كو قورئان و سوننەت پێ هاتين.

(إبن القيم) ل سەر زەيتا زەيتوونێ دبێژيت: ((فالمعتصَرُ مِنَ النَّضيجِ أعدَلُه وأجودُه... ومن الأسودِ يسخِن ويرطب باعتدالٍ، وينفعُ من السموم، ويطلقُ البطنَ، ويخرجُ الدودَ، والعتيقُ منه أشدُ تسخيناً وتحليلاً، وما استخرِجَ منه بالماءِ فهو أقلُ حرارةً، وألطفُ، وأبلغُ في النفعِ، وجميعُ أصنافهِ مُلينةٌ للبشرةِ، وتبطئُ الشيبَ، وماءُ الزيتونِ المالحِ يمنعُ من تنفُطِ حرقِ النارِ، و يشدُ اللثةَ، وورقُه ينفعُ من الحمرةِ، والنملةِ، والقروحِ الوسخةِ، ويمنع العرق، ومنافعُه أضعاف ما ذكرنا))[2]، ئانكو: ئەوێ هاتييە گڤاشتن ژ هەميان چێتر و ب مفاترە... و يێ رەش گەرمكەر و ب رەحەتى نەرم دكەت، و پاراستنە ژ ژەهران، و زكى بەرددەت و نەرم دكەت، و كرمان دەردئێخيت، و يێ كەڤن ژێ پتر گەرمكەر و شرۆڤەكەرە، و هندى ب ئاڤێ ژێ دەربێخن گەرماتييا وى كێمتر و نەرمتر و ب مفاترە،

---

١- (سنن الدارمي) (٢٠٥٢)، ژ زارێ ئەبى ئوسەيد ئەلئەنسارى، و ئبن ماجە دەرئێخستيە ژ ئبن عومەرى (٣٣١٩).

٢- زاد المعاد (٣١٧/٤)، والطب النبوي ص٢٤٤.

و هەمی جۆرێن وی پیستی نەرم دکەن، و پیراتییێ گیرۆ دکەن، و ئاڤا سویر یا زەیتوونان ناهێلیت پەڤیشك ل جهێ سۆتنێ پەیدا ببن، و پێتییێ موکوم دکەت، و بەلگێن وی بۆ سۆرکان و حەساسییێ و پرسکێن پیس د باشن، و ناهێلیت خوهدان پەیدا ببیت، و مفایێن وی گەلەك پترن ژ ئەڤێن مە گۆتین.

# قوندك ( كولند )

خودێ دبێژیت: (وَأَنْبَتْنَا عَلَيْهِ شَجَرَةً مِنْ يَقْطِينٍ) [الصافات:١٤٦]، ئانكو (مە كوندكەك (كولند زەرەك) ل سەر شینكر (دا سیبەرێ لێ بكەت، و دەمەكی د بنڤە بمینیت، هەتا ب سەر خوٚڤە دئێت). ئانكو ل سەر یونس پێغەمبەر ﷺ.

زار ئەنەسێ كورێ مالك دبێژیت: ((إنَّ خَيَّاطاً دَعَا رَسولَ اللهِ (صلى الله عليه وسلم) لِطعامٍ صَنَعَهُ، قَالَ أنسٌ: فَذَهَبْتُ مَعَ رَسولِ اللهِ (صلى الله عليه وسلم) إلى ذلِكَ الطعامِ فَقَرَّبَ الى رسولِ اللهِ (صلى الله عليه وسلم) خُبْزاً مِنْ شَعيرٍ، وَمَرَقاً فيهِ دُباءٌ وَقَديدٌ، قَالَ أنسٌ: فَرَأيتُ رسولَ اللهِ (صلى الله عليه وسلم) يَتَتَبَّعُ الدُباءَ مِنْ حَوْلِ الصَفْحَةِ، فَلَمْ أزَلْ أحِبُّ الدُباءَ مِنْ يَوْمِئِذٍ))[1]، ئانكو: خودان دروارەكی (خیاط) پێغەمبەرێ خودێ ﷺ گازیكرە خوارنەكێ، ئەنەس دبێژیت: ئەز ژی د گەل پێغەمبەرێ خودێ ﷺ چوٚمە وێ مێهڤانداریێ، نانێ جەهی و ئاڤك بوو كولند و گوٚشتێ هشككری تێدا بوو پێشكێشی پێغەمبەرێ خودێ ﷺ كرن، ئەنەسی گوٚت: من پێغەمبەرێ خودێ ﷺ دیت یێ قەستا كولندی دكەت ل دوٚر سفرێ، و ژ هینگێ وەرە ئەز حەژ كولندی دكەم.

و ئەنەس دیسا دبێژیت: ((رأيْتُ النَبيَّ صلى الله عليه وسلم أُتِيَ بِمَرَقَةٍ فيها دُبَّاءٌ وَقَديدٌ، فَرَأيْتُهُ يَتَتَبَّعُ الدُبَّاءَ يَأكُلُهَا))[2]، ئانكو: من پێغەمبەر ﷺ دیت ئاڤك بوٚ ئینا كولند و گوٚشتێ هشككری تێبی، من دیت یێ قەستا كولندی دكەت و دخوٚت.

---

١ـ بوخاری (٥١٢٣)، موسلم (٢٠٤١)، و ئەبو داوود (٣٧٨٢)، و هندەكێن دی.

٢ـ بوخاری (٥١٢١)، و موسلم (٢٠٤١)، و هندەكێن دی.

و زار (أبي طالوت) دبێژیت: ((دَخَلتُ علی أنَسِ بنِ مالِكٍ وَهوَ يَأكُلُ القَرَع، وَهوَ يَقولُ: يا لكِ شَجَرَةً، ما أحَبَّكِ إليَّ لِحُبِّ رَسولِ اللهِ (صلى الله عليه وسلم) إيَّاكِ))[1]، ئانكو: ئەز چۆمە دەڤ ئەنسێ کورێ مالکی من دیت یێ کولندی دخۆت، و یێ دبێژیت: تو بنەکی گیایی، ژ بەر ڤیانا پێغەمبەرێ خودێ ﷺ بۆ تە من تو خۆش دڤێی.

(ابن کثیر) د تەفسیرا خۆدا بۆ ڤێ ئایەتێ دبێژیت: ﴿وَأَنْبَتْنَا عَلَيْهِ شَجَرَةً مِنْ يَقْطِينٍ﴾ [الصافات:١٤٦]: ((هندەکان مفایێن د ڤوندکیدا (کولند) دیارکرینە، ژ وان زوی شین دبیت، و بەلگێن وی سیبەرێ دکەن ژ بەر مەزنییا وان، و نەرماتییا وی، و مێش نێزیك نابن، و بەرێ وی (ڤوندك) خوارنەکا خۆش و باشە، و ب ساناهی دهێتە خوارن، و یێ لێنایی ب بەرك و تیڤلێ ویڤە، و یا هاتییە سەلماندن کو پێغەمبەرێ خودێ ﷺ حەژ ڤوندکی دکر، و ل دویڤ ئێك ڤوندك دخوار ژ رەخێن ئامانی))[2].

و (ابن القيم) دبێژیت: ((اليقطينُ باردٌ رطبٌ، يغذو غذاء يسيراً، وهو سريع الانحدار، وإن لم يفسُدْ قبلَ الهضم تولّد منه خلط محمودٌ... وهو لطيفٌ مائيٌّ، يغذو غذاءً رطباً بلغمياً، وينفعُ المحرورين، ولا يلائم المبرودين، وماؤهُ يقطعُ العطشَ، ويُذهِبُ الصداع الحارَّ إذا شُرِبَ، أو غُسِلَ به الرأسُ، وهو مليّن للبطنِ... وبالجملةِ فهو مِن ألطفِ الأغذيةِ، وأسرعِها انفعالاً))[3]، ئانکو: کولند یێ سار و ب شهە، خوارنەکا ب ساناهییە، و ئەو زوی دئێتە خوارێ، و ئەگەر بەری هەرسکرنێ پویچ نەکەت تێکەلەکی باش ژێ چێدبیت... ئەو ئاڤییەکێ نەرمە، خوارنەکا ب شه یا بلغەمییە، ب کێر وان دئێت یێن تایا گەرم لێ، و ب کێر وان نائێت یێن تایا سار لێ، ئاڤا وی تێهنکێ دشکێنیت، و سەرئێشانا کەل ناهێلیت ئەگەر هاتە ڤەخوارن، یان سەر پێ هاتە شویشتن، و ئەو زکی نەرم دکەت... و ب کورتی ئەو نەرمترین خوارنە، و ب لەزترین کاریگەرە.

---

١. (الترمذي) (١٨٤٩).

٢. تەفسیرا (ابن کثیر) (٤/٢٢-٢٣).

٣. زاد المعاد (٤/٤٠٤-٤٠٥) د گەل دەستکارییەکا کێم و سڤك.

قوندك یێ زەنگینە ب شەکران ـ ئەڤە ئاخفتنا نوژدارێن نوییە ـ و ڤیتامینێن (A ـ B) و ئاسن و (کلس)، و توخمێن کاریگەر یێن تێدا وەکی (القَرعین) و ترشێن ئەمینی وەکی (لۆسین)، و نەیێ هشککەرە، و یێ هەرسکرییە، و تەناکەر و تەرە، و یێ باشە بۆ هاتنا میزێ، و شلەیێن ژ دورستبوونا کیسێن ئاڤێ د خلۆلاهییا زکیدا و کیسێن ئاڤێ ل سەر هەردو سیهان دەردئێخیت، و پاقژکەرە بۆ سینگی، و بۆرییێن هەناسێ، و بۆرییێن میزێ، و مفا ژێ دهێتە وەرگرتن د چارەسەرکرنا کولبوونا بۆرییێن میزێ، و بۆ باوەسیران و قەڤزبوونێ، و نەهاتنا میزێ، دیسا یا ب مفایە د چارەسەرییا لاوازییێ، و هەرسکرنا ب زەحمەت، و کولبوونا رویڤیکان، و بۆ وان یێن نەخۆشییێن دلی هەی، و بۆ خەو نەهاتنێ، و نەخۆشێن شەکرێ، و یا ب مفایە بۆ ئێشانێن کماخێ.

یاسایا زێرین دبێژیت: ((باشترین دەرمان ئەوە خوارن بیت، و باشترین خوارن ئەوە دەرمان بیت)).

(إبن القیم) د (زاد المعاد)دا دبێژیت: ((یقطین: (وهو الدُباءُ والقرع) ئانکو: قوندك، و ئەگەر ناڤێ (یقطین) تەڤاییتر بیت، ئەڤە د زمانیدا هەر دارەکا (شجرة) ل سەر قورمی نەرابیت، وەکی گوندۆری و خیاری، خودێ دبێژیت: ﴿وَأَنْبَتْنَا عَلَيْهِ شَجَرَةً مِنْ يَقْطِينٍ﴾ [الصافات:١٤٦]، و ئەگەر گۆتبا: ل سەر قورمی نەرابوویيە دێ بیتە گل و گیا (یێ بێ بن) نە دار، و دارێ: قورم یێ هەی، زمانناس دبێژن: پا چاوا گۆتییە: ﴿شَجَرَةً مِنْ يَقْطِينٍ﴾؟ بەرسڤ ئەوە (الشجرَ) وی دەمی دبێژنێ کو قورم هەبیت ل سەر رابیت، و ئەگەر گرێدا ـ وەکی د گۆتنا خودێدا ﴿شَجَرَةً مِنْ يَقْطِينٍ﴾ ـ ب تشتەکیڤە ب ویڤە دهێتە گرێدان، و جودایی د ناڤبەرا رەهایی و گرێدایی د ناڤاندا بابەتەکێ گرنگە، مفایێ وێ یێ مەزنە د تێگەهشتنێدا، و د پلەیێن (مراتب) زمانیدا))[1].

---

١ـ زاد المعاد (٤٠٢/٤).

# شێلم خوارنە و دەرمان

تشتێ سەرنجا من راکێشای ئەو بوو کو ئەڤ خوارنا ئەم دخۆین دەرمانەکێ نێزیکترە بۆ مە بەری کو ببیتە خوارن، ژ بەر کو خودێ کەرستێن کاریگەر یێن کرینە تێدا کو چارەسەرییا گەلەک نەخۆشییان دکەن، و ئەڤ شێلمە دهێتە هژمارتن، ژ باشترین چێکرن و سەخبێرکرنا خوینێ، ژ بەر کو خوێ یێن کانزایی یێن تێدا، و ئێک ژ وان رووەکانە کو رێژەکا زۆر یا کالسیۆمی تێدا هەیە ژ بۆ چێکرنا هەستییان و ددانان، و ئەڤ شێلمە مرۆڤی ژ گەلەک نەخۆشییان دپارێزیت ئەو ژی ب هەبوونا چەندییەکا مەزن ژ مەگنیزیۆمی تێدا، و مرۆڤی دپارێزیت وەکی هندەك نوژدار دبێژن ژ وەرەمێن پەنجەشێرێ، ئەڤە ژی ژ بەر هەبوونا کەرستێ مەگنیزیۆم، و ب هەبوونا ئازۆتەی، دبیتە پاقژکەر بۆ خوینێ، و ئەندامەتییێ موکم دکەت، و ئەو پۆتاسیۆمێ د شێلمێدا وەل شێلمێ دکەت کو ژ باشترین زەرزەواتان بیت ژ بۆ نەهێلانا ئەندامەتییێ، و کەڤتنە سەرئێکا بەزی، ئانکو حەلکەرە بۆ بەزی د ناڤ خوینێدا، و زرنیخ یا تێدا، و زرنیخ پشکدارییێ د چێکرنا تەپکێن خوینێ یێن سۆر و سپیدا دکەت، و یا زەنگینە ب ترشێ فوسفۆری، و ترشێ فوسفۆری خوارنێ ددەتە خانا دەمارگیری، ئەوێ کارەکێ هزری هەبیت، دێ شێلم خوارنێ دەتە مێشك و دەمارێن وی، و بەلگێن شێلمێ گەلەك ئاسن و سفر یێ تێدا، و ئەڤە ب مفانە د زەنگینکرنا خوینێدا، و یا زەنگینە ب یودێ، و ئەڤە مفایی دگەهینیتە رژێنا پەریزادێ، و یا زەنگینە ب ڤیتامینێن (A، B، C) و ئاڤا شێلمێ بۆ پرتپرتکرنا بەرکێن گولچیسکێ، و ئاڤا کەلاندییا شێلمێ پاقژکەرە بۆ بۆرییێن هەناسێ، و گەریێ پاقژ دکەت، و پیستی دپارێزیت ژ کولك و پرسکان، و دیسا شێلمێ ب

کار دئینن وەك لسقە بۆ پیستی، (سبحان الله)! ئەرێ ئەڤە خوارنە، یان دەرمانە؟! هۆسا خودێ هندەك دەرمان یێن کرینە د ڤان زەرزەواتاندا، لەوا نوژدار دبێژن: بەرێ خۆ ژ دەرمانی وەرگێرە بەر ب خوارنێڤە، ئانکو بلا پاراستن و چارەسەرییا تە د خوارنێدا بیت نە د دەرمانیدا بیت، و جۆراتییێ د خوارنێدا بکە، و ئەگەر تە ژ هەمی زەرزەواتی خوارن، ئەڤە هەمی دەرمان مرۆڤی کۆمکرن، و تو هەست پێ ناکەی.

# تڤر

ئەم رووەكێ تڤرێ د بازاراندا دبینین، چێدبیت ئەم بكرین، یان نەكرین، و هندەك مرۆڤ ڤی رووەكی ب كێماتی ددانن و دبێژن: ئەرزانترە ژ تڤرێ، ژ بەر بێ بهاییا ڤی رووەكی ل دەڤ وان.

زانا دبێژن: ڤی رووەكی كەرستێن ئازۆتی یێن تێدا، و چەندییەكا ژ كەرستێن نشایێ، و كانزایی، و رێژەكا باش یا ڤیتامین (C) یا تێدا هەی، و دیسا كالسیۆم و ئاسن، و ژ بەر كو ئەڤ ڤیتامینە یێن تێدا، ئەڤ رووەكە هەستییان ب هێز دئێخیت، رێ خۆشكەرە بۆ میزێ، و ئاڤا وی یا ب مفایە بۆ پویچكرنا بەركێن گولچیسكان، و بۆ پویچكرنا بەركێن زراڤی، و رەملا میزێ حەل دكەت، و دەرمانەكە بۆ نەخۆشییا مێلاكێ، و هاریكارە بۆ هەرسكرنێ، و دهێتە ب كارئینان د هندەك دەولەتێن پێشكەڤتیدا ـ ب پیڤەرێ سەردەمی ـ وەك چارەسەری بۆ نەهێلانا قورباجێ.

خودایێ من هەر تویی یێ ژ هەمی كێماسییان پاك و پاقژ! ئەڤ هەمی كەرستە و كانزا، و ئەڤ ڤیتامینە د ڤی رووەكیدا كو خەلك گرنگییێ پێ نادەت! خودێ هەمی تشت یێن ئافراندین و داهێنان یا تێدا كری، و ب باشترین شێوە یێن دورستكرین، و ئەڤ رووەكە یێ كرییە تشتەكێ هەڤسەنگ، خودێ دبێژیت: ﴿وَأَنْبَتْنَا فِيهَا مِنْ كُلِّ شَيْءٍ مَوْزُونٍ﴾ [الحجر:١٩]، ئانكو: مە هەمی تشت ب پیڤان و كێشان (ل دویف یا پێدڤی) تێدا یێت شینكرین.

ڤی رووەکی (٨٥٪) ئاڤ یا تێدا، و کەرستێن ئازۆتی، چەندەها کەرستێن گانزایی، ڤیتامین (A) و (C)، و کالسیۆم، و ئاسن، و ترشێن دەستنیشانکری، ئەڤە هەمی ژ بەر هندێ دا مرۆڤ پێ پاراستی بیت ژ هندەك نەخۆشییان، و دا هاریکارییا وی بکەن بۆ سەخبێرکرنا هندەك ئەندامان، و خودێ وەسا ئەڤ رووەکە پێ چێکری کو ببیتە نیشانەکا بەلگە ل سەر مەزناهییا وی، خودێ دبێژیت: (فَلْيَنْظُرِ الْإِنْسَانُ إِلَى طَعَامِهِ (٢٤) أَنَّا صَبَبْنَا الْمَاءَ صَبًّا (٢٥) ثُمَّ شَقَقْنَا الْأَرْضَ شَقًّا (٢٦) فَأَنْبَتْنَا فِيهَا حَبًّا (٢٧) وَعِنَبًا وَقَضْبًا (٢٨) وَزَيْتُونًا وَنَخْلًا (٢٩) وَحَدَائِقَ غُلْبًا (٣٠) وَفَاكِهَةً وَأَبًّا (٣١) مَتَاعًا لَكُمْ وَلِأَنْعَامِكُمْ (٣٢)) [عبس].

# کەلەمی

د ڤەکۆلینەکا سەیر و کێم وێنەدا ل سەر کەلەمی، ئەڤ رووەکێ خەلك ل زڤستانێ دخۆن سەلماند کو کەلەمی بلندترین پلە ژ ڤیتامین (C) یا تێدا د ناڤ هەمی زەرزەواتاندا، هەتا رێژا ڤان ڤیتامینان د کەلەمیدا پترە ژ یا د لەیمونێدا ژی، و ئەڤ رووەکە ل زڤستانێ چێ دبیت، و نەخۆشییێن سەرمایێ د بەرنیاسن، ئەڤە چ رێککەفتنەکا حێبەتییە د ناڤبەرا کو ئەڤ رووەکە ل زڤستانێ شین دبیت، و د ناڤبەرا بلندترین رێژا ڤیتامین (C)دا کو یا د کەلەمیدا هەی بەرگرییا نەخۆشییێن سەرمایێ دکەت، و د لەیمون و ڤێقییێن دی یێن ترشدا، و کەلەمی ب پلا بلند دهێت ب رێژا ڤی ڤیتامینی (C).

تشتەکێ دی، کەلەمی هندەك ڤیتامینێن دی ژی یێن تێدا، وەکی ڤیتامین (B، K)، و کانزا وەکی کلس، و گۆگردی، و فوسفۆری.

زانا دبێژن: ((ئەڤ رووەکە وەستیانێ دبەت، و بەرگرییا پەرسیڤی دکەت، و چارەسەرییا لیرێن پیستی دکەت، و پرچێ و نەینوکان ب هێز دئێخیت، و هەستی گەشە دکەت، و ئەڤە چارەسەرییێن وێ یێن پاراستنێنە)).

و چارەسەرییێن وێ یێن نەخۆشییان، کەلەمی بەرگرییا مارکێن زکی دکەت، و کولبوونا بۆرییان، و یا ب مفایە بۆ زارۆك و سنێلان، چونکی رێژەکا بلند یا (کلس)ی یا تێدا کو هاریکارییا گەشەبوونا هەستییێن وان دکەت، و چارەسەرییە بۆ کێماسییێن گولچیسکان، چونکی پۆتاس یا تێدا کو ئاڤا زێدە ژ شانان دەردئێخیت، و چارەسەرییەکا کاریگەرە بۆ

نەخۆشییێن گولچیسکان، و چارەسەرییێن نەخۆشییێن دلی یێن تێدا، و کەرستەکێ تێدا وەکی ئەنسۆلینێیە، ل ڤێرە: چارەسەرییا نەخۆشییا شەکرێ یا تێدا، و چارەسەرییە بۆ ژەهراوییا دەرمانی، و چارەسەرییا نەخۆشییا کولبوونا مەعیدەی، و یا مشەیە د بازاراندا.

هەروەکی ئەڤ خوارنە یا ئەم هزر دکەین خوارنە، پتر دەرمانە کو خوارن بیت، هەروەکی ئەڤ رووەکێن خودێ ئافراندین، ژ بۆ نوژدارییەکا پاراستنێ یێن ئافراندین.

پێدڤییە ئەم ب دورستی بزانین، ئەوێ مرۆڤ ئافراندی هەر ئەوە یێ رووەك ژی ئافراندی، ئەڤە چ رێککەفتنا حێبەتییە؟ ئەو چ پەیوەندییا گرێدایە د ناڤبەرا بنیاتێ ئافراندنا مرۆڤی، و د ناڤبەرا رێژێن ڤان کەرستان د ڤی رووەکیدا؟ ئەو چێکرنا خودێیە، خودێ دبێژیت: (فَلْيَنْظُرِ الْإِنْسَانُ إِلَى طَعَامِهِ (٢٤) أَنَّا صَبَبْنَا الْمَاءَ صَبًّا (٢٥) ثُمَّ شَقَقْنَا الْأَرْضَ شَقًّا (٢٦) فَأَنْبَتْنَا فِيهَا حَبًّا (٢٧) وَعِنَبًا وَقَضْبًا (٢٨) وَزَيْتُونًا وَنَخْلًا (٢٩) وَحَدَائِقَ غُلْبًا (٣٠) وَفَاكِهَةً وَأَبًّا (٣١) مَتَاعًا لَكُمْ وَلِأَنْعَامِكُمْ (٣٢)) [عبس].

پێغەمبەر ﷺ دبێژیت:

((أَمَرَنِي رَبِّي بِتِسْعٍ؛ خَشْيَةِ اللهِ فِي السِّرِّ وَالْعَلَانِيَةِ، وَالْعَدْلِ فِي الْغَضَبِ وَ الرِّضَا، وَالْقَصْدِ فِي الْفَقْرِ وَالْغِنَى، وَأَنْ أَصِلَ مَنْ قَطَعَنِي، وَأَعْفُوَ عَمَّنْ ظَلَمَنِي، وَأُعْطِيَ مَنْ حَرَمَنِي، وَأَنْ يَكُونَ صَمْتِي فِكْراً، وَنُطْقِي ذِكْراً، وَنَظَرِي عِبْرَةً))[1]، ئانکو: خودێ فەرمان ب نەهان یا ل من کری: ترسا خودێ د نهێنی و ئاشکەراییێدا، پەیڤا راست و دورست د کەربڤەبوون و رازیبوونێدا، نەدەست بەردایی د فەقیری و زەنگینییێدا، و تێکەلییێ د گەل وی کەسی بکەم یێ تێکەلییا من بری، و ل وی ببۆرم یێ ستەم ل من کری، و دانێ د گەل وی

---

١- (القضاعي) د (مسند الشهاب)دا ١١٥٩ یا ڤەگێرایی، و (الذهبي) د (ميزان الإعتدال)دا (١٥١/٦) دبێژیت: ((ئەڤە فەرموودەکا ب زەحمەتە))، و (قرطبي) د تەفسیرا خۆدا بەحس کرییە (٣٤٦/٧).

کەسی بکەم یێ ئەز بێ بەهرکریم، و بێدەنگیيا من هزرکرن بیت، و ئاخفتنا من زکر بیت، و دیتنا من سەربۆر بیت.

ئەگەر تە خواند، و تە بەرێ خۆ دایێ، و هزر کر ژ بیر نەکە بۆ خۆ شیرەتان ژێ بینەدەر و وەربگرە، چونکی خودێ نیشانێن کرینە د عەردیدا بۆ ئەوێن حەقییێ پەسەند دکەن و پشتەڤانییا وێ دکەن. و د مرۆڤی ب خۆدا ژی نیشانێن هەین، و د عەرد و عەسماناندا نیشانێن کرینە تێدا کو ناهێنە هەژمارتن.

# چایا کەسك و پەیوەندییا وێ ب وەرەمێن پیسڤە

پسیار ژ هزرمەندەکی هاتە کرن: ئەم چ ژ رۆژئاڤا وەردگرین و چ بۆ دهێلین؟ گۆت: ئەوا د سەرێ واندا ئەم وەردگرین و ئەوا د ناڤ خۆیا واندا ئەم بۆ دهێلین، هەستێن مە مولکێن مەنە، و هەستێن وان یێن وانن، و رەوشتێن وان یێن وانن و یێن مە ژی یێن مەنە، بەلێ ئەڤ هەمی زانستە تشتەکی هەڤپشکە د ناڤبەرا هەمی مللەت و گەلاندا، و دیسا وی گۆت: رەوشەنبیرییا هەر مللەتەکی مولکێ هەمی مرۆڤایەتیییێیە، وەکی نموونا هنگڤینییە کو ژ گولێن جودا جودا یێن گەلان وەرگرتییە د گەل بۆرینا نفشان (أجیال)، ل ڤێرە ئەڤ هنگڤینە مولکێ هەمی مرۆڤایەتیییێیە، و ئەرێ یا بەرئاقلە ئەگەر کۆمەکا مێشێن هنگڤینی ب مە ڤەدا ئەم هنگڤینێ وان بهێلین و نەخۆین؟

رێژێن وەرەمێن پیس (نەخۆشییێن گران) بەردەوام د زێدەبوونێدایە، و ب مەترسینە، و ئەگەرێ وێ وەکی دهێتە زانین، د سەردەمێ نویدا دیاردا گوهۆرینا ئافراندییێن خودێ یا هەی، گوهۆرینا ئافراندییێن خودێ یا ل دۆر بلندبوونا رێژێن وەرەمێن پیس د پرانییا وەلاتێن جودا جودادا، و هوین هەمی دزانن کو د لەشێ مرۆڤیدا کۆئەندامەکێ گەلەکێ گرنگ و مەترسیدار یێ هەی ئەو ژی کۆئەندامێ بەرگرییا لەشییا وەرگرتییە، و ئەڤ کۆئەندامە پێکهاتییە ژ لەشکەرەکێ ب هەمی رامانانڤە، کو تیمەکا سەحکرنێ یا تێدا، و تیمەکا چێکرنا چەکی، و تیمەکا شەرکەران، و تیمەکا ئەندازەیی، و ئێکا کۆماندۆز، ئەڤ تیمە دشێت ڤارێبوونا خانێ د دەمەکێ زویدا ئاشکرا بکەت و داعویریت، بەلکو نویترین زانستێن نوی یێن کو ڤەکۆلینێ د زانستێ ئەندازەییا بۆ ماوەزانییێدا دکەن، کو د مرۆڤیدا جینەکا هەی یا وەرەما پیس، بنبرکەرەك (قامع) یێ هەی ئەڤە

وەناكەت ئەڤ جینا وەرەمێ یا چالاك بیت، چ تشت ڤی بنبڕكەری ژێك ڤەدكەت؟ دبێژن: گەردا پلاستیكی، ئەگەر ئەم پلاستیكی ب كار بینین ب شێوەكێ زۆر د گەل كەرستێن گەرم، و كەرستێن ترش، و ئەگەر ئەم ب كار بینین ب شێوەكێ میكانیكی ئانكو ب كێرێ ئەم كەرستەكێ خوارنێ د ئامانەكێ پلاستیكیدا كەركەین، چێدبیت هندەك گەردیلێن پلاستیكی بچنە د ناڤ لەشێن مەدا، و ئەڤ گەردیلە دشێت وی بنبڕكەری ژێكڤە بكەت ئەوێ نەهێلیت جینا وەرەما پیس كارێ خۆ بكەت.

تشتەكێ دی، گەردیلا پەترۆلێ، ئەگەر ئەم ب رێكا هەناسێ هەلكێشین، یان بخۆین ب خەلەتیڤە یان بێی خەلەتی، ئەڤە ژی دیسا دێ ڤی بنبڕكەری ژێكڤەكەت ئەڤێ كو نەهێلیت ئەڤ جینە ب وی كارێ پێ رادبوو بكەت.

و كەرستێن تیشكدار رۆلەكێ مەزن یێ هەی د دورستبوونا ڤان وەرەماندا، پاشی دژواری و توندییا دەروونی كو گەلەك مرۆڤ ئەوێن دویری خودێ تووش دبنێ و ئەوێن دكەڤنە هەڤپشكییا ڤەشارتی، ئەو وێ پەستانێ دهەلگرن ئەوا نەشێن ب هەلگرتنا وێ رابن، و ئەڤ توندییا دەروونی ئێكە ژ ئەگەرێن ڤان وەرەمان، و خودێ د ئایەتەكا پیرۆزدا دبێژیت: (فَلَا تَدْعُ مَعَ اللَّهِ إِلَهًا آخَرَ فَتَكُونَ مِنَ الْمُعَذَّبِينَ) [الشعراء:٢١٣]، ئانكو: چو پەرستییان د گەل خودێ نەپەرێسە (و بۆ نەكە هەڤپشك)، ئەگەر دێ بییە ژ وان یێت ب بەر ئیزایێ دكەڤن (ئانكو هەی موحەممەد، تو ژ خۆشتڤیترین بەندەیێت منی، بەلێ د گەل هندێ ژی، ئەگەر تو پەرستییەكێ دی ژ بلی من بپەرێسی، دێ تە ئیزادەم.

كۆئەندامێ بەرگرییا لەشی یا وەرگر، زانا بۆ ڤی كۆئەندامی دبێژن: ((ئەڤ كۆئەندامە دەرڤەی لەشی ب دەستێ خودێیە، و ڤیان و ئارامی و دلۆڤانی ڤی كۆئەندامی ب هێز دئێخن، و ترس و دودلی و نەڤیان ڤی كۆئەندامی لاواز دكەن))، و پێغەمبەرێ خودێ ﷺ گۆت: رەشرەشك مرۆڤی ژ هەمی دەردان چارە دكەت، و كۆنگرەك ل قاهیرە هاتە

گرێدان ژ بەر ڤەکۆلینا د ڤێ رەشرەشکێدا، کو ئەڤە کۆئەندامێ بەرگرییا لەشی ب هێز دئێخیت، و کۆئەندامێ بەرگرییا لەشی بەرپرسە ژ نەخۆشییێن پیس و میکرۆبی.

ئەڤە رێخۆشکەرەکە بۆ بابەتەکێ هویربین، کی ژ مە باوەر دکەت کو د جیهانێدا پێنج ملیۆن تەنێن چایێ دهێنە مەزاختن، و پێنج ئێکا ڤێ چەندێ چایا کەسکە، و ب تاقیکرنێن زانستی یا هاتییە سەلماندن کو چایا کەسک کارلێکرنەکا هەی دژی پەنجەشێرێ، دیسا رێگرییێ دکەت بۆ کەرستێن کیمیایی یێن دبنە ئەگەرێ پەنجەشێرێ، ئەڤ کەرستێ چالاک باراپتر وەرەمێن پیس یێن رویڤیکان دپارێزیت.

و ڤەخوارنا چایا کەسک د گەل خوارنێ ل یابان داب و نەریتەکێ بەربەلاڤە د ناڤ خەلکیدا، ژ بەر ڤێ چەندێ کێمترین رێژا تووشبوونا ڤێ نەخۆشییێ یا ل یابان، ئەڤ راستییە من د رۆژنامەکا گەلەکا رەسەندا خواندبوو، من دڤییا ئەز دانمە بەردەستێن هەوە.

د سەر هەمییێرا، ساخلەمییا مرۆڤی نە ب تنێ مولکێ مرۆڤییە بەلکو مولکێ خێزانا وی و مولکێ موسلمانایە، و ئەو ساخلەمی سەرمایەدارێ وییە، و ئەجەل نە پێش و نە پاش دکەڤیت، بەلێ مرۆڤ چێدبیت نەخۆش ببیت، و چێدبیت ب ساخلەمی بژیت، ئەڤە یا گرێدایە ب ویڤە کا چەند ل دویڤ سوننەتا پێغەمبەری ﷺ دچیت، و ئێکتاپەرستی سەرێ پاراستنا ڤان نەخۆشیانە، چونکی تە ژ توندییا دەروونی دویر دئێخیت کو ئەڤ چەندە یا ل دۆر بارا پترێ نەخۆشییان.

پێدڤییە ئەم ڤان راستییان وەرگرین، و ئەم چاڤدێرییا ساخلەمییا خۆ بکەین؛ چونکی ئەو سەرمایەدارێ مەیە، و ئامانێ کارێن مەیە، و رێکا مەیە بۆ ب دەستڤەئینانا رازیبوونا خودێ.

# ڤێقییێن ترش و پەیوەندییا وان ب وەرزێ زڤستانێڤە

د ڤان ڤێقییێن کو خودێ بۆ مە ئافراندین حیکمەتێن مەزن یێن تێدا هەین ناهێنە زانین ب تنێ ژ لایێ وان زانایان نەبیت یێن دویڤچۆنێ د نهێنییێن واندا دکەن، و بۆچی ئەڤ ڤێقییە یێن زڤستانینە؟

ئەڤە ڤەکۆلینەکا زانستی یا هویربینە ل سەر مفایێن هندەك ڤێقییێن ترش دئاخڤیت، و چاوا د وەرزێ زڤستانێدا دگەهن و نە د وەرزێن دیدا؟ هندەك زانا دبێژن: ژ بەر کو د پرتەقالێدا پێکهاتێن خوارنێ یێن تێدا هەین، و ڤیتامینێن پاراستنکەر، و ژ دیارترین ڤان ڤیتامینان ڤیتامین (C)یە، ئەڤ ڤیتامینە بەرهنگارییا لەشی دکەت ژ لاوازبوونێ، و بەرگرییا خوین هاتنا پیستی دکەت، و بەرگرییا حەلبوونا کەرستێ کلسێ دکەت د هەستییاندا، و بەرگرییا تێکچۆنا هەرسکرنا خوارنێ، و بەرهنگارییا ژ دەستدانا دلچۆنا خوارنێ، و بەرهنگارییا کولبوونان دکەت، و د شیانێن ئێك پرتەقالدا هەیە ڤان هەمی پێدڤییێن مرۆڤی د ئێك رۆژ ژ ڤیتامینان دابین بکەت، و کێمییا ڤی ڤیتامینی د شیرێ دایکێدا، یان د شیردانا شیرێ چێکریدا ڤێ چەندێ دشێن ڤەرەبوو بکەن ب ئاڤا پرتەقالێ، و ئەگەر شیرێ چێکری ئەوێ کو ددەنە زارۆکێن ژ نوی پەیدابوویی کێم ئاسن بن، و ژ ڤیتامین (C)، دێ ئاڤا پرتەقالێ بۆ زارۆکی ڤەرەبوویا هەمی وان تشتێن شیرێ چێکری ژ دەست دایی کەت، و دیسا ڤەرەبوویا کێمییا ئاسنی د خوارنێدا ژی دێ کەت.

ئەڤ ڤیتامینە گەلەك بەرگرییا لەشی ژ کەرستێن ژەهراوی دکەت، و د پلە ئێكدا لەیموونێ ئەڤ تایبەتمەندییە یێن تێدا، ئەگەر ئەم دەه گرامێن ئاڤا لەیموونێ بکەینە د لیترەکا ئاڤێدا، دێ هەمی میکرۆبان کوژیت، و ئەگەر مە بڤێت ئاڤێ بۆ ڤەخوارنێ پاقژ

بکەین، ل جهەکی ئاڤا وی یا پیس، دێ هندەك چپکێن ئاڤا لەیموونێ کەینە د ناڤدا، ئەڤ ئاڤا لەیموونێ تێرا هندێ هەیە میکرۆبێ کۆلێرایێ ژ ناڤ ببەت، و تایا تیفوییێ، و ئەڤ فێقییێ خودێ چێکری بەرگرییا رۆماتیزمێ دکەت، و بەرهنگارییا نەخۆشییێن مەعیدەی دکەت، و دلی ب هێز دئێخیت، و ئەو ژەهرا ب خەلەتیڤە مرۆڤی ب رێکا خوارنێ خواری ژ ناڤ دبەت، ئەڤ لەیموونە دیار دبیت دەرمانە بەری ببیتە خوارن، ب هەمی رامانێن خۆڤە.

ئەڤە نیشانێن خودێنە د چێکرییێن ویدا، ئەڤ فێقییێ کو ئەم هزر دکەین فێقییە، بەلێ د راستیدا کۆگەهەکا دەرمانایە، ئەو پاراستن و هێزکرن و چالاکییێ ددەت، و ئەگەر مرۆڤی هزر د خوارنا خۆدا کر دێ دلێ وی ب ترس کەڤیت، و رۆندك ژ چاڤێن وی دێ هێن، و دێ بۆ خودێ چیتە سوجدێ.

# مۆز

خودێ بەحسێ فێقییێ خەلکێ بەحەشتێ دکەت و دبێژیت: (وَطَلْحٍ مَنْضُودٍ) [الواقعة:٢٩]، ئانکو: یێت د ناڤ دارمۆزێت، مۆزێت وان ل سەرێك.

تشتێ جهێ حێبەتییێ ئەوە، د ڤی فێقیدا، هەر سەد گرامێن وی وەکی سەد گرامێن گۆشتی ژ گەرمۆکان ددەن، ژ وان کەرستانە کو وزێ ددەن، و د ڤی فێقیدا، کالسیۆم، و فوسفۆر، و ئاسن، و پوتاسیۆم، و سفر، فلور یێن تێدا هەین، ئەڤە هەمی کانزاییێن گەلەك سەرەکینە یێن کو مرۆڤی پێدڤی پێ هەی، ئانکو سێ مۆز تێرا مرۆڤی ڤان کانزایان ددەت د رۆژێدا، ڤی فێقی هەشت ڤیتامینێن سەرەکی یێن تێدا کو کارتێکرنەکا مەزن یا هەی ل سەر کارێن کۆئەندامێن مرۆڤی، پاشی ئەڤ فێقییە ب شیری تمام دبیت کو خودێ کریە فەنجی ل سەر مە، و نانێ بۆ مە کرییە قویت.

و ئەو مرۆڤێ ڤی فێقی دخۆت، پێدڤییە باش بزانیت کو خودێ تایبەت بۆ مرۆڤی یێ چێکری. و مرۆڤێ باوەردار وەسا دبینیت کو خودێ هەمی تشت د عەردیدا بۆ وی یێن بەردەستکرین، بەردەستکرنەکا رێزگرتنێ، و نیاسینێ، ئەڤ پەیوەندییە د ناڤبەرا پێدڤییێن لەشێ مرۆڤی ـ نەخاسمە لەشێ زارۆکان ـ و د ناڤبەرا پێکهاتێن ڤی فێقیدا پەیوەندییەکا گەلەکا هویربینە، کالسیۆم، د گەل فوسفۆری، و د گەل ئاسنی، و پوتاسیۆمی، و سفری، و فلۆری، بەرگرییا رزینا ددانان دکەت، و زێدەباری کۆمەکا ڤیتامینان (B1، B2، B6، B12، و ڤیتامین D، و O) هەشت ژ جۆرێن ڤیتامینان د ڤی فێقیدا یێن هەین، و کەرستێن شەکرێ یێن تێدا، و هندەك کەرستێن دوهنی، و هندەك کەرستێن پرۆتینی، و ئاڤ، و ئەڤە ژ فەنجییێن خودێنە کو ب وان مننەت یا ل مە کری!.

# مەعدەنۆس[1] و مفایێن وێ یێن ساخلەمییێ

چەند نیاسینا تە بۆ نیشانێن خودێ زێدە دبیت دێ نیاسینا تە بۆ خودێ زێدە بیت، تشتەکە ناهێتە سەر هزرا مرۆڤی، ئەڤ مەعدەنۆسا ئەم هەمی رۆژان دخۆین، گەلەک توخمێن کێم وێنە یێن تێدا، و زەیتا فرێنەر یا تێدا، دو کەڤچکێن ڤی رووەکی ب نەرمی پرت پرت بکەن تێرا سێکا خوارنا رۆژانە هەیە ژ وان ڤیتامینێن دەستپێکێ (A)، و سێکا ڤیتامین (C)، و تێرا خوارنا رۆژانە ژ ئاسنی.

کەرستێن کێم وێنە د ڤێ مەعدەنۆسێدا: زرنیخ، بورون، سفر، و تیتانیۆم، ئەڤە کەرستێن کێم وێنەنە د مەعدەنۆسێدا، ژ بەر ڤێ چەندێ هندەک نوژدار دبێژن: هەمی تشتان ب ناڤنجی بخۆ، چونکی هەمی تشتان کەرستێن سەخبێرکەر یێن تێدا، و چارەسەرینە بۆ لەشی.

نوژدار شیرەتا وێ چەندێ دکەن کو بەری پێنج خۆلەکان ژ خوارنێ ڤی رووەکی داننە سەر سفرا خوارنێ؛ چونکی زەیتا فرینەر یا تێدا، و مفا یێ د ڤێ زەیتا فرینەردا.

ئەڤ رووەکە دەرمانەکێ رێخۆشکەرە بۆ میزێ، ب کار دئینن د کاودانێن ئاڤکەڤتنا بن پیستیدا، و ئەو ئاڤکەڤتنا ژ چێبوونا وێ دل ب خۆ بیت، و ب کار دئینن بۆ پرت پرتکرنا بەرکی، و چارەسەرییا نەخۆشییێن گولچیسکێ، و نەخۆشییێن میزلدانکێ، و نەخۆشییێن مێلاکێ، و زراڤ، و ئەڤ رووەکە هەناسێ رێک دئێخیت، و دلی چالاک دکەت، و هاریکارییا دەرکەڤتنا گازان دکەت د لەشیدا، و دیتنێ خۆش دکەت، و پتییا ددانی

---

١ـ خەلکێ رۆژهەلاتی (عەرەب) دبێژنێ بەقدونس، و خەلکێ رۆژئاڤا عەرەبی دبێژنێ مەعدەنۆس، ((و دیار دبیت کو بنیاتێ ڤێ پەیڤێ ـ مەعدەنۆس ـ بیزەنتییە، یا بەرنیاسە هەر د سەردەمێ گەلەک کەڤندا... دهاتە چاندن د ناڤ باخچێن ئیمبراتۆرییا رۆمانی، و تایبەت د یونانا کەڤندا ژ بەر مفایێن وێ یێن نوژداری...)). [موسوعة النباتات المفيدة (ص ١١١)].

دپارێزیت، و پێڤەدانێن پێشییان چارەسەر دکەت، و زرکێتکێ و مێشا هنگڤینی، و مشەخۆران دکوژیت، ئەڤ رووەکە یێ هەی و یێ مشەیە، و ئەو د راستیدا دەرمانە، ئەڤ رووەکە بێهنا نەخۆش یا لەشی دبەت، هەردو رژینێن ئەدرینالی ب هێز دئێخیت، و ئەڤ هەردو رژینە بەرپرسن ژ چارەسەرکرنا کاودانێن توند یێن تووشی مرۆڤی دبن، و رژینێن ئەدرینالی لێدانێن دلی بلند دکەت، و لۆلەیێن خوینێ یێن ل دۆر دلی تەنگ دکەت، و رێژا شەکرێ د خوینێدا زێدە دکەت، و لێدانێن هەردو سیهان زێدە دکەت.

ئەڤ رووەکە مفایی دگەهینیتە رژینا پەریزادێ، یا بەرپرسە ژ دەربرینا خۆراکی، و لۆلەیێن خوینێ ب هێز دئێخیت و ناهێلیت بپەڤن دەمێ پەستان بلند دبیت، و گەلەکا باشە بۆ نەخۆشییێن کۆئەندامێ میزێ یێ زێدەبوونێ، و دبیتە هاریکار بۆ پرت پرتکرنا بەرکی دەمێ د گولچیسك و د میزلدانکێدا چێدبیت، و چارەسەرییا نەخۆشیا ئاڤکەڤتنا د بن پیستێڤە (الاستسقاء) دکەت، و چارەسەرییا هندەك نەخۆشییێن چاڤان دکەت، و ژڤانێ هەیڤانە (العادة الشهرية) ل دەڤ ئافرەتێ باشتر لێ دکەت، دیسا دهێتە هژمارتن ژ کەرستێن جوانکارییێ.

ئەڤ رووەکێ د ناڤ دەستێن مەدا، ئەگەر مرۆڤ هزرێ د ڤێ خوارنا دخۆتدا بکەت دێ زانیت مەزناتییا ئافرێنەرێ خۆ، کێ ئەڤ رێژە ژ کانزایان و ڤیتامینێن کێم وێنە کرینە د ناڤدا؟ ژ بەر ڤێ چەندێ دبێژن: چێترین دەرمان ئەوە خوارن بیت، و چێترین خوارن ئەوە دەرمان بیت.. دەرمانێ رووەکی یێ هەڤسەنگە نەیێ ب زیانە، بەلێ ئەو دەرمانێن کیمیایی یێن ئەم وەردگرین لایەکی چارەسەر دکەت و زیانێ دگەهینیتە لایەکێ دی.

## خەل

زار جابرێ کورێ عەبدوللایی ﷺ دبێژیت: ((أَخَذَ رَسُولُ اللهِ (صلى الله عليه وسلم) بِيَدِي ذَاتَ يَوْمٍ إِلَى مَنْزِلِهِ، فَأَخْرَجَ إِلَيه فِلَقاً مِنْ خُبْزٍ، فَقَالَ: مَا مِنْ أُدْمٍ؟)) فقالوا: لا، إلا شَيْءٌ مِنْ خَلٍّ، قَالَ: ((فَإِنَّ الْخَلَّ نِعْمَ الأُدْمُ، قَالَ جابرٌ: فَمَا زِلْتُ أُحِبُّ الْخَلَّ مُنْذُ سَمِعْتُهَا مِنْ نَبِيِّ اللهِ))[1]، ئانکو: پێغەمبەری ﷺ دەستێ من گرت و ئەز برمە مالا خۆ، ئینا هندەك نان بۆ ئینا، گۆت: ((ما چ خوارن نینە؟)) گۆتن: نە، چو نینە ژ بلی خەلێ، گۆت: ((ب راستی خەل باشترین خوارنە))، جابری گۆت: پشتی من ئەڤ ئاخفتنە ژ پێغەمبەری (سلاڤ ل سەر بن) گوهـ لێ بووی بەردەوام ئەز حەژ خەلێ دکەم.

د فەرموودەکا دیدا: زار عائیشایێ ﷺ، پێغەمبەری ﷺ گۆت: ((نِعْمَ الأُدْمُ أَوِ الإِدَامُ الْخَلُّ))[2]، ئانکو: باشترین خوارن خەلە.

زانایان ئاشکراکر کو خەلێ گەلەك مفا پێن هەین ناهێنە هژمارتن، دبێژن: ((خەل میکرۆبان دکوژیت د ماوێ چەند خۆلەکاندا د ناڤ مەعیدەیدا))، ئەگەر ئامانێ خوارنێ باش نەپاقژکربیت، ئەو خەلا د ناڤدا دێ پاقژکەت، بەلکو خەل مەعیدەی دپارێزیت ژ کولبوونان و ژەهراوییان، و ئەو کانزایێن د ناڤدا: پۆتاسیۆم، و فوسفۆر، و کلۆرین، و سۆدیۆم، و مەگنیزیۆم، و کالسیۆم و گۆگرد، و بهایێ وێ یێ کالۆری چوننەیە، و خەل کولبوونێن دەڤ و گەرییێ دەرمان دکەت، و بەزی دبەت، و ژانەسەرێ رەحەت دکەت، و کولبوونا گەهان چارەسەر دکەت، و گیرها د ناڤ خوینبەرێن لەشیدا دبەت، و ئاخفتنا پێغەمبەری ﷺ نە ژ دەڤ خۆ دئاخفت، بەلکو ئەو وەحی بوو بۆ دهات، ئەو نوژدارێ دلایە، و نوژدارێ جەستەیانە، و خەل ژ (الطب النبوي)یە، نەخاسمە خەلا سێڤێ.

---

١ـ موسلم (٢٠٥٢)، و ئەحمەد (١٥٣٢٨).

٢ـ موسلم (٢٠٥١).

(إبن القيم) دبێژیت: ((خەل یا ئاوێتەیە (پێکهاتییە) ژ گەرمییێ، و سەرما پترە ل سەر... ناهێلیت کەرستە برژن، و سروشتی خۆش دکەن، و خەل مفایی دگەهینیتە مەعیدا کولبوویی، و زەرکێ ناهێلیت، و زیانا دەرمانێن کوژەك دبەت، و شیر و خوینێ حەل دکەت دەمێ د هناڤاندا دقەرسن، و مفایی دگەهینیتە خالخالکێ، و مەعیدەی گەمار دکەت، و زکی پەیت دکەت، و تێناتییێ ناهێلیت، و وەرەمان ناهێلیت دەمێ کو دێ چێ بن، و هاریکارە بۆ هەرسکرنێ، و بلغەمێ دبەت، و خوارنێن رەق و گران نەرم دکەت، و زەرکا خوینێ دبەت، و دەمێ د گەل خوێی خوار دێ مفایی گەهینیتە وی کەسی یێ کڤارکا کوژەك خواری، و دەمێ دهێتە ڤەخوارن ئەوا د ئەرزینکێدا دهێتە خوار مرۆڤ پاقژ دکەت، و دەمێ ب گەرمی دمڤێ خۆ وەرددەن دێ مفایی گەهینیتە ئێشانا ددانان، و پتیێ ب هێز دئێخیت... و یا ب مفایە بۆ وەرەمێن گەرم، و سۆتنا ئاگری، و مێتنە بۆ خوارنێ، و تەناکەر و نەرمە بۆ مەعیدەی...))[1].

و پێغەمبەرێ خودێ ـ راستگۆ و راستی بێژ ﷺ ـ دەمێ گۆتی: ((نِعْمَ الأُدُمُ أوِ الإدامُ الخَلُّ))[2].

---

١ـ الطب النبوي ص٢٣٥، وزاد المعاد (٣٠٦/٤) د گەل دەستکارییەکا کێم و سڤك.

٢ـ سبق تخريجه، ئەوەوی د شرۆڤەکرنا ڤێ فەرموودێدا یا موسلمی ڤەگوهاستی (٧-٦/١٤) دبێژیت: [د فەرموودێدا باشییا خەلێ دیارکرییە، و ناڤلێنایە ب پێخوارن، کو پێخوارنەکا خۆش و باشە، زمانناس دبێژن: الإِدامُ: ئانکو ئەوا پێ دهێتە خوارن، دبێژن: (أدم الخبز) ئانکو ب نانی هاتە خوارن، و کۆما (الإدام) دبیتە أدُم، وەکی (إهاب و أهب) و (کتاب و کتُب)، و الأُدْمُ ب هەبوونا (همزە)یێ ل سەر پیتا دال کەتا وێ دبیتە وەکی (الإدام)... و رامان فەرموودێ خەتابی و (القاضي عياض) دبێژن: راماناوێ: پەسنا کێمییێ د خوارنێدا، و نەهێلانا نەفسێ ژ تاما خوارنان، و رێزگرتنا وی: پێ خوارنێ ب خەلێ بکەن، و رامان د ڤێدا ئەوە خوارنەکا سڤك و کێم مەزاختنە، و هەبوونا وێ نە یا ب زەحمەتە، و نە چنە د ناڤ دلچۆناندا چونکی پویچکرنەکە بۆ ئایینی، ئەڤە ئاخڤتنا خەتابییە، و ئەوێن ل دویڤدا هاتین، و ئەو دورستییا کو دشێین ب وێ ڤەبرین ئەوە کو پەسنەکە بۆ خەلێ ب خۆ].

# سیواك و كاریگەرییا وی د میكرۆباندا

زار عائیشایێ ﵂ ژ پێغەمبەری ﷺ: ((السِّوَاكُ مَطهَرَةٌ لِلفَمِ، مَرضاةٌ لِلرَّبِّ))[1]، ئانكو: سیواك پاقژییەكە بۆ دەڤی، رازیبوونەكە بۆ خودێ.

د گۆڤارەكا ناڤداردا ل هندەك وەلاتێن عەرەبی دەردكەڤیت گۆتارەكا زانایەكی تایبەتمەند ب زانستێ میكرۆبان و ژینگەهانڤە ل ئەلمانیا هاتبوو، دبێژیت: ((من ل سەر سیواكی ـ ئەوێ عەرەب وەك فرچێ ددانان ب كار دئینن ـ د پەرتۆكەكا گەرۆكەكیدا خواند، كو سەرەدانا وەلاتێن عەرەبی كربوو)).

و نڤیسەرێ ڤێ پەرتۆكێ ب شێوەیەكێ ترانەپێكرنێ بەحسێ سیواكی كربوو، ئەڤە كربوو بەلگە ل سەر پاشڤەمانا وان مرۆڤێن ددانێن خۆ ب پارچەكا داری د سەدێ بیستێدا دشۆن.

ئەڤ زانایێ ئەلمانی دبێژیت: ((بەلێ من ئەڤ چەندە ژ لایەكێ دیڤە وەرگرت، و من هزر كر بۆچی ل دۆر ڤێ پارچا داری، كو نافێ وێ كرییە فرچێ ددانا یێ عەرەبی راستییەكا زانستی نابیت، ئەگەر ئەز بشێم تاقیكرنان ل سەر بكەم، پاشی هەڤالەكێ من چۆ سودان، و زڤریڤە كۆمەكا سیواكان د گەل خۆ ئینابوو، و هەر زوی من تاقیكرن ل سەر كر، پشتی من هەرشاندی و تەڕكری، و من ئەڤا هەرشاندی و تەڕ دانا سەر زەڤییێن میكرۆبان، ژ نیشكەكێڤە بۆ من دیاربوو كو من ئەو هزر نەدكر چونكی ل سەر زەڤییا میكرۆبان دیاربوو، هەمان كاریگەری بوو ئەوا بەنسەلین دكەت، كو بەنسەلین كەرستەكێ كارتێكەرە بۆ كوشتنا میكرۆبان، ئەڤەیە ئەوا زانایێ ئەلمانی یێ تایبەتمەند ب زانستێ میكرۆبان و ژینگەهانڤە گۆتی.

---

١ـ بوخاری د بابەتێ (السواك الرطب واليابس للصائم)، و نەسائی (٧٩).

(إبن القيم) دبێژیت: ((د سیواکیدا چەند مفایەکێن تێدا؛ دەڤی نەرم و خۆش دکەت، و پتیێ موکوم دکەت، و بلغەمێ دبەت، و دیتنێ رۆهن دکەت، و زەراتییا ددانا دبەت، و مەعیدەی ساخلەم دکەت، و دەنگی زەلال دکەت، و هاریکارییا هەرسکرنا خوارنێ دکەت، و بۆرییێن ئاخفتنێ خۆش دکەت، و چالاك دکەت بۆ خواندنێ، و زکری و نفێژێ، و خەوێ دبەت، و خودێ رازی دبیت، و ملیاکەت حێبەتی دبن، و باشییان زێدە دکەت))[1].

و دبێژیت: ((و باشترە سیواکی ژ دارا سیواکی ب خۆ بینن و قەست بکەنێ، و ناچێبیت ژ دارەکا بەرزە یان دارەکا دی بینن، چێدبیت یا ژەهراوی بیت، و پێدڤییە ڤایدە بهێتە ب کارئینان، و ئەگەر زێدە ب کار ئینا بەلکی جوانی و تەیسینا ددانان ببەت، و ئامادەکر بۆ وەرگرتنا هەلێن ژ مەعیدە و پیساتییان بلند دبن و دهێن))[2].

١ـ زاد المعاد (٣٢٢/٤).

٢ـ زاد المعاد (٣٢٢/٤).

١- دلێ دایکێ د بوونەوەرێن زیندیدا

٢- مفاییێن هێکێ

٣- نەخۆشییا دیناتییا چێلێ ( نەخۆشبوونا مێشکی )

٤- شیرێ چێلان

٥- حێشتر

٦- هەسپ

٧- زەرافە

٨- بەراز و حیکمەتا حەرامکرنا گۆشتێ وی

٩- گیانەوەرێ وەکی کەنگەری د بیابانان‌دا دژیت

١٠- سە و ئەو نەخۆشییێن ژێ پەیدا دبن

١١- هەستەوەرگرێ بهێنکرنێ ل دەڤ سەی

١٢- دوپشك و پەقینا ئەتۆمی

١٣- حەرامکرنا خوینێ

١٤- خوینا رژیایی و پەیوەندییا وێ ب میکرۆبانڤە

ژ نیشانێن خودێ یێن بەلگە ل سەر مەزناهییا وی دلێ دایکێیە، نە ئەو دلێ کەرستەیی، ئەوێ ژ دو گوهکان و دو زکۆکان، و خوینبەران و خوینهێنەران پێک دهێت، بەلێ دلێ ناخی، زانا دبێژن: هێزترین پالدەر ل دەڤ مرۆڤی پالدەرێ دایکینییێیە، و بەلکو پالدەرێ دایکینییێ هێزترین پالدەرە د بوونەوەرێن زیندیدا، و شادەییێن ل سەر دلۆڤانییا دایکێ د بوونەوەرێن زیندیدا نە ب تنێ د مرۆڤیدا پتر دێ هژمێری و بینی.

زار عەبدوللایێ کورێ مەسعودی دبێژیت: نَزَلَ رسولُ اللهِ (صلى الله عليه وسلم) مَنزِلاً، فانطلَقَ إنسانٌ إلى غَيضَةٍ فأخرَجَ منها بَيضَ حُمَّرَةٍ[1]، فجاءَتِ الحُمَّرَةُ ترِفُّ على رسولِ اللهِ (صلى الله علي وسلم) وَرُؤُسِ أصحابِهِ، فقال: ((أيُّكُمْ فَجَعَ هذهِ؟)) فقالَ رَجُلٌ مِن القَومِ: أنا أصَبْتُ لَها بَيضاً، قالَ رسولُ اللهِ (صلى الله عليه وسلم): ((ارْدُدْهُ))، وفي رواية: وَقالَ: ((رُدَّهُ رَحمَةً لَها))[2]، وفي رواية أبي داود: ((تفرش جناحها))، بدل ((ترفُّ))، ئانكو: پێغەمبەر .

ل جهەکی روینشت، زەلامەک بەزی ناڤ داروباران هێکێن چویچکەکێ ژ هێلینا وێ ئینان دەرێ، چویچک هات هنداڤ پێغەمبەری ﷺ و سەحابییان پەرێن خۆ لێک ددان، ئینا گۆت: ((کێ ئەڤە بزداندییە؟)) زەلامەکی گۆت: من هێکێن وێ یێن ئینایین، پێغەمبەری ﷺ گۆت: ((بزڤرینەڤە))، و د ریوایەتەکێدا گۆت: ((دلۆڤانییێ پێ ببە و بزڤرینەڤە))، و د ریوایەتا ئەبو داودیدا: پەرێن خۆ بەلاڤ دکرن ل شوینا لێک ددان.

---

١. [دەمیری دبێژیت: الحُمَّرة: کۆمەکا بالندایە وەکی چویچکانە، و ئێکا وێ دبێتە حمرة، و ئەڤە هەمی زانایێن شەریعەتی حەلال کرییە چونکی ژ جۆرێن چویچکانە... (تفرش) ئانکو: پەرێن خۆ پان دکەت، (مَن فجع) ژ تووشبوونا موسیبەتێ هاتییە، (ئەوێ تووشی ڤێ بوویی)، ئانکو: ئەڤ جۆرێ بالندەی ب تێژکا خۆ، ئانکو ب برنا تێژکا وێ.

د (المصباح)دا دبێژیت: الفجيعة الرزية والزرية المصيبة: دەمێ نەخۆشییەک دگەهیتێ، ئانکو: دگەهیتە ڤی جۆرێ بالندان. عون المعبود (١٢٠/١٤) ب راستڤەکرنەکا کێم و سڤک.

٢. ئەبو داوود (٢٦٧٥)، ئەحمەد (٣٨٣٥)، و گۆتن یا وییە.

زانا دبێژن: هرچ، و سه، و کتك، ب کێلبێن خۆ یێن تیژ تێژکێن خۆ دهەلگرن، و دویر دبەن، بێی کو پیستێ تێژکێن وان بریندار و بئێشن.

گیانەوەرێ (ئیکسیلۆپ) د وەرزێ بهارێدا ب تنێ دژیت، و گاڤا هێك کرن دمریت، و دایك تێژکێن خۆ نابینیت ئەوێن نەشێن سالەکێ خوارنا خۆ ب دەستڤە بینن، بەلکو دایك هێکان دکەت پاشی دمریت، ئەڤ هێکێن داناى دەمێ دبنە تێژك، خوارنا تێژکێن وێ ژ کیڤە دهێت؟ نەشێن ئێکسەر خوارنێ بخۆن ب تنێ پشتی سالەکێ نەبیت، دێ چ چێبیت؟ بەرى هێککرنێ، دایك رادبیت پارچەکا دارى کون دکەت، ب شێوەکێ لاکێشەیى، پاشی تایێن گولا دێ ئینیت، و هندەك بەلگێن شرین، و دێ وێ کونێ ب ڤان تژى کەت، پاشی دێ هێکا کەت، و دێ دارەکى ئینیت و دانیتە سەر، و پاشی دێ مریت، پشتی دەمەکى تێژك دێ ژ هێکان دەرکەڤن، و دێ خوارنێ بینن ل جهێ خۆ کو تێرا وان سالەکێ دکەت، خودێ دبێژیت: (قَالَ فَمَنْ رَبُّكُمَا يَا مُوسَى (٤٩) قَالَ رَبُّنَا الَّذِي أَعْطَى كُلَّ شَيْءٍ خَلْقَهُ ثُمَّ هَدَى (٥٠)) [طه]. ئانكو: (فیرعەونى) گۆت: پا خودایێ هەوە کییە، هەى مووسا؟ خودایێ مە ئەوە یێ هەر تشتەکێ چێکرى، ئەو داییێ (ژ رەنگ و وێنەیان) یێ ب کێر وى بهێت، پاشی هەمى راستەرێکرن (بۆ وێ ئارمانجێ یا ئەو بۆ هاتینە چێکرن).

مێشەك یا هەى دبێژنێ (الحفار)[1]، مێیا ڤێ مێشێ کونەکێ د عەردیدا دکۆلیت، پاشی ل کرمەکى دگەریت پێڤە ددەت، و بێهۆش دکەت، و نامریت، پاشی دێ کێشیتە د کونێدا، پاشی دێ هێکا کەت، و دێ کونێ گریت، و بۆ تێژکێن خۆ خوارنەکا تەرا نوى ئامادەکر تێرا وان هەیە ماوەکێ درێژ، و پاشی ئەڤ مێشە دێ مریت.

---

١- چێدبیت ستێنگ بیت د زمانێ عەرەبیدا دبێژنێ (الزنبور)، یا د (لسان العرب)دا هاتى (مادة الزنبور): (والزُّنْبُورُ والزِّنبار والزُّنْبُورَةُ): جۆرەکە ژ مێشێن پێڤەدانێ دکەن.

هندەك بالندێن مێ، د رۆژێدا پتر ژ هزار و سێ سەد جاران خوارنێ ددەنە تێژكێن خۆ، خوارنێ د ناڤبەرا رۆهەلاتن و ئاڤابوونێدا ددەنە تێژكێن خۆ.

حێشتر دكەتە گری دەمێ تێژكەكا وێ دمریت، و سە دكەتە گری ل سەر مرنا كویچكێ خۆ.

و دەمێ هەسپ تێژكەكا خۆ ژ دەست ددەت نهنهەكێ دكەت ب دەنگەكی مرۆڤ گوهـ لێ دبیت، وەك هۆڤا لێ دهێت، و ناهێلیت كەس نێزیكی تێژكا وێ ببیت، و دەمێ تێژكا وێ دهەلگرن دا ڤەشێرن دێ د دویڤرا چیت، و دەمێ ڤەشارت دمینتە سەر قەبرێ تێژكا خۆ، و خۆ ژ خوارن و ڤەخوارنان دبریت.

ژ نیشانێن خودێ كو بەلگەنە ل سەر مەزناهییا وی دلێ دایكێیە، نە ب تنێ ل دەڤ مرۆڤی، بەلكو د بوونەوەرێن زێندیدا ژی.

## مفاییێن هێكێ

ئەڤ هێکا ئەم دخۆین کی باوەر دکەت شازدە کانزایێن کێم وێنە یێن تێدا، و هەشت کانزایێن بەرنیاس؟ و کانزایێن د ناڤ هێکێدا رێژا وان (٢٪)، بەلێ کانزایێن د تیڤلێ وێدا (١٠٪).

کی باوەر دکەت د ناڤ هێکێدا (٢٠٠) جۆرێن پرۆتینان یێن تێدا، و (١٤) جۆرێن ڤیتامینان، و کەرستێن شەکرێ، و هەڤدژێن چالاك یێن تێدا، کو بەرگرییا رزین و پویچبوونا هێکێ دکەن، و دیسا دوهنێن سڤك و گران تێدانە.

و شێوێ هێکێ ب ڤی رەنگی، ژ باشیێن وێ یێن ئەندازەیینە کو دویر گرێل نابیت، و ئەگەر شێوێ وێ یێ بازنەیی با دا دویر گرێل بیت.

ئەڤ شێوە بهێزترین شێوێن ئەندازەییە، بەرگرییەکا مەزن یا هەی، و شێوێ هێکێ وەلێ دکەت کو بەرگرییا وێ دابەش ببیتە سەر هەمی رویێ وێ، و ژ لایێ ب کارئینان و ڤەکرنێڤە یا ب ساناهییە، و ب ساناهییە داننە سەرئێك.

## نەخۆشییا دیناتییا چێلێ ( نەخۆشییا مێشکی )

دەمێ مرۆڤی کوفری ب وەحییا عەسمانی کری، و پشت خۆ ب ئاقلێ خۆ ب تنێ موکوم کر، ئەو بەرزەکر، و بەرێ وی دا هندێ وان مالبچویکێن ژ نەخۆشخانان دئینن بدەنە چێلێ، پشتی هشك دکەن و دهێرن، و هەستییێن بەرازان و پیساتییا حەفنی و گەنی دکەنە د مەنجەلاندا و دکەلینن، پاشی هشك دکەن و دهێرن، و ددەنە چێلێ وەك خوارن، و ب ڤێ خوارنێ نەخۆشییەکا گەلەك مەترسی تووشی چێلێ دبیت، زانایان ناڤێ وێ کرییە: دیناتییا چێلێ، یان نەخۆشییا مێشکی.

ئەڤ نەخۆشییا ب مەترسی، دێ بەرهەمهێنەرێن چێلان مەجبورکەت یازدە ملیۆن چێلان بسۆژن، کو بهایێ وان دگەهیتە (٣٣) ملیار جونەیهێن ئیستەرلینی، چونکی وان سەرپێچییا رێبازا خودێ کر د دانا خوارنێدا بۆ ڤی گیانەوەری.

ناڤێ ڤێ نەخۆشیێ: نەخۆشییا مێشکی یا ئیسفەنجی، و ئەگەرێن ڤێ نەخۆشییێ، هندەك بوونەوەرێن گەلەك هویرن، هەتا نوکە ب دورستی نەهاتینە زانین، کو ماوەکێ گەلەك دمینیت، دگەهیتە هەشت سالان، و ل دەڤ مرۆڤی دگەهیتە بیست سالان، و ڤێ نەخۆشییێ چو دیاردا کولبوونێ نینە، و دیاردا بەرگرییێ ژی نینە، و ل دویماهییێ ئاشکەراکر کو ئەڤ نەخۆشییە نەبەس دهێتە چێلان، بەلکو دهێتە مرۆڤان ژی، ئەگەر مرۆڤی گۆشتێ ڤێ چێلا ئەڤ نەخۆشییە لێ خوار، دێ نەخۆشییەکا وەکی نەخۆشییا چێلان هێتە مرۆڤی، و نیشانێن ڤێ نەخۆشییێ ل دەڤ چێلێ دێ رێڤەچۆنا وێ یا گران بیت، و لنگێن خۆ بلندکەت، و هەستزانییا وێ دێ ژ تخوییان دەرکەڤیت، و خوریان، و ژ دەستدانا دلچۆنا خوارنێ، و زێدەییا ئینان و برنا ئەزمانی، و نەکۆنترۆلکرنا دەمارگیری، و ئەڤ چەندە هەمی دێ کێشیتە رەوشتەکێ دژمنکاری، پاشی مرنێ.

ئەوا مرۆڤێ غافل و سەرداچۆیی دکەت، و ئەوا مرۆڤێ کوفری ب رێبارا خودێ کری، و ئەوا مرۆڤێ خۆ هێلایە ب هیڤییا ئاقلێ خۆ یێ ب کێماسی و بێ شیان، ئایەتەکا قورئانا

پیرۆز ڤێ چەندێ دیار دکەت، خودێ دبێژیت: (فَلَيُغَيِّرُنَّ خَلْقَ اللَّهِ) [النساء:١١٩]، چێکرن و یاسایێن خودێ دگوهۆرن.

ئەڤ چێلا نەخۆشییا دیناتییێ دهێتێ، ژ ئەگەرێ دیناتییا مرۆڤییە، و دیناتی د پێناسا پێغەمبەرێ خودێدا چییە؟ پێغەمبەر ﷺ د گەل هندەك هەڤالێن خۆ بوو، دینەك د رێكێدا دیت، ئینا پێغەمبەری پسیار كر: ((مَنْ هذا؟ قالوا: مَجنونٌ یا رَسُول الله! قال: لیسَ بالمَجْنونِ وَلكِنَّهُ مُصابٌ، إنّما المَجْنونِ المُقيمُ عَلى مَعْصِيَةِ الله تعالى))[1]، ئانكو: ئەڤە كییە؟ گۆتن: ئەو یێ دینە ئەی پێغەمبەرێ خودێ! پێغەمبەری گۆت: نەخێر نەیێ دینە بەلكو توشبوویە، مرۆڤێ دین ئەوە یێ دمینیت سەر دەركەڤتنا ژ فەرمانا خودێ.

و نیشانێن وی مرۆڤی یێ ئەڤ نەخۆشییە دهێتێ، زانا دبێژن: دێ بیردانكا خۆ ژ دەست دەت، رێكخستنا پێكڤە یا ماسولكان دێ ژ دەست دەت، و ژ دەستدانا هەڤسەنگییێ، و توشبوونا كۆراتییێ، و ژ دەستدانا ئاخفتنێ، و د ناڤبەرا سێ هەیڤا هەتا سالەكێدا دێ مریت، ژ دەستپێكا دیاربوونا نیشانان، دودلی و داماییبوون پێڤە یا دیارە، و گوهۆرینێن رەوشتی، و تێكچۆنا چالاكییا مێشكێ كارەبایی، ئەڤ نەخۆشییە چێل و مرۆڤ ژێ تووش دبنێ، بەلكو ئەو مرۆڤێن گۆشتێ ڤێ چێلێ ژێ دخۆن تووشی ڤێ نەخۆشییێ دبن، ژ بەر مەترسییا ڤێ نەخۆشییێ، بەهرا پتر ژ دەولەتان ناهێلن گۆشتێ وان چێلان بچیتە د ناڤ واندا یێن وان جهێن ئەڤ نەخۆشییە لێ هەی.

خوارن و ب كارئینانا گۆشتێ چێلێ، و بەرهەمێ وان، و روین و هناڤ و پاشمایی و ئەو ئالیكێ ژێ چێ دكەن، و بەرهەمێن جوانكارییێ ئەوێ ژێ دورست دكەن، و گۆشتێ داگرتی د ڤۆدیكاندا (معلبات)، و جۆرێن شیری و تشتێ ژێ چێدكەن، و جۆرێن وان شرینییێن ڤان روینان ب كار دئینن، بۆ چێكرنا وان، یان نیڤشك، یان سەرتیك، چێ دبیت ب ڤان هەمییان مرۆڤ تووشی ڤێ نەخۆشییێ ببیت.

---

١. الفردوس بمآثر الخطاب (٦٦٤٤) زار ئەنەسی.

و ئەگەر تە گۆت: ئەرێ ئەڤ ئارێشە ب لێنانێ دێ هێتە چارەکرن؟

من گۆت: نەخێر، ژ بەر کو لێنان دێ وی ڤایرۆسێ د ناڤ گۆشتیڕا گەشە کەت ئەگەر پلا گەرمییێ سەد بیت، و ئەڤ جۆرە ئەگەر هاتە لێنان، و پلا گەرمییێ سەد و بیست بیت چو تشتان ناگەهینیتێ، دێ ڤایرۆسێ ڤێ نەخۆشییێ مینیتە د ناڤدا، چونکی ئەو هۆکارێ بوویە ئەگەرێ ڤێ نەخۆشییا دیناتییا چێلێ خۆ ل بەر پلێن گەرمییا بلند دگریت.

ئەڤ راستییێن ئەز ددانمە بەر دەستێن هەوە کۆرتییەکە ژ بەلاڤۆکەکا راگەهاندنێ ئەوا رێکخراوا ساخلەمییا جیهانی دەرکری و یا دویرە ژ زێدەییان.

و شەیتانی سویند یا خواری مرۆڤان سەردا ببەت، و ئەڤە ژ سەرداچۆنا وییە: (وَلَأُضِلَّنَّهُمْ وَلَأُمَنِّيَنَّهُمْ وَلَآمُرَنَّهُمْ فَلَيُبَتِّكُنَّ آذَانَ الْأَنْعَامِ وَلَآمُرَنَّهُمْ فَلَيُغَيِّرُنَّ خَلْقَ اللَّهِ وَمَنْ يَتَّخِذِ الشَّيْطَانَ وَلِيًّا مِنْ دُونِ اللَّهِ فَقَدْ خَسِرَ خُسْرَانًا مُبِينًا) [النساء:١١٩]، ئانکو: ئەز دێ وان ژ رێکا راست بەرزەکەم، و دێ وان ب هیڤی ئێخم (کو دێ ژی درێژ بن و دێ هزرکەن هێژ زوییە تۆبە بکەن، و ل خۆ بزڤرن هەتا ژیانا خۆ هەمییێ ب ڤان هیڤییان دبەنە سەری) و ئەز دێ فەرمانا وان کەم، ڤێجا ئەو دێ گوهێت تەرشان ژێڤەکەن (کو بێنە نیشانکرن ئەو پێشکێشن بۆ پەرستی و بوتان)، و ئەز دێ فەرمانا وان کەم کو ئەو چێکرییان یان دینێ خودێ بگوهۆرن. و هەر کەسێ شەیتانی ل جهێ خودێ بۆ خۆ بکەتە هاریکار و پشتەڤان، ئێدی ب سویند ئەو ب بەر زیانەکا ئاشکەرا کەڤت.

و جوداهییا یا د ناڤبەرا رێبازا خودێ، و رێبازا شەیتانیدا هەی، خودێ دبێژیت: (فَمَاذَا بَعْدَ الْحَقِّ إِلَّا الضَّلَالُ فَأَنَّى تُصْرَفُونَ) [یونس:٣٢]، ئانکو: ڤێجا ما تشتەك پشتی هەقییێ هەیە ژ گۆمڕایی و بەرزەبوونێ پێڤەتر، (ئانکو پشتی هەقییێ، بەرزەبوون)، ڤێجا چاوا ڕوییێ خۆ ژ هەقییێ وەردگێڕن بۆ گۆمڕاییێ.

# شیرێ چێلان

ئەو شیرێ هەر ئێك ژ مە ب كار دئینیت خوارنەكا تمامە، ب هەر رەنگەكی، ماست، پەنیر، روین، و یێن وەكی ڤان، كو رێژا (٩١،٧٨٪) ئاڤە، دیسا د شیریدا قەلەوی، و شەكر، و پرۆتین، و كانزا، و ڤیتامین، و گازێن حەلكری، و خوارنەكا تمامە كو گازێن حەلكری یێن تێدا، وەكی گازا دوان ئۆكسیدێ كاربۆن ($CO_2$)، و ئۆكسجین، و (نشادر)، و ڤیتامینێن (ا، ب، ث، د)، و ژ كانزایان: كالسیۆم، و فوسفۆر، و ژ پرۆتینان: كاثرین، ئەلبوومین، و یێن وەكی ڤان، و ژ شەكران: شەكرا تری، و قەلەوی، و ئاڤ.

بەلێ ل ڤێرە موعجیزە ئەوە ئەڤ شیرە ژ زكێ چێلێ دەردكەڤیت یێ پاقژ و زەلال د ناڤبەرا عویرگیشكی و خوینێدا.

نویترین ڤەكۆلینێن زانستی دبێژن: د چێلێدا رژینەكا شیردانێ یا هەی، ئەڤ رژینە یا دابەشكرییە بۆ ڤاچان (فصوص)[1]، و ئەڤە ژی یا دابەشكرییە بۆ ڤاچێن بچویكتر، و دیسا ئەڤە ژی د دابەشكرینە بۆ خلۆلاهییێن بچویك كو ئەو ژی ژێدەر و بنیاتن (أسناخ)، و ئەڤە یێن دۆرپێچكرینە ب تیڤلەكی ژ خانان، و ل دۆر ڤان خانان مویلەلەیێن خوینێ یێن هەین، خانە ل دویڤ پێدڤییا خۆ خوینێ وەردگرن، و د خلۆلاهییێن بچویكدا شیر دهێت، ئەڤ خلۆلاهییە ب كەنالەكێ ب دویماهی دهێت كو دچیتە حەوزا پەریزادێ، پاشی دێ چیتە حەوزا گوهانێن چێلێ، پاشی بۆ سەرێ بشكۆژا چچكێ وێ.

---

١- ڤاچ (فصوص): هەر گوهانەكێ چێلێ د ناڤبەرا (١٥-٢٠) یێن تێدا، كو دبنە ژێدەرێ شیری. وەرگێر.

بەلێ هەتا نوکە نەهاتییە زانین کا سروشتێ کارێ خانێ چییە، کو خانەکە ژ دەرڤەی خۆ خوینا پێدڤی وەردگریت، و د ناڤ خۆیا خۆدا شیری ددەت.

زانا دبێژن: سێ سەد قەبارە، هەتا چار سەد قەبارە ژ خوینێ ل دۆر ڤان بنیات و ژێدەران (أسناخ) دچن، ژ بەر چێبوون و ب دەستڤەهاتنا لیترەکا شیری، ئانکو هەر لیترەکا شیری ژ سێ سەد یان چار سەد لیترین خوینێ چێ دبیت، ل دۆر ڤان مویلەلەیان دزڤرن، و چێل کارگەهەکا مەزنە، (مِنْ بَيْنِ فَرْثٍ وَدَمٍ لَبَنًا خَالِصًا سَائِغًا لِلشَّارِبِينَ) [النحل:٦٦]، ئانکو: د زکێ تەرشاندا (د پەز و چێل و حێشتراندا) د ناڤبەرا ریخێ و خوینێدا شیرەکێ زەلال و پارزنی ددەینە هەوە.

و تشتێ جهێ حێبەتییێ هەتا نوکە، نوزانن ئەڤ خانە چاوا کار دکەت؟ ژ لایێ مویلەلەیێن خوینێڤە: کەرستان، و ڤیتامینان، و کانزایان، و پرۆتینان، و شەکران، و قەلەوی، و ئاڤ ڤان تێکەل دکەت، و د ناڤ خانێدا شیری ددەت، هەر چێلەك سیه هەتا چل لیترێن شیری بەرهەم دئینیت، و هەر لیترەکا شیری ژ زڤرینا سێ سەد لیترێن خوینێیە.

د ناڤ ڤان مویلەلەیێن خوینێدا سێ سەد قەبارە بۆ چار سەد قەبارە داکو لیترەکا شیری چێکەن، و دەمێ خودایێ مە دبێژیت: (نُسْقِيكُمْ مِمَّا فِي بُطُونِهِ مِنْ بَيْنِ فَرْثٍ وَدَمٍ لَبَنًا خَالِصًا سَائِغًا لِلشَّارِبِينَ) [النحل:٦٦]، ئانکو: ب ڕاستی بۆ هەوە د تەرشاندا (د پەز و چێل و حێشتراندا، د چێکرن و سەرنەرمکرنا واندا بۆ هەوە) دەرس و چامە هەنە، و د زکێ تەرشاندا (د پەز و چێل و حێشتراندا) د ناڤبەرا ریخێ و خوینێدا شیرەکێ زەلال و پارزنی ددەینە هەوە کو ب ساناهی د گەوریيا واندا بچیت یێت ڤەدخۆن، و ئاماژە یا دایە نیشانەکا مەزنا بەلگە ل سەر مەزناهییا خودێ.

زانایان ڤەکۆلین کر ژ وی یێ فەرمانان ددەت، کی ڕێك دئێخیت؟ کی پێکڤە گرێ ددەت؟ کی فەرمانا ڤێ خانێ دکەت بۆ وەرگرتنا پۆتاس و فوسفۆر و کالسیۆم و ڤیتامین و

کانزایان و یێن وەکی کانزایان و گازان و شەکران و کەرستێن قلەو ژ خوینێ؟ چاوا تێکەل دبن؟ چاوا دبیتە شیرەکێ سپی یێ زەلال؟ یێ زەلال ژ هەر گلێش و پیساتییەکێ؟ چو شوینا خوینێ تێدا نینە؟ و شوینا ریخێ ژی تێدا نینە؟ وان نەدیت ژ بلی دەستێ خودێ کو کار د نەپەنیدا دکەت.

ئەگەر مرۆڤ هزرێ د ئافراندنا عەرد و عەسماناندا بکەت، ئەگەر مرۆڤ هزرێ د ئافراندنا گیانەوەرێن ل دۆرماندۆری خۆ بکەت، و هزرکرنێ د رووەکاندا بکەت، و د ئافراندییێن دیدا بکەت، دێ گەلەك حێبەتی بیت، و دێ مرۆڤ سوجدێ بۆ خودێ بەت، و دا فەرمانێن وی ب جھ ئینیت، وی خودایێ ژ وی گیایێ چێل دخۆت دکەتە شیر بۆ تە، ئەرێ تو دشێی ڤی گیایی بکەیە شیر؟ نەخێر تو ڤێ چەندێ نەشێی، چاوا شیر خوارنەکا سەرەکییە د ژیانا تەدا؟ ماستی ژێ چێ دکەن، و شیری، و پەنیری و سەرتیك و هتد...، ئەڤە هەمی دانا خودێیە، خودێ دبێژیت: ﴿وَالْأَنْعَامَ خَلَقَهَا لَكُمْ فِيهَا دِفْءٌ وَمَنَافِعُ وَمِنْهَا تَأْكُلُونَ﴾ [النحل:٥]، ئانکو: تەرش (حێشتر و چێل و پەز و بزن) ژی یێت چێکرین، بۆ هەوە گەرماتی یا تێدا (ئانکو ئەو جلکێت هوین خۆ پێ گەرم دکەن ژ هری و موییێ وان چێ دکەن)، و هندەك مفایێت دی ژی بۆ هەوە یێت تێدا هەین، و هوین دخۆن ژی، و دبێژیت: ﴿وَذَلَّلْنَاهَا لَهُمْ فَمِنْهَا رَكُوبُهُمْ وَمِنْهَا يَأْكُلُونَ﴾ [یس:٧٢]، ئانکو: مە یێت بۆ وان سەرنەرم کرین و ئێخستینە د خزمەتا واندا، ڤێجا ئەو ل هندەکان سویار دبن و هندەکان دخۆن.

یێت سەرنەرم کرین و ئێخستینە د خزمەتا مرۆڤاندا، زارۆکەکێ بچویك گوهانێ چێلێ ددۆت! زارۆکەکێ بچویك چێلەکێ دهاژۆت! و ئەگەر ئازری (هۆڤەبوو) دێ دەهان کوژیت!.

بۆ مە یێن ئافراندین، و بۆ مە یێن سەرنەرم کرین و ئێخستینە د خزمەتا مەدا، ئەرێ ما ئەم شوکورا خودێ نەکەین؟ ئەرێ ما پەرستنا وی نەکەین؟ ما گوهدانا وی نەکەین؟ ما حەژێ نەکەین؟

# حێشتر

ئەگەر مرۆڤ باش بەرێ خۆ بدەتە حێشترێ، دێ بینیت کو ژ ئافراندیێن خودێ یێن گەلەك حێبەتییە، و ئەو حێبەتییەکە د ئەندازەیا توێکاریدا، و حێشتر ئالافەکە گەلەکێ ب بهایە، ل جهێن بیابانێن بەرفرەهـ، کو رێژا بیابانان شەش ئێکا رووبەرێ هشکاتییە ل جیهانێ، و حێشتر موکومترە ژ بهێزترین ئامویرێن سویارییێیە، و ل جیهانێ پتر ژ پازدە ملیۆن حێشتران یێن هەین، و بەردەوام د زێدەبوونێدانە، و هەر تشتەکێ د حێشترێدا یێ ب موکومی داهێنانکرییە، دا بگونجیت ل دویف ژینگەها وێ یا نەخۆش، و هەر چاڤەکێ وێ جۆتەکێ مژویلانکێن تژی و تێکرا یێن هەین، دا ژ تۆزا بیابانێ بێنە پاراستن، و شیانێن مەزنکرن و نێزیککرنێ یێن هەین، ئانکو ئەو تشتێ دویر نێزیك دبینیت، و یێ بچویك مەزن دکەت، و ئەڤە نهێنییا هاژۆتنا وێیە بۆ زارۆکەکێ بچویك، یان بۆ دەوارەکێ لاواز، خودێ دبێژیت: (وَذَلَّلْنَاهَا لَهُمْ فَمِنْهَا رَكُوبُهُمْ وَمِنْهَا يَأْكُلُونَ) [يس:٧٢].

و د شیانێن حێشترێدایە، کو گوهـ و خمخمکێن خۆ بگریت بۆ پاراستنا ژ تۆزێ، و سمێن وێ یێن مەزن هاتن و چۆنا وێ ب ساناهی دئێخن بێی کو د خیزیدا بچیتە خوار، و هەردو لێڤێن وێ (مطاط)ینە، د موکمن، سترییێن تیژ دگرن، و د کاریگەرن بۆ کۆمکرنا خوارنێ و سترییێن تیژ، ژ بەر کو دا حێشتر چو شهێ ژ دەست نەدەن ب درێژکرنا ئەزمانێ خۆ بۆ دەرڤە، خودێ دبێژیت: (أَفَلَا يَنظُرُونَ إِلَى الْإِبِلِ كَيْفَ خُلِقَتْ) [الغاشية:١٧]، ئانکو: ما نارێننە حێشترێ، کا چاوا هاتییە چێکرن؟!

ژ دیارترین سالۆخەتێن حێشترێ کێم پێدڤییا وێ ب ئاڤێ، و د گەل هندێ ژی د شیانێن وێدایە هندی لەگەنەکا سەرشویشتنێ ئاڤێ ڤەخۆت، و د شیانێن وێدایە ب دەهان رۆژان ئاڤێ نەڤەخۆت، بەلکو هندەك هەیڤان، و دشێت د کاودانێن بەرتەنگدا ئاڤێ ژ شانێن لەشێ خۆ دەمێ پێدڤی ب کار بینیت، دێ چارێکا کێشا خۆ ژ دەست دەت، بێی کو ژ لایێ بزاڤ و لڤینانڤە لاواز بیت، و د کۆدێ پشتا خۆدا بەزی عومبار دکەت، کو دبیتە هەمبەری پێنج ئێکا کێشا وێ، و ل ڤێرە حێشتر پێدڤییا خۆ ب خوارنێ ژێ وەردگریت، ئەگەر چو خوارن ب دەست نەکەفتن، (أَفَلَا يَنْظُرُونَ إِلَى الْإِبِلِ كَيْفَ خُلِقَتْ).

ژیێ ناڤنجی یێ حێشترێ پتر ژ چل سالان دژیت، و سویاربوونا حێشترێ نە یا ب ساناهییە ئەگەر سەرەدەرییەکا نەرم و دلۆڤانی د گەل نەهێتە کرن، و د ڤێ چەندێدا چامەیەکە بۆ مرۆڤان، خودێ دبێژیت: (أَفَلَا يَنْظُرُونَ إِلَى الْإِبِلِ كَيْفَ خُلِقَتْ).

# هەسپ

تشتێ بەرێخۆدانا مرۆڤی رادکێشیت د نیشانێن خودێدا یێن بەلگە ل سەر مەزناهییا وی هەسپە کو پێغەمبەری ﷺ د دەرهەقێ ویدا گۆتییە: ((الخَيلُ مَعقودٌ في نَواصِيها الخَيرُ إلى يَومِ القِيامَةِ))[1]، ئانکو: هەسپی خێر یا ب ئەنیا ویڤە گرێدایە هەتا رۆژا قیامەتێ.

و ژ حێبەتییا تایبەتمەندییێن ڤی گیانەوەرێ خودێ بەردەست کری بۆ مرۆڤی وەك رێزگرتنەك بۆ وی کو گوهلێبوونا وی یا ب هێزە، و هەسپی گوه ل پێژنا پێیان هەیە بەری ئەوێ ب رێڤە دچیت ببینیت، و گوه ل دەنگێ سمێن هەسپەکێ دی هەیە بەری دیار ببیت، و خودانێ خۆ هشیار کەت.

و هەسپ نەراوەستیت ل سەر زێدەبوونێ (التناسل) ئەگەر ب ناڤ سالڤە ژی بچیت، ((الخَيلُ مَعقودٌ فيِ نَواصيها الخَيرُ))، دیسا برینێن هەسپی و نەخۆشییێن گەلەك زوی چێدبن، کو زویتر ژ یێن مرۆڤی، و هەستییێن وی ژی دەمێ دەرزین و شکەستنێ گەلەك زوی چێدبن، و ئالیکەکا کێم تێرا هەسپی هەیە داکو گەلەك ببەزیت.

و کۆئەندامێ هەناسێ یێ هەسپی گەلەکێ ب هێزە، و بۆرییەکا هەوای یا بەرفرەهـ یا هەی، و قەفەسەکا سینگی یا گەلەك بەرفرەهـ، ئەڤە هاریکارییا وی دکەت کو مەزنترین چەندییا هەوای هەلکێشیت، دا ببیتە هاریکار بۆ برینا رێکێن درێژ.

---

١ـ بوخاری (٢٦٩٤)، زار ئبن عومەر، موسلم (١٨٧١)، زار جەریر و ژ بلی ڤان هەردویان.

و هەسپی شیانێن خۆلبەرگرتنا زەحمەت و وەستیانێ یێن هەین، و دشێت چارێکا کێشا خۆ باری هەلگریت، ئانکو ئەگەر کێشا وی (٤٠٠) کیلۆ بیت، دشێت (١٠٠) کیلۆیان هەلگریت، و دشێت ببەتە رێکێن درێژ، و هەسپ دشێت بێی ئاڤ و خوارن دویراتییێن درێژ ببڕیت، و دیسا هەسپی بیردانکەکا گەلەك تیژ یا هەی، و ئەو جهێن لێ ژیایی د ڤێ بیردانکێدا یێن هاتینە دانان، ب ڤێ چەندێ دەمێ خودانێ وی تووشی نەخۆشییەکێ دبیت دشێت ب بیردانکا خۆ بهێتە مال، بەلکو هەسپ دشێت هویرترین جه ژ بەر بکەت، و دەنگێ خودانێ خۆ ژی دنیاسیت، خۆ ئەگەر نەبینیت ژی، حەتا دشێت خودانێ خۆ ب رێکا شێوێ سویاربوونا وی بنیاسیت، یان ب بێهنا وی، یان ب رێکا دەنگێ وی.

و هەسپ گەلەك زوی رەتکرنا کاری بەرسڤ ددەت بۆ بزاڤێن سویارێ وی.

و ژ وان چیرۆکێن کو هاتینە ڤەگەراندن کو هەسپەکی کچا خودانێ وی لێ سویاربوو بەلێ هەسپ ترسیا، ئەڤ کچە ژ سەر پشتا خۆ ئینا خوارێ، پاشی هەسپ غار دا و رەڤی وەك وەفادارییەك بۆ خودانێ خۆ ژ هندێ کو خرابییەکێ بگەهینیتە کچا وی.

و هەسپ ژ زیرەکترین گیانەوەرایە، و ب ئەختوبارترینێ وانە، و تشتێ دلان دبەت ـ وەکی د هندەك ڤەکۆلینێن زانستیدا هاتی ـ کو سویارییا هەسپی مرۆڤی ژ نەخۆشییێن دلی، و مێلاکێ، و هەردو گولچیسکان، و نەخۆشییێن کۆئەندامێ هەرسکرنێ دپارێزیت، بەروڤاژی ئالودەبوونا (إدمان) سویاربوونا ترومبێلێ مرۆڤی تووشی نەخۆشییێن دلی، و گولچیسك، و مێلاکێ دکەت.

و شاعرێ سەردەمێ جاهلییەتێ[1] بەحسێ هەسپێ خۆ دکەت:

---

١ـ ئەو ژی عەنتەرەیە، و ئەو دو دێرە ژ (مُعَلَقة)یا وی ئەوا سەرێ وێ دبێژیت:

هل غادرَ الشُعراءُ من مترَدَم ... ام هل عرفتَ الدَارَ بعدَ توَهُم

فارَورَ من وقْع القنا بلَبانهِ          وشكا إليَ بعَبْرةِ وَتحَمْحُم

لو كان يدري ما المُحاورةُ أشتكى          وَلكَانَ لو علِمَ الكلامَ مُكَلِمي

و ئەڤ هەردو بەیتە دسەلمینن ل سەر زیرەکییا هەسپی و ئەختوبارییا وی بۆ خودانێ وی، و پێغەمبەری ﷺ راست یا گۆتی دەمێ دبێژیت: ((الخَيلُ مَعقودٌ في نَواصيها الخَيرُ إلى يَومِ القِيامَةِ))[1].

---

[1] - ژێدەر بەری نوکە پێ هاتییە دیارکرن.

# زەرافە

خودێ دبێژیت: (صُنْعَ اللَّهِ الَّذِي أَتْقَنَ كُلَّ شَيْءٍ) [النمل:٨٨]، ئانكو: ئەڤە چێكرنا خودێیە، ئەوێ هەمی تشت موكوم و بنەجھ چێكرین)، دیسا دبێژیت: (مَا تَرَى فِي خَلْقِ الرَّحْمَنِ مِنْ تَفَاوُتٍ) [الملك:٣]، ئانكو: دانان و رانان و چێكرنا خودێ یا وەسایە تو چو ڤێككەڤتنێ تێدا نابینی).

زەرافە، ئەو گیانەوەرە كو دهێتە هژمارتن ژ درێژترین گیانەوەران، درێژاهییا وێ پتر ژ شەش مەتران، ئەڤ گیانەوەرە ژ هشیارترین گیانەوەرایە، خودێ دو چاڤێن مەزنێن بلۆق یێن داینێ، دشێت (٣٦٠) پلەیان ببینیت، و ئەو یا راوەستیایی، سەرێ وێ وەكی بورجییە، و كێشا وێ نێزیكی تەنەكێیە، و دەمێ غار ددەت لەزاتییا وێ دگەهیتە (٦٠) كیلۆمەتران د دەمژمێرەكێدا.

ستۆیەكێ هەی درێژترین ستۆیە د ناڤ هەمی بوونەوەرێن خودێ ئافراندین، كو پتر ژ دو مەتران، سەرێ وێ یێ مەزنە، من ژ ڤی بابەتی تشتەك دڤێت، ئەو ژی ئەڤ سەرێ مەزن، و ئەڤ ستۆیێ وێ یێ درێژ كو ژ دو مەتران پترە دەمێ سەرێ خۆ ددانیتە عەردی دا تشتەكی بخۆت، هەمی خوینا وێ دهێتە سەری، و دەمێ د سەریدا كۆم دبیت، خوینبەرێن مێشكی دراوەستن، و دەمێ سەرێ خۆ بلند دكەت، گێژ نابیت و بێ هۆش ژی نابیت، ژ بەر ڤێ چەندێ خودێ ب ئالاڤەكێ حێبەتی یا ئامادەكری و چێكری زانا مانە حێبەتی ب ڤێ چەندێ، ئەو ژی خوینبەرێن سەرێ ڤێ زەرافێ سروشتەكێ تایبەت یێ هەی، كو ڤان خوینبەران ماسولكە یێن هەین، دەمێ خوین دهێتێ فرەھ دبن هەتا هەمی خوینێ وەردگرن ئەوا هاتییە سەری ب هۆكارێ راكێشانێ.

و ڤان هەمی خوینبەران ئەزمانك پێن هەین، دەمێ ژ نیشکەکێڤە زەرافە سەرێ خۆ بلند دکەت، ئەڤ ئەزمانکە هەمی دهێنە گرتن، و دێ ئەڤ چەندییا خوینێ د سەریدا مینیت، پاشی هێدی هێدی دێ ڤەبن، وی دەمی دێ خوین پیچ پیچە چیتە خوینبەرێن لەشی ئەوێن مایی، و کارێ ڤان خوینبەران سەرنجا مرۆڤی رادکێشیت، دەمێ گەلەك خوین دهێتێ فرەهـ دبن، و وەردگرن، و دەمێ زەرافە ژ نیشکەکێڤە سەرێ خۆ رادکەت دێ خوینبەر ئەزمانکێن خۆ گرن، داکو خوین تێدا نەدەرکەڤیت، دا گێژبوون و بێ هۆشبوون چێ نەبیت، کێ ئەڤە بۆ ئامادەکرییە؟ کێ وەل ڤان خوینبەران کرییە کو ئەڤ ماسۆلکە هەبن؟

کێ ئەڤ ئەزمانکە کرینە د ڤان خوینبەراندا؟ ئەرێ ما ئەو نە پڕ زانا و خودان حیکمەتە؟ ئەرێ ئەو نە پڕ زانا و شارەزایە؟ ئەرێ ما ئەو نە ئافرێنەرێ خودان شیانە؟ ما ئەو نە دەولەمەند و شایی سوپاسییێیە؟

چو ئافراندی نین د عەردیدا، و ل ژێر عەردی، و ل سەر عەردی، ئەگەر خودێ نەئافراندبیت ب داهێنانترین چێکری، و پێن چێکری ب چێکرنەکا موکوم و بنەجهـ، خودێ دبێژیت: (مَا تَرَى فِي خَلْقِ الرَّحْمَنِ مِنْ تَفَاوُتٍ فَارْجِعِ الْبَصَرَ هَلْ تَرَى مِنْ فُطُورٍ) [الملك:٣]، ئانکو: دانان و رانان و چێکرنا خودێ یا وەسایە تو چو ڤێککەڤتنێ تێدا نابینی، چاڤێت خۆ بگێڕە تو چو تیك و دەرزان ل عەسمانان نابینی.

دلێ زەرافێ د هەر خۆلەکەکێدا، پێنجی و پێنج لیترێن خوینێ دهاڤێت.

خودێ دبێژیت: (قُلِ انْظُرُوا مَاذَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَا تُغْنِي الْآَيَاتُ وَالنُّذُرُ عَنْ قَوْمٍ لَا يُؤْمِنُونَ) [یونس: ١٠١].

هەر تشتێ چاڤێ تە بکەڤیتە سەر ئەو نیشانەکا بەلگەیە ل سەر مەزناهییا خودێ، و هەر تشتێ تو سەح دکەیێ، هەر تشتێ دویڤچۆنێ بۆ دکەی، و هەر تشتێ هویربینییێ تێدا دکەی، ئەو نیشانەکە دسەلمینیت کو خودێ ئێکە، و تاك و تەنیایە، و ئەو تاکێ هەوجەییا هەمیان دڤەتینیت.

# بەراز و حیکمەت ژ حەرامکرنا خوارنا وی

من گۆتارەك خواند کو کورتییا پەرتۆکەکا زانایەکێ رۆژئاڤابوو ل سەر بەرازی دئاخفت، ناڤەرۆکا وێ ئەو بوو دەمێ خودێ خوارنا گۆشتێ بەرازی حەرامکری، ڤێ حەرامکرنێ حیکمەتەك یا بۆ هەی.

خودانێ ڤێ پەرتۆکێ دبێژیت: ((بەراز گیانەوەرەکێ گۆشت خۆر و گیا خۆرە، و هەمی شەریعەتان گۆشتێ وی حەرام کرییە، و بەرازی سروشتەکێ هەی ژ پیسترین سروشتایە، کو بێ فامی، و پیساتی، و بێ رەوشتی، یا ل دەڤ هەی، و ل چو هەڤشێوێن خۆ یێن بەراز نابۆریت هەتا دچیتە دەڤ دایکا خۆ)).

تشتەکێ دی، خۆشترین خوارن بۆ وی پیساتینە، و مشکێن مری، و خوارنا گەنی، ئەگەر بەرازەکی دانییە جهەکێ پاقژ، و ب رەخ ڤی جهیڤە پیساتی هەبن، دێ چیتە ڤی جهێ پیس و چەریت، ئەڤە تشتەکێ حێبەتییە د سروشتێ بەرازیدا!!

هێکێن کرمان چێدبیت د گۆشتێ ویدا هەبن، مرۆڤ ژ مەترسییا وان رزگار نابیت، ئەگەر ئەڤ گۆشتە دەمژمێرەکا تمام ژی بکەلیت، و ب لێنانەکا سادە بلێنن، و بژارتنەکا سەرڤە بیت، مرۆڤ ژ مەترسییا گۆشتێ بەرازی رزگار نابیت.

من گۆت: (سبحان الله)!! گەلەك نەخۆشی و کرمێن مەترسی د ناڤ خانێن ویدا دژین، و د ناڤ گۆشتێ ویدا، و ئەڤ کرمە د قایم و پاراستینە، و ئەگەر ئەڤ گۆشتە ب لێنانەکا سادە، یان بژارتنەکا سەرڤە هاتە لێنان ئەڤ کرمە نامرن، و پێدڤییە د تەزاندنەکا ژ

سیه پله ل ژێر سفرێدا بیت، یان پتر ژ دەمژمێرەکێ بکەلینن هەتا ئەڤ کرمێن د ناڤ گۆشتێ ویدا بمرن.

دەمێ خودێ گۆشتێ بەرازی حەرامکری، حەرامکرنا وی ژ بۆ حیکمەتەکا مەزنە، ئەڤە هندەك ژ حیکمەتان بوو.

دیسا نڤێسەرێ ڤێ پەرتۆکێ دبێژیت: ((ڤی گیانەوەری کارەکێ هەی ئەو ژی پاقژکرنا عەردییە ژ پیساتییان، و گلێشان، و تشتێ گەنی)) ئەڤە کارێ وییە، و د سەر ڤێ هەمییێرا هندەك مرۆڤ خوارنا گۆشتێ بەرازی دکەنە خوارنا خۆ یا سەرەکی.

دەمێ خودێ تشتەکی حەرام دکەت ئەگەرەکێ زانستی یێ هەی د ناڤبەرا ئەنجام و ئەگەرێ حەرامکرنێدا، و هەر گۆشتەکێ تژی کرم و هێکێن کرمان بیت ئەگەر ب لێنانەکا سادە بهێتە لێنان، یان بژارتنەکا سادە، ئەڤ هێکێن کرمان نامرن، ژ بەر ڤێ چەندێ دەمێ نەخۆشی بەلاڤ دبن ل هندەك وان دەولەتێن گۆشتێ بەرازی دخۆن، تشتەکێ گەلەکێ سروشتییە، و یا هاتییە زانین کو هەر شەش حالەتێن مرنێ ئێك ژ وان ژ ئەگەرێ ڤی کرمییە کو د ناڤ خانێن بەرازیدا دژیت.

تشتەکێ دی، ئەو دوهنێن د لەشێ ڤی گیانەوەریدا رێژەکا بلند یا کۆلسترۆلی یا تێدا هەی، ژ بەر ڤێ جەلتا دلی، و رەقبوونا خوینبەران، هەشت جارکی ئەڤ نەخۆشییە پتر یێن هەین ل دەولەتێن پێشکەفتی ئەوێن گۆشتێ بەرازی دخۆن، بەرامبەر وان دەولەتێن گۆشتێ بەرازی نەخۆن.

من حەز دکر ژ ڤێ گۆتارا هاتییە بەلاڤکرن د گۆڤارەکێدا کو موسلمان بزانیت بۆچی خودێ گۆشتێ بەرازی حەرام کییە؟ و گۆتار یا درێژە، گەلەك بەرفرەهی و هویربین یێن تێدا هەین، بەلێ من هندەك ژ وان گۆتن.

ب راستی خودێ تشتێن زیان بەخش پێن حەرامکرین، و تشتێن باش و ب مفا پێن حەلالکرین، و ئەو تشتێ بۆ ناخی پێ باش بیت حەلالە، و تشتێ جەستەیێ مرۆڤی پویچ دکەت، یان عەقلێ مرۆڤی دبەت حەرامە.

و د سەر هەمییێڕا ئەگەرێ هەر فەرمانەکا خودایی ئەو فەرمانەکا خوداییە و بەس، و پشتی شەرەدەڤەکێ درێژ د ناڤبەرا دو زانایێن موسلماندا ل دۆر حیکمەتا حەرامکرنا گۆشتێ بەرازی ئەوێ پتر شارەزا د فقهیدا گۆت: بەسی تەیە د ڤێ شەرەدەڤا درێژدا بێژییە من: خودێ پێ حەرامکری.

# گیانەوەرێ وەکی کەنگەری د بیابانان‌دا دژیت

ژ حیبەتیبێن ئافراندییان گیانەوەرەك ژ گیانەوەران كو د بیابانان‌دا دژیت، ڤی گیانەوەری دو پێبێن درێژ یێن هەین خۆ پێ دهاڤێژیت، وەکی کەنگەرێ ئوسترالی، و کوریا وی داڤەکا موی یا پێڤە هەی دشێت ب ڤێ داڤێ سەمتا خۆ بگوهۆریت دەمێ خۆ دهاڤێژیت و ئەو ل هەوا وەکی دیلێ فرۆکێ ب تمامی، ڤی گیانەوەری دیاردەکا سەیر یا هەی، ئەو ژی وەکی هەمی گیانەوەرێن دی، کۆئەندامێ هەرسکرنێ (حەلکرنا خوارنێ) یێ هەی، و کۆئەندامێ هاتن و چۆنا خوینێ یێ هەی، و گەلەك شلە یێن د لەشیدا هەین، بەلێ ئەڤ گیانەوەرە ب هەمیڤە ئاڤێ ناڤەخۆت د ژیانا خۆ هەمییێدا، و خودێ دبێژیت: (وَجَعَلْنَا مِنَ الْمَاءِ كُلَّ شَيْءٍ حَيٍّ) [الأنبياء: ٣٠].

چ بوونەوەرەکێ زیندی نینە کو ئاڤ پشکەکا سەرەکی نەبیت ژ وی، بۆ نموونە، (٧٠٪) کێشا مرۆڤی ئاڤە، نینە بوونەوەرەك، و زیندەوەرەك، کو ئاڤ پشکەکا سەرەکی نەبیت ژ وی، و ئەڤ گیانەوەرە ژیانا خۆ هەمییێ چیکەکا ئاڤێ ناڤەخۆت.

هندەك زانایان دویڤچۆنا ڤی گیانەوەری کر، و دانا د کێلگەیان‌دا، و هەلگرت دا ئاڤێ ڤەخۆت بەلێ سەرنەکەتن، د ژیانا خۆ هەمییێدا ئاڤێ ناڤەخۆت، پسیارەکا مەزن: ژ کیڤە ئاڤ بۆ دهێت؟ کۆئەندامێن وی هەمی ب ئاڤن، ژ کیڤە ئاڤ دهێت؟ زانایان ل دویماهییێ ئاشکەراکر کۆئەندامێ هەرسکرنێ یێ ڤی گیانەوەری ئاڤێ دورست دکەت ژ وی هەوایێ دهەلکێشیت، و ئەڤە پێدڤی ب ئامویرێن گەلەك هویربینن، ئەڤ گیانەوەرێ د بیابانێدا دژیت، و ب کۆئەندامێ خۆ یێ هەرسکرنێ ئاڤێ چێ دکەت، کو ئۆکسجینی ژ هەوای وەردگریت، و هایدرۆجینی کو ئەڤ هەردویە پێکهاتێن ئاڤێنە، ژ هندەك تۆڤکێن

هشك يێن ئەو دخۆت، و ژ ڤی ئۆكسجین و هایدرۆجینی ئاڤ ژێ دهێته دورستكرن كو هاریكارییا وی دكەت بۆ بەردەوامبوونا ژیانا وی وەكو پێدڤی.

د گەردوونیدا تشێن گەلەك حێبەتی یێن هەین ئەگەر ئەو چاڤێن ل راستییێ دگەرن ببینن دێ مەزناهییا خودێ زانن، و خودێ ل سەر هەمی تشتان خودان شیانە، و هەر گیانەوەرەك چێ دبیت ب شێوەكی ژ مرۆڤی زیرەكتر و خودان شیانتر بیت، بەلێ مرۆڤی خودێ رێز لێ گرتییە كو ئەو ئەمانەتێ (ئەڤ ئایینە و فەرمانێن خودێ) پێ هاتییە راسپاردن هەلگریت، و ئەگەر ژ ڤی ئەمانەتی غافل بوو دێ هەر گیانەوەرەك ژ وی بلندتر و پێشكەڤتیتر بیت، چونكی ئەو نەیێ راسپاردییە، و ناهێنە ئیزادان، هزركرنێ د چێكرییێن خودێدا بكەن، چونكی د گەردوونیدا نیشانێن هەین چو ڤەبرین بۆ نینە، و د عەردیدا نیشان و بەلگە گەلەكن بۆ وان ئەوێن هەڤییێ پەسەند دكەن و پشتەڤانییا وێ دكەن؛ د خوارنا هەوەدا، و د ڤەخوارنا هەوەدا، و ژ وان دیاردێن كو هوین ل دۆر خۆ دبینن د هەر جهەكیدا، نیشانێن بەلگەنە ل سەر مەزناهییا خودێ.

## سە و ئەو نەخۆشییێن ژێ پەیدا دبن

من ڤەکۆلینەکا زانستی یا ب سەیانڤە گرێدایی خواند، کو ئەڤ ڤەکۆلینە ژ سێ فەرموودەیێن پێغەمبەری یێن سەحیح دەرئێخستینە.

یا ئێکێ: ژ زار ئیبن عومەری ژ زارێ پێغەمبەری ﷺ دئاخڤیت، گۆت: ((مَنِ اتخذَ كَلباً إلّا كَلبَ زَرعٍ أوْ غَنَم أوْ صَيْدٍ، يَنقُصُ مِنْ أجْرِهِ كُلَّ يَومٍ قِيراطٌ))[1]، ئانکو: هەرکەسێ سەیەکی نە بۆ چاندنێ یان پەزی یان نێچیرێ ببەتە دەڤ خۆ، رۆژێ ڤیراتەك ژ خێرێت وی کێم دبیت.

و د فەرموودا دووێدا: پێغەمبەر ﷺ دبێژیت: ((مَنْ اقتَدَى كَلباً لا يُغني عَنهُ زَرعاً وَلا ضَرعاً، نَقَصَ كُلَّ يَومٍ مِنْ عَمَلِهِ قِيراط))[2]، ئانکو: هەرکەسێ سەیەکی ببەتە دەڤ خۆ چو مفایێ چاندنێ یان گیانەوەری ژێ نەبینیت، رۆژانە دێ ڤیراتەك ژ کارێ وی کێم بیت.

و یا سێیێ: ژ زار عەبدوللایێ کورێ موغەففەلی دبێژیت: ((إنّي لَمِمَّنْ يَرفَعُ أغصانَ الشَّجَرَةِ عَنْ وَجهِ رَسولِ اللهِ (صلى الله عليه وسلم) وَهوَ يَخطُبُ فَقالَ: لَوْ لا أنَّ الكِلابَ أُمَّةٌ مِنَ الأُمَمِ لَأمَرتُ بِقَتلِها فاقتُلوا مِنها كُلَّ أسوَدَ بَهيم، وَ ما مِنْ أهلِ بَيْتٍ يَرتَبطونَ كَلباً، إلا نَقَصَ كُلَّ يَومٍ قِيراط إلا كَلبَ صَيْدٍ أوْ كَلبَ حَرثٍ أوْ كَلبَ غَنَم))[3]، ئانکو: من چەڤێت دارا

---

١. بوخاری (٣١٤٦)، و موسلم (١٥٧٤)، و ژ بلی ڤان هەردویان.

٢. بوخاری (٢١٩٨)، و موسلم (١٥٧٦)، و ژ بلی ڤان هەردویا ژ زار سوفیانێ کورێ ئەبی زوهەیر.

٣. (الترمذي) (١٤٨٦)، و (الدارمي) (٢٠٠٨).

ژ بەر چاڤێت پێغەمبەری ﷺ وی ڤەددان و وی خوتبە دخواند، گۆت: ((ئەگەر سە ئوممەتەك ژ ئوممەتان نەبان دا فەرمانێ ب كوشتنا وان دەم، هەر سەیەكێ رەش یێ كو چو رەنگێن دی د ناڤ رەشاتییا ویدا نەبن بكوژن، نینە هەر مالەكا سەیەكی د مالڤە گرێدەن (بخودان بكەن) ئیللا دێ رۆژانە قیراتەك ژ خێرێت وان كێم بیت سەیێ نێچیرێ یان یێ كێلانێ یان یێ بەر پەزی نەبیت)).

نڤێسەرێ ڤێ ڤەكۆلینێ، بەحسێ (٣٦) نەخۆشییان[1] دكەت سە ئەگەرێ ڤان نەخۆشییایە، ئانكو سە وەكی ناڤبرەكێیە بۆ ڤەگوهاستنا هۆكارێن ڤان نەخۆشییان، و چو رێك نینە بۆ رزگاربوونێ ژ ڤان نەخۆشییان، ب تنێ رزگاربوونە ژ سەی ب خۆ، و یا هەژییە بێژین نەخۆشییەكا گەلەكا ب مەترسی یا هەی دبێژنێ نەخۆشییا سەی، كو نەخۆشییەكا كوژەكە د ماوێ پێنج رۆژاندا دمینیت پاشی دێ تێبەت، و چێ دبیت تو پسیاركەی: ئەرێ چ گیانەوەرێن دی نینن ببنە ئەگەرێ ڤەگرتنێ، دێ بێژین: جودایی یا د ناڤبەرا واندا هەی، بۆ نموونە ـ رێژا ڤەگوهاستنا كتكان بۆ نەخۆشییان ژ (٧٪) نابۆریت، بەلێ رێژا ڤەگوهاستنا نەخۆشییان (٩٢٪) ب رێكا سایە.

ل فرەنسا ب تنێ حەفت ملیۆن سە ل سالا (١٩٧٦ز) لێ هەبوون، و ژمارا خەلكێ وێ (٥٢) ملیۆن بوون، جیهانا رۆژئاڤا چاڤدێرییەكا گەلەك ددەتە سەی كو دگەهیتە پلا نەبەر ئاقل، و هەروەكی بێ منەت بوون ژ زارۆكان ب سەیان.

و تشتێ سەیر ئەوە ئەڤ رێژا زۆر یا سەیان د بن سیبەرا بۆشاییا روحی، رۆلەكێ خراب و پیس یێ هەی د ڤارێبوونا (شذوذ)ا جنسیدا، ل ئەورۆپا و ئەمریكا.

---

١. چێدبیت ل ڤێرە پەیوەندی ب دیاركرنا وانڤە نەبیت بۆ مفایەكێ مەزن.

و د ئیسلاما مه یا ڕاستدا، و ئایینێ مه یێ پاقژ چو نینه ب هەبوونا خودانکرنا سەیێ نێچیرێ، و زێرەڤانییێ، ژ بلی ڤان ئارمانجان نابیت سه بهێته خودانکرن، ((مَنِ اتَّخَذَ كَلباً إلا كَلبَ زرْعٍ أوْ غَنَمٍ أوْ صَيْدٍ، يَنْقُصُ مِنْ أجْرِهِ كُلَّ يَومٍ قِيراطٌ))[1].

---

[1] - ژێدەر بەری نوکه یێ هاتییه دیارکرن.

# هەستەوەرگریّ بهیّنكرنیّ ل دەڤ سەی

خودیّ نیشانیّن حێبەتی پیّن كرینە د گیانەوەراندا، و هەر ئێك ب نیشانەكیّ پیّ تایبەتكری، و د ڤان سەیاندا هەستەوەرگریّ بهیّنكرنیّ پیّ ل دەڤ هەی كو ملیۆن جاران ژ پیّ مرۆڤی پتڕە.

د شێین هندەك گرامیّن كەرستەكیّ بیّهۆشكەر بكەینە د عەلبكەكیّدا و باش بهیّتە گرتن، و ڤی كەرستەی باش د ناڤ پەرەكیدا بپێچین، و عەلبك یا گرتی بیت و د عەلبكەكا دی یا گرتیدا، و ئەڤ هەردو عەلبكە د سندۆقەكیّدا بن، و سەد سندۆقیّن وەكی ڤیّ سندۆقیّ بینن، و سەیەكیّ ڤرێكەیێ، دێ ئەڤ سەیە چیتە وێ سندۆقا ئەڤ كەرستە تێدا د ناڤ سەد سندۆقاندا، خودیّ ئەڤ شیانە یا دایێ، و دێ پسیار ل ڤی دەمی هێتە كرن: چاوا بهێن دهێت؟ و چاوا دگەهیتە دفنا ڤی گیانەوەری؟!! ئەڤە تشتەكیّ نە د شیاناندایە.

زانستی نوی سەلماندییە كو هەر مرۆڤەكیّ ل سەر روییّ عەردی بێهنەكا تایبەت یا هەی، و بێهنا دو مرۆڤان وەكی ئێك نینە، هەتا د جێمكاندا كو ژ هێكەكێ پیّن پەیدابوویی هەر ئێكی بێهنەكا تایبەت یا هەی، ل ڤێرە تێرا هندێ هەیە كو تشتەك ژ بێهنا خوها مرۆڤی نێزیكی دفنا ڤی گیانەوەری ببیت، و ئەگەر ئەڤ مرۆڤە د ناڤ سەدان هزاران مرۆڤاندا بیت، دێ سە بەرەڤ وی چیت، و ئەڤە تشتەكیّ نە د شیاناندایە.

خانێن بێهنیّ د مرۆڤیدا روبەریّ وان ژ پێنج سەنتیمەترێن دوجاری زێدەتر ناگریت، بەلێ خانێن بێهنیّ د سەیدا روبەریّ پتر ژ سەد و پێنجی سەنتیمەترێن دوجاری دگریت،

و مرۆڤی پتر ژ پێنج ملیۆن خانه یێن هەین بۆ هەست وەرگرا بێهنان، بەلێ د ڤی گیانەوەریدا پتر ژ سەد و پێنجی ملیۆن خانه یێن هەین بۆ هەست وەرگرا ڤان بێهنان.

ئەو هەست وەرگرێ بێهنێ ل دەڤ ڤی گیانەوەری ملیۆن جاران پترە ژ هەست وەرگرێ ل دەڤ مرۆڤی، ژ بەر ڤێ چەندێ هەر چەند رەڤینەرێن کەرستێن بێهۆشکەر ڤێلبازییان بکەن، و چەند د جهەکێ پاراستیدا ڤەشێرن، دێ ئەڤ گیانەوەرە شێت ڤی کەرستەی ئاشکەرا کەت، کو ئەڤ کەرستە خۆشی و شادیا خێزانان تێك ددەت.

و گیانەوەرێ راهێنان پێکری دشێت ل دویڤ بێهنان بچیت کو بێهنا مرۆڤەکێ بێهن بکەت د ناڤ سەد هزار مرۆڤاندا، ب مەرجەکی بەری وەختی تشتەك ژ بێهنا وی دابیتێ، و ئەگەر خۆ نیشانەکا سڤك ژی لێ بیت.

کی باوەر دکەت کو بیردانکا ڤی گیانەوەری دشێت ملیۆنەها بێهنان وەرگریت، و ئەگەر هاتە راهێنانکرن ل سەر ئاشکەراکرنا بێهنەکا دەستنیشانکری، هەر بێهنەکا بکەڤیتە وێ بێهنا د بیردانکا ویدا دێ ئاشکەراکەت.

تشتەکێ دی: ئەگەر تو دو ئامانان بینی، و د هەر ئامانەکیدا پێنجی لیترێن ئاڤێ تێدابن، و تو کەڤچکەکێ بچویکێ خوێ بکەیە د ئێك ژ واندا، دێ ئەڤ گیانەوەرە ئاڤا شرین و ئاڤا سویر ب رێکا بێهنێ ب تنێ ژێك جوداکەت.

تشتەکێ دی: ئەگەر تو کەڤچکەکێ خەلێ بکەیە د ناڤ پێنج هزار لیتراندا، ئانکو د پێنج تەنناندا، و تو پێنج هزار لیترێن ئاڤا شرین دانییە رەخڤە دێ سە چیتە وێ ئاڤا خەل کرییە تێدا، ئەڤە چ هەستە وەرگرێ حێبەتییە؟

و ژ تشتێن سەیر و کێم وێنەیە کو ئاماژەکرنێ بۆ هندەك دەولەتێن کو ڤی گیانەوەری ب کار دئینن بۆ ئاشکەراکرنا ژ بەرهاتنا گازێ د بۆرییێن ڤەشارتی د بن عەردیدا، ئەو

دویف ڤێ بۆریێ دچیت، و درەویت ل هەر جهێ بێهنا گازێ بچیتێ، دا جهێ ژ بەرهاتنا گازێ دەستنیشان بکەت.

خودێ ئەڤە بۆ مە بەردەست کرییە، و ئەم چ دکەین؟ ئەرێ مە شوکورا وی کرییە ل سەر ڤی گەردوونێ مەزن؟ ئەرێ مە شوکورا وی کرییە ل سەر ڤان چێکرییێن ژ بەر مە بەردەستکری؟ (هُوَ الَّذِي خَلَقَ لَكُمْ مَا فِي الْأَرْضِ جَمِيعًا) [البقرة:٢٩]، ئانکو: (ئەو خودایێ) هەمی تشت بۆ هەوە د عەردیدا ئافراندی.

# دویپشك و پەقینا ئەتۆمی

مرۆڤی تایبەتمەندی یێن هەین کو پێ دهێتە ڤەدمرکرن ژ ئافراندییێن دی، و هندەك تایبەتمەندی یێن هەین د هەڤپشکن د گەل ئافراندییان، و هەر سالۆخەتەکێ مرۆڤ شانازییێ پێ ببەت د هندەك ئافراندییێن دیدا ژ وی شیانتر و زیرەکترن تێدا، بەلێ خودێ مرۆڤ پێ جوداکری ب زانستی، و شەهرەزاییێ، و هێزا زانینێ، و مرۆڤ پێ جوداکری کو چێکرییەکێ خودان رێزە، و پێ راسپاردی بۆ ئاڤاکرنا عەردی، و راسپاردی کو نەفسا خۆ پاقژ بکەت، و ئەگەر مرۆڤی خۆ مژویلی وی تشتی کر یێ پێ ڤەدەر باشترە بۆ وی کو بزاڤێ بکەت بۆ سەرکەفتنێ د هندەك تشتاندا کو خودێ هندەك چێکرییێن خۆ پێ ڤەدمرکری ل سەر وی.

گۆتارەك کەڤتە د دەستێ مندا، ناڤەرۆکا وێ ئەو بوو کو فرەنسا بەری پێنجی سالان د بیابانا جەزائیرا رۆژئاڤادا رابوو ب پەقینەکا ئەتۆمی، و ئەڤ پەقینا ئەتۆمی وەکی دهێتە زانین، گورپیەکا سۆتێنەرە، یان پەستانەکا وێرانکەرە کو تشتەکی ناهێلیت، نە رووەکی، و نە گیانەوەری، و نە مرۆڤی، و ڤێ پەقینێ چالەکا گەلەك مەزن دورست کر، و تەپەکا ئاگری ژێ پەیدابوو ل سەر رووبەرێن بەرفرە کەفت و بلند بوو، و پشتی پەقین ب دویماهی هاتی و عەرد تەنا بووی؛ دویپشکەك دیت یێ ل جهێ پەقینێ دچیت، ئەڤە تشتەکێ نەچاڤەرێکری یێ سەیر و حێبەتی بوو.

زانا چارێکا سەدی مانە پێڤە بۆ ڤەکۆلین و دویڤچۆنا دویپشکی، بۆ وان دیار بوو کو دویپشك دشێت بێی خوارن و ڤەخوارن بۆ ماوێ سێ سالێن ل دویف ئێکدا بمینیت، و دیت دویپشك دشێت هەناسا خۆ ل بن ئاڤێ بۆ ماوێ دو رۆژێن تمام بگریت، و بۆ وان

دیار بوو ئەگەر مرۆڤ دوپیشکی بکەتە د سەلاجەکێدا د پلا دەه بن سفرێدا، پاشی ببەتە سەر خیزێ گەرما بیابانێ د پلا شێستێدا، دێ خۆ د گەل ڤێ گوهۆرینا گەلەکا جیاواز گونجینیت، پاشی داننە د سەرشۆیەکا تژی میکرۆبڤە چ کارتێکرن لێ ناهێتە کرن، و هەروەکی ئەو د سەرشۆیەکا سارڤە، پاشی دانینە بەر تیشکا ئەتۆمی کو زێدەتر بیت ژ سێ سەد جاران ئەوا مرۆڤ خۆ ل بەر دگریت، دێ دوپیشک خۆ ل بەر گریت، و هاتە تویکارکرن (تشریح) کو خوین د لەشێ ویدا نینە، بەس شلەکێ زەر یێ هەی، ئەڤە چ نیشا مە ددەت؟

ئەڤ ڤەکۆلینە نیشا مە ددەت کو مرۆڤ زوی ژ ناڤ دچیت، خۆ ل بەر سیە و حەفت پلێن گەرمێ دگریت، خۆ ل بەر چل پلان ناگریت، و سفر پلە.

خودێ حەز کر کو مرۆڤ یێ هەستیار بیت، و د شیاندا بوو کو وەکی ڤی چێکری بیت، ب چو تشتان کارتێکرن لێ نەبیت، و نەخۆش نەبیت، بەلێ نەخۆشی پەنجەرەکە بۆ عەسمانی ل بەر مرۆڤی ڤەدبیت، دوپیشك چێکرییەکێ بچویکە چو کەس پویتە پێ ناکەت، بەلکو دەمێ دبینیت دکوژیت، دوپیشکی ئەڤ موکومییە یا هەی، کارتێکرن لێ نەبوو د چالا پەڤینا ئەتۆمیدا، و ما ساخ و ب رێڤە چۆ.. رامانا ڤێ چەندێ ئەوە کو د نەخۆشییێدا حیکمەتەك یا هەی هندەك جاران ئەم ژ بیر دکەین، و د شیاندا بوو، و خودێ ل سەر هەمی تشتان خودان شیانە، کو مە ئەڤ موکومییە هەبیت، نە نەخۆشی، و نە نەخۆشخانە، و نە بلندبوونا پەستانێ، و نە نەخۆشییا دلی، و نە یا هەردو سیهان، و نە وەرەمان، و نە تشتەکێ وەکی ڤان.

خودێ وەسا حەز کر کو مرۆڤ تووشی بەلا و نەخۆشییان ببیت، چونکی د نەخۆشییێدا حیکمەتەکا مەزن یا بۆ هەی، چێدبیت ئاشکەرا بیت، و چێدبیت بەرزەبیت، د گەل هندێ خودێ دشێت وەل مرۆڤی بکەت کو یێ پاراستی بیت ژ نەخۆشییان، و دویر بیت ژ نەخۆشخانان، بەلێ نەخۆشی پەنجەرەکە بۆ عەسمانی.

# حەرامكرنا خوینێ

خودێ دبێژیت: (قُلْ لَا أَجِدُ فِي مَا أُوحِيَ إِلَيَّ مُحَرَّمًا عَلَى طَاعِمٍ يَطْعَمُهُ إِلَّا أَنْ يَكُونَ مَيْتَةً أَوْ دَمًا مَسْفُوحًا أَوْ لَحْمَ خِنْزِيرٍ فَإِنَّهُ رِجْسٌ أَوْ فِسْقًا أُهِلَّ لِغَيْرِ اللَّهِ بِهِ فَمَنِ اضْطُرَّ غَيْرَ بَاغٍ وَلَا عَادٍ فَإِنَّ رَبَّكَ غَفُورٌ رَحِيمٌ) [الأنعام:١٤٥]، ئانكو: (هەی موحەممەد) بێژە: (گاورێت مەكەهێ) ئەز د وێ وەحییێدا یا بۆ من هاتی (كو قورئانە) تشتەكێ حەرام و نەدورست ل سەر هەر ئێكێ هەبیت نابینم، ژ بلی مراری یان ژی خوینەكا رۆن یان ژی گۆشتێ بەرازی، نێ ئەو یێ پیسە، یان ژی ژ گونەهـ ناڤێ غەیری خودێ ل سەر ئینا بیت، ڤێجا هەر كەسێ نەچار ببیت (ژ برساندا ژ حەرامێ بۆری بخۆت) بەلێ بێی دل ل سەر هەبیت و زێدە بدەتە بەر (چو گونەهـ ل سەر نینە)، ب راستی خودایێ تە گونەهـ ژێبەر و دلۆڤانە.

زانا چ دبێژن بۆ خوینێ؟..

خوین ژەهرێ دهەلگریت، و گەلەك بەرمایكان، و كەرستێن زەرەرمەند، ژ بەر ڤێ چەندێ چونكی ئێك ژ كارێن خوینێ ئەوە ڤەگوهاستنا بەرمایكێن لەشی و ژەهراوی دهاڤێژیت، و گرنگترین كەرستێن كو د ناڤ خوینێدا هەین یوریك و ترشێ میزێیە، ئەڤە كەرستێن دویماهییێنە یێن ژ ئەنجامێ پویچبوونا پرۆتینان، و خوین هندەك ژەهرێ دهەلگریت ئەوا رویڤیك ڤەدگوهێزنە مێلاكێ ژ بەر پێدڤیيا ب راستڤەكرنا وێ، ئەگەر مرۆڤی هندەك خوین ڤەخوار، دێ ئەڤ كەرستێن مە بەری نوكە ئاماژە پێ دایی د ناڤ خوینێدا دێ هێنە مێژتن، و دێ رێژا وان د لەشیدا بلند بیت، زێدەباری وان كەرستێن كو حەلكرنا خوینێ ب خۆ دورست دكەن، ئەڤ چەندە دێ بیتە ئەگەرێ

بلندبوونا رێژا یوریك یا خوینێ، و دویڤدا ژی دێ نەخۆشبوونا مێشکی روی دەت، و ل دویماهییێ ژی بێ هۆشییە.

ئەڤەیە زانایان گۆتی ل دۆر خوینێ، دەمێ خودێ خوین حەرامکری، ئەڤ حەرامکرنە ژ بۆ حیکمەتەکا مەزنە.

خوین دهێتە هژمارتن ناڤبەینەکێ گەلەك گونجای، بۆ گەشەکرنا گەلەك جۆرێن میکرۆبان، مفا ژ ڤێ تایبەتمەندییێ دهێتە وەرگرتن د چێکرنا زەڤییێن میکرۆبان ژ خوینێ، و نابیت خوین بهێتە هژمارتن ژ خوارنێ، ژ بەر ڤێ چەندێ ئەو گیانەوەرێ ب دورستی نەڤەکوشتی نابیت بێتە خوارن، چونکی خوینا وی یا تێدا... و ڤەکوشتنا گیانەوەری ئەگەر نە ل دویڤ شەریعەتێ ئیسلامێ بیت نابیت تو بخۆی ب هەر کاودانەکێ بیت، و ئەو خوینا مایە د ناڤدا هەمی ئەو ژەهرێن تێدا، و هەمی بەرمایی و تشتێن زیان بەخش.

تشتەکێ دی، ئەڤ حوکمێ شەرعی یێ هاتییە وەرگرتن ژ ڤێ ئایەتا پیرۆز پێدڤییە یێ دیار بیت د ناڤ هش و بیرێن موسلماناندا، دەمێ گەشتە بۆ وەلاتێن رۆژئاڤای کر، ئەو گیانەوەرێ هاتییە ڤەکوشتن نە ب رێکا ئیسلامی نابیت بهێتە خوارن، بەلێ ئەگەر (بسم الله) ل سەر کر هندەك فقهناس خوارنا وی دورست دکەن، بەلێ ئەگەر نە ل دویڤ رێکا شریعەتی ڤەکوشت، ب رێکا دەرکەڤتنا هەمی خوینێ بۆ دەرڤەی گیانەوەرێ ڤەکوشتی، ئەڤە دێ زیانەکا توند گەهینیتە مرۆڤی، و دێ کەڤیتە سەرپێچییا فەرمانا (گونەهێدا) خودێدا.

# خوینا رژیایی و پەیوەندییا وێ ب میکرۆبانڤە

خودایێ مە خوینا رژیایی ل سەر مە حەرام کرییە، و ئەڤە ژ ئیعجازا زانستییە د گۆتنا خودێدا: (قُلْ لَا أَجِدُ فِي مَا أُوحِيَ إِلَيَّ مُحَرَّمًا عَلَى طَاعِمٍ يَطْعَمُهُ إِلَّا أَنْ يَكُونَ مَيْتَةً أَوْ دَمًا مَسْفُوحًا) [الأنعام:١٤٥]، و د پەیڤا: (مَسْفُوحًا) ئاماژەیە بۆ هندێ کو ئەڤ خوینا رژتی جهێ میکرۆبانە، ژ بلی کو د لەشیدا کۆئەندامێن هەین ب بلندترین ئاست بۆ زەلالکرنێ، ئەو ژی هەردو گولچیسك و هەردو سیهن بەردوەام خوینێ ژ گازان و کەرستێن ژەهراوی پاقژ دکەن، و هەردو گولچیسك خوینێ ژ کەرستێن ژەهراوی پاقژ دکەن، و هەردو سیهان ژ گازێن ژەهراوی پاقژ دکەن، بەلێ دەمێ گیانەوەر دمریت دێ خوین بیتە جهێ میکرۆب و پیساتییان، ژ بەر ڤێ چەندێ ئەو تشتێ سەرنجا مرۆڤی رادکێشیت ئەوە کو پشتی جیهانا رۆژئاڤا میکرۆب ئاشکەراکری یاسایێن قەدەغەکرنا خوینێ دەرکرن، و قەدەغەکرنا گۆشتێن مری، پشتی کو زیانا وێ زانی، بەلێ خودێ د قورئانا پیرۆزدا بەری (١٤٠٠) سالان خوینا رژیایی و گۆشتێ گیانەوەرێ مری ل سەر مە یا حەرامکری.

ئەو تشتێ ڤێ راستییێ دوپات دکەت ئەوە کو هەر ساتۆرەکا قەسابی هزاران میکرۆب پێن پێڤە، و دەمێ ئەڤ میکرۆبە دگەهنە خوینێ دێ هەر نیڤ دەمژمێرەکێ میکرۆب چێ بن و زێدەبن، و د سێ دەمژمێراندا ژ هزار میکرۆبان دێ بنە سەدان سەدان هزاران میکرۆب، و ژ بەر ڤێ چەندێ دەمێ خودێ د پەرتۆکا خۆ یا پیرۆزدا خوین و گۆشتێ مری ل سەر مە حەرامکری، دێ بینین کو ئەڤە رێك دکەڤیت د گەل نویترین بیردۆزێن زانستی یێن گرێدایی ب زێدەبوونا میکرۆبانڤە، و ب ڤەگرتنێڤە، و دەمێ تو قورئانێ دخوینی پێدڤییە بزانی کو ئەڤە ئاخڤتنا ئافرێنەرییە، (وَلَا يُنَبِّئُكَ مِثْلُ خَبِيرٍ) [فاطر:١٤]، ئانکو: کەس وەکی من یێ شارەزا، تە ئاگەهدار ناکەت. (و چو شارەزا تە

ئاگەهدار ناکەن وەکی ڤی شارەزایێ ئەڤە بۆ تە گۆتی کو خودێیە)، و چو ئالییان شارەزاییەکا مەزنتر نینە، و راستتر نینن د ئاراستەکرن و شیرەتێن خۆدا ژ ئافراندنەرێ گەردوونی.

و ئەڤ پەیڤە: (دَماً مَسْفُوحًا)، دوپات دکەت کو ئەڤ خوینا د لەشیدا دهێت و دچیت خوینەکا پاقژە، و دەمێ هاتە رژتن دێ تژی میکرۆب بیت.

و عەرەبان بەری ئیسلامێ خوین دکرە د رویڤیکاندا و دبژارت و دخوار، و نوکە ل وان وەلاتێن کو ل دویف فەرمانا خودێ ناچن دورست دکەن گۆشتی د گەل خوینا وی بخۆن، ژ بەر ڤێ چەندێ گیانەوەر گەلەك ئێش و ئازاران دبەت، و ناهێتە ڤەکوشتن، و پرت پرت دکەن، و ئەڤ پێنج لیترێن کو خوینا ڤی گیانەوەرییە د میننە د گۆشتێ ویدا، و ئەگەر تە بەختەوەری بۆ خۆ بڤێت، و تە بڤێت تو ژ نەخۆشی و بەرتەنگییێن ژیانێ قورتال بی دێ رێنماییێن چێکەری (خودێ) ب جه ئینی، و ئەڤ قورئانا پیرۆز رێنمایی و زانیارییێن خودێنە، و ئەڤەیە کو دڤێت مرۆڤێ باوەردار تێبگەهیت، و فەرمانێن ئایینی نەتخویبەکە بۆ ئازادییا وی، بەلکو گرنتییەکە بۆ ساخلەمی و خۆشییا وی.

ئەگەر تە ستوینەکا کارەبێ دیت ل سەر نڤێسییە: ((مەترسییا مرنێ))، ئەرێ تو دێ هەست کەی کو بەرپرسان ئەڤ تابلۆیە یێ دانای دا ئازادییا تە تخویب بکەن، نەخێر، بەلکو یێ دانای دا سلامەتییا تە بپارێزن.

پێدڤییە ئەم ب ڤێ تێگەهشتنا کویر د ئایینی بگەهین، و ئەگەر تە پرەك دیت و تابلۆیەك ل سەر بوو ل سەر نڤێسییە: ((دویماهیك راگرتنا باری پێنج تەنن))، و تو یێ بارهەلگرەکا بارێ وێ حەفت تەن دهاژۆی، و ئەگەر تە ڤیا د سەر ڤێ پرێرا بچی، ما دێ بێژی: ئەرێ سەرپێچییێ بکەم؟ ئەرێ کەسەك زێرەڤانییا من دکەت؟ نەخێر، ئەڤ کێشە ژ وێ چەندێ کویرترە، کەس زێرەڤانییا تە ناکەت، و ئەگەر تو د سەر ڤێ پرێرا چۆی چو پێ نەڤێت دێ ئەڤ پرە کەڤیتە د رویباریدا، ئەڤ تابلۆیێ ل سەر ڤێ پرێ

نفێسی نە تخویبەکە بۆ ئازادییا تە، بەلکو گرنتییەکە بۆ سلامەتییا تە، ئاها هۆسا دڤێت مرۆڤێ باوەردار تێبگەهیت، ژ بەر ڤێ چەندێ خودێ تخویب یێن دانایین، خودێ دبێژیت: (تِلْكَ حُدُودُ اللَّهِ فَلَا تَعْتَدُوهَا) [البقرة:٢٢٩]، ئانکو: ئەڤە بڕیار و تخویبێت خودێنە نەدەنە سەر.

وەکی تەزۆیێ (تیار) کارەبایی یێ بلند وی نەرحەت و دلتەنگ دکەت، ل دۆر ڤی تەزۆیی گۆرەپانەك هەبیت بهێتە کێشان بۆ ڤێ گۆرەپانێ، ئەگەر سەرپێچی (گونەه) ژ ڤی جۆری بن دێ ئەڤ ئایەتە ب جه ئێت: (تِلْكَ حُدُودُ اللَّهِ فَلَا تَقْرَبُوهَا) [البقرة: ١٨٧]، ئانکو: ئەڤە تان و پەژانێت خودێنە، خۆ نێزیك نەکەن.

و دویراتییەکا مەزنە د ناڤبەرا (فَلَا تَعْتَدُوهَا)، و (فَلَا تَقْرَبُوهَا)، ئەو تخویبێن مەیسمێ وێ ئەو بیت کو مرۆڤی ب خۆ بکێشیت نێزیك نەبە.

خودێ دبێژیت: (وَلَا تَقْرَبُوا الزِّنَا) [الاسراء:٣٢]، ئانکو: نێزیکی زنایێ و دەهمەن پیسییێ نەبن، زنا پێنگاڤن، و خودێ دبێژیت: (تِلْكَ حُدُودُ اللَّهِ فَلَا تَقْرَبُوهَا)، و خوارنا مالێ حەرام، (فَلَا تَعْتَدُوهَا)، ئانکو: نەدەنە سەر، و د سەر هەمیێڕا ئەو تخویبێن سلامەتییا تەنە، ئەگەر ئەم بێژین: تخویبێن خودێ، ئەو تخویبێن سلامەتییا تەنە، و دا خودێ ژ تە رازی بیت، و دا هەژی چاڤدێرییا خودێ بی، و دا هەژی پاراستنا خودێ بی، ئەڤە هەمی ژ تخویبێن خودێنە، و ئەگەر تو د گوهدانا خودێدابی تو یێ د ئێمانەت و پاراستن و رازیبوونا ویدا، و ئەگەر ئەم ڤەکۆلینا هەر گوهدانەکا خودێ بکەین، و هەر سەرپێچییەکێ دێ زانین، و گوهدانا خودێ دکێشیتە باشییان کو چو تخویب بۆ نینە، و سەرپێچی دکێشیتە خرابییێ کو چو تخویب بۆ وێ نینە، بەلێ ل سەر مرۆڤی پێدڤییە تێبگەهیت، و ل سەر وی پێدڤییە تەسلیم ببیت بۆ وی تشتێ تێنەگەهیت.

# حیکمەت ژ ڤەکوشتنا حەلال

ژ بەلگەیێن پێغەمبەربوونا پێغەمبەری ﷺ ئەڤ بابەتێ زانستییە، ڤەکوشتن، و ل دویڤ شیرەتکرنا پێغەمبەری ﷺ ئەو ژی ڤەکوشتن ب رێکەکا دەستنیشانکری، و ئەڤ چەندە چێدبیت ب برینا خوینهێنەرا سەرەکی ب تنێ، و ئەو کەسێ ب ڤەکوشتنێ رادبیت نابیت سەری هەمییێ ببڕیت، و چو رێکێن زانستی نەبوون نە ل سەر دەمێ پێغەمبەری ﷺ و نە د گزیرتا عەرەبی و نە د مەلبەندێن شارستانی یێن رۆژهەلات و رۆژئاڤادا کو بزانن ئەگەرێ ڤێ شیرەت و ئاراستەکرنێ چییە، بەلکو نە ل سەردەمێ دویڤ سەردەمێ پێغەمبەریدا ﷺ ژی نەبوون، هەتا ل دویماهییێ ئاشکەراکری بەری چەند دەه سالان کو دل ـ دلێ مرۆڤی و دلێ ئاژەلێ ڤەکوشتی ـ لێددەت ب هۆشدارییا خۆیەتی کو ژ مەلبەندێ کارەباییێ د دلیدا دهێت، و د گەل ڤی مەلبەندێ ئێکێ دو مەلبەندێن کارەبایی یێن یەدەکێن دی یێن هەین بۆ ڤی مەلبەندی، یێ دوییێ کار دکەت دەمێ یێ ئێکێ ژ کارکەڤت، و یێ سێیێ کار دکەت دەمێ یێ دوییێ ژ کار دکەڤیت، بەلێ ئەڤ هۆشدارییا خۆیەتی کو ژ دلی دهێت لێدانا سروشتی ددەتە دلی (هەشتێ لێدان د خولەکەکێدا، چو دی نە)، بەلێ دەمێ زیندەوەر تووشی مەترسییەکێ بوو، و پێدڤی ب سەد و هەشتێ لێدانان دبیت د خولەکەکێدا دا خوین ب لەز بکەڤیت د لولەیێن خوینێدا، و دا شیانا ماسولکەیی بلند بیت ژ بەر پێدڤییا وێ ب خوینێ ل ڤێرە دێ پێدڤی کەت کو فەرمانەکا چێتر یا کارەباییا هۆرموونی دێ هێت ژ رژینا ژێر مەژی د مێشکیدا بۆ رژینا ئەدرینالی، پاشی بۆ دلی، و ئەڤە دێ وەل سەرێ ئاژەلی کەت کو ب کەلەخێ ویڤە بمینیت، هەتا ئەڤ فەرمانا چێتر یا کارەبایا هۆرموونی لێدانێ بلند دکەت.

و لێدانێن دلی پشتی ڤەکوشتنێ - د ماوێ هەبوونا پەیوەندیەکێ د ناڤبەرا مێشکی و دلیدا - دێ خوینێ هەمییێ هاڤێژیتە ژ دەرڤەی لەشی، دێ ئەڤ گیانەوەرێ ڤەکوشتی پاقژ بیت و رەنگێ وی پیڤازی بیت، و یا هاتییە زانین کو کارێ دلی د دەمێ ڤەکوشتنا ئاژەلیدا دەرئێخستنا هەمی خوینێیە ژ لەشێ وی، و لێدانا سروشتی تێرا هندێ ناکەت بۆ دەرئێخستنا هەمی خوینێ د لەشێ ئاژەلێ ڤەکوشتیدا، و ئەگەر سەر هەمی ژێ ڤەکر دێ دل ژ هۆشدارییا (إستثنائي) یا کارەبایی یا هۆرموونی بێ بەهر بیت کو هاریکارییا دەرئێخستنا هەمی خوینێ دکەت ژ ڤەکوشتی، ل ڤی دەمی خوینا ئاژەلی دێ مینیتە د ناڤدا، و ناهێتە ڤەشارتن کا د ڤێ چەندێدا ژ زیان گەهاندنا ڤی گۆشتی بۆ وان کەسێن دخۆن، و دەمێ خوینا ئاژەلی دمینیتە د ناڤ گۆشتیدا مەترسییە ل سەر ساخلەمییا مرۆڤی، چونکی خوین د ژیانا ئاژەلیدا دهاتە زەلالکرن ب رێکا هەردو سیهان و هەردو گولچیسکان، بەلێ پشتی ڤەکوشتنێ دێ خوین بیتە ژینگەهەکا باش بۆ گەشەکرنا میکرۆبێن کوژەك، ژ بەر کو دێ ترشێن ژەهراوی ژێ هێن کو زیانێ دگەهیننە مرۆڤی ب ئەگەرێ هەبوونا وان د لەشێ ئاژەلیدا، و ب ڤێ گۆشت هەمی دێ ژەهراوی بیت، و ژ ئەگەرێ ترشێ یوریك د خوینێدا، و ژ هەبوونا خوینێ د ناڤ گۆشتیدا ئەڤ هەمییە دێ چیتە ئەوێن ڤی گۆشتی دخۆن، و ئەگەر مرۆڤی ئەڤ گۆشتە خوار دێ تووشی ئێشانێن گەهان بیت، چونکی ترشێ یوریك دێ بیتە گیرهە د ڤان گەهاندا، و ژ بەر ڤێ چەندێ پاقژییا ڤەکوشتنا ئاژەلی ئەوە کو خوین ژێ دەرکەڤیت، و خوین هەمی ژێ نادەرکەڤیت ب تنێ ئەگەر سەر پێڤە بمینیت دێ ژێ دەرکەڤیت.

کێ ئەڤ راستییە بۆ پێغەمبەری ﷺ گۆتنە کو بەری دەمەکێ یێن ئاشکەراکرین، ژ بەر کو فەرمانا هەڤالێن خۆ دکر ب برینا لۆلەیێن خوینێ یێن ستۆیێ ئاژەلی بێی ژێڤەکرنا سەری، وەکی باراپتری جهێن سەرژێکرن و کەلاشتنا ئاژەلی د جیهانا نەیا ئیسلامیدا ڤێ چەندێ دکەن؟

ئەڤ فەرموودا پێغەمبەری ژ بەلگەیێن پێغەمبەربوونا موحەممەدینە ﷺ.

هەر تشتەكێ خودێ ل سەر مە حەرامكری ژ بەر هندێ یێ حەرامكری چونكی ئەو یێ پڕ زانا و شارەزایە، خودێ دبێژیت: ﴿وَلَا يُنَبِّئُكَ مِثْلُ خَبِيرٍ﴾ [فاطر:١٤]، و ژ بەر كو وی ئەم یێن ئافراندین، و ئەو پتر دزانیت كا چ بۆ مە یێ باشە و مفایێ مە تێدایە، و ئەوێ سەرپێچییا فەرمانا خودێ بكەت ل سەر وییە بهایێ وێ بدەت.

و ژ سوننەتێن پێغەمبەری ﷺ خوین هاتنە، و بڕینا لۆلەیێن خوینێ یێن ستۆیێ ئاژەلی، چونكی دڤێت ئەڤ خوینە دەركەڤیت كو هەمی هۆكارێن نەخۆشییێ د لەشێ ئاژەلیدا یێن تێدا، و زانا دبێژن: ((ئەو ئاژەلێ خوین دمینیتە د شانێن لەشێ ویدا ڕەنگێ وی سەر ب ڕەنگێ شینیڤە دچیت، و دەمێ ئەڤ خوینە دمینیتە د ناڤ شانا ماسۆلكەییدا حەل دبیت، و ترش ژێ دەردكەڤن ئەڤە وەلێ دكەت كو گۆشت هشك و ڕەق ببیت، و پشتی سێ دەمژمێران میكرۆبێن هەوایی و نەهەوایی ب تنێ دێ مینن كو ڤان شانێن گۆشتی پویچكەن یێن كو خوین تێدا مای، و ئەڤ كارلێكە پێكهاتێن بێهنێن نەخۆش ژێ چێ دبن، ژەهراوییەكا كارتێكەرە، و دێ گۆشت وان گازێن چێبوویی هاڤێت)).

ژ بەر ڤێ چەندێ دەمێ پێغەمبەری ﷺ نیشا مە دایی كو دڤێت ئاژەل بهێتە ڤەكوشتن ژ لۆلەیێن خوینێ یێن حەفكێ، و ژ بەر كو دا خوین ژ لەشی دەركەڤیت، و دا گۆشت بمینیت یێ پاقژ و ب تام.

ل ڤێرە حیكمەتا خودایێ مە كو ل سەر مە حەرامكرییە خوارنا ئاژەلێ (المُنخَنِقةُ)[1] تەرشا هاتییە فەتساندن، و (الموقوذةُ)[2] تەرشا ب لێدانان (داروبەران) كوشتی، و

---

١. تەفسیرا (طبري) (٦/٦٨).

٢. [و ژ زار قەتادەی د گۆتنا ﴿وَالْمَوْقُوذَةُ﴾: ل سەردەمێ جاهلییەتێ (بەری ئیسلامێ) ب گوپالی لێ ددا هەتا دمر پاشی دخوار]، تەفسیرا (طبري) (٦/٦٩).

(الُمتَرَدِّيةُ)[1] تەرشا دهێته هاڤێتن ژ جهەکێ بلند بۆ جهەکێ نزم و دمریت، و چ ئەڤ هاڤێتنه ب خۆ بیت یان ئێك باڤێژیت، و (النَّطِيحةُ)[2] ئەوا ب قۆچا ئێکا دی مربیت، و گۆشتێ دهەبەیان خواری، د ڤان کاودانان هەمییاندا خوین دمینیته د لەشێ ئاژەلیدا، و هەمی هۆکارێن نەخۆشییێ یێن د خوینێدا هەین، و هۆکارێن رزین و رەقبوونێ، و هۆکارێن پڤبوونێ، لەوا پێدڤییه ڤەکوشتنا ئاژەلی ل دویڤ رێکا شەریعەتی بیت.

بەلێ پێغەمبەری ﷺ مەرجێ هاتنا خوینێ بۆ ماسی نەدانایه، و چێدبیت ئێك پیسارکەت: بۆچی ئەم ماسی مری دخۆین؟ و ئەرێ خوینا ماسی نه ژ خوینا ئاژەلێن دینه؟ زانا بەرسڤا ڤێ پسیارێ ددەن کو خودێ تایبەتمەندییەکا کرییه د ماسیدا، و ئەو ژی دەمێ ماسی دهێته نێچیرکرن، و ژ ئاڤێ ئینا دەر، و دمریت دێ خوینا وی هەمی د گوهێن ویدا کۆم بیت، و هەر وەکی ڤەکوشتی، ژ بەر ڤێ چەندێ تو دشێی ئەو ماسییێ نوی هاتییه گرتن جودا بکەی ژ ماسییێ کەڤن ب رێکا گوهێن وی، و ئەگەر یا تژی خوینا سۆر بیت ماسی یێ تەر و نوییه، و ئەگەر گوهێن وی رەنگێ شین بن رامانا وێ دەمەك یێ ل سەر گرتنا ویڤە چۆیی، ژ بەر ڤێ چەندێ پێغەمبەری ﷺ ماسی یێ ڤەدەرکری ژ گیانەوێن دی کو دورست کرییه ب مری بخۆن، و ئەڤه ژ بەلگەیێن پێغەمبەربوونا وینه، و ئەو ژ دەڤ خۆ نەدئاخڤت، و دەمێ فەرمان ل مە کری ب ڤان سوننەتان چونکی بۆ حیکمەتەکێ دچیت کو زانستی پیچ پیچه یا ئاشکەراکری ژ دویراتی و هویربینی و حیکمەتێن وێ.

# پشکا هەشتێ

---

١ـ تەفسیرا (طبري) (٤٩/٦).

٢ـ تەفسیرا (طبري) (٤٩/٦).

# ماسی

1- نەهنگ

2- ماسی، پەرێن وی، و پیڤەرێ پەستانێ ل دەڤ وی

3- ماسییێ سەلەموون

4- ماسییێ هیلامی

5- ماسییێ نوژدار

6- برینێن ماسییان و لەزاتییا چێبوونا وان

7- ماسییێن دەریایی یێن کارەبایی

8- مارێ ئاڤی یێ کارەبایی

# نەهنگ

ژ نیشانێن بەلگە ل سەر مەزناهییا خودێ ئەڤ نەهنگێن کو د زەریایاندا دهێن و دچن، تشتێ سەرنجا مرۆڤی رادکێشیت ئەوە کو جۆرەکی ژ وان، ئەو ژی نەهنگێ شینە هژمارا وان پتر ژ (١٥٠) هزار نەهنگان، وەکی هندەك زانا تەخمین دکەن، و ئەڤ نەهنگە کێشا وی (١٣٠) تەنە، و درێژاهییا وی دگەهیتە (٣٥) مەتران! ئەگەر کێشا ڤی نەهنگی لێکدانی هژمارا نەهنگان بکەین، دێ ژمارەکا مەزن دەرکەڤیت، و ئەگەر ئەم دابەشی خەلکێ عەردی بکەین، دێ هەر مرۆڤەکی ژ شەش هزار ملیۆنان، چار کیلۆ گەهنێ.

و ڤی نەهنگی تێژك دبن، و ئەگەر درێژاهییا وی دەمێ ئەو کۆرپەلە د زکێ دایکا خۆدا ژ سنتیمترەکێ نەبۆریت بەلێ پشتی بوونێ دگەهیتە حەفت مەتران، و کێشا وان دگەهیتە دو تەنان، و نەهنگ دشێت بۆ ماوێ پتر ژ سیە خۆلەکان بمینیتە د بن ئاڤێدا، و مرۆڤ نەشێت بێی هەناسە پتر ژ سێ خۆلەکان بمینیت، چونکی شێوێ سروشتی یێ لەشێ نەهنگی وەدکەت ڤێ ئۆکسجینا ئەو هەلدکێشیت دهێتە عومبارکرن د ماسۆلکێن ویدا، و د خوینا ویدا، و د شانەیێن ویدا، و دەه ژ سەدێ د سیهێن ویدا عومبار دبیت، و ئەڤ نەهنگە د گۆیا عەردیدا دگەریت، د زەریا و دەریایاندا، ژ باکووری بۆ باشووری، دچیتە هەردو جەمسەران، و دزڤریتە هێلا کەمەری، و ئەو تشتێ دهێتە زانین ئەوە جوداییێن مەزن یێن هەین د پلا گەرماتییا ڤان جهاندا، ژ بلی هندێ کو تەخەکا بەزییە وی ژ سەرمایێ دپارێزیت، ستویراتییا وی دگەهیتە مەترەکێ، دەمێ بەرەڤ هێلا کەمەری دچیت، ژ بەر ئاڤا گەرم ئەڤ چەندییا بەزی نێزیکی نیڤا وێ دهێتە خوار.

و هەر دانەكێ خوارنا نەهنگی ژ چار تەنان كێمتر بیت تێر نابیت، ئەڤ نەهنگێ مەزن، ئەگەر تو بەرێ خۆ بدەیە كاودانێن ماسییێ بچویك، ئەو كۆئەندامێن تێدا هەین د نەهنگیدا ژی یێن هەین، بەلێ بشێوەكێ بچویكتر، و پاكی و بلندی بۆ باشترین و چێترین چێكەر، ئەڤە نیشانەكە ژ نیشانێن خودێ، و دەریا و ئەو هەمی گیانەوەرێن تێدا كو پتر ژ ملیۆن جۆرێن ماسیانە، ئەڤە هەمی خودێ بۆ مە یێن ئافراندین، خودێ دبێژیت: (وَسَخَّرَ لَكُمْ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ جَمِيعًا مِنْهُ) [الجاثية:١٣]، ئانكو: هندی د عەرد و عەسمانان‌دا هەی خودێ ژ نك خۆ بۆ هەوە یێت دایین، ب راستی ئەڤە (چێكرنا عەرد و عەسمانان هۆسا) نیشان و بەلگەنە بۆ وان ئەوێت هزرا خۆ تێدا دكەن.

خودێ ئەڤ نیشانە یێن چێكرین بۆ دو كاران؛ كارێ ئێكێ كارەكێ بەلگەییە، و یێ دویێ دنیاییە، خودێ دبێژیت: (نَحْنُ جَعَلْنَاهَا تَذْكِرَةً وَمَتَاعًا لِلْمُقْوِينَ) [الواقعة:٧٣]، ئانكو: مە ئەڤ ئاگرە (یێ دنیایێ) یێ كرییە بیرئینان بۆ ئاگرێ ئاخرەتێ (ڤێجا وەختێ وی ئاگری و كارلێكرنا وی دبینیت، دێ ئاگرێ جەهنەمێ ئێتە بیرا وی، و دێ ژ خودێ و ئیزایا وی ترسیت)، و مە یێ كرییە فایدە بۆ رێڤینگان.

هەر تشتێ خودێ ئافراندی بیرئینان و مفا وەرگرتن یا تێدا، (فَسَبِّحْ بِاسْمِ رَبِّكَ الْعَظِيمِ) [الواقعة:٧٤]، ئانكو: ڤێجا ناڤێ خودایێ خۆ یێ مەزن، ژ هەمی كێماسییان پاك و پاقژ بكە.

## ماسی، پەرێن وی، و پیڤەرێ پەستانێ ل دەڤ وی

خودێ دبێژیت: ﴿وَهُوَ الَّذِي سَخَّرَ الْبَحْرَ لِتَأْكُلُوا مِنْهُ لَحْمًا طَرِيًّا﴾ [النحل:١٤]، ئانكو: هەر ئەوە (خودێیە) دەریا ئێخستییە د بن خزمەتا هەوەدا، دا هوین گۆشتێ نوی و تەڕ ژێ بخۆن.

ل دویڤ هندەك ئامارێن كەڤن، پتر ژ سەد ملیۆن تەنێن ماسییێن دەریایی دهێنە مەزاختن ل جیهانێ، ئەڤە خوارنە بۆ مرۆڤان، و زانا تەخمین دكەن، كو د دەریا و زەریایاندا پتر ژ ملیۆن جۆرێن ماسیان هەنە؛ هندەك د مەزنن، كو كێشا وان دگەهیتە (١٤٠) تەنان، وەكی نەهەنگی، و هندەك د بچویكن، و هندەك ژی د خۆجهن، و هندەك د دوڕندەنە، و هندەك د جوانن، و هندەك كارەباییینە، گەلەك جۆرێن هەین ناهێنە هژمارتن.

بەلێ زانا ل سەر ڤان پەرێن ماسییان راوەستییان، گۆتن: ئەڤ پەرە پێن پالدان و هەڤسەنگی و ئاراستەكرنێنە، و ب ڤان پەران دشێن راوەستن، یان لەزاتییا خۆ كێم بكەن، و بەرەف پێشییێ دبەت ب رێكا پەران، و هەڤسەنگ دبیت ب رێكا پەران، و ئاراستەكرنا بەرێخۆدانا خۆ بۆ چەپ و راستێ، بلندی و نزمییێ ب رێكا پەران دورست دكەت.

ب ڤان پەران ماسی دچن، و رێرەوێ خۆ دگوهۆڕن، یان دورست دكەن، و ب ڤان پەران هەڤسەنگ دبن، و دراوەستن.

خودێ ئامویرەك یێ كرییە د لەشێ ماسیدا بۆ پیڤانا پەستانێ، ماسی دزانیت د هەر دەمەكیدا كا ئەو ل كیڤەیە د كویراتییا ئاڤێدا؟ ئەگەر ئەم ماسیەكێ بگرین، دێ بینین د پشكا لەشێ وێ یێ بلنددا، هێلەكا پێكڤە گرێدایی ب رەخ گوهێن وێ هەتا دیلێ وێ دچیت، ئەڤ هێلە بۆرییەكا ڤالایە ژ هەوای، هەر دەمێ پەستانا ئاڤێ ل سەر زێدە دبیت، دهێتە گڤاشتن، و ب ڤێ گڤاشتنێ ماسی دزانیت كا ئەو ل كیرا ئاڤێیە، كا ئەو نێزیكی سەرییە یان بنی؟

و ماسی نیشانەکە ژ نیشانێن خودێ، دشێت خوارنێ بکەتە هەوا دێ بلند بیت بۆ سەری، و دەمێ ئەڤ هەوایێ زێدە هاڤێت دێ بەرەف کویراتییێ چیت، ئەڤ هەوایە د ماسیدا ژ خوارنێ چێدبیت، دێ ب وی بلند بیت یان دێ هاڤێژیت و بەرەف نزماتییێ چیت، ئەڤە نیشانە ژ نیشانێن خودێ د ئافراندنا وێدا.

مەزناهی بۆ وی خودێیە یێ هەمی تشت بۆ مە ئافراندین، و هەمی بۆ مە بەردەست کرین، و پێدڤییە ل سەر مرۆڤی هزرکرنێ د نیشانێن خودێدا بکەت، بەلکو د ماوێ ڤان نیشاناندا خودێ بنیاسیت، و ئەگەر وی خودێ نیاسی دێ مینیتە سەر فەرمانێن وی، دێ ژێ ترسیت و مەزناهییا وی زانیت، خودێ دبێژیت: (وَمَا قَدَرُوا اللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِ وَالْأَرْضُ جَمِيعًا قَبْضَتُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَالسَّمَاوَاتُ مَطْوِيَّاتٌ بِيَمِينِهِ سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى عَمَّا يُشْرِكُونَ) [الزمر:٦٧]، ئانکو: وان (ئەوێت هەڤپشکان بۆ خودێ چێ دکەن) ب دورستی و ب ڕەنگێ پێدڤی، ڕێز ل خودێ نەگرتییە (و وەك پێدڤی نەنیاسییە و مەزن نەدانایە) و عەرد هەمی ڕۆژا قیامەتێ د دەستێ ویدایە، و عەسمان ژی د دەستێ وی یێ ڕاستێدا د پێچایینە، و خودێ یێ پاك و بلندە ژ وێ شرکا ئەو دکەن.

هزرکرن پەرستنە، ئانکو: مرۆڤ خودێ نانیاسیت ب تنێ د ماوێ نیشانێن ویدا نەبن، خودێ دبێژیت: (تِلْكَ آيَاتُ اللَّهِ نَتْلُوهَا عَلَيْكَ بِالْحَقِّ) [الجاثية:٦]، ئانکو: ئەڤە نیشان و بەلگەیێت خودێنە ئەم بۆ تە ب ڕێکا وەحییێ دخوینین.

و خودێ دبێژیت: (إِنَّ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَاخْتِلَافِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ لَآيَاتٍ لِأُولِي الْأَلْبَابِ (١٩٠) الَّذِينَ يَذْكُرُونَ اللَّهَ قِيَامًا وَقُعُودًا وَعَلَى جُنُوبِهِمْ وَيَتَفَكَّرُونَ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَذَا بَاطِلًا سُبْحَانَكَ فَقِنَا عَذَابَ النَّارِ) [ال عمرن: ١٩٠ – ١٩١].

## ماسییێ سەلەموون

ژ نیشانێن بەلگە ل سەر مەزناهییا خودێ ماسییەکە د دەریایاندا نافێ وی: سەلەموونە، و نافەکێ دی ژی یێ هەی دبێژنێ نەهنگێ سولەیمان، ڤان ماسییان رەوشتەك یێ هەی زانا حێبەتی کرن، کو ئەڤ ماسییە ژ موعجیزانە، و نەشێین راڤە بکەین ب تنێ ل بەر رۆناهییا قورئانێ نەبیت، خودێ دبێژیت: (قَالَ رَبُّنَا الَّذِي أَعْطَى كُلَّ شَيْءٍ خَلْقَهُ ثُمَّ هَدَى) [طه: ٥٠].

ئەڤ ماسییە ل سەروکانییێن رویبارێن ئەمریکا دبن، و ژ وێرێ مشەخت دبن بۆ جهێ ڤەرێشتنا وان رویباران، و ل ڤێرە بۆ دویماهییا (رۆژهەلاتێ) زەریایێ ئەتلەسی و ژ ڤێرێ ژی مشەخت دبن بۆ کەنارێ رۆژئاڤایێ ئەتلەسی یێ ئەوروپا (کەنارێن فرەنسا)، ئانکو زەریایا ئەتلەسی هەمیێ دبریت، و بۆ ماوەکی دمینتە ل رۆژئاڤایا ئەوروپا (کەنارێن فرەنسا)، پاشی ژ ڤێرە دزڤریتەڤە بۆ سەروکانییێن رویباران (بۆ جهێ بوونا وی)، هزر نەکە ئەڤە ب تنێ ئاخفتنە، چونکی د ڤێ چەندێدا ڤوکۆلینێن هەین کو دەهان سالان ڤەدکێشیت، و ل وێرێ مەلبەندێ ڤەکۆلینان یێن دانایین د هندەك رویباراندا، کو ڤان ملیۆن جۆرێن ماسییێن سەلەموون یێن هژمارتی، کو دزڤرنە جهێ خۆ یێ دەستپێکێ ل هەمی رۆژان، و بۆ ماوێ دو هەیڤان، و هندەك زانا پارچەکا کانزایی ب ماسیڤە دکەن کو مێژوویا مشەختبوونا وی ل سەر چێ دکەن، و دەمێ دزڤرن ماوێ ڤێ چۆن و هاتنا وان دزانن، بەلێ ئەو پسیارا مەزنا عەقلان حێبەتی دکەت: چاوا ئەڤ ماسییە ژ زەریایا ئەتلەسی دچیتە جهێ ڤەرشتنا رویباری پاشی بۆ سەروکانییا خۆ؟ ئەگەر ئەم زانایەکێ دەریایان بینین، و ل گەمییەکێ سوار بکەین، و چاڤێن وی دخۆش بن، و ئەم بێژینێ: تو یێ ل کەنارێ فرەنسا بەرەف ڤەرشتنا رویبارێ ئەمازۆن هەرە، ئەڤ مرۆڤێ عاقلێ هزرڤان، ئەگەر زانایەکێ مەزنێ زانستێ دەریایی ژی بیت نەشێت بچیت ئەگەر ب نەخشە و ئەندازەیان نەبیت، و پەیوەندییێن

تێلەفۆنی، و ب وەستییان، و ب گەلەك تشتان، و ئەڤ ماسییە د بنێ دەریایدا ئەگەر ب تنێ پلەیەکێ رێرەوێ خۆ خەلەت بکەت یان ژێ دەرکەڤیت دێ گەهیتە رویبارەکێ دی، ئەگەر سێ پلا رێرەوێ خۆ گوهۆری دێ سەمتا جهێ وی هێتە گوهۆرین ژ ئەمریکا باکوور بۆ ئەمریکا باشوور، چاوا ئەڤ ماسییە دشێت و ئەو نەگەهشتییە وێ یا مرۆڤ گەهشتییێ کو ژ کەنارێن فرەنسا بزڤریتەڤە بۆ سەروکانییا وی رویبارێ ژێ هاتی، پاشی دێ بەردەوامییێ دەتە چۆنا خۆ د هەر وی رویباریدا، و چێدبیت ل سویلاڤان سەرکەڤیت، و وێنەیێن هویربین و دیار یێن گرتی بۆ ماسییێ سەلەمون، دەمێ ژ سویلاڤان سەردکەڤیت دا بزڤریتە جهێ بوونا خۆ، ل ڤێرە دبن و دمرن، کییە ڤی ماسی دبەت؟ خودێ دبێژیت: (قَالَ رَبُّنَا الَّذِي أَعْطَى كُلَّ شَيْءٍ خَلْقَهُ ثُمَّ هَدَى) [طه: ٤٩-٥٠]، و خودێ دبێژیت: (سَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الْأَعْلَى (١) الَّذِي خَلَقَ فَسَوَّى (٢) وَالَّذِي قَدَّرَ فَهَدَى (٣)) [الأعلى]، ئانکو: ب پاك و پاقژی ناڤێ خودایێ خۆ یێ بلند بینە. ئەو خودایێ هەر تشتەك چێکری، و بێ کێماسی لێکدایی و ب سەروبەر کری. و ئەوێ هەر تشتەك ب کێش و پیڤان کری، و رێ نیشا دایی.

ئەگەر ئەم هزرکرنێ د رەوشتێ گیانەوەراندا بکەین دێ حێبەتییێن مەزن بینین، و زێدەباری ماسییێ سەلەموون مارێن دەریایان یێن هەین، و بالندە د عەسمانی، کی دبەت و دئینیت؟ کی ڤێ شیانێ ددەتێ بۆ زانینا ئارمانجێن خۆ ب شەڤ و رۆژ، هەر چەند مرۆڤ ل بەر وان خەلەت و ئالۆز بکەت، دێ هەر گەهنە ئارمانجا خۆ.

# ماسییێ هیلامی

جۆرەکێ ماسی یێ هەی دبێژنێ ماسییێ هیلامی، ڤی جۆرێ ماسی بەری دەمەکێ نێزیک ب ملیۆنەهان هاتبوونە کەنارێن فرەنسا و ئیتالیا و یونان، و کربوو عەردەکێ ب سترى وەکی دارستانەکا ماران لێکربوو، مەلەڤانەك سەرهاتییا خۆ ڤەدگێریت کو ئەو نێزیکی مرنێ ببوو، کو ب مەلەڤانییان ژ کەنارێ نێزیکی ئەسینا دویرکەفتبوو، دبێژیت: ژ نیشکەکێڤە من هەست ب ئێشانەکا دژوار کر د لنگێ خۆدا، وەکی وێ ئێشانا ژ پێڤەمانا ئوتیییێن سۆژەك (کززێن ژێ دهێت) چێ دبیت، و پشتی چارێك دەمژمێرێ من هەست کر هەروەکی دەرزیك یێ ب سەرێ من دکەڤن، پاشی من های ژ خۆ نەما، و دەمێ چارەسەرییێن دەستپێکێ بۆ من کرین، و نوژداری سەحکرییە من، پەستانا من نێزیکی سفرێ ببوو، و هندەك زانا تەخمین دکەن: کو هژمارا ماسییێن هیلامی د وان جهێن دچنێ، ژ بیست و پێنج ماسییان پتر د هەر مەترەکا چارگۆشەدا، و رەڤدەکا ژ ڤان ماسییان کو درێژاهییا وێ دو کلیۆمەتر بن، ب ملیاران ماسییێن ژ ڤی جۆری یێن تێدا، و زانایێن زیندەوەران د رێککەفتینە کو ڤان ماسییان تشتەکێ دیار نینە د لڤینێن واندا، بۆچی هاتنە ڤان کەناران؟ ئەم نوزانین.. ئەرێ یاسایەك هەیە؟ نوزانین، و ئەرێ خۆلێن زڤرینێ یێن جهگر هەنە؟ ئەم نوزانین، و ماسییێ هیلامی گەلەك جۆرن کو پتر ژ هزار جۆرانە، و تیرا هندەکان ژ وان دو مترن، و پێڤەدانا ماسییێ هیلامی یێ ئوسترالی ب چەند خۆلەکان قوربانییێ خۆ دکوژیت، ڤی ماسییێ هیلامی چاڤ و گوه و مەژی نینن، لەشێن وان تەنك و رۆنن و نەرم دیار دکەن، و ئاڤ (٩٨٪) لەشێ وی پێك دئینیت، و د ناڤ لەشێ ویدا شاخکێن رۆهنێن ژەهراوی یێن هویر یێن هەین وەکی داڤانە، و یا ب زەحمەتە مرۆڤ ببینیت، و ئەڤ شاخکە ژێك دهێنە دەرێ نێزیکی هەشتێ سەنتیمەتران،

و ئەڤ داڤە تژی ژەهرن و ب شێوێ لێدانان دلڤن! و دەمێ ماسییێ هیلامی دگەهینیتە لەشەکێ، دێ ملیۆنەها داڤان ژ لەشێ خۆ بەردەتێ داکو ژەهرێ بەردەتە د لەشێ وی زیندەوەرێ دبیتە قوربانی.

نوژدار شیرەت دکەن کو ل سەر کەناران یەکێن چارەسەرییێن دەستپێکی ئامادەکەن، و نوژدار شیرەتان ل مەلەڤانان دکەن کو شرینقێن (کۆرتیزۆن) د گەل خۆ هەلگرن، چونکی پێڤەدانێن کوژەك یێن ل ڤان جهان هەین ژ لایێ ڤی ماسییێ هیلامیڤە.

ئەگەر زانایێن ژیانا دەریایی ل سەر هندێ رێککەڤتن کو چو ئەگەرەکێ دیار نینە د لڤینێن ڤی ماسییێ هیلامیدا، زانایێن ئێکتاپەرێسییێ د رێککەڤتینە کو ئەڤ ماسییێ هیلامی ل دویڤ نەخشەکێ دیار لڤینێ دکەت، و ئارمانجەکا ئاشکەرا، یا هاتییە دانان ژ لایێ وی خودایێ ئەو چێکری، ئەڤ ماسییە بەرەڤ وان کەناران دچیت یێن خرابی تێدا زۆر بوویی، و خودایێ مە دبێژیت: (ظَهَرَ الْفَسَادُ فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ بِمَا كَسَبَتْ أَيْدِي النَّاسِ لِيُذِيقَهُمْ بَعْضَ الَّذِي عَمِلُوا لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ) [الروم:٤١]، ئانکو: خرابی و نەخۆشی و تەنگاڤی ل گوند و باژێرێت سەر ئاڤێ و ل یێت نە ل سەر ئاڤێ، ئاشکرابوو ژ بەر گونەهێت مرۆڤان، دا تاما جزایێ هندەك ژ وان گونەهان نیشا وان بدەت، بەلکی تۆبە بکەن و ل خۆ بزڤرن، و دبێژیت: (اللَّهُ خَالِقُ كُلِّ شَيْءٍ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ وَكِيلٌ) [الزمر:٦٢]، ئانکو: خودێ چێکەرێ هەمی تشتانە، و هەر ئەوە سەخبێرکەر و سەرکارێ هەمی تشتان.

ئەڤ ماسییە چو لڤینان ناکەن ئەگەر ل دویڤ حەزکرنا خودێ نەبیت، و نەخشەکێ هویربین ئەو خودایێ ئەو ئافراندی یێ بۆ دانای، و چو مرۆڤ نینن تشتەکی بلڤینن و بکەن بێی ئارمانج، پا دێ چاوا بیت بۆ خودایێ گشت جیهانان؟ ئەرێ لڤینێن ڤان ماسییان بەرەڤ وان کەناران بێی ئارمانجن؟ خودێ دبێژیت: (مَا مِنْ دَابَّةٍ إِلَّا هُوَ آخِذٌ بِنَاصِيَتِهَا) [هود:٥٦]، ئانکو: جاندارەك ل سەر رویێ عەردی نینە، ئەمرێ وی د دەست

خودێدا نەبیت و د بن دەستهەلاتا ویڤە نەبیت، و خودێ دبێژیت: (مَا أَصَابَ مِنْ مُصِيبَةٍ فِي الْأَرْضِ وَلَا فِي أَنْفُسِكُمْ إِلَّا فِي كِتَابٍ مِنْ قَبْلِ أَنْ نَبْرَأَهَا إِنَّ ذَلِكَ عَلَى اللَّهِ يَسِيرٌ) [الحديد:٢٢]، ئانکو: نینە تشتەك د عەردیدا بقەومیت یان بێتە سەرێ هەوە، و د دەپێ پاراستیدا یێ نڤێسی نەبیت - بەری ئەم بدەین - و ب راستی ئەڤە ل بەر خودێ یا ب ساناهییە)، ئەو لەشکەرەکە ژ لەشکەرێن خودێ، (وَمَا يَعْلَمُ جُنُودَ رَبِّكَ إِلَّا هُوَ) [المدثر:٣١]، و لەشکەرێن وی گەلەکن.

و ئەڤ ماسییێ هیلامی یێ کو هێرش کرییە کەنارێن فرەنسا و ئیتالیا و یونان، وەکی دارستانەکا ماران لێ کری، خودێ ئەو لڤاندن بۆ حیکمەتەکێ کو ناهێتە ڤەشارتن ل دەڤ باوەرداران.

# ماسییێ نوژدار

ئێك ژ زانایێن دەریایی گەشتییەکا بن ئاڤێ یا ڤەکۆلینان ل بن دەریای سویار بوو، چاڤێ وی ب ماسییەکێ کەڤت کو ژ جهێ خۆ دەرکەفت، و بەرەف ماسییەکێ بچویکڤە چۆ، ڤی زانای وەسا هزر کر کو دێ ڤی ماسی خۆت، بەلێ دیت ئەڤ ماسییێ مەزن ب رەخ ماسییێ بچویکڤە راوەستیا، و ڤی ماسییێ بچویك دەست ب خوارنا پەرێن ماسی کر، ڤی زانای ئەڤ چەندە ل دەڤ خۆ تۆمارکر.

پشتی بۆرینا نێزیکی دەھ سالان، ئاشکەراکرنەکا دورست دیار بوو ئەو ژی کو ئەڤ ماسییێ بچویك یێ تایبەتمەندە ب چارەسەریێن نەخۆشییێن ماسییان هەمییان، هەروەکی پەیمانەك و رێککەفتنەکا نەیا نڤێسی د ناڤبەرا ماسییێن دەریایدا هەی کو بریار دایە نابیت ئەڤ ماسییێ بچویکێ تایبەتمەند ب چارەسەرییا نەخۆشییێن دەرەکی یێن ماسییان بهێتە خوارن، ژ بەر ڤێ چەندێ گەلەك ڤەکۆلین هاتنە کرن، و زانا دویڤ جهێ ڤی ماسی چۆن، کو ناڤەکێ تایبەت یێ دانایە سەر.

ئەڤ ماسییە خودێ وەلێ کرییە کو خوارنا وی ل سەر برینان و تشتێ گەنی و بهێن کەڤتی، و مشەخۆران و کەروویێن دکەڤنە سەر پەرێن ماسیێن مەزن بیت، و ماسیێن مەزن بەرەف وانڤە دچن دا چارەسەرییا وان بکەن ژ نەخۆشییان، و هەروەکی تشتەکێ عەدەتی و ڤەنجیکرن ل دەڤ وان هەی.

هندەك کاودانێن سەیر یێن تۆمار و وێنەکری، کو ماسییەکێ مەزن برینەك د دەڤێ ویدا بوو، دەمێ دەڤێ خۆ ڤەکری بەرامبەر ماسییێ نوژدار، ماسیێ نوژدار ب ئارامی دچیتە د دەڤێ ویدا داکو وێ برینا د دەڤێ ویدا چارەسەر بکەت، و د ڤی دەمیدا

ماسییەکێ ژ ڤی ماسییێ بریندار مەزنتر هێرش کرە سەر، ماسییێ نوژدار هند گەهشت خۆ ژ دەڤێ وی باڤێژیت و برەڤیت.

ئەڤە چ عەدەتە؟ و چ گرێدانە؟ و چ پەیمانە؟ و ئەڤە چ یاسایە د هەمی لایێن دەریایاندا ل دویڤ دچن؟ ئەڤ ماسییە خودێ وەسا چێکرییە کو دەمەکێ گەلەک گەلەگێ هویربین یێ هەی، و کۆئەندامێ هەرسکرنێ یێ ماسی کەرۆیان و تشتێن بریناڤە و رزی، و یێن وەکی ڤان وەردگریت، و ئەڤە خوارنا وانە، و ئەڤ ماسیێن مەزن دەمێ بریندار دبن بەرەڤ وانڤە دچن، ژ ئەگەرێ ڤێککەڤتنا د ناڤبەرا ماسییاندا، یان هندەك جاران ژ ئەگەرێ شەران.

و تشتێ سەرنجا مرۆڤی دکێشیت ئەوە دەمێ ماسییێن بریندار زێدە دبن بەرامبەر ماسییێ بچویکێ نوژدار خۆ ریز دکەن ل دویڤ ئێك، وێنێ ڤێ چەندێ یێ هاتییە گرتن ب دەهان ماسی ل پشت ئێك راوەستیاینە، هەروەکی خۆ ل سرایا خۆ دگرن، و هندەك جاران هەر ئێك خۆلەکەکێ پتر دمینیت، و پاشی دێ چیتە سەر رێکا خۆ.

﴿هَذَا خَلْقُ اللَّهِ فَأَرُونِي مَاذَا خَلَقَ الَّذِينَ مِنْ دُونِهِ﴾ [لقمان:١١]، کێ نیشا ملیۆن جۆرێن ماسییان هەمیان دایە کو ئەڤ ماسییە نابیت بهێتە خوارن و هێرش ل سەر بهێتە کرن، کو ئەو ب کارەکێ بەرکەڤتی یێ ماسییان رادبیت، کێ نیشا وی دایە؟ ئەرێ ئەڤ ماسییە خودان عەقلن؟ خودێ دبێژیت: ﴿قَالَ رَبُّنَا الَّذِي أَعْطَى كُلَّ شَيْءٍ خَلْقَهُ ثُمَّ هَدَى﴾ [طه:٥٠].

# برینێن ماسییان و لەزاتییا چێبوونا وان

ژ نیشانێن بەلگە ل سەر مەزناهییا خودێ، ئەو هونەرێن جەنگینە یێن ماسی د شارەزا تێدا، وەکی دهێتە زانین جەنگ هێرشکرن و رەڤینە، و چو جەنگ نینن کوشتن و بریندار نەبن، و ئەڤ چەندە ل دەڤ زیندەوەرێن ل ژێر ئاڤێ ژی یا هەی، و گەلەك جاران ماسی ب برینداری درەڤن، ژ ئەنجامێ شوین لەقەکێ یان شەفکرنەکا لەشی ژ لایێ دژمنێ وی، بەلێ تشتێ حێبەتی ئەوە کو برینێن ماسییان زوی چێدبن، و زوی خۆ لێك ددەن، د دەمەکێ وەسا یێ ب لەزدا مرۆڤ باوەر ناکەت، ئانکو د دەمەکێ گەلەك کورتدا، ئەڤێ چەندێ زانایێن گیانەوەر و دەریایان حێبەتی کرن!.

هندەك زانایان ئەڤ دیاردە ڤەگەراند کو لەزاتییا چێبوونا برینێن ماسییان هەمبەر یێن مرۆڤان، د دەمەکێ گەلەکێ کورتدا، دزڤریت بۆ سویراتییا ئاڤێ، بەلێ ئەڤ ڕاڤەکرنە هەر زوی ژ کار کەڤت بەرامبەر گەلەك دیاردان، کو زانایێن دەریایان ب چاڤێن خۆ دیتن، زانایێن دەریایان و زانایێن ماسییان، شیان ب ڕێکا تێبینیکرنا هویر بزانن کو هندەك ماسی دەمێ بریندار دبن، دچنە دەڤ هندەك ماسیێن ژ جۆرێ خۆ، کو خۆ ددەنە پال ئێك داکو لەشێ خۆ ب جهێ برینێن وانڤە بنویسینن، و پتر ژ دوسێیەکان ب ڤی کاری رادبن هەتا برین چێدبیت، زانایان وەسا هزرکر، کو ئەڤ ماسییە کەرستەکێ ژ لەشێ خۆ دەردئێخن هاریکارییا چێبوونا برینان دکەت، و خۆلێکدانا وان، ژ بۆ زانینا ڤێ چەندێ زانایێن ماسییان هندەك ماسی ئینانە د تاقیگەهاندا، و دانانە د ئاڤا سویردا، و هەمان مەرج ب کار ئینان، و برین ل هندەك ڤان ماسییان کرن، تشتێ سەرنجا مرۆڤی رادکێشیت، ئەوە ڤان ماسییان چارەسەرییا برینێن هەڤالێن خۆ نەکر!! کو ئەڤ چەندە ل بن چاڤدێرییا زانایان بوو!! و ئەڤ نهێنییە نەهاتە زانین ب سالێن

درێژ، هەتا زانایەك هاتی ب سالێن درێژ ب ڤێ چەندێڤە بۆراندی، و شیای ڤان کەرستێن ژ ماسییان دەردکەڤن ژ بۆ چارەسەرییا برینان، دەمێ خۆ ددەنە پال ئێك بۆ چێکرنا برینێن هەڤالێن خۆ، دەرکەفت کو ئەڤ کەرستە د ژەهراوینە، و د زەرەرمەندن، بەلێ هندەك تایبەتمەندن ب راوەستاندنا خوینێڤە، و هندەك ژی هاریکارییا تێکچۆن و خۆلێکدانا پیستی دکەن، و ماسۆلکان ژی، و هندەکێن دی کەرستەکێ چرە، دێ ل دەستپێکێ خوینێ راوەستینیت، و یا دویێ دێ ماسۆلکان و پیستی لێك شدینیت، و پاشی کەرستێ چڕ دهێت دا برینێ بگەهینیتە ئێك و ب دویماهی بینیت.

هندەك ژ ڤان کەرستان ئینان، و دانانە سەر برینێن مرۆڤان، ئەڤ برینە ب لەزاتییا سێکا دەمی چێبوون کو بەری هنگی چێدبوون، ئانکو ژ دەه رۆژان بوونە سێ رۆژ، ب ئەگەر و کاریگەرییا ڤی کەرستەی، بێی کو ڤان کەرستان خرابییەك و زیانەك هەبیت، زانا دبێژن: هەروەکی ئەڤ کەرستێن جۆرە و جۆر، هندەك ژ وان بۆ راوەستاندنا خوینێنە، و هندەك بۆ شداندنا پیستی و ماسۆلکانە، و هندەك وەکی کەرستەکێ چرە ژ بۆ خۆلێکدانا برینێ، ئەڤ هەمی کەرستە تەمامکارێن ئێکن ژ بۆ ئێك ئارمانج و ئەنجامن ئەو ژی چێکرنا ب لەز یا برینان.

ئەڤ نیشانا گەردوونی، راستدەرئێخە بۆ گۆتنا خودێ: (قَالَ فَمَنْ رَبُّكُمَا يَا مُوسَى (٤٩) قَالَ رَبُّنَا الَّذِي أَعْطَى كُلَّ شَيْءٍ خَلْقَهُ ثُمَّ هَدَى (٥٠)) [طه].

زانست ل دویڤ زانستییە، شیان ل دویڤ شیانێ، لەوا هندەك زانا دبێژن: ((هەر مرۆڤێ د ڤی گەردوونیدا نەبینیت کو هێزەکا ژ وێ هێزێ مەزنتر یا هەی، و زانینەکا ژ وێ زانینێ چێتر یا هەی، و شەهرەزاییەکا ژ وێ شەهرەزاییێ باشتر یا هەی، و دلۆڤانییەکا ژ وێ دلۆڤانییێ بەرفرەهتر یا هەی، ئەو مرۆڤەکێ ساخە ژ لایێ جەستەیڤە بەلێ یێ مرییە ب عەقل و دلی))، و د هەر تشتەکیدا نیشانەك یا هەی کو خودێ ئێکە و یێ بێ هەڤپشکە.

# ماسیێن دەریایی یێن کارەبایی

زانا دبێژن: ((چو زیندەوەر نینن ئەگەر چالاکییەکا زیندی یا وزا کارەبایی د لەشێ واندا نەبیت))، بۆ نموونە: دل هێزەکا کارەبایی ددەت کو دگەهیتە ئێك ژ سەدێ ژ ڤۆلتێ، و ئامویرێن پیڤانا لێدانێن دلی ب رێکا ڤێ هێزا کارەبایی یا دل ددەت دپیڤن، ژ بەر ڤێ چەندێ دبێژنە ڤان ئامویران، ئامویرێن نەخشەدانانا کارەبایی، ئەڤە تشتەکە یێ هاتییە زانین، و هەر ماسۆلکەکێ ژ لڤینا وی وزەکا کارەبایی پەیدا دبیت، و تشتێ نەهێتە باوەرکرن، ئەوە هندەك ماسی د دەریایاندا، هێزەکا کارەبایی ددەن، کو هێزا وێ پترە ژ (٢٢٠) ڤۆلتان، و ئەڤ ماسییە بەرەڤانییێ ژ خۆ دکەن ب رێکا هنارتنا ڤێ هێزا کارەبایی، و دژمنێ خۆ د کویراتییێن دەریایاندا پێ دکوژیت، و هێزا ڤێ کارەبێ کو هندەك ماسییێن دی دەردئێخن ژ هەردو رەخێن خۆ پترە ژ (٦٠٠) ڤۆلتان، هندەك ژ ڤان ماسییان ئینان و کرنە د برکێن ئاڤێدا کو گلۆپێن کارەبایی تێدا بوون، ئێك ماسی ب تنێ شیا ب رێکا وێ هێزا کارەبێ یا دلەشیدا وزێ بدەتە شەش گلۆپان - و وزا هەر گلۆپەکێ (١٠٠) وات بوو - و هەمی بۆ ماوێ چەند چرکەیان هەلبوون.

ماسییەکە د کویراتییا دەریایاندا خواندەڤان د بابەتێ زانستێن زیندوەریدا دخوینن، زانا پسیار کر: چاوا ئەڤ ماسییە ڤێ وزا کارەبایی ددەت؟ وان ئەڤ ماسییە شیکار کر، کو د هەردو رەخێن ڤی جۆرێ ماسیدا (مَواشِر)ێن شەش گۆشە یێن هەین (وەکی دەڤێن مشارینە)، ئەڤە دهێنە رێزا خانێن کارەبایی، و ب رێکا وزا کیمیایی ئەڤ کارەبە ژ لەشێ وان چێ دبیت، و وان دیت کو د ئێك ژ ڤان ماسییاندا، پترى (٤٠٠) خانێن کارەبایی یێن هەین، ئەڤ خانە پێکڤە د گرێدایینە، ب رێکەکا زنجیرەیی، ژ بەر کو دەمێ فەرمانەك ژ

مێشکی دەردکەڤیت، کو هەمی داگیرتییا خۆ یا کارەبێ ب ئێك جاری ڤالا بکەت و باڤێژتە دژمنی، و تشتێ حێبەتی هویربینییا ڤان گەهاندنێن ڤان خانانە، و گەهشتنا فەرمانا ڤالاکرنا وان داگرتییێن کارەبایی ژ مێشکی تشتەکە دلا دکێشیت، چار سەد خانێن کیمیایی دشێن وزەکا کارەبایی یا ب لەز، کو هێزا وێ پتر بیت ژ شەش سەد ڤۆلتان دەربێخیت، مرۆڤ هەر زوی د ڤێ وزا کارەباییدا دمریت، ئەگەر ماسییەك ژ ڤی جۆری ڤێ وزا کارەبایی بکەتە د لەشێ مەلەڤانەکیدا، هەر د گاڤێدا دێ مریت، خودێ دبێژیت: (سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الْآفَاقِ وَفِي أَنْفُسِهِمْ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ الْحَقُّ) [فصلت:٥٣].

ئەڤ ماسیيە وزەکا کارەبێ دەردکەت پترە ژ دو سەد و بیست ڤۆلتان، و ماسییەکێ دی پتری شەش ڤۆلتان! ئەڤ ماسیيە دانا سەر پاتەکێ تەڕ بەری بمریت، و ئەڤ پاتێ تەڕ زەلامەکی گرت، و زەلامەکێ دی ژی، هەتا بووینە هەشت زەلام، و دەمێ ل دۆر ڤی ماسی گرتی هەر هەشت زەلام هاڤێتن ژ بەر توندییا وزا کارەبا ڤی ماسی.

ئافراندییێن خودێ بەلگەنە ل سەرمەزناهییا خودێ، و ل سەر شیانا وی، و ل سەر زانین و شارەزاییا وی، (أَلَا يَعْلَمُ مَنْ خَلَقَ وَهُوَ اللَّطِيفُ الْخَبِيرُ) [الملك:١٤]، ئانكو: ما ئەوێ مرۆڤ چێکری پێ نوزانیت؟ نێ هویربین و شارەزا هەر ئەوە.

# مارێ ئاڤی یێ کارەبایی

د جۆیێن ئاڤێن شرین یێن بەرازیلێدا، و د حەوزا رویبارێ ئەمازووندا، هۆڤێن ئاڤی یێن سەیر دژین، دبێژنێ مارێن ئاڤی یێن کارەبایی، کو د داگرتینە ژ وزەکا گەلەکا ب هێزا کارەبایی، ب تنێ جارەکێ ئەڤ وزە بگەهیتە لەشێ مرۆڤی، ڤێ ڤێککەفتنا کارەبایی د ژیانا خۆ هەمییێدا ژ بیر ناکەت.

درێژاهییا ڤی ماری ژ دو مەتران پترە، چار ژ پێنجێ لەشێ وی یێ تژییە ژ کۆئەندامێن وزا کارەبایی، و عومبار دکەت، و مەعیدێ خۆ تژی دکەت، و ئەندامێن خۆ یێن دەرڤەی لەشی، و سێ جۆتێن وزێن کارەبایی یێن هەین، و هەمی د ئامادەکرینە ب تابلۆیێن کارێ وەکی پاتریا عومبارکرنا وزێ دکەت د ترومبێلێدا، و د پێکڤەناییینە ئێك ب رەخ ئێکێڤە، هەر وزەدانەکێ سیە بۆ سیە و شەش تابلۆ یێن د گەلدا بۆ عومبراکرنا کارەبێ.

د هەمی ئافراندییاندا ب تنێ شەش جۆر وزا کارەبایی ددەن، و هەمی ئەڤ جۆرە ژ ماسییانە، و مارێ ئاڤی یێ کارەبایی کو تەزوویەکا کارەبایی ددەت دگەهیتە (٥٠٠) ڤۆلتان، و هوین هەمی دزانن کو د مالاندا (١١٠) ڤۆلت، یان (٢٢٠) ڤۆلت یێن کارەبێ یێن هەین، و د گەل هندێ ژی چێدبیت یا کوژەك بیت، بەلێ ئەڤ مارە وزەکا کارەبایی ددەت کو تەزوویا وێ دگەهیتە (٥٠٠) ڤۆلتان.

مارێ کارەبایی هێزترین تەزوو ددەت، کو دگەهیتە چەند سەدان ژ ڤۆلتان، و تشتێ سەیر ئەوە ئەڤ مارە کۆنترۆلێ د هێزا تەزوویا کارەباییدا دکەت، ئانکو ئەگەر وی بڤێت گیانەوەرەکی ژ خۆ دویر بێخیت، دێ تەزوویەکا کارەبایی یا لاواز فرێکەت، یان ئەگەر بڤێت جهێ گیانەوەرێ دژمن دەستنیشان بکەت، دیسا دێ تەزوویەکا لاواز فرێکەت، دێ

ئەڤ تەزوویا کارەبایی بۆ وی زڤریتەڤە وەکی وی کاریٚ رادار دکەت، و د ماویٚ تەزوویا لاوازرا دیٚ جهیٚ دژمنی زانیت، یان دیٚ هۆشدارییٚ دەتە دژمنی، بەلیٚ ئەگەر وی ڤیا دژمنی بکوژیت دیٚ تەزوویا ب هێز دەتیٚ، ژ بەر کو ئەڤ مارە کۆنترۆلا توندییا تەزوویێ کارەبایی دکەت.

ئێك ڤێککەفتنا تەزوویا ب هێزا کارەبایی بەسی هندێیە کو دژمنەکیٚ ب قەباریٚ مرۆڤی بکوژیت، و تێرا هەیە کو ڤێکەفتنەك چیٚ ببیت چێدبیت یا کوژەك بیت بۆ دژمنەکیٚ ب قەباریٚ هەسپەکی، ژ بەر توندییا ڤی تەزوویی.

و هندەك جۆرێن دی یێن ماسییان یێن هەین کارەبیٚ بەرددەن، هندەك ژ ڤان ماسییان لەشیٚ وان ییٚ ب کارەبە، دەمیٚ مرۆڤ دگریت دیٚ تووشی ڤێککەڤتنەکا کارەبایی بیت، دیٚ نەچار بیت بەردەت، ئەڤە جۆرەکیٚ ماسییانە.

و جۆرەکیٚ دی ییٚ ماسییان ییٚ هەی، کو هندەك ژ وان دشێن رۆناهییان هەلکەن، و ڤەمرینن، ل سەر لەشیٚ وان وەکی گلۆپێن هەلکرینە دبرسقن و دهێنە ڤەمراندن ژی، و هندەکێن دی ژ ڤان ماسییان رۆناهییەکا سۆر هندەك جاران بەرددەن، و هندەك جاران ژی رۆناهییا سپی، و هندەك جاران یا شین.

و ل سەر لەشیٚ هندەك نەهنگان کو ناڤەکیٚ سەیر ییٚ هەی، رێزەکا پێکڤە گرێدایا گلۆپان یا هەی، وەکی هندەك ترومبێلێن بارهەلگرن ب شەڤ ئەم ل جادەیان دبینین.

و ڤەمراندنا رۆناهییان ل دەڤ هندەك ژ ڤان ماسییان ئێك ژ وان رێکانە بۆ بەرهنگارییٚ ژ خۆ، دەمیٚ دژمن نێزیك دبیتیٚ، ئەو رۆناهییان دڤەمرینن، دا ل بەر چاڤێن وان بەرزە ببیت.

سەیرترین تشت د ڤی بابەتیٚ زانستیدا، ئەوە کو دەمیٚ مرۆڤ رۆناهییٚ هەل دکەت ب رێکا مەزاختنا وزیٚ، دیٚ پشکەکا مەزنا وزیٚ هێتە مەزاختن ل سەر شێویٚ گەرماتی کو

پێدڤی وێ ناکەت، و ئەڤ گەرماتییە وزەکا هەدەردانە (بێ مفا دچیت)، ژ بەر هندێ چو گلۆپ هەلکری نینن ئەگەر گەرماتییەك تێدا نەبیت، ئەڤ گەرماتییە وزەکا بەلاش دبەت، بەلێ ماسی ڤان رۆناهییان دەردئێخن بێی کو لەشێ وان چو جاران گەرم ببیت.

دبێژن: ملیۆن جۆرێن ماسییان د دەریایاندا یێن هەین، و د دەریایاندا جۆرەهان ئافراندییێن کو عەقل پێ حێبەتی دبن یێن هەین، و ئەڤە هەمی ژ ئافراندییێن خودێنە، و ئەڤە هەمی بۆ مرۆڤی یێن بەردەستکرین، و ئەڤ مرۆڤە یێ کو ئەڤ هەمی ئافراندییە بۆ بەردەستکری یێ غافلە ژ خودایێ خۆ، خودێ دبێژیت: ﴿تُسَبِّحُ لَهُ السَّمَوَاتُ السَّبْعُ وَالْأَرْضُ وَمَنْ فِيهِنَّ وَإِنْ مِنْ شَيْءٍ إِلَّا يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِ وَلَكِنْ لَا تَفْقَهُونَ تَسْبِيحَهُمْ إِنَّهُ كَانَ حَلِيمًا غَفُورًا﴾ [الاسراء: ٤٤].

ئەڤ هەمی چێکرییە تەسبیحا خودێ دکەن ئانکو خودێ ژ کێماسییان پاقژ دکەن، بەلێ مرۆڤێ کو ئەڤ هەمی چێکرییە بۆ بەردەستکری یێ غافلە ژ خودایێ خۆ ژ لایەکی، و ژ لایەکێ دیڤە یێ سەرپێچییا فەرمانێن خودێ دکەت.

# پشکا نەهێ

## بالندە

١- بالندە و شیانێن وان یێن ب سەر فرۆکە و مرۆڤی دکەڤن

٢- بازێ دەریایی ( مەقەسۆکا دەریایی )

٣- رەوشتێ بازی

٤- دارکۆکە

٥- کۆترا نامەبر (الحمام الزاجل) ئێکەم ئاژانسا دەنگ و باسان د دیرۆکێدا

٦- مشەختبوونا بالندان

# بالندە و شیانێن وان یێن ب سەر فرۆکە و مرۆڤی دکەڤن

د پێشەکییا مەوسووعەکا زانستی یا مەزندا ل سەر فرینێ هاتبوو: ((چو فرۆکە نینن، ئەوێن مرۆڤی چێکرین بگەهنە ئاستێ بالندەی، و نێزیکی ئاستێ وی ببن)).

و بالندێن خودێ ئافراندین نیشانەکە ژ نیشانێن خودێ، و خودێ ئەو سالۆخەتکرینە دبێژیت: ﴿أَوَلَمْ يَرَوْا إِلَى الطَّيْرِ فَوْقَهُمْ صَافَّاتٍ وَيَقْبِضْنَ مَا يُمْسِكُهُنَّ إِلَّا الرَّحْمَنُ إِنَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ بَصِيرٌ﴾ [الملك:١٩]، ئانکو: ئەرێ ما وان تەیر و تەوال، چەنگ ڤەکری و چەنگ گرتی و ل هەوا، و د سەر خۆڕا نەددیتن کەس وان ل هەوا ڕاناگریت ژ خودێ پێڤە، ئەوە ژ هەر تشتەکێ ب ئاگەهـ.

بالندە ژ جوانترین ئافراندییێن خودێنە، و ژ جوانترین ئاوازن، و ژ پترینێ وانە بۆ حێبەتییێ، و بالندە ل هەر جهەکێ جیهانێ یێن هەین؛ ل رەخێن دەڤەرێن جەمسەری، و گوپیتکێن چیایێن بلند، و ل دەریایێن پتر لڤین و ئارامی، و ل دارستانێن گەلەک تاری، و ل بیابانێن گەلەک رویت، و ل باژێرێن گەلەک ڤەرەبالغ.

هەتا نوکە زانایان هژمارا جۆرێن بالندان پتر ژ نەهـ هزار جۆران دانایینە، و خودێ وەسا حەزکرییە کێشا بالندەی یا سڤك بیت، کو ئەڤە هاریکارییا وی دکەت بۆ فرینێ، و کیسێن هەوای د بەربەلاڤن ل هەر جهەکی د لەشێ بالندەیدا، ئەڤە کێشا وی سڤك دکەن، و ماسولکێن وی یێن گەرم سار دکەن، ژ ئەگەرێ لێکدانا پەرێن خۆ، و هەستییێن وی وەسا دورست کرینە کو د خلۆلەنە، و پەرێن وی چو کێش نینە، دا ببنە هاریکار بۆ فرینێ، و هۆسا خودێ بالندە یێ ئافراندی کو سالۆخەتێن پێدڤی بۆ فرینێ ل دەڤ

هەبن، هێزا دیتنێ ل دەڤ بالندان گەلەکا دژوارە، و هێزا دیتنا هندەك بالندان، هەشت جارکی پترە ژ دیتنا مرۆڤی، هندەك جۆرێن بالندان ب دویراتییا دو هزار مەتران نێچیرا خۆ دبینیت، و چاڤێ بالندەی مەزنترە ژ مەژییێ وی، و چاڤێن وی دشێن بازنییەکا تمام بینن، بەلێ مرۆڤ دشێت (١٨٠) پلە تشتان ببینیت، دەمێ مرۆڤ دێمێ خۆ و سەرێ خۆ دزڤرینیت، ئەڤ پلە هۆسا بەرفرەهـ دبن، بەلێ بالندە کو هەردو چاڤێن وی دکەڤنە هەردو رەخێن سەرێ وی، ب شێوێ بازنی یێ تمام تشتان دبینیت، بێی کو سەر و لەشێ خۆ بزڤرینیت.

و هندەك جۆرێن بالندان کەلەخێ مری ب بلنداهییا دو هزار مەتران دبینن، ب ئاشکەرایی دبینیت، و هندەك ژ وان هێکێ ل سەر داران د بن بەلگانڤە دبینن، و هندەکێن دی ماسی د ئاڤێدا دبینن و ئەو یێ ل بلنداهییێن عەسمانی و دێ خۆ بەردەتە د ئاڤێدا، و دێ گریت دا بخۆت.

و لەزاتییا بالندەی پترە ژ (١٣٠) کیلۆمەتران د دەمژمێرەکێدا، و هندەك جۆرێن بالندان، شەش هزار کیلۆمەتران دبڕن بێی راوەستییان، ئەڤ دەمێ فرینێ دبیتە نێزیکی (٨٦) دەمژمێران ڤی جۆرێ بالندەی بڕی بێی راوەستییان، چ فرۆکە هەنە ڤێ دویراتییێ ببڕیت، (٨٦) دەمژمێران بێی راوەستییان؟ و بێی داگرتنا سۆتەمەنییێ، یان خوارنێ، یان ڤەخوارنێ؟: ﴿أَوَلَمْ يَرَوْا إِلَى الطَّيْرِ فَوْقَهُمْ صَافَّاتٍ وَيَقْبِضْنَ مَا يُمْسِكُهُنَّ إِلَّا الرَّحْمَنُ إِنَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ بَصِيرٌ﴾ [الملك:١٩].

شیاندانا وان گەلەکا بلندە، و پەیکەرێ موکومێ سڤك ئەڤە دو مەرجێن سەرەکینە دڤێت ئەڤ مەرجە د هەر فرۆکەکێدا بن، و ئەگەر تو سالۆخەتێن فرۆکەکێ کورت بکەی ب گۆتنێ دێ دبێژی: شیاندانا وێ گەلەکا بلندە، و پەیکەرەکێ موکومێ سڤك یێ هەی.

زانایێن گیانەوەران دبێژن: ئەڤ هەردو مەرجە دابینکرینە ب شێوەکێ باش د بالندانداه، بلندی د شیاندانێدا، و کێشەکا سڤك و موکوم.

و شیانا لڤینەر ژ ماسۆلکێن هێزێن سینگی دهێت، و دلەکێ مەزن لێدانێن وی د بلندن، و خودان هاڤێتنەکا ب لەز، و ئەڤ بالندە دشێن بۆ ماوێن درێژ بفرن، بەلکو ئەو لەزترینێ هەمی گیانەوەرانە.

و کۆئەندامێ هەناسێ کۆنترۆلا گەرمییا ژ ماسۆلکان دەردکەڤیت دکەت . کو بلندترینێ کۆئەندامێن هەناسێ یێ شیانداره د ناڤ خودان بربرێن پشتێدا.

چێکەرێن لڤینەران تووشی مەزنترین ئاستەنگ دبن، ئەو ژی ئاستەنگا سارکرنا لڤینەرییە، و ئەگەر کێماسی کەڤتە د سارکرنێدا دێ لڤینەر هێتە سۆتن.

و ئەڤ بالندێ کو پتر ژ پێنج هزار کیلۆمەتران دفریت بێی راوەستیان، و ئەو خوە نادەت، و ئەو زەحمەتەکا مەزن د فرینێدا دمەزێخیت، و ئەڤ زەحمەتا مەزن پێدڤی ب تەزاندنەکا نموونەییە، چ دل هەیە؟ و چ ئامویرێ هاڤێتنێ هەیە؟ و چ لێدان هەنە؟ و چ ماسۆلکەنە کو نە بێزار دبن و نە دوەستیێن؟

و هندەك کەنالێن د هەردو سیهاندا هەین هەوای دبنە هەمی لایێن لەشێ وی، هەتا دبەتە پەنجارێن وی، دا ماسۆلکێن وی تەزی ببن د دەمێ فرینێدا.

تشتەکە جهێ حێبەتییێیە! کۆئەندامێ هەناسێ یێ هەمە لایەنییە د هەمی لەشێ بالندەیدا، ئەو هەوایێ هەلدکێشیت دچیتە هەمی ماسۆلکێن وی دا بتەزینیت.

و ب کارئینانا سۆتەمەنییێ، کو ئەو ژی هندەك بەزە یێ د بن پیستێ ویدا ب شیاندانەکا بلند دورست دبیت.

و ئەو بالندێ دبێژنێ (کەرەوانێ زێرین) دویراتییا پێنج هزار کیلۆمەتران بێی راوەسییان دفریت، و ب تنێ پشکەکا گەلەك کێم ژ کێشا وی دهێتە خوارێ، ئەڤە نابیتە چو ئەگەر ئەم ب کێشا وی یا گشتی بپیڤین.

د هەر تشتەکیدا نیشانەکا هەی دسەلینیت کو خودێ ئێکە

# بازێ دەریایی (مەقەسۆکا دەریایی)

جۆرەکێ بالندانە ناڤێ وی: بازێ دەریایە، ژ سەرمایێ درەڤیت، ژ بەر ڤێ چەندێ مشەخت دبیت ژ باکوورێ ئاسیا و ئەمریکا بۆ دەڤەرێن گەرم ل باشوورێ عەردی، (١٩) هزار کیلۆمەتران دبڕیت د چۆنا خۆدا ل زڤستانێ و هاڤینێ، بەلێ ئەڤ بالندە چو خوارنێ د گەل خۆ هەلناگریت، و ئاڤ کارتێکرنێ ل پەڕێن وی ناکەت، چونکی ئەگەر ئاڤێ کارتێکرن لێ کربا نەدشیا بفریت پشتی کو ئەو خۆ نقۆ دکەتە ئاڤێ، ژ بەر کو ئاڤ دچیتە د پەڕێن ویدا و دا گران بیت، و نەدشیا بفریت.

زانایێن بالندان دبێژن: ((هەمی بالندێن دەریایی پەڕێن وان کارتێکرن لێ نابیت ب ئاڤێ، و ئاڤ ب هەمیڤە پێڤە نا نسیت، چونکی خوارنا وان ماسییێن دەریایینە)).

و ئەڤ بالندە دویڤچۆنا هندەك بالندێن نێچیرێ دکەت، دەمێ نێچیرا ماسییان دکەن ژ ئاڤێ دئیننە دەر، و ئەڤ بالندە نەشێن بۆ تێژکێن خۆ ببەن دێ بازێ دەریایی هێرشێ کەتێ، و دێ بالندێ دی ژێ ترسیت و نێچیرا خۆ ل هەوا بەردەت، کو بکەڤیتە د ئاڤێدا، بەلێ بەری بکەڤیتە د ئاڤێدا هێژ ل هەوا بازێ دەریایی خۆ لێ ددەت و دگریت، ئەرێ د شیانێن فرۆکەڤانەکیدا هەیە بشێت نێچیرا خۆ بگریت دەمێ ژ دەڤێ بالندەکی بکەڤیت، بگریت بەری بکەڤیتە د ئاڤێدا، و پاشی ل عەسمانان بفریت؟

جۆرەکێ دی یێ بالندێن مەقەسۆك یان دبێژنێ دی مەقەس، ژ دەڤەرا بەستەلێ باکووری دچنە دەڤەرا بەستەلێ باشووری، و (٣٢) هزار کیلۆمەتران دبڕیت د چۆنا خۆدا، چێدبیت ئێك پسیار بکەت: چاوا زانا ڤێ چەندێ دزانن؟ هندەك بالندان د

هێلینێن واندا دگرن ل باشوورێ عەردی، و خەلەکێن کانزایی دئێخنە پێیێن وان، د گەل نڤێسینا هێمایان ل سەر ڤان خەلەکان، و زانا ب ڤێ رێکێ مشەختبوونا بالندان دزانن، و چەندییا بالندان د چۆنا خۆ یا درێژدا برِین دزانن.

جۆرەکێ دی یێ بالندان یێ هەی دویراتییا چار هزار کیلۆمەتران دبرِن بێی کو تشتەکی بخۆن، و هندەك ژ ڤان بالندان ماوێ (٨٦) دەمژمێران بەردەوام دفرن، و خودێ دبێژیت: (أَوَلَمْ يَرَوْا إِلَى الطَّيْرِ فَوْقَهُمْ صَافَّاتٍ وَيَقْبِضْنَ مَا يُمْسِكُهُنَّ إِلَّا الرَّحْمَنُ) [الملك:١٩]، ئانکو: ئەرێ ما وان تەیر و تەوال، چەنگ ڤەکری و چەنگ گرتی و ل هەوا، و د سەر خۆرِا نەددیتن کەس وان راناگریت ژ خودێ پێڤە.

و خودێ دبێژیت: (أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ يُسَبِّحُ لَهُ مَنْ فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَالطَّيْرُ صَافَّاتٍ) [النور:٤١]، ئانکو: ما تە نەزانییە هندی د عەرد و عەسماناندا هەی، و بالندەیێت چەنگ ڤەکری ل عەسمانان، هەمی تێکدا، خودێ ژ تشتێ نەهێژا پاقژ دکەن.

و رامانا (صَافَّاتٍ) ئانکو: پەرێن وان د ڤەکرینە دەمێ فرینێ.

خودێ دبێژیت: (أَلَمْ يَرَوْا إِلَى الطَّيْرِ مُسَخَّرَاتٍ فِي جَوِّ السَّمَاءِ مَا يُمْسِكُهُنَّ إِلَّا اللَّهُ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ) [النحل:٧٩]، ئانکو: ئەرێ ما ئەو بەرێ خۆ نادەنە بالندەیان، وەسا یێت چێکرین کو ب ساناهی ل عەسمانی بفرِن، و کەس وان راناگریت و ناپارێزیت خودێ نەبیت، ب راستی ئەڤە بەلگە و نیشانن (ل سەر دەستهەلاتدارییا خودێ) بۆ وان ئەوێت باوەرییێ دئینن.

ئەڤ هەرسێ ئایەتە، نیشانێن رۆن و ئاشکەرانە، کو هاندانا مە دکەن ژ بۆ هزرکرنێ د بالندەیدا وەکی ئافراندییەك ژ ئافراندییێن خودێ.

# رەوشتێ بازی

ژ رەوشتێ بازی سەرئێخستنا ئێكدویە، چونكی هێمایەكە بۆ رەتكرنا ستەمێ، رەگەزێ خۆ دپارێزیت، و بەرەڤانییێ ژێ دكەت، و ئەگەر بێ منەت بوو دهێلیت، ژ بەر ڤی ئەگەری هندەك دەولەتان باز كرییە درویشمەك بۆ خۆ، و ژ رەوشتێ ڤی باڵندەی فێربوونێ پەسەند دكەت، و ئەو خۆشییەكێ دبینیت دەمێ راهێنەرێ وی یێ ژ وی رازی بیت، و ژ رەوشتێ ڤی باڵندەی ب رەزیلییێ رازی نابیت، و رازی نابیت بێ ئەختوبارییێ، و دەمێ پێدڤیی دبیت وەردگریت، و دەمێ بێ منەت بوو دهێلیت، و سەرەدەرییا وی د گەل مێیا خۆ نموونەكە بۆ دلۆڤانی و كەیفخۆشییێ د گەلدا، و ئەو حەژێكەرێ تێژكێن خۆیە، خودان غیرەتە ل سەر تێژكێن خۆ.

من گۆت: (سبحان الله)! ئەرێ چێدبیت باز ژ مرۆڤی مەردتر بیت؟ ئەرێ چێدبیت ب شەرمفتر بیت ژ مرۆڤی؟ و مرۆڤ ئەوە یێ خودایێ وی ب رویمەت و بلند كری؟! ﴿وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِي آدَمَ وَحَمَلْنَاهُمْ فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ وَرَزَقْنَاهُمْ مِنَ الطَّيِّبَاتِ وَفَضَّلْنَاهُمْ عَلَى كَثِيرٍ مِمَّنْ خَلَقْنَا تَفْضِيلًا﴾ [الاسراء:٧٠]، ئانكو: ب راستی مە دویندەها ئادەمی یێت ب رێز و رێمەت ئێخستین، و مە ئەو د دێمی و ئاڤێدا یێت هەلگرتین و گێڕاندین (ئانكو مە شیانا داییە هەوە، هوین ب پییان و دەواران و گەمییان و ئالەتێت دی ڤویناخێت درێژ ببڕن)، و رزقێ پاك و پاقژ مە دا وان، و مە ئەو ب سەر گەلەك چێكرییێن خۆ ئێخستن و ب قەدرتر لێ كرن.

عەقل یێ دایە ملیاكەتی بێی دلچۆن، و گیانەوەری دلچۆن یا دایێ بێی عەقل، و هەردو یێن دانینە مرۆڤی، و ئەگەر عەقلێ وی ب سەر دلچۆنا وی كەڤت دێ رێزا وی ب سەر

ملياكەتاندا بيت، و ئەگەر دلچۆنا وى ب سەر عەقلێ وى كەڤت دێ رێزا وى ل ژێر گيانەوەراندا بيت، ئەرێ چێدبيت ئەو مرۆڤێ ژ رێكا خودێ دەركەڤتى رێزا وى د بن يا گيانەوەراندا بيت؟ بەلێ، ئەو خرابترين چێكرينە، ئەڤ بازێ بێ زار و زمان يێ كو كەس د ئاخڤتنا وى نەگەهيت، سەرئێختنا وى بۆ هەڤ رەگەزێ خۆ، بەرەڤانيیا وى ژ وان، پەسەندكرنا وى بۆ فێركرنێ، حەزا وى بۆ فێركرنێ، ب ژيانا رەزيلييێ رازى نابيت، ب غەدرێ رازى نابيت، دەمێ پێدڤى دبيت وەردگريت، و دەمێ بێ منەت دبيت دهێليت، نموونەكا دلۆڤانييێيە د سەرەدەرييێدا د گەل يا مێ، حەزژێكەرێ تێژكێن خۆييە، يێ ب غيرەتە ل سەر تێژكێن خۆ، ئەگەر ئەڤ بالندە يێ هۆسا بيت دێ ئاخڤتنا تە چ بيت بۆ وان مرۆڤێن غەدرێ دكەن، و ئەوێن ب رەزيلييێ رازى، و ئەوێن وەردگرن و نەخۆن، و مالى كۆم دكەن و نەپێدڤينە؟ تە چ گۆتن هەيە بۆ وان مرۆڤێن خۆ ل سەر فێركرنێ مەزن دكەن!! و دەمێ تە بانگەوازييا وى كر بۆ رێكا راست دێ خۆ ب گونەهێ مەزن و بلندكەت: (وَإِذَا قِيلَ لَهُ اتَّقِ اللَّهَ أَخَذَتْهُ الْعِزَّةُ بِالْإِثْمِ) [البقرة:٢٩٦]، ئانكو: هەر دەمەكێ بۆ (ڤى دوروى) بێتە گۆتن: ژ خودێ بترسە، سەرێ وى ب گونەهێ مەزن دبيت (ژ خۆ ناگريت بهێليت)، (إِنَّهُمْ كَانُوا إِذَا قِيلَ لَهُمْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ يَسْتَكْبِرُونَ) [الصافات: ٣٥]، ئانكو: هەر وەختێ دگۆتە وان: ژ بلى خودێ چو پەرستى نينن هێژايى پەرستنێ بن، وان خۆ مەزن دكر (و باوەرى نەدئينان).

ئەرێ چێدبيت بالندێ باز ژ مرۆڤى بلندتر و ب رێزتر بيت كو خودێ بۆ مرۆڤى هەر تشتێ د عەرد و عەسماناندا هەمى بۆ بەر دەستكرى، و ب رێز و قەدر ئێختى؟

ڤى بالندەى جۆتيار وەستاندن، هەتا هندەكان ژ وان گازندەكرن ژ مشەبوونا وان د وەلاتيدا؛ چونكى هندەك جاران تێژكێن مريشكان دگرتن و دخوارن، و ئەڤ گازند بۆ بەرپرسێن وێرێ بر ل ئەمريكا، و دەولەتێ خەلاتەكێ بەركەڤتى دانا بۆ هەر كەسێ بازەكى د دو هەيڤێن د دويف ئێكدا بكوژيت، و ب ڤێ چەندێ ب ئێكجارى كۆنترۆل ل

سەر بازێن ڤی وەلاتی کر، پاشی تشتەکێ نەچاڤەرێ کری بۆ جۆتیاران چێ بوو، کو مشکێن کێلگان گەلەك زێدەبوون، و ڤان مشکان پترینێ وی دەرامەتی خوار یێن گەلەك پێدڤی پێ، پاشی زانی کو هەڤسەنگییەك یا د ژینگەهێدا هەی د ناڤ هەمی گیانەوەراندا، و د ناڤ هەمی رووەکاندا، و نوکە لایەنەکێ دی یێ هەی بۆ کارئینانا دەرمانێن زیندەیی، و نە یێن کیمیایی، چونکی دەرمانێن زیندەیی د هەڤسەنگن د گەل نەخۆشییێن رووەکی، بەلێ ئەگەر دەرمانێن کیمیایی ب کار بینین چێدبیت هەڤسەنگییا ژینگەهێ تێك بچیت، و بکەڤینە د وان نەخۆشییێن بۆ مە پاراستنا وان گەلەك یا پێدڤی.

ب راستی گوهۆرینا چێکرییێن خودێ ژ سالۆخەتێن خەلکێ دنیاییێنە، و ژ سالۆخەتێن مرۆڤێن غافلن ژ خودێ، حیکمەتەکا مەزن یا هەی، کو هەڤسەنگییەکا هویربین د ناڤبەرا بوونەوەران، و گیانەوەران، و رووەکاندا یا هەی، و د ناڤبەرا گیانەوەری و رووەکی، و د ناڤبەرا رووەکی و مرۆڤیدا، و هەر تێکچۆنەك تووشی ژینگەهێ ببیت دێ بهایەکێ مەزن دەین.

# دارکۆکە

هندەك پێزانینن ناهێنە باوەرکرن؛ بالندەکە ژ بالندان خودێ یێ ئافراندی، نافێ وی کونکەرێ دارایە، ئانکو دارکۆکە، چو گۆمان نینە مە هەمیان یا های ژ نافێ ڤی بالندەی بووی، بەلێ ئەگەر ئەم هویربینییێ ل سەر شێوێ دورستبوونا ڤی بالندەی بکەین، دێ بینین د چێکرنا ویدا ب زانایانە دورستکرییە کو د سەر سنوورێ خەیالا مرۆڤیدا، ڤی بالندەی دمەکێ ب هێزێ موکوم یێ هەی، بەرهنگارییا هێزا پەستانێ دکەت، و یێ موکومە بەرهنگارییا شدیانێ دکەت، دمێ وی یێ ب هێز و موکومە وەکی ئامویرێ کونکرنا داری کار دکەت، یێ کونکەرە.

دمێ وی ب پێکهاتییەکێ حێبەتی یێ چێکرییە، د هێز و موکومییێدا، و د نەرمییێدا، و ماسۆلکێن ستۆیێ وی گەلەك د موکومن، چونکی هێزییا ماسۆلکان و موکومییا وان پێدڤینە، ژ بۆ باش لێدانا ب هێز یا دمێ وی کو کار پێ دکەت وەکی وێ (ساتۆرا کڤانەیی ئەوا ب سەرێ رمێڤە بۆ نێچیرکرنا چێلا هۆڤە)[1]، چاوا ئەڤ دمێ وی د داریدا دچیتە خوار؟ ل سەر دارێ دراوەستیت و ڤورمێ وێ کون دکەت هەتا دگەهیتە ناڤکا دارێ، چێدبیت کێزەك یان کرمەك د ناڤکا وێدا هەبیت، بەلێ چاوانییا زانینا دارکۆکەی بۆ جهێ ڤێ مێشەومرێ؟ ڤی تشتی کەس نوزانیت هەتا نوکە.

و ئەڤە پێدڤی ب کولوخکەکێ سەری یێ ستویرە، بەلێ نەرماتییێ ددەتە وان شەریتێن هویربین یێن ستوونی، و دڤێت ڤی بالندەی مێژتن بۆ لێدانان هەبیت، هەر وەکی د

---

١. لسان العرب مادة زمل.

گەلەك ئامويراندا هەی، ئەڤ مێژتنێن لێدانان تەڤنەكێ گەلەكێ ستويرە د ناڤبەرا دمی و كولۆخكێ سەری.

و ديسا ئەزمانەكێ بلندێ درێژ يێ هەی هندی درێژاهييا دمێ وی، و دويماهييا وی پانييەكا زڤرە، و كەرستەكێ چڕ يێ ل سەر، دا كو وێ مێشا وی بڤێت نێچيركەت.

و پيێن وی د كورت و ب هێزن نە د لاوازن وەكی پيێن باراپترێ بالندان، دا خۆ ل سەر بگريت و ببنە هاريكار بۆ وی، و ب ڤێ كورتی و هێزيا پيێن وی لێدانێن وی ب هێزن بۆ داری، و پەنجێن وی وەكی مەنگەنێ گرتنا تشتانە؛ كو دو پەنجێن وی يێ ل پێشييێ، و دو يێ ل پشتێ، وەكی كێلبتانييە كو هاريكارييا وی دكەت بۆ موكوم گرتنا تيڤلێ دارێ[1].

و دويلەكێ موكوم يێ هەی كو ببيتە هاريكار بۆ خۆگرتنێ ب تايێ دارێڤە، هاريكارييا وی دكەن ل سەر ڤان لێدانان دا دمێ وی بگەهيتە ناڤكا دارێ، و د گەل هەردو پيێن وی يێن ب هێز و كورت، و چار كلبەتانان ل سەر تيڤلكێ دارێ.

خودێ دبێژيت: (صُنْعَ اللَّهِ الَّذِي أَتْقَنَ كُلَّ شَيْءٍ) [النمل:٨٨]، هەر وەكی ئەڤ بالندە وەكی ئاميرەكێ گەلەكێ ئالۆزە، ئاميرەكە هەمی شيانێن كونكرنێ[2] يێن تێدا، پێكهاتێن لەشێ وی پالپشتييەكێ ب هێزە بۆ وی، و ژ بۆ مێژتنا لێدانان و لەرزينان، دمەكێ ب هێزێ موكوم، ئەزمانەكێ ب درێژاهييا دمێ وی، خودان پاناتييەكا زڤرە، كو كەرستەكێ چڕ يێ ل سەر.

خودێ دبێژيت: (قَالَ فَمَنْ رَبُّكُمَا يَا مُوسَى (٤٩) قَالَ رَبُّنَا الَّذِي أَعْطَى كُلَّ شَيْءٍ خَلْقَهُ ثُمَّ هَدَى (٥٠)) [طه].

---

١. مختار الصحيح مادة ل ح ي.

٢. ژ پەيڤا (المثقب): ئەو ئاميرەيە يێ پێ كون دكەن) (لسان العرب مادة ثقب).

ئانكو: تەكووزی یا دایە ئافراندییێن خۆ.

و خودێ دبێژیت: (سَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الْأَعْلَى (١) الَّذِي خَلَقَ فَسَوَّى (٢)) [الأعلى]، ئانكو: ب پاك و پاقژی ناڤێ خودایێ خۆ یێ بلند بینە. ئەو خودایێ هەر تشتەك چێكری، و بێ كێماسی لێكدایی و ب سەروبەر كری.

ئانكو: ئەڤ ئامویرە و ئەندام بێی كێماسی یێن چێكرین كو یێ گونجایە بۆ باڵندەی، ئەڤە كارێ وییە كو بگەهیتە ناڤكا دارێ دا وان مێشان بخۆن یێن زیانێ دگەهیننە دارێ، ئەڤ باڵندە یێ هاتییە ئامادەكرن ب ڤان شیانان، و كێمتر نینە ژ ئالۆزترین ئامویرێن كونكرنێ.

# کۆترا نامەبر ( الحمام الزاجل )[1] ئێکەم ئاژانسا دەنگ و باسان د دیرۆکێدا

میر (نور الدین) زەنکی یێ شەهید پۆستێ عەسمانی یێ ب کار ئینای، دەمێ ئەو میر ل وەلاتێ شامێ و مسرێ.

و زانا دبێژن: کۆترا نامەبر یان کۆترا نامان پتر ژ (٥٠٠) جۆران پێن هەین، و ئەڤ کۆترا نامەبر ژیرییا وێ یا تیژە و شیانێن مەزن یێن فرینێ یێن هەین، و سالۆخەتەکێ ب هێز یێ هەی بۆ گەهشتنا ئارمانج و جهێ خۆ، و کۆترا نامەبر گیانەوەرەکێ هۆگرێ کەهییە، خودێ دبێژیت: (وَذَلَّلْنَاهَا لَهُمْ) [یس:٧٢]، ئانکو: مە (کەوال و پێرە) پێت بۆ وان سەرنەرم کرین و ئێخستینە د خزمەتا واندا.

کێ ئێخستییە د خزمەتێدا؟ کێ وەلێ کرییە کو یا ژیر تیژ بیت؟ خودان شیانەکا بلند بیت بۆ فرینێ، و خودان غەریزەکا ب هێز بیت پێ بگەهیتە ئارمانجا خۆ؟ کێ وەلێ کرییە هۆگر بیت کو مرۆڤ بشێت کەهی بکەت و خزمەتا وی بکەت و بۆ وی یێ بەردەست کری؟.

ئەڤ بالندە (کۆترا نامەبر) یان کۆترا نامەیان ـ وەکی ناڤلێنایە ـ دویراتییا هزار کیلۆمەتران دبریت بێی راوەستییان، کو د هەر خۆلەکەکێدا کیلۆمەترەکێ دبریت، ئانکو شێست کیلۆمەتران د دەمژمێرەکێدا، ئەڤ کۆترا نامەبر سالانە نەهـ جۆتێن

---

١ـ د (لسان العرب)دا (مادة زجل): [الزَّجْل: هنارتنا کۆترا رێ شارەزا بۆ جهەکێ دویر، (وزجل الحمام یزجِلها زَجلاً): ئانکو: ئەو هنارتە دویر، ئەو ژی کۆترا نامەبرە.

تێژکان دئینیت، و دبیته هاریکار بۆ ڤەگوهاستنا نامێن تە د ماوێ بلنداهییاندا، و گەلەك ب لەز نامان دگەهینیت ئەگەر ئەم ل دویڤ وی سەردەمی بپیڤین.

د سەر هەمییێڕا، سولتان (نور الدین) کۆترا نامەبر ب کار دئینا بۆ ڤەگوهاستنا نامێن خۆ د ناڤبەرا دیمەشق و قاهیرەدا، چونکی پۆستەگەهاندن دهاتە ڤەگوهاستن ب رێکا ڤێ کۆترێ، ناڤێ سولتانی ل سەر دمێ سۆرێ ڤێ کۆترێ دنەخشاند، و کاغەزەکا تایبەت هەبوو کو کێشا وێ یا سڤك بوو دهاتە هەلگرتن ب ڤی جۆرێ کۆترێڤە، و سولتانی دو هزار کۆترێن نامەبر ب کار دئینان بۆ ڤەگوهاستنا نامێن خۆ د ناڤبەرا وی و کاربدەستێن ویدا ل هەرێم و باژێران.

و تشتێ گەلەك مژدار و نەدیار هەتا نوکە ڤەکۆلەر حێبەتی کرین، چاوا ئەڤ کۆترە خودێ چێکرییە کو دگەهیتە ئارمانجا خۆ؟ و ئەو چ رێکە ئەڤ کۆترە ب کار دئینیت؟ و زانا پسیار دکەن: چاوا وێ رێکا درێژ دزانیت یا وێ گەشتا دچیتێ؟ و ژ بیر نەکەن کۆتر دهێتە هژمارتن ئێکەم ئاژانسا دەنگ و باسان د دیرۆکێدا، و ل دەڤ هەمی گەلان دهاتە ب کارئینان؛ گریك، یونان، رۆمان، و ل دەڤ عەرەبان، و د هەمی سەردەماندا، و دهاتە ب کارئینان بۆ ڤەگوهاستنا نامان، و گەهاندنا دەنگ و باسان، و هندەك دەولەتێن رۆژئاڤا ژی ب کار ئینایە وەکی هۆلەندا دا فەرمانان بۆ گزیرتا سومەترە ل ئەندونیسیا ببەت، (باشوورێ رۆژهەلاتا ئاسیا)، کو دویراتییان دبریت پتر ژ هەڤدە هزار کیلۆمتران، بەلێ ئەو پسیارا عەقلان حێبتی دکەت: چاوا ئەڤ بالندە د ماوێ ڤان دویراتییێن درێژ، کو د شیانێن زیرەکترین فرۆکەڤاندا نینە ڤێ چەندێ بکەت؟ پێدڤی ب ئاماژانە، و ب نمرە و ژمارانە بۆ جه و سەمت و دویراتییێن وی جهی، و نەخشان، و پەخشەکێ بەردەوام دەستنیشان بکەت کا ل کیڤ جهییە ل سەر رویێ عەردی؟ ئەو ڤویناخەکا درێژە ژ رۆژئاڤا بۆ باشوورێ رۆژهەلاتا ئاسیا، پا چاوا بالندەکێ بچویك نامەکێ دگەهینیتە دویرترین جه؟ و چاوا هەستەوەرێ بالندەی ئاراستە دکەت بەرەڤ رێکا وی کار دکەت؟ زانا دبێژن: ((تشتەکێ هەی ڤان بالندان ئاراستە دکەن بۆ ئارمانجێن وان ئەم نوزانین)).

و هندەك زانا وەسا تەخمین دكەن كو زانیارییێن عەردی (بەرزی و نزمی) د بیردانكا وێدا چاپ دبیت، ئەو دزانیت و دچیتە وی جهی، و ئەڤە بیردۆزەكە، و زانایەكێ دی دهێت، ڤێ گریمانێ دهەلوەشینیت، وی كۆترەكا نامەبر ئینا و چاڤێن وێ گرێدان، و بەردا و شیا بچیتە جهێ ئارمانجێ، پا كا ئەو زانیاری؟ و كا ئەو بیردانك؟ د گەل هندێ چاڤێت ڤێ كۆترێ د گرێدای بوون و چۆ جهێ ئارمانجێ.

گریمانەیا دویێ: ئەڤ كۆترە د گەل رۆژێ گۆشەكێ چێ دكەت ب ڤی دچیت بۆ جهێ خۆ، و دەمێ گۆتییێ: د شەڤێدا دفریت؟ و چاوا دچیت بۆ جهێ ئارمانجا خۆ، و ئەو ب شەڤ دفریت؟ ئەڤ بیردۆزە ژی هەلوەشییا.

بیردۆزا سێیێ: وان هزر كر كو ئامویرەكێ رادارێ یێ د مێشكێ وێدا پێ دگەهیتە ئارمانجا خۆ، ئینا ئامویرەكێ بچویكێ كارەبایی ب سەریڤە كر كو ئاماژێن كارەبایی ژێ دەردكەڤتن دا ژ بەر ڤێ كۆترێ شێلی بكەت، و د گەل ڤێ چەندێ گەهشتە ئارمانجا خۆ.

پاشی هزر كر كو ب رێكا گۆرەپانا موگناتیسی ئەوا كو د عەردیدا، ئینا بازنێن ئاسنی یێن ب موگناتیسڤە دانانە سەر سەرێ كۆترێ ب ئاراستێن ژێك جودا دا ڤێ گۆرەپانێ شێلی بكەن، و دورست چۆ جهێ ئارمانجا خۆ.

چ بیردۆز ل دەڤ وان نەمان ئەگەر نەهاتبنە هەلوەشاندن، و چاوا ئەڤ بالندە دەهان هزاران میلان دبریت ل سەر دەریا و چیایان و بیابانان و دۆلان؟ و چاوا گۆشەكێ وەردگریت بۆ ئاراستێ ئارمانجێ؟ ئەڤە نهێنییە هەتا نوكە زانا د حێبەتینە، و زانایەك دبێژیت: ((تشتەكێ هەی بالندان ئاراستە دكەت بۆ جهێ وان))، خودێ دبێژیت: (قَالَ رَبُّنَا الَّذِي أَعْطَى كُلَّ شَيْءٍ خَلْقَهُ ثُمَّ هَدَى) [طه: ٥٠].

و راستترین راڤەکرن بۆ ڤی بابەتی ئەوە کو فەرمان یا گرێدایە ب رێکنیشاندانا خودێ، خودێ دبێژیت: (سَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الْأَعْلَى (١) الَّذِي خَلَقَ فَسَوَّى (٢) وَالَّذِي قَدَّرَ فَهَدَى(٣)) [الأعلى]، ئانکو: ئەوێ هەر تشتەك ب کێش و پیڤان کری، و رێ نیشادایی.

ژ بەر ڤێ چەندێ زانایێن ئێکتاپەرستییێ ئەڤ دیاردا کو عەقلان حێبەتی دکەت ناڤلێنا رێنیشادانا خودێ، و زانایێن زیندەورزانی ب غەریزە ناڤلێنا، ئەڤە سیستەمەکێ ئالۆزە یێ ل دەڤ ئافراندی هەی بێی فێرکرنەك، کارەکێ بیرتیژییێیە، ب ڤویناخان، و بەرنامە کرییە، گیانەوەر دکەت بێی فێرکرن.

# مشەختبوونا بالندان

خودێ دبێژیت: (أَلَمْ يَرَوْا إِلَى الطَّيْرِ مُسَخَّرَاتٍ فِي جَوِّ السَّمَاءِ مَا يُمْسِكُهُنَّ إِلَّا اللَّهُ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ) [النحل:٧٩]، و خودێ دبێژیت: (أَوَلَمْ يَرَوْا إِلَى الطَّيْرِ فَوْقَهُمْ صَافَّاتٍ وَيَقْبِضْنَ مَا يُمْسِكُهُنَّ إِلَّا الرَّحْمَنُ إِنَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ بَصِيرٌ) [الملك:١٩].

ڤان ئایەتان ئەم چاوا تێبگەهین؟ ئەرێ ما د ڤان ئایەتاندا هاندانا مە ناکەت بۆ هزرکرنێ د ئافراندنا عەرد و عەسماناندا؟ ئەرێ ما هاندانا مە ناکەت کو هزرکرنێ د دیاردا بالندان ل عەسمانی بکەین؟ ئەرێ د ڤێ نیشانێدا (بالندە) کو خودێ هەلبژارتی مانە بەلگەیە ل سەر مەزناهییا وی؟.

ل وی دەمێ مرۆڤی بالندە دیتین و نیاسین؛ مرۆڤی ددیت کو ل پاییزێ ب هەمیڤە بەرزەدبوون، و ل بهاران دیار دبوونەڤە، و زانا دبێژن: ((دەهان هزار ملیۆن بالندە مشەخت دبن ل هەمی سالان، نەخاسمە د نیڤا باکوورێ عەردی، بۆ نیڤا باشوورێ عەردی، و جهێ د چنێ باشوورێ ئەمریکا، و باشوورێ ئەفریقیایە، هندیکە ئەو جهێ لێ مشەخت دبن ئەمریکا باکوورە، و ئەوروپا، و ئاسیا، ئەڤ بالندە هێلا کەمەری دبۆرن بۆ باشوورێ ئەفریقیا، و باشوورێ ئەمریکا دچن، و د هەمی مەوسووعێن زانستیدا دیار دکەن، کا چاوا دگەهنە ڤان راستییان؟

ل ڤێرە پترى چار ملیۆن بالندان یێن هەین، و خەلەکێن کانزایی ب پییێن وانڤە دکەن، ناسناما بالندەی دیار دکەن و لڤینێن وی، و کۆمەلەکا دی یا بالندان یا هەی سێ ملیۆن بالندەنە، و کۆمەلەکا دی یا سییێیە کو سێزدە ملیۆن بالندەنە، خەلەکێن کانزایی یێن

ئێخستینه پیێن وان هێز د بچویك د هێلینێن خۆدا، داكو دویڤچۆنا لڤینێن وان بكەن ژ باكووری بۆ باشووری، و مەلبەندێن ڤەكۆلینان د بەربەلاڤن د ناڤبەرا باكوور و باشوورێ عەردیدا.

هندەك بالندە یێن هەین د ماوێ مشەختبوونا خۆدا چاردە هزار كیلۆمەتران دبڕن، و هندەكێن دی یێن هەین شازدە هزار كیلۆمەتران دبڕن، بەلێ درێژترین ڤویناخ كو كۆمەك ژ بالندا پێ رادبیت، ب دویراتییا بیست و دو هزار كیلۆمەتران دبڕن، ژ دەڤەرا بەستەلێ باكووری، بۆ باشوورێ ئەفریقیا، چۆنا لەزاتییا ڤان بالندان دگەهیتە د ناڤبەرا (١٠٠-٤٠) كیلۆمەتران د دەمژمێرەكێدا، بەلێ (٣٦٠) كیلۆمەتر ئەو دەمە یێ هندەك بالندێن باز هێرشێ دكەنە نێچیرا خۆ، بەلێ لەزاتی، د ناڤبەرا (١٠٠-٤٠) كیلۆمەترایە د دەمژمێرەكێدا، هندەك تێبینی یێن هاتینە تۆماركرن ل سەر هندەك جۆرێن بالندان كو زێدەتر ژ (٢٧٠٠) كیلۆمەتران دفڕن بێی راوەستییان د ماوێ بیست دەمژمێراندا، و ب بلنداهییا پتر ژ (٩٠٠) مەتران دفڕن كو نێزیكی كیلۆ مەترەكێیە، و هندەك ژ وان ب بلنداهییا (١٥٠٠) مەتران دفڕن، و هندەكێن دی ب بلنداهییا (٤٢٠٠) مەتران، و هندەك جۆرێن دی یێن بالندان ب بلنداهییا شەش هزار مەتران دفڕن، ئانكو شەش كیلۆمەتران، و فرۆكێن نوكە دوازدە كیلۆمەتران بلند دبن.

دڤێت د سەرێ بالندەیدا دەمژمێرەك هەبیت، چونكی بالندە د دەمێ خۆدا مشەخت دبیت ل هەمی سالان! ئەو چییە دەمێ مشەختبوونێ نیشا ددەت؟ دڤێت دەمژمێرەك هەبیت د سەرێ هەر بالندەكیدا، هندەك زانا دبێژن: ((بالندان هێزەكا نەلقامێ (خارقە) یا هەی بۆ بڕینا وان دویراتییێن پێ رادبن، و چ چێكری ل سەر روییێ عەردی نینە كو ژ بالندەی بهێزتر بیت د بڕینا دویراتییێن درێژ، ژ بۆ حیكمەتەكا خودێ ڤیایی و حەزكری)).

تشتێ سەرنجا مرۆڤی رادکێشیت، ئەو بالندێن دویراتیێن درێژ دبڕن، پتر ژ بیست هزار کیلۆمەتران، ئەڤ بالندە بەزی د لەشێ خۆدا عومبار دکەن بەری بارکەن، و هندەك بالندە یێن هەین، کێشا وان دوجاری لێ دهێت، ژ بەزێ عومبارکری د لەشێ واندا، داکو ئەڤ بەزێ د لەشێ واندا عومبارکری ببیتە سۆتەمەنییەك بۆ وان، د ڤێ چۆنا درێژا ب زەحمەتدا.

هندەکان هزر دکر کو هندەك دیاردێن جوگرافی، ژ رویبار و دەریا و کەنار و چیایان، بالندە ب رێکا ڤان دچن و دگەهنە جهێ ئارمانجێ، بەلێ ژ کارکەڤتنا ڤێ بیردۆزێ هاتە سەلماندن، چونکی بالندە هەمی دەمژمێرێن شەڤێ دفڕن، و رۆژێن تاری، و چو تشتان نابینن، و د گەل هندێ ژ رێکا ئارمانجا خۆ دەرناکەڤن.

و هندەکان ژ وان گۆت: چێدبیت د بالنداندا بێهنەکا بێهنکرنا بەردەوام هەتا دگەهیتە جهێ ئارمانجێ هەبیت، و زانستی بەروڤاژی ڤێ چەندێ سەلماند.

و گۆتن: ل دویڤ رۆژێ دچیت، تاقیکرن هاتنە کرن، و بالندە ژ تیشکا رۆژێ ڤەدەرکر، بەلێ بالندە هەر د رێرەوێ خۆ یێ دورستڕا چۆ.

و گۆتن: گوپیتکا عەسمانی هاریکارییا وی دکەت، ژ گوپیتکا عەسمانی ژی ڤەدەرکر، بەلێ د نەخشێ خۆ یێ ل سەر هیبوویێڕا چۆ.

و گۆتن: بالندە د ناخێن خۆدا لێزڤرینێن رێکێ تۆمار دکەت، ئینا بالندە دانا د تلپەکیدا (قرص) و زڤراند دا ڤان چۆنێن د ناخێ خۆدا ژ بیر بکەت، سەرکەڤتن نەئینا و یا بێ مفا بوو.

و هندەکان راڤەکرنەك بۆ ڤێ بیردۆزێ دەرئێخست، بەلێ زانایێن نوی ئاشکەراکر کو د سەرێ بالندەیدا تەڤنەکێ هەی قەبارێ وی ژ نیڤ مللیمترا دوجاری نابۆریت، یێ پێکهاتییە ژ کەرستێن کو کاریگەر دبیت ب موگناتیسییا عەردی، دەمێ باوەرییێ ب

هندەك گۆتگۆتكان (درەوان) دئينن، و هێزا كارەبێ تێدا بەروڤاژی كری بالندە بۆ پشتێ زڤری، و ئاراستێ وی بەروڤاژی بوو، ئەڤە چ تەڤنە د ناڤبەرا چاڤی و مێشكی د بالندەيدا؟ ئەو هەست ب گۆرەپانا موگناتيسييا عەردی دكەت؟.

و زانايان بيردۆزەكا دی زانی، ئەو ژی ئەوە بالندە ل دويڤ ستێرێن عەسمانی دچيت، و تو هەی مرۆڤێ زيرەك، ئەوێ تە خواندی و تە وەرگرتی، بەلكی تو نەشێی ل دويڤ ستێرێن عەسمانی بچی.

چ بيردۆز نەمانە د مەيدانێدا ب تنێ دو تێ نەبن: يا ئێكێ: چۆن ب رێكا ستێرێن عەسمانی، بەلێ چاوا؟ ئەم نوزانين، و ئەڤە كيژ ستێرە؟ ئەم نوزانين، و بيردۆزا دويێ: كو تەڤنەك يێ د بالندەيدا كاريگەر دبيت ب گۆرەپانا موگناتيسييا عەردی، هەتا ڤێ دويراتييا درێژ ببريت بێی كو ژ ئارمانجا خۆ دەركەڤيت.

و ئەڤ نهێنييە يا مايە شێلی هەتا نوكە، و ئەڤەيە رامانا گۆتنا خودێ: (مَا يُمْسِكُهُنَّ إِلَّا الرَّحْمَنُ إِنَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ بَصِيرٌ) [الملك:١٩]، ئەو راستەرێكرنەكا ئێكسەرە ژ لايێ خودێڤە.

تشتێ سەرنجا مرۆڤی رادكێشيت، ئەوە بالندێن بچويك ئەوێن ژ نوی بووين، خەلەكان دئێخنە پيێن وان، و دورست دچن د چۆنا خۆدا، بێی بالندێن مەزن وان فێركەن! كێ ئەڤ چەندە كرييە د بالندێ بچويكدا ئەڤ شيانا حێبەتی دا كو بچنە جهێ ئارمانجا خۆ؟ خودێ دبێژيت: (قَالَ فَمَنْ رَبُّكُمَا يَا مُوسَى (٤٩) قَالَ رَبُّنَا الَّذِي أَعْطَى كُلَّ شَيْءٍ خَلْقَهُ ثُمَّ هَدَى (٥٠)) [طه].

ب راستی تشتێ حێبەتی، ئەوە هێلێن چۆنا وان نە د راستن، چاوا فرۆكا سادە، دويراتييا هندە كيلۆمەتران، رێرەوێ خۆ ب هندە گۆشان دگوهۆريت، ل ڤێرە نەخشە يێن هەين، و فرۆكەڤان، و هاريكارێ فرۆكەڤانی، و رادارێن هەين، و نەخشە، و ئاراستەكرنێن

عەردی پێن هەین، و پەیوەندییا بەردەوام د گەل عەردی یا هەی، داكو فرۆكە ل سەر هێلا چۆنا خۆ بمینیت، و هێلێن چۆنا بالندان نە د راستن، كو هێلێن خوار و ڤیچ پێن هەین، چونكی ئێكێ هەی بۆ وی ئەڤ هێلە وێنەكری، و ئاراستەكری كو ل سەر بچیت.

هندەك زانا دبێژن: ((ئەگەر ئەڤ بالندە ب پلەكێ ژ ئارمانجا خۆ چۆ دەرێ دێ ل دویماهییێ گەهیتە ئارمانجەكێ كو دویری ئارمانجا وی بیت، و كێمتر نەبیت ژ هزار كیلۆمتران))، كیيە ڤێ ئارمانجێ راست و دورست دكەت؟ هێژ زانایێن عەردی د حێبەتگرتینە ژ ڤێ هێزێ؛ كو بالندان د فرینێدا ئاراستە دكەت.

بالندەك دانا د فرۆكەكێدا، و پێنج هزار كیلۆمەتران ژ جهێ وی دویرئێخست، چ ئەڤ دویركرنە بەرەف رۆژهەلاتێ بیت یان بەرەف رۆژئاڤای، یان بەرەف باكووری، و د قەفەسەكا گرتیدابوو، و یێ قەدەغەكری بوو ژ دیتنێ، پشتی دەه رۆژان زڤری جهێ خۆ!!.

ژ بەر ڤێ چەندێ خودێ دبێژیت: (أَلَمْ يَرَوْا إِلَى الطَّيْرِ مُسَخَّرَاتٍ فِي جَوِّ السَّمَاءِ مَا يُمْسِكُهُنَّ إِلَّا اللَّهُ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ) [النحل:٧٩].

# پشکا دەهێ

## مێشەوەر

١- کرمێ ئارمویشی و ئارمویش

٢- مێشا هنگڤینی نیشانەکا مەزنە

٣- هنگڤین و مفایێن وی

٤- ئەڤەیە ئەو جڤاکێ مێرییان

٥- پێشی

٦- مێش

٧- برێن کولییان

٨- خانییێ پیرتەڤنکێ

٩- شاخێن هەستپێکرنێ د مێشەوەراندا

# کرمێ ئارمویشی و ئارمویش

خودایێ مە دبێژیت: (وَفِي الْأَرْضِ آيَاتٌ لِلْمُوقِنِينَ) [الذاريات:٢٠]، ئانكو: د عەردیدا نیشان و بەلگە گەلەكن، بۆ وان ئەوێت هەقییێ پەسەن دكەن و پشتەڤانییا وێ دكەن.

کرمێ ئارمویشی زانا دبێژنێ: شاها تەڤنی یا بێ هەڤرك، ئەڤ كرمە دەمێ تفا وی ل هەوا دكەڤیت، هشك دبیت، و دبیتە دەزییەكێ ئارمویشی، ئەڤ تفە یا بۆیاغكرییە ب كەرستەكێ پرۆتینی، كو تەیساندنەكا رەنگێ دورِێ ددەتێ، ئەڤ بەلاتینكە دشێت شەش بهۆستان د ماوێ خۆلەكەكێدا تەڤنی دورست بكەت، و درێژاهییا دەزییێ وێ، (٣٠٠) مەترێن بەردەوامن، و هەر (٣٦٠) (شرنقة)[1] دبنە قەمیسەكێ ئارمویشی، پا كێشا ڤی قەمیسی چەندە؟.

هەتا نوكە مرۆڤ نەشیایە وەكی دەزییێ ڤی كرمی چێكەت، بۆچی؟ چونكی ژ باشییێن چێكرنا دەزییێ كرمی ئەوە كو خودان كێشەكا گەلەكا سڤكە، و موكوم یا وی بلندترە ژ موكومییا پیلایی، و (٢٥) هزار (شرنقة) دبنە منەكا ئارمویشی، ئانكو دەه هزار (شرنقة) دبنە كیلۆیەكا ئارمویشی، ئەگەر د شیاندا بیت پیلایی ژێك بكێشن هندی دلۆپەكا دەزییێ ئارمویشی، دێ دەزییێ ئارمویشی موكومتر بیت ژ پیلایی، و د گەل ڤێ چەندێ ئەڤ دەزییە یێ جوان، و تیشكدار، و موكوم، و سڤكە، ئەڤە ژ چێكرنێن خودێیە، خودێ دبێژیت: (صُنْعَ اللَّهِ الَّذِي أَتْقَنَ كُلَّ شَيْءٍ إِنَّهُ خَبِيرٌ بِمَا تَفْعَلُونَ) [النمل:٨٨].

---

١. ئەو دەزییە یێ كرمێ ئارمویشی ل دۆر خۆ دئالینیت، وەرگێر.

بەلاتینکەکا دی یا هەی ئارمویشێ رەنگ زێر چێدکەت، و دیسا ئارمویشێ رەنگ زیڤ کو ب هەمیڤە وەکی دورێیە، و ئارمویشێ رەنگ زێر ب رەنگەکێ سروشتییە، رۆژ کارتێکرنێ لێ ناکەت، و پێدڤی ب موکومکرنێ نینە، رەنگەکێ جهگرە وەکی زێری، و یێ جهگرە وەکی لۆلۆیێ.

ئەڤ نیشانێن خودێ کرینە د عەردیدا، ژ بەر هندێیە دا ئەم وی بنیاسین، و مەزناهیا وی بزانین، و زانینا وی، و دلۆڤانییا وی، و شارەزاییا وی، و شیانا وی، و بێمنەتییا وی، خودێ دبێژیت: ﴿وَمِنَ النَّاسِ وَالدَّوَابِّ وَالْأَنْعَامِ مُخْتَلِفٌ أَلْوَانُهُ كَذَلِكَ إِنَّمَا يَخْشَى اللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ الْعُلَمَاءُ﴾ [فاطر:٢٨].

خودێ دبێژیت: ﴿إِنَّ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَاخْتِلَافِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ لَآيَاتٍ لِأُولِي الْأَلْبَابِ (١٩٠) الَّذِينَ يَذْكُرُونَ اللَّهَ قِيَامًا وَقُعُودًا وَعَلَى جُنُوبِهِمْ وَيَتَفَكَّرُونَ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَذَا بَاطِلًا سُبْحَانَكَ فَقِنَا عَذَابَ النَّارِ (١٩١)﴾ [ال عمران].

و پێدڤییە ل سەر مرۆڤی هزرکرنێ بکەت یێ راوەستیای بیت (ل سەر پێیان) یان روینشتی، د مالا خۆدا، یان د گەل هەڤالێن خۆ، دا هزرکرنێ د چێکرنا خۆ، و نەفسا خۆ، و زارۆکێ خۆ، و پێدڤییێن وان و د جل و بەرگێن وان، و د دەزییێ هریێدا، و دەزییێ ئارمویشیدا بکەت، کو نەشێت چاڤلێکرنا وی بکەت (ئانکو نەشێت وەکی وی چێکەت.

# مێشا هنگڤینی نیشانەکا مەزنە

مێشا هنگڤینی نیشانەکە ژ نیشانێن خودێ یێن گەلەك جوان و بەلگە ل سەر مەزناهیيا خودێ، خودێ دبێژيت: ﴿وَأَوْحَى رَبُّكَ إِلَى النَّحْلِ أَنِ اتَّخِذِي مِنَ الْجِبَالِ بُيُوتًا وَمِنَ الشَّجَرِ وَمِمَّا يَعْرِشُونَ﴾ [النحل:٦٨]، (ئانکو: خودایێ تە ئیلهام دا مێشا هنگڤینی، کو جهێ خۆ ل چیا و داران و د وان ئاڤاهییێت دئێنە ئاڤاکرندا بکە.

ئەڤ پیتا (ي) د دویماهییا پەیڤا (اتَّخِذِي)دا بۆ ئاخفتنا د گەل (مؤنثة) ئانکو مێیە، و هەروەکی ئایەت یا ئاراستەکرییە بۆ یا مێ بیی یا نێر، خودێ دبێژیت: ﴿وَأَوْحَى رَبُّكَ إِلَى النَّحْلِ أَنِ اتَّخِذِي مِنَ الْجِبَالِ بُيُوتًا وَمِنَ الشَّجَرِ وَمِمَّا يَعْرِشُونَ (٦٨) ثُمَّ كُلِي مِنْ كُلِّ الثَّمَرَاتِ فَاسْلُكِي سُبُلَ رَبِّكِ ذُلُلًا يَخْرُجُ مِنْ بُطُونِهَا شَرَابٌ مُخْتَلِفٌ أَلْوَانُهُ فِيهِ شِفَاءٌ لِلنَّاسِ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَةً لِقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ (٦٩)﴾ [النحل]، ئانکو: خودایێ تە ئیلهام دا مێشا هنگڤینی، کو جهێ خۆ ل چیا و داران و د وان ئاڤاهییێت دئێنە ئاڤاکرندا بکە. پاشی ژ هەمی فێقییان بخۆ، ڤێجا ئەو رێکێت خودایێ تە ئیلهاما تە پێ کری ب ساناهی بگرە و تێرا هەرە. و د ناڤ هناڤێت وێدا فەخوارنەکا رەنگ رەنگ دەردکەڤیت، دەرمانە بۆ مرۆڤان، ب راستی ئەڤە نیشانەکا ئاشکەرایە بۆ وان ئەوێت هزرا خۆ دکەن.

مێشا هنگڤینی مێشا ئێکانەیە کو بشێت ئاڤا گولان بۆ خوارنێ عومبارکەت، و زێدەباری کو ئەو بۆ دورستکرنا خانێن خۆ ب کار دئینیت، و شەمایێ و هنگڤینی ژێ چێ دکەت، ئەو ب کارەکێ باش و مەزن رادبیت ئەو ژی ئاڤزکرنا (تەلقیحکرنا) گولانە، و بێی مایتێکرنا مێشا هنگڤینی هژمارەکا گەلەکا مەزن ژ رووەکان بەری نادەن.

و مێشێن هنگڤینی ژ خانێن خودان سیستەمەکێ جڤاکی یێ هویربینێ لێکدایە (رێکخستی)، کو د شیاندا نینە مەزنترین جڤاکێن مرۆڤایەتییێ چاڤلێکرنا وی بکەن (ئانکو وەکی وی بشێن ڤێ چەندێ بکەن).

مێشا هنگڤینی دچیتە سەر پتر ژ هزار گولان، داکو چپکەکا ئاڤا گولان ب دەست خۆ بێخیت، و ب دەستڤەئینانا ئێك چپکا ئاڤا گولێ پێدڤییە دادەتە سەر هزار گولان، یان پتر، و ژ بۆ کۆمکرنا سەد گرامێن ئاڤا گولێ، پێدڤی ب ملیۆن گولایە.

لەزاتییا مێشا هنگڤینی د دەمێ فرینێدا، پترە ژ (٦٥) کیلۆمەتران د دەمژمێرەکێدا، لەزاتییا وێ نێزیکی لەزاتییا ترومبێلێیە، و دەمێ یا داگرتی بیت ژ ئاڤا گولان، لەزاتییا وێ دهێتە خوارێ بۆ (٣٠) کلیۆمەتران د دەمژمێرەکێدا، و ژ بیر نەکەین کو ئەڤ داگرتنە ژ ئاڤا گولان، هەمبەری سێکا کێشا وێیە، و ئێك کیلۆگراما هنگڤینی پێدڤی ب فرینا نێزیکی (٤٠٠) هزار کیلۆمەتران هەیە، ئانکو هندی دەه زڤرینان ل دۆر عەردی بزڤریت د هێلا کەمەریدا، دبیتە هەمبەری دەه جارێن چێوێ عەردی، و گوهۆرینەکا کیمیایی ل سەر ئاڤا گولاندا دهێت دەمێ فرینێ.

هندەك دەولەتێن پێشکەفتی د بوارێ پیشەسازییێدا، کەرستێن خاڤ (یێن دەستپێکێ) دئینن ژ کیشومرەکی، و د رێکا چۆنا خۆدا بۆ کارگەهان، گەلەك کریار دئێنە کرن د گەشتیێ ب خۆدا ل سەر ڤان کەرستان، بۆ ب دەستڤەئینانا دەمی، و دابینکرنا مەزاختنا شیانان، و ئەگەر ڤان ئەڤ رێکە داهێنابیت، ب راستی مێشا هنگڤینی د ڤێ چەندێدا بەری وان ڤەگوهاستنێ دکەت ب گەلەك جاران، کو د ماوێ فرینا مێشێدا گەلەك گوهۆرینێن کیمیایی ل سەر وێ ئاڤا گولان یا وێ هەلگرتی دهێتە کرن.

دەمێ گول د وەرزیدا زۆربن، دێ ئەو ئاڤا گولان یا وێ هەلگرتی دەتە مێشەکا دی یا هنگڤینی، و ب لەز دزڤریتەڤە دا دەم ژێ نەچیت، و ئاڤا گولان بمێژیت، و ئەگەر گول د کێم بن، دێ هەلگرتنا خۆ بەتە د ناڤ خانێدا، و دێ دانیتە جهێ وێ یێ گونجای.

و قەبارێ شاها وان ژ هەمییان مەزنترە، و ل وەرزێ بهارێ رۆژانە هزار هەتا دو هزار هێکان دکەت، و تشتێ حێبەتی ئەوە ئەڤ شاهە شاهان ددانیتە جهەکی، و نێران جهەکی، و مێیان جهەکی، دا هەر ئێك ژ ڤان خوارنەکا تایبەت بگەهیتێ، و چاڤدێرییەکا تایبەت، ل دویڤ رەگەزێ وی، هەروەکی جۆرێ رەگەزی دزانیت بەری بوونێ، و مرۆڤ نەشێن ڤێ چەندێ بکەن.

ئەگەر ژنەکێ زانستێ نوژداری خواندبیت، و یا تایبەتمەند بیت ب نەخۆشییێن ژنان، و د بوارێ زارۆکبوونێدا، و شوی بکەت، و ب دوگیان بکەڤیت، ئەرێ دێ زانیت چ رەگەزە د زکێ ویدا؟ شاها مێشێن هنگڤینی دزانیت رەگەزێ د زکێ ویدا نێرە یان مێیە، یان شاهە، و دەمێ دهێت دا هێکێ بکەت، ددانیتە جهێ وێ یێ گونجای.

و هندەك مێشێن مێ یێن هنگڤینی، خوارنا تایبەت بۆ شاهێ دئینن، و زانایێن مێشا هنگڤینی ناڤێ ڤان کرییە مێشێن هنگڤینی یێن خزمەتکار.

و ئەگەر شاه مر شانە تێك دچیت، و مرۆڤ تێبینییا ڤێ گوهۆرینێ دکەت، و زیلکا شاهێ ب مرۆڤی ڤەنادەت، بەلکو ب وان شاهان ڤەددەت ئەوێن هەڤرکییا وێ دکەن ل سەر پۆستێ وێ، ژ بەر هندێ کارێ مێشێن مێ دەرزیدانا شاهایە، و مێشێن مێ کارکەرن، و کارێ شاهێ کرنا هێکایە.

ئەڤە نیشانەکە ژ نیشانێن خودێ بەلگەیە ل سەر مەزناهییا وی، خودێ دبێژیت: (وَأَوْحَى رَبُّكَ إِلَى النَّحْلِ أَنِ اتَّخِذِي مِنَ الْجِبَالِ بُيُوتًا وَمِنَ الشَّجَرِ وَمِمَّا يَعْرِشُونَ (٦٨) ثُمَّ كُلِي مِنْ كُلِّ الثَّمَرَاتِ فَاسْلُكِي سُبُلَ رَبِّكِ ذُلُلًا يَخْرُجُ مِنْ بُطُونِهَا شَرَابٌ مُخْتَلِفٌ أَلْوَانُهُ فِيهِ شِفَاءٌ لِلنَّاسِ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآَيَةً لِقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ (٦٩)) [النحل].

و خودێ هۆسا حەز کر ب حیکمەتا خۆ جڤاکەکی چێکەت ل سەر بلندترین ئاستێن هاریکاری و تەکووز، و تایبەتمەندی و کارێ رژدێ ب بەرهەم، و رێکخستنەکا موعجیزە، ب فەرمانەکا چێکرنێ نە یا راسپاردنێ.

لەوا تو نەشێی تێکچۆنەکێ د ڤی جڤاکیدا ببینی، و نە خرابکارییەکێ، ئەڤە تەکووزییا چێکرییەکا رەهایە، چونکی فەرمانا وی ل ڤێرە یا چێکرنێیە، نە یا راسپاردنێ، ئەڤێ چەندێ ئەم د جڤاکێ مێشا هنگڤینیدا دبینین.

ئەڤە جڤاکەکێ ئێککگرتییە، و تەکووزە، ل سەرێ ڤی جڤاکێ ئێککگرتی شاهەك یا هەی، چو یێن دی هەڤرکییا وێ ناکەن، هەر مێشەك هەست ب هەبوونا شاها مێشان دکەت ب رێکا کەرستەکێ کو ئەڤ شاهە بەرددەت، و ڤی کەرستەی مێشێن مێ یێن کارکەر بۆ هەمی تاکێن د شانێدا ڤەدگوهێزن، و دەمێ شاها وان دمریت سیستەم د شانێدا تێك دچیت، و بەرەلایی بەلاڤە دبیت، و کار دمیننە ب رێڤە.

و مێشا مێ یا هنگڤینی گەلەك کارێن جودا جودا یێن هەین و د ناڤبەرا خۆدا ل دویڤ ژییێن وان دابەش دکەن، و بەرهەڤییێن وان یێن لەشی، و ل دەمێ پێدڤی و ل دەمێ مەترسییێ، و د وەرزێن زەحمەتدا هەر مێشەك وی کاری دکەت یێ ل سەر هاتییە سەپاندن.

و شاهێ خولام یێن هەین ب خزمەتا وێ رادبن، و خوارنا شاهانە بۆ دئینن، و هندەکێن هەین ب چاڤدان و پەروەردەکرنێ رادبن، ب چاڤدێرییا تێژکان رادبن، و ئینانا خوارنا گونجای، و مێشێن مێ یێن کارکەر یێن هەین ئاڤێ بۆ شانێ ئامادە دکەن، و هندەکێن دی ل هاڤینێ ب کارێ سارکرنا خانێ رادبن، و ل زڤستانێ گەرم دکەن، و تەرکرنا وێ د دەمێ هشکاتییێدا، و ژ بلی ڤان هندەکێن دی ب کارێ پاقژکرنا شانێ رادبن، و دیوارێن شانێ حولی و نەرم دکەن و ب رێکا کەرستێن تایبەت د تەیسینن.

و هندەکێن دی پاسەوانن زێرەڤانییا شانێ دکەن ژ دژمنان، و ناهێلن چو مێش بچنە د ناڤ شانێدا ئەگەر پەیڤا نهێنی نەبێژن، ئەگەر دێ کوژن، و پەیڤا نهێنی ل دەمێ پێدڤی دگوهۆرن.

و هندەك ب چێكرنا تلپێن شێوێن شەش لایی رادبن، ئانكو كونێن شانێ، كو بۆشایی د ناڤبەینێدا نینە، ب شێوازەكی كو د شیاندا نەبیت مەزنترین ئەندازیار بشێن ڤێ چەندێ بكەن.

و هندەكێن دی ب كارێ لێگەریان و ئاشكەراكرنا جهێن گولان رادبن، و دەمێ ب سەر جهێن گولان هلبوون دێ زڤرنە شانێ، و دێ لەیزن لەیزاندنەكا تایبەت ب ڤێ لەیزاندنێ دێ بۆ مێشێن دی یێن مێ یێن كاركەر ڤی جهی دەستنیشان كەن، ژ لایێ دویراتی و ئاراستەی، و پلا چالاكییێ د لەیزاندنێدا نیشانە بۆ زۆرییا خوارنێ، یان كێمییا وێ.

و كۆما مەزنا مێشێن كاركەر دێ بەرەڤ جهێن گولانڤە چن دا ئاڤا وان بەرهەم بینن، چونكی ئەڤە كەرستێ ئێكێیە بۆ هنگڤینی، و چێدبیت ئەڤ جهە پتر ژ دەھ كیلۆمتران یێ ژ شانێ دویربیت، و دێ مێش زڤرنە شانێ پشتی ئاڤا گولان وەرگرتی ب رێكەكا كو هەتا نوكە نە یا دیارە.

و مێشا هنگڤینی شیانترین و شارەزاترین مێشە د كۆمكرن و ڤەگوهاستن و عومباركرنا مەزنترین چەندی ژ ئاڤا گولان، و د كێمترین دەمدا، و ب كێمترین زەحمەت، و شیانترین مێشە د ئاڤزكرنا (تەلقیحكرنا) رووەكاندا، دا ببیتە هاریكار بۆ بەرهەمئینانا تۆڤی، و بەری.

و مێشا هنگڤینی دچیتە ئێك جه كو بەری هنگی هاتییە دەستنیشانكرن، دا ئاڤا گولان ژ ئێك جۆر وەرگریت، و ئەوێ سەرنجێ رادكێشیت ئەوە چو نەخۆشییێن مێشا هنگڤینی ناهێنە ڤەگوهاستن بۆ مرۆڤی ب رێكا هنگڤینی.

و مێشا هنگڤینی شیانا هەستكرنێ ب دەمی یا ل دەڤ هەی و شرۆڤەكرنا وێ یا ب زەحمەتە، دزانیت كەنگی هەر جۆرەكێ گولێن رووەكی ئاڤا خۆ بەرددەت، و كەنگی

دندکێن تەلقیحا وان دهێنە پێومرکرن، پاشی هەر جۆرەکێ گولان د دەمێ وان یێ گونجایدا دێ چنێ (سەرەدانا وێ کەن).

ب راستی بهایێ هنگڤینی یێ چارەسەرییێ دووجارکی بهایێ وێ یێ خوارنێیە، چونکی مفایێن وی یێن چارەسەرییێ جهگرن د هەمی کۆئەندامێن لەشی و ئەندام و شانێن ویدا، بەلکو ل سەر تخویبێ بەرعاقلیێدایە، چاوا نە، دەمێ خودێ دبێژیت: (يَخْرُجُ مِنْ بُطُونِهَا شَرَابٌ مُخْتَلِفٌ أَلْوَانُهُ فِيهِ شِفَاءٌ لِلنَّاسِ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَةً لِقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ) [النحل:٦٩].

و چ هەیە ژ ئیعجازا رێکخستنێن ڤێ ئایەتێ؟ دا ڤی کاری بۆ ڤەگێرێ وێ و زانایێ وێ بهێلین.

مامۆستایەکی چل سالان د زانکۆیەکێدا کار دکر و زانستێ پەروەردەکرنا مێشا هنگڤینی دخواند، و دەمێ ئەڤ گۆتنا خودێ خواندی: (وَأَوْحَى رَبُّكَ إِلَى النَّحْلِ أَنِ اتَّخِذِي مِنَ الْجِبَالِ بُيُوتًا وَمِنَ الشَّجَرِ وَمِمَّا يَعْرِشُونَ) [النحل:٦٨]. حێبەتی بوو کو چو تخویب بۆ نەبن، چونکی رێك و پێکی و رێکخستنا ڤێ ئایەتێ، سەلماندنا پەیڤێن وێ، و جوانییا ئاماژێن وێ، رێك دکەڤن د گەل نویترین بیردۆزێن مێشا هنگڤینی، بەلکو هنگڤینی ئەو رۆل نەبوو یێ کو نوکە دهێتە زانین دەمێ هاتنەخوارا ڤێ ئایەتێ، هنگڤین ل وی دەمی خوارن بوو، و نوکە دەرمانە، کو کەرستەکێ تام شرین بوو، و ئەڤرۆ بوویە دەرمانخانەکا تمام، (وَأَوْحَى رَبُّكَ إِلَى النَّحْلِ أَنِ اتَّخِذِي مِنَ الْجِبَالِ بُيُوتًا وَمِنَ الشَّجَرِ وَمِمَّا يَعْرِشُونَ).

زانا دبێژن: ((خودێ وەحی دابوو عەردی: [(بِأَنَّ رَبَّكَ أَوْحَى لَهَا) [الزلزلة:٥]، و وەحیا خودێ بۆ عەردی ئەوە فەرمانا وی دکەت کو تشتەکێ دەستنیشانکری بکەت، و دەمێ وەحی دایە مێشا هنگڤینی ئەو وەحییا غەریزییە[1] کو خودێ کرییە د مێشا

---

١. ئەو سالۆخەتن یێن خودێ د گەل چێکرنا بوونەوەران داینە د گەل. وەرگێر

**هنگڤینیدا، و چێدبیت وەحییا ئیلهامی بدەتە مرۆڤەکێ ئاسایی هەر وەکی وەحی دایە دایکا مووسایی: (وَأَوْحَيْنَا إِلَى أُمِّ مُوسَى أَنْ أَرْضِعِيهِ) [القصص:٧]، ئانکو: (وەختێ مووسا بووی) مە ئیلهام بۆ دەیکا مووسایی هنارت کو شیری بدە مووسایی. و دەمێ خودێ وەحییێ ددەتە پێغەمبەرێن خۆ ئەو وەحییا پەیامێیە)).**

**و دەمێ خودێ وەحی دایە مێشا هنگڤینی ژ بەر کو ئەڤ مێشە تشتەکێ ب بها بۆ مرۆڤی پێشکێش دکەت، و پەیڤا: (الشفاء) ب تنێ ل دو جهان د قورئانێدا یا هاتی؛ جهێ هنگڤینی[1]، و جهێ قورئانێ[2]، و هەر وەکی هنگڤین چارەسەرییە بۆ لەشان، و قورئان چارەسەرییە بۆ دەروونان[3]، و گۆتنا خودێ: (وَأَوْحَى رَبُّكَ إِلَى النَّحْلِ)، نەگۆت: (وأوحى**

---

١. جهێ ئاماژە داییە هنگڤینی د گۆتنا خودێدا: (يَخْرُجُ مِنْ بُطُونِهَا شَرَابٌ مُخْتَلِفٌ أَلْوَانُهُ فِيهِ شِفَاءٌ لِلنَّاسِ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً لِقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ) [النحل:٦٩].

٢. و جهێ ئاماژە داییە قورئانێ د گۆتنا خودێدا: (وَنُنَزِّلُ مِنَ الْقُرْآنِ مَا هُوَ شِفَاءٌ وَرَحْمَةٌ لِلْمُؤْمِنِينَ وَلَا يَزِيدُ الظَّالِمِينَ إِلَّا خَسَارًا) [الاسراء:٨٢]، و خودێ دبێژیت: (يَا أَيُّهَا النَّاسُ قَدْ جَاءَتْكُمْ مَوْعِظَةٌ مِنْ رَبِّكُمْ وَشِفَاءٌ لِمَا فِي الصُّدُورِ وَهُدًى وَرَحْمَةٌ لِلْمُؤْمِنِينَ) [یونس:٥٧].

٣. (إبن القيم) د (الطب النبوي)دا (٢٧/١) دبێژیت: [و د فەرموودەکا دیدا هاتییە ((عليكم بالشفاءين؛ العسل والقرآن))، (ئانکو دو چارەسەرییان بزانن؛ هنگڤین و قورئان). د ناڤبەرا نوژدارییا مرۆڤی و خوداییدا کۆمکرییە، و د ناڤبەرا نوژدارییا جەستەیان و روحاندا، و د ناڤبەرا دەرمانێ عەردی و دەرمانێ عەسمانیدا.

**ئەگەر ئەڤە هاتە زانین، ئەڤە ئەوە یا پێغەمبەری ﷺ سالۆخەتا هنگڤینی کری دا زکێ وی بهێتە بەردان ژ حەبلینەکێ کو تووشی تژیبوونێ ببوو، فەرمان یا کری ب خوارنا هنگڤینی ژ بۆ پالدانا وان زێنماییان ژ لایێ مەعیدەی و رویڤیکان دەردکەڤن ژ بەر کو هاریکارە بۆ ڤالاکرن و پالدانا زێنماییێن خوارنێ، و چێدبیت مەعیدە تووشی تێکهەلکرییێن حولی بیت نەهێلیت خوارن تێدا جهگر بیت ژ بەر حولیباتییا وێ، و مەعیدەی رویشی (خمل) یێن هەی وەکی لحێفەکا ب رویشییە، و دەمێ ئەڤ تێکهەلکرییە پێڤە دنسیێت خراب دکەت، و خوارنێ ژی خراب دکەت، ل ڤێرە دەرمانێ وێ بۆ ڤالاکرنا وان تێکهەلکرییان هنگڤینە، و هنگڤین باشترین چارەسەرییە بۆ ڤی دەردی، ئەخاسمە دەمێ هنگڤینی تێکەلی ئاڤا گەرم دکەن.**

**و دوبارە ڤەخوارنا هنگڤینی رامانەکا نوژداری یا داهێنانکرییە، کو دەرمان دڤێت ل دویف وێ چەندییا نەخۆشیێ بیت، ئەگەر کێماسی تێدا کر هەمی ناچیت، و ئەگەر زێدە ژ رادەێ وێ ب کار ئینا دێ زیانەکا دی پەیداکەت، و دەمێ فەرمانا وی کری کو هنگڤینی بخۆت، هند هنگڤین خوار تێرا بەرگرییا نەخۆشییێ**

الله)، د گەل هندێ کو ناڤێ (الله) نیاسینە ل سەر خۆیەتی کو بەردەوام یێ د هەبوونێدا، و د گەل هندێ کو هەمی ناڤێن خودێ د گۆتنا (الله)دا یێن هەین، بەلێ خودێ وەسا حەز کر مرۆڤی تێبگەهینیت کو ئەڤ خودایێ ب دان و مەرد یێ کو چاڤدێرییا تە و دانا تە دکەت ئەوە یێ مێشا هنگڤینی چێکری ژ بەر تە، جە ل ڤێرە جهێ پەروەردە و چاڤدێرییێیە.

خودایێ تە ئەوە یێ تە مەزن دکەت، و یێ لەشێ تە مەزن دکەت، و نەڤاسا تە، و ئەوێ تو ئینایە هەبوونێ، و هەوای ددەتە تە، و ئاڤێ و خوارن و ڤەخوارنێ، و کانزایان، و یێن وەکی کانزایان، و وان هەمییێن د عەردیدا ژ چێکرییان، هەر ئەو ب خۆیە یێ ئیلهام دایە مێشا هنگڤینی.

و تشتێ مرۆڤ پێ حێبەتی دبیت ئەوە کو فەرمان بۆ مێشا هنگڤینی ب شێوازێ (مێ) د ڤێ ئایەتێدا هاتییە: (وَأَوْحَى رَبُّكَ إِلَى النَّحْلِ أَنِ اتَّخِذِي) [النحل:٦٨]، و بۆ مێرییێ ب

---

نەکر، و نەگەهشتە ئارمانجێ، و دەمێ ئەڤ چەندە گۆتییێ زانی کو ئەوێ هنگڤین خواری تێرا هندێ نەخواربوو کو بەرگرییا نەخۆشییێ بکەت، و دەمێ دوبارە ئینایە دەڤ پێغەمبەری ﷺ دوپات کر کو جارەکا دی بخۆتەڤە دا بگەهیتە وێ رێژا بەرگرییێ بۆ نەخۆشییێ، و دەمێ خوارن دوبارەکری ل دویڤ کەرستێ نەخۆشییێ (هنگڤین) ژ ڤێ نەخۆشییێ رزگار بوو ب حەزکرن و شیانا خودێ، و ل ڤێرە ئەو چەندییێن دەستنیشانکری و چاوانییێن وان و رێژا هێزا نەخۆشییێ و نەخۆشی ژ مەزنترین یاسایێن نوژدارییێنە.
و د گۆتنا پێغەمبەریدا ﷺ: ((صدق الله وكذب بطنُ أخيك)) ئاماژەکە بۆ ب جههاتنا مفایێ ڤی دەرمانی، و مانا نەخۆشییێ نە ژ کێماسییا دەرمانی ب خۆیە، بەلکو تێرا وێ نەخۆشییا زکی بۆ نەهاتە دان، و زێدەیا کەرستێ پیس تێدا، فەرمان کر ب دوبارەکرنا دەرمانی (هنگڤین) ژ بەر گەلەکییا کەرستەی، و نوژدارییا پێغەمبەری ﷺ نەوەکی نوژدارییا نوژدارانە، ژ بەرکو نوژدارییا وی یا پشت راست و ڤەبڕە چونکی یا ژ وەحییێ دەرکەڤتی و چرایێ پێغەمبەراتییێ، و تەکووزیا عەقلی].

(ابن القيم) ئاماژێ بۆ فەرموودا ئەبی سەعیدی دکەت د هەردو سەحیحاندا ((أنَّ رَجُلاً أتى النبيَّ (صلى الله عليه وسلم) فقال: أخي يَشتكي بَطنَه، فقال: اسقِهِ عَسَلاً، ثمَّ أتى الثانية فقال: اسقِهِ عَسَلاً، ثمَّ أتاهُ الثالثة فقال: اسقِهِ عَسَلاً، ثمَّ أتاهُ فقال: قد فعلتُ فقال: صدَقَ اللهُ، وكَذَبَ بَطنُ أخيكَ، اسقِهِ عَسَلاً، فسقاهُ فبَرَأ)).

شێوازێ (نێر) هاتییه، خودێ دبێژیت: ﴿حَتَّى إِذَا أَتَوْا عَلَى وَادِ النَّمْلِ قَالَتْ نَمْلَةٌ يَا أَيُّهَا النَّمْلُ ادْخُلُوا مَسَاكِنَكُمْ﴾ [النمل:١٨]، و بۆچی مێری ب شێوازێ (نێر) هاتییه، و مێشا هنگڤینی ب شێوازێ (مێ) هاتییه؟ ژ بەر کو مێری کومەکن نێر و مێ یێن تێدا، و دەمێ تە بڤێت باخڤی د زمانیدا ئاماژێ ب نێر و مێیان بکەی دێ جێناڤێ (نێر) ب کار ئینی، بەلێ ئەگەر ئاخڤتن یا ئاراستەکری بیت بۆ (مێ)یان دێ ب تنێ جێناڤێ (مێ) ب کار ئینی، و ئاخڤتن بۆ مێشا هنگڤینی ب شیوازێ (مێ) یا هاتی چونکی کارکەرێن مێ ب تنێ هنگڤینی چێ دکەن، ئەرێ ئەڤە یا بەرنیاس بوو بەری سەردەمێ پێغەمبەری ﷺ؟.

گەلەك ئایەت خودێ یێن کرینە د گەردوونی و عەردیدا، و ئەوا ل سەر مرۆڤی پێدڤی ئەوە هویربینییێ تێدا بکەت، دا باوەرییا وی ب خودێ جێ بەجێ ببیت د ماوێ ڤان نیشانێن جوان و سەرنج راکێش کو شیانێن مرۆڤی پێڤە د لاوازن ل سەر هزرکرن و تەخمینکرنا وان.

# هنگڤین و مفایێن وی

مێشا هنگڤینی یا هاتییە چێکرن ل سەر سیستەمەکێ جڤاکی یێ گەلەك ب رێك و پێك و حێبەتی، کو بلندترین پلەیێن هاریکارییێ یێن تێدا، و بلندترین پلەیێن سیستەماتییێ، و بلندترین پلەیێن تایبەتمەندییێ، و بلندترین پلەیێن نەرمییێ یێن تێدا ب جهئینانەکە بۆ بەرژەوەندییا گشتی، بەلێ ب فەرمانەکا پێکهاتەیی نە ب فەرمانەکا راسپاردەیی، ژ وان نیشانێن بەلگە ل سەر مەزناهییا خودێ جڤاکێ مێشا هنگڤینییە، کو ئەو ژی هنگڤینە بابەتێ ئاخفتنا مەیە.

ژ وان نیشانێن دهێنە دەرئێخستن و دیارکرن ل ژێر ئیعجازا د قورئانا پیرۆزدا، یان هندەك زانایێن قورئانێ دبێژنێ: د بەر ڕاکرنا زانستی (السَّبَقُ العلميُّ) د قورئانا پیرۆزدا، ئەوە کو خودێ بەحسێ هنگڤینی دکەت وەك شیفا بۆ مرۆڤان (چارەسەری بۆ نەخۆشییان)، خودێ دبێژیت: ﴿يَخْرُجُ مِنْ بُطُونِهَا شَرَابٌ مُخْتَلِفٌ أَلْوَانُهُ فِيهِ شِفَاءٌ لِلنَّاسِ﴾ [النحل:٦٩]، و دەمێ قورئانا پیرۆز بۆ پێغەمبەری ﷺ هاتییە خوارێ، هنگڤینی ب دیتنا مرۆڤان ب تنێ بهایێ خوارنێ هەبوو، و نەیێ چارەسەرییێ، قورئانێ ئاماژە یا ب ڤێ چەندێ دای بەری پتر ژ (١٤٠٠) سالان.

هندەك زانا دبێژن: ((بهایێ هنگڤینی یێ چارەسەرییێ بنیاتێ وێ هەبوونا (ئەنزیمێن) چالاکە، و ئەڤ ئەنزیمە ب لەز کارتێکرنێ دکەن، و ب گەرمییێ پویچ دبن، و ئەگەر هنگڤینی بۆ ماوێ هەیڤەکێ عومبارکەن ب (٣٠) پلێن گەرمێ، دێ باراپتر تایبەتمەندییێن خۆ ژ دەست دەت، و ب پلا (٢٠) بۆ ماوێ پتر ژ سالەکێ دێ باراپتر

تایبەتمەندییێن خۆ ژ دەست دەت، پێدڤییە ل سەر شێوێ وی یێ سروشتی بهێتە پاراستن، بێی کو گەرم ببیت، بێی کو ل جهەکێ گەرم عومبارکەن)).

و ژ بەر کو دا مرۆڤ نەکەڤیتە د بێهیڤیبوونێدا و وی های ژ گۆتنا خودێ هەیە: (فِيهِ شِفَاءٌ لِلنَّاسِ)، لەوا پێدڤییە جودایی بێتە کرن د ناڤبەرا هنگڤینێ دورستێ سروشتی کو ب ئاڤا گولان مێشێن هنگڤینی دورست کرییە، و د ناڤبەرا هنگڤینێ سەختە کو ب ئاڤ و شەکرێ دورست کری، کو ددانن نێزیکی جهێ شانێن مێشا هنگڤینی، کاریگەرییا ڤی هنگڤینێ سەختە گەلەکا لاوازە، هەتا کو مرۆڤ بێ هیڤی نەبیت، خودایێ گەردوونی دبێژیت: (فِيهِ شِفَاءٌ لِلنَّاسِ).

ڤەکۆلین و تاقیکرنێن گەلەك هویربین یێن هاتینەکرن ل سەر کاریگەرییێن هنگڤینی د کۆئەندامێ هەرسکرنێدا، و د کۆئەندامێ دەمارگیری، و پیستی، و مێلاکا سۆر، و رویڤیکاندا، و پەیوەندییا وی ب نەخۆشییا شەکرێڤە، و پەیوەندییا وی ب نەئارامییا دەمارگیری، و ب نەهاتنا خەوێ، و ب نەخۆشییێن هەستیاری، و کۆئەندامێ هەناسێ، و کۆئەندامێ دلی و زڤرۆکا خوینێ، ئەگەر ئەم بزڤرینە وان لێڤەگەرێن ل سەر بهایێ هنگڤینی ئەوێن ل سەر چارەسەرییێ دئاخڤن، دێ بینین کو هەمی کۆئەندامێن لەشێ مرۆڤی بێی ڤەدەرکرن، کارتێکرنەکا ئەرێنی و یا ب لەز لێ دبیت ب هنگڤینێ راستەڤینە، یێ کو دهێتە وەرگرتن ب ئاڤا گولان.

و وەك نێزیککرنەك خودێ وەسا حەزکرییە کو ب هنگڤینی کولبوونا دژوار یا رویڤیکان چارەسەر دبیت، چونکی ب لەز مێژتنێ دکەت، ناهێلیت کویفکاتی د رویڤیکاندا چێ ببیت، کۆنترۆلا ماسۆلکێن میزلدانکێ دکەت، کو هنگڤینی رۆلەکێ ئەرێنی تێدا یێ هەی، باشترلێهاتنا گەشەبوونا هەستییان ژ کارتێکرنێن هنگڤینینە، چارەسەرییەکا هەرە باشە بۆ وان کەسێن تووشی برینێن مەعیدەی و رویڤیکان بووین، و باراپتر نەخۆشیێن کۆئەندامێ هەرسکرنێ.

هنگڤین زیانێ ناگەهینیتە وان کەسێن نەخۆشییا شەکرێ هەی، چونکی شەکرەکا کەتییە (أحادي)، شەکرەکا کەتییا کو ب لەز دهێتە هەرسکرن، و نەئارامی و توندبوونا دەمارگیری کارتێکرنەکا ئەرێنی دکەتە سەر ب خوارنا هنگڤینی، و هنگڤین خەو نەهاتنێ ناهێلیت، و نەخۆشییێن هەستیاری (حساسیة)، و نەخۆشییێن پیستی، هەتا نوژدارێن نوکە هنگڤینی ددانتە سەر برینان بەری چێبن، چونکی چێبوونا برینان ب رێکا هنگڤینی سێ جارکی بلەزتر چێ دبیت ژ چێبوونا وێ یا ئاسایی.

و شوینا مرۆڤ دەرمانێن گرانبها ب کار بینیت، پێدڤییە ڤێ خوارنا پاقژ ب کار بینیت، ئەوا خودێ ئەڤ تایبەتمەندییێن حێبەتی کرینە د ناڤدا.

زانا دەربارەی هنگڤینی دبێژن: ((حەفتێ کەرستێن چارەسەرییێ یێن د هنگڤینیدا هەین))، رەنگە خوارنا هنگڤینی ببیتە دەرمانخانەکا تمام! ئەنزیم، ڤیتامین، کانزا، دوازدە جۆرێن شەکرێ، و هەر جۆرەکی مفایەکێ تایبەت یێ هەی، و هەتا نوکە ژی ئەڤ بابەتە جهێ ڤەکۆلینێیە، و هەتا زانا تشتەکێ ئاشکەرا و پێشکێش دکەن هندەك تشتێن دی ل بەر بەرزە دبن.

# ئەڤەیە جڤاکێ مێرییان

مێری مێشەوەرەکا جڤاکییا پێشکەفتی و بلندە، ل هەمی جهـ و دەمان یا هەی، جۆرێن مێرییان پتر ن ژ نەهـ هزار جۆران، و هندەك مێری د ژیانەکا خۆجهییێدا دژین و د کونێن خۆدا، و هندەك مێری د ژیانەکا هاتن و چۆنێدا دژین وەکی کۆچەران ب تەمامی، و هندەك رزقێ خۆ ب شیان و کارێ خۆ ب دەست خۆڤە دئینن، و هندەك ب غەدر و کۆنترۆلکرنێ خوارنا خۆ پەیدا دکەن، و مێری مێشەوەرەکا جڤاکییە، دەمێ ژ مێرییێن ژ جۆرێ خۆ ڤەدەر بوو دمریت، ئەگەر خوارنەکا باش و جهەکێ باش و دەمێ باش ژێ هەبیت، ئەو وەکی مرۆڤییە، ئەگەر ڤەدەر بوو ژ جهەکێ دویری رۆناهییێ، و دەنگی و دەمی و شەڤێ و رۆژێ د ماوێ بیست رۆژاندا دێ هەڤسەنگییا خۆ ژ دەست دەت.

و مێری وانەکا مەزن نیشا مرۆڤی ددەت ل سەر هاریکارییێ، دەمێ مێرییەکا برسی و ئێکا تێر گەهشتنە ئێك، دێ مێرییا تێر نیڤشکێن خوارنێ ژ لەشێ خۆ دەتێ، چونکی د کۆئەندامێ وێ یێ هەرسکرنێدا ئامویرەکێ هاڤێتنێ یێ هەی خوارنێ پێ ددەتە هندەکێن دی، هویربینییێ بکەن د فەرمووودا پێغەمبەریدا ﷺ: ((لَيسَ المؤمنُ الَّذِي يَبيتُ شَبْعان، وَجارُهُ جائِعٌ))[1]، ئانکو: مرۆڤێ باوەردار نەئەوە یێ بنڤیت و جیرانێ وی یێ برسی.

---

١. شرح معاني الآثار للطحاوي (٢٧/١).

زانایان زێرەڤانی و دویڤچۆنا رێکێن ژیارا مێرییێ کر، و پێڤە مەندەهۆش بوون ب کارێ وان یێ رژد و ب زەحمەت و بەردەوام د دەستڤەئینانا رزقێ خۆ، و هاریکاری و لێکڤەکرنا کاران د ناڤبەرا واندا ب هەمی هویربینی و رژدییەکێڤە.

مێرییان شاهەکا ڤەبارە مەزن یا هەی، کارێ وێ کرنا هێکایە، و دانا شیرەت و ئاراستەکرنانە، و ڤێ شاها مێرییان جهەکێ ئارام یێ هەی د ناڤ جهێن مێرییاندا، و شاها مێرییان د پەیوەندییەکا بەردەوامدایە د گەل هەمی مێرییێن شاهنشینا خۆ، و مێرییێن مێ یێن کارکەر ب چەندین کارێن جودا جودا رادبن. ژ وان کاران پەرومردەکرنا تێژکان، و ئەڤە وەکی کەرتێ ڤێرکرنێیە، و د ناڤ مێرییاندا لەشکەرێن هەین ڤەبارێن وان مەزنترن ژ یێن دی، و سەرەکێ رەق یێ هەی هەروەکی کومزرییێ سەرێ سەربازایە، و ئەڤە وەکی کەرتێ لەشکەرییە د زێرەڤانییا شاها مێرییاندا، و ژ بۆ پاراستنا ئارامییێ و بەرهنگاربوونا دژمنان. و ژ کارێن مێرییێن مێ یێن کارکەر پاقژکرنا جهێن خۆ و جهێن هاتن و چۆنێ، و ئەڤە وەکی کەرتێ باژێرڤانییێیە، و دیسا کێشانا کەلەخێن مێرییێن مری ل جهێ ئاکنجیبوونا وان، و ڤەشارتنا وان د بن عەردیڤە، و ئەڤە وەکی نڤێسینگەهێن ڤەشارتنا مریانە، و دیسا ئینانا خوارنێ ژ دەرڤەی شاهنشینێ، و ئەڤە وەکی کەرتێ داهاتییانە، و ژ کارێن وان یێن دی، چاندنا مشەخۆرانە، و ئەڤە وەکی کەرتێ چاندنێیە، و خودانکرنا مێشان کو مێری ل سەر ئاڤا وان دژین، و ئەڤە وەکی کەرتێ خودانکرنا پەزییە.

مێرییان سیستەمەکێ هویربین یێ هەی د ژیارا خۆدا، و سەرکردەکێ هەی ئاراستە دکەت، و فەرمانێ لێ دکەت، و جهێن خۆجهییێ یێن هەین تێڤە دژین، و ئەڤ جهە د لێکڤەکرینە بۆ زۆرێن حەواندنێ و ژیارێ، و عومبارێن هەین بۆ عومبارکرنا خوارنێ، و رێکێن درێژێن گەلەك چەق ژێ دچن د ناڤدا یێن هەین، زێرەڤانییەکا دژوارا بەردەوام یا ل سەر هەی، و کۆمڤەبوویێن وان د ڤان جهاندا گوندێن تمامن، وەکی داگیرگەهانە رێکێن گەهاندنێ یێن د ناڤبەرا واندا، ب ڤان رێکان دگەهنە سەر عەردی.

مێری د گوندێن خۆدا ل دویڤ سیستەمەکێ حێبەتی و ڤەبر کاردکەن، و ب سەرپەرشتییا وان مێرییێن سەرێن وان مەزنبوویی، و لمبیسێن وان ژی مەزنبوویی:

مێری باژێران ئاڤا دکەن، و رێکان دکۆلن و دورست دکەن، و تۆنێلا دکۆلن، و خوارنێ د جهێن تایبەتدا عومبار دکەن، و د هندەك جهێن شاهنشینا خۆدا هندەك جۆرێن مێرییان باخچان چێدکەن، و رووەکان دچینن، و هندەك جۆرێن مێرییان شەران د گەل هۆزێن دی دکەن، خودێ دبێژیت: (وَمَا مِنْ دَابَّةٍ فِي الْأَرْضِ وَلَا طَائِرٍ يَطِيرُ بِجَنَاحَيْهِ إِلَّا أُمَمٌ أَمْثَالُكُمْ مَا فَرَّطْنَا فِي الْكِتَابِ مِنْ شَيْءٍ ثُمَّ إِلَى رَبِّهِمْ يُحْشَرُونَ) [الأنعام:٣٨]، ئانکو: نینە جانەوەرەك ل سەر روییێ عەردی بچیت یان بالەفرەك ب چەنگێت خۆ، بفریت، هەکە ئەو ژی (د ژین، و مرن، و چێکرن، و ڤەژین و هەوجەیییا خۆدا) وەکی هەوە کۆم نەبن، و مە چو (ژ هەوجەیییێت هەوە) د کتێبێدا (مەخسەد پێ دەپێ پاراستییە) نەهێلایە و ژ بیر نەکرییە، ڤێجا پاشی ئەو دێ ب بال خودایێ خۆڤە ئێنە کۆمکرن.

و جۆرەکێ دی یێ مێرییان یێ هەی خانیێن خۆ ل سەر عەردی ژ بەلگێن داران و ل سەر تاییێن وان ئاڤا دکەن، و ئەڤە د مشەنە د بن دارا کاژێ، یان ڤان خانییان دکۆلن د دارێن کەڤناردا، هەر وەکی مرۆڤ چیایان دکەتە خانی بۆ خۆ، و د گەل هندێ مێرییان ئامویرە نینن و تشتێن بەرهەڤکری بەلێ ئەو بورجان ئاڤا دکەن گەلەك هویربین و د موکومن، ب هاریکارییا وێ مەقەسا تیژا ب دەڤێ وانڤە، و ئەو تشتێ دبرن د جوین هەتا وەکی هەڤیری لێ دهێت، بەلکی مسرییێن کەڤن د ئاڤاکرنا خانی و هەرەمێن خۆدا چاڤلێکرنا مێرییان بیت.

و مێرییێن بچویك دمیننە د کونانڤە، دێ ئۆدا کۆلن، و بنداڤان ئاڤاکەن، و ئەو تێدا مەزن دبن، زێدەباری هەبوونا پەروەرکەران، و هندەك مێری بەرپرسن ژ زێرەڤانی، و پاقژکرنێ و پاراستن و رێك و پێککرنا وێ خوارنێ یا مێرییێن کارکەر ئامادەکری، و

ئەو ب هەمیڤە ڤاییل نابیت و خۆ دەتە پاش کو ئێك ل سەر نهێنییێن وێ هەل ببیت، یان مایتێکرنێ ل سەر بکەت دا سیستەمێ وێ یێ حێبەتی د ژیانێدا بزانیت.

و زانایان دیت دەمێ مێری ژ گوندێ خۆ دچن هەر دویراتییەکا دەستنیشانکری کەرستەکێ کیمیایی یێ بێهنەکا تایبەت هەی دهنێرنێ، دا بشێن رێکا زڤرینا خۆ بزانن، و دەمێ ئێکێ ئەڤ شوینوارێن ڤی کەرستەی نەهێلان مێری نەشێت رێکا زڤرینا خۆ بزانیت، و دەمێ مێرییێ تشتەکێ ب مفا دیت و نەشیا هەلگریت دێ هندەك بێهنێ ل دۆر بەلاڤکەت، و دێ کێمەکێ ژ ڤی تشتی بەت، و دێ زڤریتە دەڤ هەڤالێن خۆ، و هەر دەمێ ئێکێ ژ وان دبینیت دێ تشتەکی ژ وی دەتێ ئەوێ د گەلدا دا ئەڤ تشتە بهێتە سەلماندن، هەتا کۆمێن ژ وان ل سەر ڤی تشتی کۆم دبن، وی تشتی دهەلگرن، و ب وەستیان و ب زەحمەت دکێشن، هاریکارییا ئێکدو دکەن د ڤەگوهاستنا ویدا، بۆ زانین مێرییێ هێزەکا ماسولکەیی یا هەی ل دویڤ ڤەبارێ هێزا مەزنترین زۆرانباز و وەرزشڤان هەمبەری وێ گەلەکا کێمە، چونکی مێرییەکا ب تنێ دشێت ب دەڤێ خۆ تشتەکی هەلگریت کێشا وی سێ هزار جاران ژ کێشا وێ ب خۆ پتر بیت و بێی وەستییان.

دیسا زانایان دیت مێری دەمێ مرنا وێ بێهنەکا تایبەت بەلاڤ دکەت هۆشدارییێ ب ڤێ بێهنێ ددەتە مێرییێن دی کو پێدڤییە لەزێ بکەن د ڤەشارتنا وێدا بەری مێشەوەرێن بیانی بهێنێ، و دەمێ زانایەك رابوویی چپکەکا ڤی کەرستەی دانایە سەر لەشێ مێرییەکا دی یا ساخ هەر زوی مێرییێن دی هاتنێ و ئەو ب ساخی ڤەشارت.

و مێری ژ گیانەوەر و مێشەوەرێن کێمن کو خودێ غەریزا هەلگرتنا خوارنێ کرییە د واندا، ئەو دندکان دهەلگرن و د خانییێن خۆ یێن ب شە و گەرمڤە دپارێزن، ل ژێر عەردی بێی کو تووشی پویچبوونێ ببیت، و مێری رێکێن هونەری ب کار دئینیت د هەلگرتنێدا ل دویڤ جۆرێن وێ، و ئەو دندکا گەنمی دکەتە دو کەر، و کەلیکداران تیڤل

دکەت دا شین نەبنەڤە، یان دێ چەند حەفتییەکان هێلیتە د سەڤا و گەرمییەکا دەستنیشانکریدا، و رێ دەتێ پاشی شین ببیت، دێ گەشێ کەت، و دێ رەهەك و قورمەکێ بچویك ژێ دیار بن، دێ رابیت بڕیت و هشك کەت، دا ببیتە کەرستەکێ ئامادەکری بۆ خوارنێ ب درێژاهییا ماوێ زڤستانێ، دیسا رادبیت ب پیتێنەرکرنا (کێمیاکرنا) بەلگێن دارێن بڕی ب پیساتییا جۆرەکێ دەستنیشانکری ژ بەلاتینکان، و دێ جۆرەکێ کەرویان ل سەر شین بیت دبێژنێ نانێ ڤەلێ، مێری ڤێ دخۆت، دیسا هندەك جۆرێن مێرییان هێکێن سیسکان دئینە د هێلینێن خۆڤە، و دەمێ دپەڤن دهاڤێژنە دەرڤە، و ددانە سەر وان رووەکێن شیلییا هنگڤینی هەی، پاشی ب شەڤێ دئیننە د هێلینا خۆڤە، و ڤی کەرستەی ژێ ددۆشیت، و هەر مێشەوەرەك نێزیکی چل و هەشت چێکان ژ ڤێ شیلییێ ددەت د ماوێ بیست و چار دەمژمێراندا، بۆ زانین بۆ ڤان مێشەوەران ئۆدێن تایبەت ئاڤا دکەن دا تێدا جهگر ببن، خودێ دبێژیت: (حَتَّى إِذَا أَتَوْا عَلَى وَادِ النَّمْلِ قَالَتْ نَمْلَةٌ يَا أَيُّهَا النَّمْلُ ادْخُلُوا مَسَاكِنَكُمْ لَا يَحْطِمَنَّكُمْ سُلَيْمَانُ وَجُنُودُهُ وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ) [النمل:١٨]، ئانکو: هەتا لەشکەرێ وی (سولەیمان پێغەمبەر) گەهشتییە نهالا مێرییان (نهالەکە ل شامێ، گەلەك یا ب مێرییە)، مێرییەکێ گۆت: گەلی مێرییان هەرنە د جهێت خۆڤە، سولەیمان و لەشکەرێ خۆ هەوە نەهەڕشینن، بێی کو هەست پێ بکەن و پێ بحەسن.

خودێ د ڤێ ئایەتێدا دسەلمینیت کو مێرییان زمان و ئاخفتن یا هەی، و ئەڤە رامانن د ڤێ ئایەتێدا شاها مێرییان ڤەدگوهێزیت بۆ ئەوێن ل بن دەستێ وێ، ئەرێ زانایان زمانێ مێریان ئاشکەرا کرییە؟ بەلێ، زانا دبێژن: ((د مێریاندا رژێنێن کیمیایی د زك و سەرێ واندا یێن هەین، ڤی کەرستێ کیمیایی دهنێرن؛ کو ئەو زمانێ وان یێ ئاخفتنێیە مێری ب وی د گەل ئێك د ئاخڤن)).

د زمانێ مێرییاندا زمانەکێ دەنگی یێ هەی، و زمانەکێ ئاماژەیی ـ لڤینن ـ زمانەکێ گوهلێبوونێ، و زمانەکێ دیتنێ، و بزاڤان، و دەنگان، و بێهنێ، زمانێ د ناڤبەرا مێرییاندا زمانەکێ کیمیاییە، مێری ب ئەندامێن هەستەوەرێ بێهنێ کو د دابەشکرینە

ل سەر هەردو شاخێن وێ یێن هەستپێکرنێ ئەڤە ئامێرێن کیمیاییێنە، و دەمێ مێرییان ڤیا کو ب کۆمی بچنە جهێ خوارنێ، دێ مێرییەك دەرکەڤیت و دێ ل خوارنێ گەریت، و دێ کەرستەکێ کیمیایی بەردەتە سەر رێکا چۆنا خۆ، و ئەڤە زمانەکە ژ زمانێن مێرییان. و دیسا خودێ جۆرەکێ تێگەهشتنێ د ماوێ ڤێ ئایەتێدا سەلماندییە، هەروەسا گیانێ کۆمەلێ بۆ وی سەلماندییە، و مێرییێ هزر د رزگارکرنا خۆدا نەکر ب شێوەکێ نەڤیانێ، بەلکو هەڤالێن خۆ هشیارکرن ژ سولەیمان و لەشکەرێ وی، ئەڤ چەندە گیانێ کۆمەلێ و هاریکارییێ و بەری براندن ب سەردا بهێت دسەلمینیت.

مێرییێ مێشکەکێ بچویك یێ هەی، و خانێن دەمارگیری، و هندەك دەمار یێن هەین بۆ تەخمینکرنا پێزانینان، و نەخشان دا یێ بگەهنە جهێن خوارنێ، و بزڤرنە کونێن خۆ.

و مێرییێ سەر یێ هەی، و ناڤەند، و دیلەکێ لۆلەیی یێ هەی، و شەش پێ یێن هەین دشێت ب لەز پێ بچیت، و هندەك ژ وان پەرێن هەین بۆ خۆ هلاڤێتنێ، و پێنج چاڤێن هەین، دو چاڤێن وێ هەر ئێك یێ ل لایەکێ سەرێ وێ، پێك دهێن ژ چاڤێن سادە کو ب سەدان دهێن هژمارتن، و پێکڤە داناییێنە و پێکهاتی و رێك و پێك، ب ڤان دبینیت و هەروەکی چاڤەك هەی، و سێ چاڤێن دی ل سەر شێوێ سێ گۆشێ داناییێنە، ل سەر هەردو چاڤێن دیدا، و ئەو چاڤێن سادەنە چو پێکهاتە نینە، ژ بلی ڤێ ژی چاڤێن مێرییا نێر مەزنترن ژ چاڤێن مێریا مێ، و د نێزیکی ئێکن، ژ بەر وێ هێزا کاری یا ب وێڤە گرێدایی.

و هەر مێرییەکێ دو شاخێن درێژ یێن هەین وەکی دو موییانە، ب وان هەست ب تشتان دکەت، و جهێ دەست و پێیان دگرن د هەلگرتنا تشتی، و دبێژنە هەردویان هەستپێکرنێن دو.

و مێرییێ جۆرەکێ سەرەدەرییا ئاقلییانە[1] یێ هەی، کو ژ زیرەکترینێ مێشومرانە، و ئەو ب پێلێن رۆناهییێ دبینیت کو مرۆڤ نابینن، و زمانێ مێرییان یێ کیمیاییە، کو دو کار پێن هەین: گەهشتن و ئاگەهدارکرن، ئەگەر مێرییەك هاتە هەرشاندن دێ بێهنەك ژێ دەرکەڤیت، دێ مێرییێن دی د هەوارێ چن، یان دێ وێ ئاگەهدارکەن کو نێزیکی مەترسییێ نەبیت، و مێری نەشێت بچیتە د کونا خۆڤە ئەگەر ئەو پەیڤا نهێنی دیار نەکەت.

مێرییێ کۆئەندامەکێ هەرسکرنێ یێ حێبەتی یێ هەی، دەڤ و سورێنچك (ئەو رویڤیکا د ناڤبەرا حەفکێ و مەعیدەیدا)، و مەعیدە و رویڤیك و کۆئەندامێ مێژتن و هاڤێتنێ پێن تێدا.

و مێرییێن مێ هێکێن خۆ ددانن جهێن نێزیك ژ خانییێن مەزنان، و بۆ وان پەروەردەکەران دگرن کو ب شەڤ و رۆژ چاڤدێرییا وان دکەن، د گەل دابینکرنا گەرمییا گونجایی بۆ وان هەتا هێك ڤەدبن، و کرمەکێ بچویك ژێ دەردکەڤیت نە پەر و نە پێ هەنە، پەروەردەکەر چاڤدێریا وان دکەن و خوارنێ ددەنێ، و وەکی خەلایێ دخۆن چەند حەفتییکان، پاشی ب دەڤێ خۆ دێ تەڤنەکی بەردەت و دێ رێسیت بۆ خۆ تەپکەکا ئارمویشی ژێ چێکەت و دێ نڤیت، و دەمێ هندەك رۆژ دچن دێ ژ خەوا خۆ هشیار بیت، و دێ داڤێن ڤێ تەپکێ بڕیت، و دێ ئارمویشێ وێ ژی بڕیت، پەروەردەکەر

---

١ـ و ژ دەرئێخستنێن جوان د گۆتنا خودێدا: (قَالَتْ نَمْلَةٌ يَا أَيُّهَا النَّمْلُ ادْخُلُوا مَسَاكِنَكُمْ لَا يَحْطِمَنَّكُمْ سُلَيْمَانُ وَجُنُودُهُ وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ) ئەوە کو ڤێ مێرییێ ب گازییەکا جوان وەك هۆشدارییەکێ (يَا أَيُّهَا النَّمْلُ)، ب فەرمانەکا هاندانێ یا ب هشیاریڤە: (ادْخُلُوا مَسَاكِنَكُمْ)، ئەو ژی ژ بەر ئەگەرێ (لَا يَحْطِمَنَّكُمْ سُلَيْمَانُ وَجُنُودُهُ)، ب لێبۆرینڤە ژ کارێ سولەیمان و لەشکەرێن وی ب گۆتنا (وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ)، ئەو ج مێرییە یا هۆسا کو جیهانا وان حیکمەتەك و رێزگرتن وەرگرتییە، و پاکی و مەزناهیی بۆ خودایێ زانا و خودان شیان ئەو ب ئاخڤتن ئێخستی.

ب ڤێ چەندێ هاریكارییا وێ دكەن، و ب پاڤژییا وێ رادبن، و پەر و پێیێن وێ چێ دبن و دیار دبن، و مێری گەلەك حەژ پاڤژییێ دكەت.

و مێری بێی نیشانەك مێرییێن دی دنیاسیت، و پێكڤە گرێدان و دلۆڤانی ب تنێ د ناڤبەرا مێرییێن ئێك گونددا یا هەی، ژ بلی وان دژمنن كو د ناڤبەرا واندا دژمنكاری یا هەی، و چێدبیت شەر د ناڤبەرا چەند گوندەكێن مێرییاندا دورست ببیت، و دێ خۆ رێك ئێخن د رێزێن جەنگێدا، و شەر روی ددەن، و كوشتی و بریندار ژێ دكەڤن، و مێرییێن سەركەڤتی ئێخسیران دئینن و دكەنە خزمەتچی د گوندێن خۆدا، و كوشتییێن خۆ دڤەشێرن د مەزارگەهەكا تایبەتدا، دیسا عەردێ خۆ پاقژ دكەن ژ كەلەخێن دژمنێ خۆ، هەتا دبێژن: مێری نێزیكترین مێشەوەرە بۆ مرۆڤی د كارێن خۆدا، و چێدبیت مێری ببنە هێزەكا نەرەحەتكەر و پویچكەر، و مەترسییەكا مەزن بۆ مرۆڤی ب خۆ، و دشێت ستوینێن خانییێن داری بهەرفینیت، هەتا هەمی ب سەرێكدا دهێت، یان داگیرگەهان چێدكەن د جهێن پەرتۆكاندا، رادبن ب پویچكرنا پەران ب خوارن و دراندنێ.

ڤی بابەتی دێ ب ئاخڤتنا ئیمام عەلی ﷺ ب دویماهیك ئینین: ((بەرێ خۆ بدە بچویكییا كەلەخێ مێرییێ، و نازكییا سەروبەرێ وێ، تێرا دیتنا مرۆڤی ناكەت، و هزر ژێ ناگەهیت بزانیت، چاوا د سەر عەردیڕا دچیت، و ل رزقێ خۆ دگەریت، دندكێ ڤەدگوهێزیتە كونا خۆ، و ددانیتە جهێ وێ یێ دورست، كۆم دكەت ژ گەرمێ بۆ سەرمایێ، و د دویچكێ وێ بۆ سینگێ وێ، یا راسپاردییە ب رزقێ خۆ، یا رزقدایە ب هەلگرتنا وێ و كۆمكرنا وی (بوَسقِهَا)[1]، خودێ نەیێ بێ ئاگەهە ژ وێ، و ژ وێ

١. [الوَسَق: تشتەكی بدەنە د گەل تشتەكێ دی، و ژ فەرموودا: استوسقوا كما یستوسق جَربُ الغنم، ئانكو ژ هەمی رەخانڤە كۆم ببن]، النهایة في غریب الحدیث، (١٨٤/٥)، و رامانا گۆتنا وی: مرزوقة بوسقها، ئانكو ب كۆمكرنا وێ، و [الوسَق ژێدەرە، وَسَقَ الشيءَ: ئانكو كۆم كر و هەلگرت، (وبابُه وَعَدَ) و ژ ڤێ گۆتنا خودێ

نابرينيت، و ج د كەڤرەكێ هشكدا بيت، و د بەرەكێ نەلڤدا بيت، و ئەگەر ئەم هزرا خۆ د بۆرييێن خوارنا وێدا بكەين ل سەرى و بنى، و كا ج د ناڤخۆيا وێدا هەيە ژ تەنشتێن زكێ وێ (شَراسِيف)[1]، و ل سەريدا ژ چاڤێن وێ و گوهێن وێ، دێ ب ئافراندنا وێ حێبەتى بين، و دێ ب سالۆخەتكرنا وێ زەحمەت كەڤيت، مەزناهى بۆ وى خودێيە يێ ئەو ل سەر پێيێن وێ راگرتى، و ب ڤى شێوەى چێكرى، چو كەسێ د چێكرنا وێدا پشكدارى نەكرييە، و چو خودان شيانان هاريكارى د ئافراندنا وێدا نەكرييە))[2].

---

(وَاللَّيلِ وَمَا وَسَقَ)، دەمێ شەڤێ سەر ب چيايان و داران و دەريا و عەرديدا گرت و ژێ كۆم بوو ئانكو ئەڤە رامانا (وَسَقَهَا) مختار الصحاح مادة (وسق).

١. الشُّرسُوف كتا الشراسيف، ئەو رەخێن پەراسيانە يێن بلندتر ژ زكى، و دبێژن: ئەو كركركە يا ب هەمى زكيڤە گرێدايى]، النهاية في غريب الحديث (٢/٤٥٩).

٢. المستطرف في كل فن مستطرف (٢/٣٦٧-٣٦٨).

# پێشی

ژ نیشانێن خودێ یێن بەلگە ل سەر مەزناهییا وی، خودێ دبێژیت: ﴿إِنَّ اللَّهَ لَا يَسْتَحْيِي أَنْ يَضْرِبَ مَثَلًا مَا بَعُوضَةً فَمَا فَوْقَهَا فَأَمَّا الَّذِينَ آمَنُوا فَيَعْلَمُونَ أَنَّهُ الْحَقُّ مِنْ رَبِّهِمْ وَأَمَّا الَّذِينَ كَفَرُوا فَيَقُولُونَ مَاذَا أَرَادَ اللَّهُ بِهَذَا مَثَلًا يُضِلُّ بِهِ كَثِيرًا وَيَهْدِي بِهِ كَثِيرًا وَمَا يُضِلُّ بِهِ إِلَّا الْفَاسِقِينَ﴾ [البقرة:٢٦]، ئانكو: ب راستی خودێ هەر مەتەلەكا بینیت شەرمێ ژێ ناكەت، ڤێجا (ئەو مەتەل) پێشی بیت یان تشتەكێ مەزنتر و پێهەلتر بیت، و ئەو كەسێت باوەری ئینایین دزانن (ئینانا ڤان مەتەل و نموونەیان) راستییە ژ خودایێ وان، و هندی ئەون یێت گاوربوویین دبێژن: خودێ چ ژ ڤان نموونەیان ڤیایە؟ (خودێ) گەلەكان پێ سەردا دبەت و گومڕا دكەت، و گەلەكان پێ راستەرێ دكەت، و كەسێ پێ گومڕا ناكەت ئەگەر ئەو ب خۆ ئەو نەبن یێت ژ رێ دەركەڤتی.

دەمێ پێشی ل سەر دەستێ تە دراوەستیت دكوژی، و هەست ب چو ناكەی، هەروەكی چو نەچێبووی، ژ بەر لاوازییا وێ ل دەڤ تە، هەتا پێغەمبەر ﷺ دبێژیت: ژ زار سەهلێ كورێ سەعەدی گۆت: پێغەمبەری ﷺ گۆت: ((لَوْ كانتِ الدُّنيا تعدِلُ عِندَ اللهِ جَناحَ بَعوضَةٍ ما سَقى كافِراً شَرْبَةَ ماءٍ))[1]، ئانكو: ئەگەر دنیایێ ل دەڤ خودێ هندی پەرێ پێشییێ بها هەبا نەدهێلا چو گاور ئاڤێ ژێ ڤەخۆن.

د سەرێ پێشییێدا سەد چاڤێن هەین، و ئەگەر سەرێ پێشییێ ب تلسكۆپی بهێتە مەزنكرن دێ وان سەد چاڤان بینین كو ل سەر شێوێ شانا مێشا هنگڤینینە، و چل و

---

١. (الترمذي) (٢٣٢٠)، ئیبن ماجە (٤١١٠).

هەشت ددان یێن د دەڤیدا، و سێ دلێن هەین، دلەکێ ناڤەندی، و هەر پەڕەکێ وێ دلەکێ تێدا، و د هەر دلەکیدا هەردو گهۆکە و زکۆکە و هەردو ئەزمانك.

د پێشییێدا ئامویرێ راداری یێ هەی، و د فرۆکەیێن نویدا نینە، یان پێشوازکەرێن گەرمییێ، ب رامانا هندێ کو پێشی تشتان نابینیت ب شێوە و رەنگێن وان، بەلکو ب گەرماتییا وان، ئەگەر پێشییەك د ژۆرەکا تاریڤە بیت ئەو مرۆڤێ نڤستی دبینیت، چونکی گەرمییا وی پترە ژ گەرمییا وان کەل و پەلێن ژۆرێ، و هەستدارییا ڤی ئامویرەی ئێك ژ هزار ژ پلا گەرمییا سەدییە.

د پێشییێدا ئامویرەکێ شیکارییا خوینێ یێ هەی، هەمی خوین د گونجایی نینن بۆ وێ، چێدبیت دو زارۆك ل سەر تەختەکی د نڤستی بن، و دەمێ دبیتە سپێدە دێ بینی ئەنیا ئێکی ژ وان یا پڕە ژ پێڤەدانێن پێشیان، و یێ دویێ چو شوینێن پێڤەدانێن پێشیان لێ نینن.

و پێشییێ ئامویرەکێ بێهۆشکرنێ یێ هەی، و ئەگەر لمبیسا خۆ د پیستێ مرۆڤێ نڤستیدا ببەتە خوارێ دێ وێ کوژیت، بەلێ ئەو جهێ پێڤە ددەت بێهۆش دکەت، و دەمێ شوینا بێهۆشکەری دچیت مرۆڤێ نڤستی هەست ب ئێشانا پێڤەدانێ دکەت، هینگێ پێشی یا د ژۆرێدا دفریت.

و پێشییێ ئامویرەکێ هەی بۆ حەلاندنا خوینا ژ مرۆڤی دکێشیت، دا یا ب ساناهی بیت کو د لمبیسا وێ یا هویرڕا بچیت.

و د لمبیسا پێشییێدا شەش کێر یێن هەین، چار ژ وان برینەکا چارگۆشە ل سەر پیستێ وی دورست دکەن یێ پێڤە ددەت، و برین دگەهیتە لۆلەکا خوینێ، و هەردو کێرێن دی یێن پێنجێ و شەشێ پێکڤە دچن دا بۆرییەکێ دورست بکەن ژ بۆ مێژتنا خوینا وی یێ پێڤە ددەت.

و پەرێن پێشییێ ژمارەکا مەزنا جاران د چرکەکێدا ڤەدلەرزن، هەتا ئەڤ لەرزینە دگەهیتە پلا بڤڤێنێ (بڤڤێنی ژێ دهێت).

و پیێن وێ (محاجم)[1] و کێلبە یێن پێڤە، دەمێ ل سەر روییەکێ زڤر دراوەستیت، کێلبان ب کار دئینیت، و دەمێ ل سەر روییەکێ حولی دراوەستیت (محاجم)ان ب کار دئینیت، خودێ دبێژیت: (إِنَّ اللَّهَ لَا يَسْتَحْيِي أَنْ يَضْرِبَ مَثَلًا مَا بَعُوضَةً فَمَا فَوْقَهَا فَأَمَّا الَّذِينَ آمَنُوا فَيَعْلَمُونَ أَنَّهُ الْحَقُّ مِنْ رَبِّهِمْ وَأَمَّا الَّذِينَ كَفَرُوا فَيَقُولُونَ مَاذَا أَرَادَ اللَّهُ بِهَذَا مَثَلًا يُضِلُّ بِهِ كَثِيرًا وَيَهْدِي بِهِ كَثِيرًا وَمَا يُضِلُّ بِهِ إِلَّا الْفَاسِقِينَ)[2] [البقرة:٢٦].

(ابن القيم) رەحمەتا خودێ لێ بیت دبێژت: ((گۆتنا خودێ: (إِنَّ اللَّهَ لَا يَسْتَحْيِي أَنْ يَضْرِبَ مَثَلًا مَا بَعُوضَةً فَمَا فَوْقَهَا)، ئەڤ ئایەتە، بەرسڤەکا نەرازیبوونێ بوو وەك بەرسڤەك بۆ نەرازیبوونا گاوران ل سەر قورئانێ، و دگۆتن: خودێ ژ هندێ مەزنترە کو بەحسێ مێشێ یان پیرتەڤنکێ و یێن وەکی وان ژ گیانەوەرێن بێ بها و چونە بکەت، و ئەگەر ئەوا بۆ موحەممەد دهێت ئاخڤتنا خودێ بیت بەحسێ ڤان گیانەوەرێن بێ بها و چونە نەدکر، پاشی خودێ بەرسڤان وان دا و گۆت: (إِنَّ اللَّهَ لَا يَسْتَحْيِي أَنْ يَضْرِبَ مَثَلًا مَا بَعُوضَةً فَمَا فَوْقَهَا)، و ئینانا نموونان ب پێشییێ و یێن د سەردا ئەگەر دابینکرنا

---

١- ئەوە یا وەکی دەرزیکا شرینقێ خوینێ پێ دهەلکێشیت، وەرگێر.

٢- ژ زار قەتادەی ئانکو: خودێ شەرم ژ گۆتنا تشتەکێ هەقییێ ناکەت چ پێ کێم بیت یان گەلەك و دەمێ خودێ د قورئانێدا بەحسێ مێشێ و پیرتەڤنکێ کری سەرداچۆیان (مشرکان) گۆت بەحسکرنا ڤان چ پێ دڤێت (ئانکو ب بەر چو ناکەڤن)، ئینا خودێ ئەڤە ئینا خوارێ: (إِنَّ اللَّهَ لَا يَسْتَحْيِي أَنْ يَضْرِبَ مَثَلًا مَا بَعُوضَةً فَمَا فَوْقَهَا)، تەفسیرا (ابن کثیر ٦٥/١).

[و موجاهد د ڤێ گۆتنا خودێدا (إِنَّ اللَّهَ لَا يَسْتَحْيِي أَنْ يَضْرِبَ مَثَلًا مَا بَعُوضَةً فَمَا فَوْقَهَا) دبێژیت: نموونە چ یێن بچویك بن یان د مەزن باوەردار باوەرییێ پێ دئینن، و دزانن کو ئەو راستییە ژ دەڤ خودایێ وان، و ب وان نموونان خودێ وان راستەرێ دکەت، و قەتادە دبێژیت: (فَأَمَّا الَّذِينَ آمَنُوا فَيَعْلَمُونَ أَنَّهُ الْحَقُّ مِنْ رَبِّهِمْ) ئانکو: دزانن ئەو ئاخڤتنا خودایێ دلۆڤانە، و ئەو ژ پال خودێیە]، تەفسیرا (ابن کثیر ٦٦/١).

راستیيێ مسۆگەر بكەت، و رۆهنكرن و دیاركرنا وێ بیت، و نەهەقییێ نەهێلیت و پویچ بكەت ئەڤە ژ باشترینێ تشتانە، و باشی شەرمێ ژ وێ ناكەت))[1].

ب راستی پێشی مەیسیمێ وێ كێمتر نینە ژ نەهنگێ شین كو كێشا وی پتر ە ژ سەد و پێنجی تەنان، و تێژكێ وی د ئێك شیردانادا سێ سەد كیلۆیان ڤەدخۆت، كو سێ شیردانێن وی د رۆژێدا د بنە ئێك تەن، و دەمێ نەهنگ خوارنەكا ناڤنجی دخۆت كو مەعیدێ خۆ تژیكەت پێدڤی ب چار تەنێن ماسییانە، و ئەڤە دانەكێ خوارنێیە نەیێ ب قەلەوییە، و چێكرنا پێشییێ كێمتر نینە ژ چێكرنا نەهنگی، و بەلگە ل سەر ڤێ چەندێ: ﴿مَا تَرَى فِي خَلْقِ الرَّحْمَنِ مِنْ تَفَاوُتٍ﴾ [الملك:٣]، ئانكو: دانان و رِانان و چێكرنا خودێ یا وەسایە تو چو ڤێكنەكەڤتنێ تێدا نابینی. و خودێ دبێژیت: ﴿قَالَ رَبُّنَا الَّذِي أَعْطَى كُلَّ شَيْءٍ خَلْقَهُ ثُمَّ هَدَى﴾ [طه: ٥٠].

پێشی چێكرییەكێ تەكووزە؛ هەر ژ بچویكترین زیندەوەر ژ ڤایرۆسێن كو نەهێنە دیتن ئەگەر ب تلسكۆپێ ئەلكترۆنی نەبیت، و هندەك چێكری یێن هەین ژ ڤێ ژی هویرترن، و هەتا دویماهیك دهێت ب مەجەران كو ملیاران سالێن رۆناهییێ ژ مە دویرن، خودێیە خودانێ گشت جیهانان، ژ گەردیلێ بۆ مەجەرێ، ئێك سیستەمە، و ئێك بسپۆرییە، ئەڤە چێكرنا خودێیە ئەوێ هەمی تشت موكوم و بنەجە چێكرین.

---

١. بدائع الفوائد (٤/٩٤٦-٩٤٧).

# مێش

خودێ دبێژیت: (يَا أَيُّهَا النَّاسُ ضُرِبَ مَثَلٌ فَاسْتَمِعُوا لَهُ إِنَّ الَّذِينَ تَدْعُونَ مِنْ دُونِ اللَّهِ لَنْ يَخْلُقُوا ذُبَابًا وَلَوِ اجْتَمَعُوا لَهُ وَإِنْ يَسْلُبْهُمُ الذُّبَابُ شَيْئًا لَا يَسْتَنْقِذُوهُ مِنْهُ ضَعُفَ الطَّالِبُ وَالْمَطْلُوبُ) [الحج:٧٣]، ئانكو: گەلی مرۆڤان نموونەیەك هاتە دیارکرن، ڤێجا گوهێ خۆ بدەنێ، ب راستی ئەوێت هوین شوینا خودێ دپەرێسن، نەشێن مێشەکێ چێ بکەن (بدەن)، خۆ ئەگەر هەمی پێکڤە (بۆ چێکرنا مێشێ) کۆم ببن ژی، و ئەگەر مێش تشتەکی ژ وان راکەت، ئەو نەشێن ژێ بستینن، داخوازکەر (کو بوتە، ئەوێ دخوازیت تشتێ مێشێ ل سەر راکری بێتە زڤراندن) و داخوازکری (کو مێشە، داخوازکرییە ژ بەرێ بوتیڤە کو تشتێ وێ بری بزڤرینیتەڤە)، هەردو ژی (ئانکو مێش و بوت) لاوازن و بێ هێزن.

دبێژن: نەرحەتی (ازعاج) ژ مێشێ، و زیانا وێ، و ئەو نەگەرێن ژ وێ چێدبن بۆ نەخۆشییان، بەرێ مرۆڤان یێ ژ هندێ وەرگێڕای کو هزرا خۆ د ڤێ مێشێدا بکەن، کو دهێتە هژمارتن حێبەتییەك د چێکرنا خودایيدا.

خودێ مێش کرە نموونە بۆ مرۆڤان، ئەڤ چێکرییێ لاوازێ پیس، کو ب لەز زێدە دبیت، و لاواز دیار دکەت، ئەگەر تە جهەکێ گەلەك مێش لێ رەشاند، و تە هەمی ئەو مێش نەهێلان ب تنێ ئێك بمینیت، ئەڤ مێشە دێ نفشەکێ دی یێ مێشان کەت، کو بەرگرییا ڤی کەرستێ تە پێوەرکری کەت د ڤی جهیدا، و چێکرنا کەرستێن هەڤدژێن چالاك ل دەڤ مێشێ تشتەکێ نەشیانداره (معجز)، هەر تشتێ ل سەر مێشێدا بگریت و نەهێلیت دێ مێش د کۆئەندامێن خۆ یێن هویربینیدا هەڤدژییەکێ چالاك چێکەت دێ

بەرگرییەك بۆ دورست بیت دژی ڤی کەرستێ کاریگەر، هەتا دەمێ مێش ب ئەگەرێ سەرمایێ دمریت، دێ نفشەك بیت کو بەرگرییا سەرمایێ بکەت.

چاڤێ مێشێ سەدەهان جاران مەزنتر لێ کر، و تشتێ حێبەتی ژ ڤێ مەزنکرنێ دیار بی، هزاران چاڤکێن (عدسات) ل دویڤ ئێك کو ییێن ب رەخ ئێکڤە، ئەڤە بۆ مێشێ دیتنەکا تمام دورست دکەت، ئەڤ چێکرییا لاواز، ئەوا کو مرۆڤ سڤکاتییێ پێ دکەت، دشێت هندەك هاتن و چۆن و راهێنانان بکەت، کو مەزنترین فرۆکێن شەرکەر نەشێن بکەن، و نویترینێ فرۆکان نەشێن کارێ وێ بکەن، و ب لەزاتییێن گەلەك دچیت ل دویڤ قەبارێ وێ، و دشێت ژ نیشکەکێڤە ب گۆشا (٩٠) پلە خۆ ڤەگوهێزیت، و دشێت خۆ ب بانیڤە بگریت، و ڤی تشتی فرۆکێن د عەردیدا نەشێن ڤی کاری بکەن، خودێ دبێژیت: (ضَعُفَ الطَّالِبُ وَالْمَطْلُوبُ).

ئەو تشتێ سەرنجا مرۆڤی رادکێشیت، د فەرموودەکا پێغەمبەریدا ﷺ یا هاتی، ژ زار ئەبی هورەیرە رضي الله عنه گۆت: پێغەمبەری ﷺ گۆت: ((إذا وَقعَ الذُّبابُ فِي شَرابِ أحَدِكُم فَلْيَغْمِسْهُ ثُمَّ لِيَنْتَزِعْهُ فإنَّ فِي إحدى جَناحَيْهِ دَواءً وَالأخرى شِفاءً))[1]، ئانکو: ئەگەر مێشەك کەفتە د ڤەخوارنا ئێکی ژ هەوەدا نقۆ بکەن، پاشی باڤێن، چونکی پەڕەکێ وێ دەردە و یێ دی دەرمانە.

و د ریوایەتەکا دیدا[2] یا هاتی: ((فأمْلِقُوهُ))، ئانکو: نقۆ بکە.

زانستێ نوی دورستییا ڤێ فەرموودێ یا دوپاتکری، ئاشکراکر کو د هندەك جهێن هەردو پەڕێن مێشێدا کەرستەکێ دژی ژەهرێ یێ هەی ئانکو دەرمانەکە دژی ژەهرێ، کو دژی میکرۆبانە، و جۆرێن میکرۆبان، ئەو ژی دەمێ هندەك میکرۆب ب پیێن مێشێڤە دنویسن، یان بەکتریایێن ب زیان، و ئەڤ مێشە دکەڤیتە د ناڤ شلەیدا، پێدڤییە پەرێ

---

١ـ بوخاری (٣١٤٢)، و ئەبو داوود (٣٨٤٤)، و ئبن ماجە (٣٥٠٥)، و ئەحمەد (٧١٤١).

٢ـ ئەبو داوود (٣٨٤٤)، ژ زار ئەبی هورەیرە / و ئیبن حیبان (١٢٤٧) ژ زار ئەبی سەعید.

وێ یێ دویێ ژی نقۆ بکەین، ژ بەر کو د هندەك پەرێن وێدا دەرمانە، کو دژی ڤان میکرۆبان، خودێ دبێژیت: (يَا أَيُّهَا النَّاسُ ضُرِبَ مَثَلٌ فَاسْتَمِعُوا لَهُ إِنَّ الَّذِينَ تَدْعُونَ مِنْ دُونِ اللَّهِ لَنْ يَخْلُقُوا ذُبَابًا وَلَوِ اجْتَمَعُوا لَهُ وَإِنْ يَسْلُبْهُمُ الذُّبَابُ شَيْئًا لَا يَسْتَنْقِذُوهُ مِنْهُ ضَعُفَ الطَّالِبُ وَالْمَطْلُوبُ).

ژ کارێن ڤێ مێشێ ئەوە هەوای ب رێکا نەهێلانا وان رووەك و ئەندامیێن پیسبوویی پاقژ دکەت، و ئێك مێش پتری پێنجی ملیۆن میکرۆبان دهەلگریت، و هەبوونا مێشان ل جهەکی ئاماژەیە بۆ هندێ کو ئەڤ جهە نەیێ پاقژە، هەر وەکی پاشڤەلێدەرەکێ بهێزە دا تشتێن مە یێن پویچ بوویی و کەڤن پاقژ بکەت هەر وەکی پێغەمبەری ﷺ بەرێ مە دایە ڤێ چەندێ.

ئەو گەلەك ب لەز خۆ ڤەدگوهێزیت، چێدبیت ل سەر مێزا تە یا خوارنێ بیت و رۆژا دویێ ل جهەکێ دی بیت کو دویراتییا وی پتر ژ دەهـ هزار کیلۆ مەترا بیت، و هەر دەهـ رۆژان نفشەکێ تمام دبیت، بوونا وێ یا حێبەتییە.

و تشتێ نەهێتە باوەرکرن ئەوە کو دەمارگێرییا وێ هەمی وەکی هەمی دەمارگێرییا مرۆڤییە، و چاڤێ مێشێ گەلەکێ بهێزە، و گەلەکێ بهێزە بۆ دیتنێ ژی، و زانینەکا ئاست بلند یا هەی، و چێدبیت سەرەدەرییێ ب تۆرەبوونەکا توند بکەت دەمێ دکەڤیتە د مەترسییەکێدا، ئەو تۆرە دبیت، و فێر دبیت، و هەست ب ئێشانێ دکەت، و کێشا مێشکێ وێ ئێك ژ ملیۆن پشکان ژ گرامێیە، و ئەو ب بلندترین شیان کار دکەت، و کۆمەکا رژینان یێن د مێشێدا هەین، و بیردانکەك یا هەی دو خۆلەکان ڤەدکێشیت.

و مێش د جۆرە و جۆرن کو پترن ژ سەدان هزاران، ژ وانا مێشێن دوڕندە، و جۆرەکێ دی وەکی مێشا هنگڤینییە ئاڤا گولان دمێژیت، و جۆرەکێ دی ڤێقی ترش دکەت، و جۆرەکێ دی هەڤرکییا فرۆکان دکەت د هاتن و چۆنێن واندا (راهێنان)، و د لەزاتییا وان، و دشێت ل بەر وێ بەرزە بکەت ئەوا دراهێلیتە وێ، و یارییان پێ بکەت.

ڤێ مێشێ، ئەگەر هەمی ئافراندی کۆم ببن د پێشکەفتیترین سەردەمێ زانستیدا بن، نەشێن مێشەکێ چێکەن، خودێ دبێژیت: (وَإِنْ يَسْلُبْهُمُ الذُّبَابُ شَيْئًا لَا يَسْتَنْقِذُوهُ مِنْهُ ضَعُفَ الطَّالِبُ وَالْمَطْلُوبُ).

د ڤێ فەرموودێدا، چاوا پێغەمبەری ئەڤ راستییە دزانی؟ ژ کیڤە دزانی؟ ئەرێ چ شیکاری ل دەڤ وی هەبوو؟ ئەرێ چ کارگەهێن شیکاران د گەل هەبوون؟ ئەرێ میکرۆسکۆب ل دەڤ هەبوون؟ چاوا پێغەمبەر ﷺ دبێژیت: ((إذا وقعَ الذُّبابُ في شَرابِ أحَدِكُم فلْيَغْمِسْهُ ثمَّ لِيَنْزِعْهُ فإنَّ في إحدى جَناحَيْهِ دَواءً والأُخْرى شِفاءً))، و چاوا زانستێ نوی ئەڤ چەندە پشتراست کرییە؟

ئاخفتنا دورست ئەوە پێغەمبەری ﷺ د گۆتنێن خۆدا، ژ دەڤ خۆ نەدئاخڤت، ئەوا پێ دئاخڤت وەحی بوو ژ لایێ خودێڤە بۆ دهات، و ئەوا د سوننەتا دورست و پاقژدا هاتی راستییەکا ڤەبڕە، و ژ وێ ژی بەلگەکا ڤەبڕییە، و یێ ئینکارا وێ بکەت وی کوفر کر.

هویربینییێ د نیشانێن خودێ کرینە د گەردوونیدا بکەن: (قُلِ انْظُرُوا مَاذَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَا تُغْنِي الْآيَاتُ وَالنُّذُرُ عَنْ قَوْمٍ لَا يُؤْمِنُونَ) [یونس:١٠١].

(إبن القيم) د (الطب النبوي)دا ل سەر ڤێ فەرموودێ دئاخڤیت، دبێژیت: إِذَا وَقَعَ الذُّبابُ في شَرابِ أَحَدِكُم...: ((ڤێ فەرموودێ دو فەرمان یێن تێدا، فەرمانەکا فقهییە، و فەرمانەکا نوژدارییە... و رامان ژ نوژدارییێ ـ ئانکو د فەرموودێدا ـ ئەبو عوبەید دبێژیت: رامانا (أمقلوه): نقۆکرنە، دا چارەسەی (شیفا) ژێ دەرکەڤیت وەکی دەرد ژێ دەرکەڤتی... بزانە هێزەکا ژەهری یا د مێشێدا هەی ئەوا ڤێ چەندێ دسەلمینیت وەرمتن و خوریانا ژ پێڤەدانێ دیار دبیت، و ئەڤ پێڤەدانە چەکێ وێیە، و دەمێ دکەڤیتە د ئامانێ ڤەخوارن تێدا ئەو تشتێ زیانێ و نەخۆشییێ دگەهینیتێ ب ڤێ کەڤتنێ دێ چەکێ خۆ بەردەت، پێغەمبەری ﷺ فەرمان کر کو هەمبەری ڤێ ژەهرێ د پەڕێ وێ یێ دیدا چارەسەرییە ئەوا خودێ کرییە تێدا، و دێ ب هەمیڤە نقۆکەیە د

ئاڤێ و خوارنێدا، دێ كەرستێ مفا هەمبەری كەرستێ ژەهری بیت و دێ زیانا وێ چیت، و ئەڤە نوژدارییەكە نوژدارێن مەزن و پێشەنگێن وان ناگەهنێ، بەلكو ئەڤە یا دەركەڤتی ژ رۆناهییا پێغەمبەرینییێ، و د گەل ڤێ ئەو نوژدارێ زانا و تێگەهشتی و سەركەڤتی خۆ دچەمینیت بۆ ڤێ چارەسەرییێ، و بریارێ ددەت كو ئەوێ ئەڤە بۆ هاتی ئەو تەكووزترینێ (أكمل) چێكرییانە، و ئەو یێ پشتەڤان لێ كرییە ب وەحییەكا خودایی دەرڤەی هێزا مرۆڤییە))[1].

---

١ـ الطب النبوي، ل ٨٩، و زاد المعاد (١١٢/٤).

# برێن کولییان

خودێ دبێژیت: (وَمَا يَعْلَمُ جُنُودَ رَبِّكَ إِلَّا هُوَ) [المدثر:٣١]، ئانکو: کەس نوزانیت کا خودایێ تە چەند لەشکەر هەیە و کا چنە.

ژ بلی خودێ کەس لەشکەرێن وی نوزانیت، ئەم جار جار گوهلێ دبین کو برێن کولییان دهێنە ڤەگوهاستن ژ دەڤەرەکێ بۆ دەڤەرەکا دی، و بەرهنگارییێ د ڤێ دەڤەرێدا دکەت، و ژ دەستێن وان کەسێن کاری بۆ نەهێلانا وان دکەن قورتال دبن و دچن بۆ جهەکێ دیتر، ئەڤ کولییێ مرۆڤ هزر دکەت کو یێ لاوازە تشتەکێ گەلەکێ ب مەترسییە.

هندەك زانا دبێژن: ((ئەو چەندییا خوارنێ یا کولی رۆژانە دخۆت هندی کێشا وییە))، و ئەگەر برەکا کولییان کێشا وێ هەشتێ هزار تەن بن، ئەڤە د ئێك رۆژدا هەشتێ هزار تەنێن خوارنێ دخۆن، و بەلکی ناڤێ وی (جراد) ژ ڤێ چەندێ هاتبیت، کو تشتەکی ناهێلیت نە ژ بەلگێن داران، و نە ژ بەرهەمێ وان، و نە ژ تیڤلێ وان، چو ناهێلیت.

د هەر کیلۆمەترەکا دوجاریدا ژ برێن کولییان د ناڤبەرا سەد ملیۆن، و دو سەد ملیۆن کولی یێن تێدا.

و درێژاهییا هندەك برێن کولییان دگەهیتە (٤٠٠) کیلۆمەتران - ئانکو ژ دیمەشقێ بۆ حەلەبێ، یان پتر، و هندەك برێن کولییان پێك دهێن پتر ژ چل هزار ملیۆن کولییان.

# خانییێ پیرتەڤنکێ

خودێ د پەرتۆکا خۆ یا پیرۆزدا دبێژیت: ﴿مَثَلُ الَّذِينَ اتَّخَذُوا مِنْ دُونِ اللَّهِ أَوْلِيَاءَ كَمَثَلِ الْعَنْكَبُوتِ اتَّخَذَتْ بَيْتًا وَإِنَّ أَوْهَنَ الْبُيُوتِ لَبَيْتُ الْعَنْكَبُوتِ لَوْ كَانُوا يَعْلَمُونَ﴾ [العنكبوت:٤١]، ئانکو: مەتەلا وان کەسان ئەوێت غەیری خودێ بۆ خۆ کرینە سەمیان و پشتەڤان (یان ژی ئەوێت بوت کرینە هەڤال و هەڤپشك بۆ خودێ)، وەکی مەتەلا تەڤنپیرکێیە خانییەك بۆ خۆ چێ کربیت (چونکی خانییێ تەڤنپیرکێ چو مفای ناگەهینیتێ، نە ژ گەرمێ و نە ژ سەرمایێ، و نە ژ بارانێ و نە ژ دژمنی دپارێزیت، هۆسا ئەوێت غەیری خودێ بۆ خۆ بکەنە پشتەڤان، ب چو ڕەنگان فایدەی ل وان ناکەن، و چو ژ وان نادەنە پاش)، و ب ڕاستی لاوازترین و سستترین خانی، خانییێ تەڤنپیرکێیە، ئەگەر ئەو بزانن.

خانییێ پیرتەڤنکێ لاوازترین خانییە، د دەقێ ڤێ ئایەتێدا: زانا دبێژن: ((إِنَّ) پیتەکا (مُشبَهٌ بالفعلِ) ژ بۆ دوپاتکرنا تشتی دهێت، ﴿وَإِنَّ أَوْهَنَ الْبُيُوتِ﴾، (لام) د سەرێ پەیڤا (لَبَيْتُ) د زمانێ عەرەبیدا دبێژنێ (لام المزحلقة) کو د بنیاتدا (لام)ا دوپاتکرنێیە، کو یا ڕاتەحسی ژ ناڤی بۆ خەبەرێ وێ))، ل ڤێرە دو دوپاتکرن یێن هەین د ئایەتێدا، خودێ دبێژیت: ﴿وَإِنَّ أَوْهَنَ الْبُيُوتِ لَبَيْتُ الْعَنْكَبُوتِ﴾، و خودێ دبێژیت: ﴿وَتِلْكَ الْأَمْثَالُ نَضْرِبُهَا لِلنَّاسِ وَمَا يَعْقِلُهَا إِلَّا الْعَالِمُونَ﴾ [العنكبوت:٤٣]، ئانکو: ڤان نموونەیان ئەم بۆ مرۆڤان دیار دکەین و کەس تێ ناگەهیت، زانا نەبن).. و ئەڤ پێناسە ئاماژێ ب تایبەتمەندییێ ددەت، کو زانایێن مێشەوەران ب تنێ نهێنییا ڤێ نیشانێ (ئایەتێ) دزانن.

د هندەك راڤەكرناندا يا هاتی خانییێ پیرتەڤنكێ یێ لاوازە، چونكی ژ گەرمێ ناهێتە پاراستن، و نە ژ سەرمایێ، و نە ژ بارانێ، و نە ژ بای، ژ بەر كو یا لاوازە ب بێ بهاییا وی، و كێمییا وی، ب ڤی شێوەی یا د هندەك راڤەكرناندا هاتی، بەلێ مامۆستایەكێ زانستێ مێشەوەران، ل كۆلیژا زانستی، ل زانكۆیا قاهیرە د هندەك پەرتۆكێن خۆ یێن زانستیدا دبێژیت: ((د ڤێ گۆتنا خودێدا: (كَمَثَلِ الْعَنْكَبُوتِ اتَّخَذَتْ بَيْتًا) ئیعجازا زانستی یا تێدا هاتی؛ چونكی ئەو پیرتەڤنكا خانی چێدكەت، یا مێیە، ل ڤێرە (تاء التأنيث) یا هاتی د ڤێ گۆتنا خودێدا: (كَمَثَلِ الْعَنْكَبُوتِ اتَّخَذَتْ بَيْتًا))).

یا مێیە تەڤنی درێسیت و خانی دورست دكەت، كو هەر یا مێیە بۆ یا نێر حەزێ چێ دكەت و دئینیتە د ناڤ خانیدا، كو یا مێ هندەك لڤینێن خاپاندنێ ل بەر وی دكەت، و یا نێر گوهـ ل هندەك ئاوازێن بڤڤێنا وێ دبیت، دێ یێ نێر چیتە د خانیدا، پشتی ئاڤزكرنێ (تەلقیحكرنێ) دێ یا مێ یا نێر خۆت ئەگەر خۆ نەهاڤێت و برەڤیت، و دێ نێچیركەت، و پاشی دێ تێژكێن خۆ ژی خۆت، و تێژكێن وێ ژی دێ ئێكدو خۆن، دێ خانی لاواز بیت زێدەباری لاوازییا خانییێ وێ، ئەو یا لاوازە د پەیوەندییێن ناڤخۆیی ژی، ئەڤ هەردو لاوازییە یێن د ئێك لاوازیدا (د ئێك خانیدا چێد بن).

و یا هاتییە گۆتن: ئەوێ رێكێ ددەتە هەڤژینا خۆ كو ل سەر وی زال ببیت، و بكەڤیتە د بن حەز و كۆنترۆلا ویدا، و گوهدانا وی تشتی بكەت ژ وێ ئەوا خودێ ژێ نەرازی ئەو وەكی جانەوەرانە، بەلكو خرابتر ژ وان؛ چونكی كەڤتنا یێ نێر د بن فەرمانا یا مێڤە ناچێبیت ب تنێ یا ل دەڤ گیانەوەر و گیاندارێن راگرتنێ هەی.

موسلمانێن ئەڤرۆ د كاودانێن نەخۆشدانە د گەل دژمنێن خۆ یێن جوهی و ئەوێن ل پشت وان، ئەگەر پشتبەستنا خۆ دا ژ بلی خودێ، و پشتبەستنا خۆ بر بۆ هێزێن عەردی، و خۆ رادەستی وان كر دێ مەتەلا وان: (كَمَثَلِ الْعَنْكَبُوتِ اتَّخَذَتْ بَيْتًا وَإِنَّ أَوْهَنَ الْبُيُوتِ لَبَيْتُ الْعَنْكَبُوتِ لَوْ كَانُوا يَعْلَمُونَ) [العنكبوت: ٤١].

# شاخێن هەستپێکرنێ د مێشەوەراندا

مرۆڤی دویرگەهـ داهێنان دا زێرەڤانییا لڤینێن ستێران بکەت، و لەشێن ب لڤین، و ئاڤ و هەوای، کی باوەر دکەت کو د زیندەوەراندا شاخێن هەستپێکرنێ یێن هەین، ب هندەك کاران رادبن مرۆڤ نەشێت بکەت؟

د مێشەوەرێن دنیایێدا کو ئەم کێم و بێ بها ددانین، وان ئامویرە یێن هەین هویربینترین وان ئامویرانە یێن مرۆڤی داهێناین، زانا دبێژن: ((د هندەك مێشەوەراندا شاخێن هەستپێکرنێ یێن هەین، پێشوازکەرێن کیمیایی یێن تێدا، بێهنان و بێهنێن خۆش وەردگرن، و بێهنێن کەرستان، دێ لڤینێن خۆ ب ڤێ دورست کەت، و دێ ل رزقێ خۆ گەریت، ل دویڤ وان پێزانینێن وەرگرتی ئەوێن ڤان پێشوازکەرێن کیمیایی داینێ)).

د هندەك مێشەوەراندا، شاخێن هەستپێکرنێ یێن هەین پێشوازکەرێن میکانیکی یێن تێدا ب ڤان گوهـ ل دەنگان دبن، هەست ب لڤینا بای دکەن وەکی ل دەڤ هندەك جۆرێن مێشان هەی، و ئەڤ پێشوازکەرێن میکانیکی ب لڤینێ کاریگەر دبن، و یا ئێکێ کاریگەر دبیت ژ پێکهاتا کیمیایی.

تشتەکێ دی: هندەك مێشەوەر یێن هەین، هەر وێ گاڤێ دهێن ب ئەگەرێ هەبوونا کەرستەکێ شرین، چاوا هات؟ ئەو دهێت ب رێکا پێشوازکەرێن کیمیایی.

چاوا ئەڤ مێشا مەزن دئێتە ڤی جهی؟ ژ بەر هەبوونا گیانەوەرەکێ مری، بێهنا وی د ناڤ هەوایدا بەلاڤ دبیت، و دێ ئەڤ مێشە هەست پێ کەت، و دێ هێتە ڤی جهی، ئەڤە

پێشوازکەرێن کیمایینە، تشتێ ژ ڤێ سەیرتر ئەوە کو هندەك پێشوازکەرێن د هندەك مێشەوەراندا هەین هەست ب تیشکا ژێر سۆری دکەن، و دەمێ هەستپێکرنا وێ بەردەوام بوو ب ڤی تشتێ گەرم، ب ڤێ تیشکێ ئەو دێ د گەل وی راست مینیت، ئەگەر هەستپێکرن نێزیك هات، دێ ئەو ب شێوێ پانییێ ڤەبڕیت، و ئەگەر ژ لایێ سینگیڤە هات دێ هەستپێکرن یا بەردەوام بیت، و دێ بەرەڤ چیت، و ئەڤ ئامویرە یێ د پێشییێدا ژی هەی. ئەگەر دو مرۆڤ د جهەکیدا د نڤستی بن، یێ ئێکێ تا لێ بیت، گەرماتییا وی یا بلند بیت، و پێشی سێ مەتران یا ژێ دویر بیت دێ وی جوداکەت ئانکو دزانیت کو تا یا لێ، ژ بەر کو شاخێن هەستپێکرنێ یێن هەین، کو دویماهییێن ڤان شاخان هەست ب تیشکا ژێر سۆری دکەت، دێ ب تنێ هێتە وی.

# ليستا ژێدەر و لێڤەگەڕان


١- القرآن الكريم (**تەفسیرا ژیان**).

٢- تفسيرالطبري، دار الفكر، بيروت، ١٤٠٥هـ.

٣- تفسير ابن كثير، دار الفكر، بيروت، ١٤٠١ هـ.

٤- تفسير القرطبي، دار الشعب، القاهرة، ط٢، تحقيق أحمد عبدالحليم البردوني.

٥- تفسير الجلالين، جلال الدين السيوطي، جلال الدين المحلي، دار الحديث، القاهرة، ط.١

٦- صحيح البخاري، دار ابن كثير، اليمامة، بيروت، ١٤٠٧هـ، ١٩٨٧م، ط٣، تحقيق د. مصطفى ديب البغا.

٧- صحيح مسلم، دار إحياء التراث العربي، تحقيق فؤاد عبد الباقي.

٨- سنن الترمذي، دار إحياء التراث العربي، بيروت، تحقيق أحمد محمد شاكر، وآخرين.

٩- سنن أبي داود، دار الفكر، بيروت، تحقيق محمد محيي الدين عبد الحميد.

١٠- سنن ابن ماجه، دار الفكر، بيروت، تحقيق فؤاد عبدالباقي.

١١- سنن النسائي الكبرى، دار الكتب العلمية، بيروت، ١٤١١هـ / ١٩٩١م، تحقيق عبد الغفار سليمان البنداري، سيد كسروي حسن.

١٢- مسند الإمام أحمد، مؤسسة قرطبة، مصر.

١٣- موطأ الإمام مالك، دار إحياء التراث العربي، تحقيق محمد فؤاد عبد الباقي.

١٤- سنن الدارمي، دار الكتاب العربي، بيروت، ١٤٠٧هـ، تحقيق فواز أحمد زمرلي، خالد السبع العلمي.

١٥- مصنف عبد الرزاق، الكتب الإسلامي، بيروت، ١٤٠٣هـ، ط٢، حبيب الرحمن الأعظمي.

١٦- مصنف ابن أبي شيبة، مكتبة الرشد، الرياض، ١٤٠٩هـ ط١، كمال يوسف الحوت.

١٧- صحيح ابن حبان، مؤسسة الرسالة، بيروت، ط٢، ١٤١٤هـ/١٩٩٣م، تحقيق شعيب الأرناؤوط.

١٨- صحيح ابن خزيمة، المكتب الإسلامي، بيروت، ١٣٩٠هـ، ١٩٧٠م، تحقيق: محمد مصطفى الأعظمي.

١٩- المعجم الكبير، الطبراني، مكتبة العلوم والحكم، الموصل ١٤٠٤هـ/١٩٨٣م، ط٢، تحقيق: حمدي السّلفي.

٢٠- المستدرك على الصحيحين، الحاكم، دار الكتب العلمية، بيروت، ١٤١١هـ، ١٩٩٠م، تحقيق عبد القادر عطا.

٢١- شعب الإيمان، البيهقي، دار الكتب العلمية، بيروت، ١٤١٠هـ، ط١، تحقيق: محمد السعيد بسيوني زغلول.

٢٢- مسند الشهاب، القضاعي، مؤسسة الرسالة، بيروت، ١٤٠٧هـ/١٩٨٦م، ط٢، تحقيق: حمدي السّلفي.

٢٣- الجامع الصغير، السيوطي، دار طائر العلم، جدة، تحقيق: عبد الرؤوف المناوي.

٢٤- كشف الخفاء، العجلوني، مؤسسة الرسالة، بيروت، ١٤٠٥هـ، ط٤، تحقيق: أحمد القلاش.

٢٥- الزهد عبد الله بن المبارك، دار الكتب العلمية، بيروت، تحقيق: حبيب الرحمن الأعظمي.

٢٦- أسنى المطالب في أحاديث مختلفة المراتب، محمد السيد درويش الحوت، دار الكتاب العربي، بيروت، ١٤٠٣هـ، تحقيق: خليل الميس.

٢٧- الفردوس بمأثور الخطاب، الديلمي الهمذاني، دار الكتب العلمية، بيروت، ١٩٨٦، ط١، تحقيق السعيد بن بسيوني زغلول.

٢٨- علل الدارقطني، دار طيبة، الرياض، ١٤٠٥هـ/١٩٨٥م، ط١، تحقيق محفوظ الرحمن زين الله.

٢٩- تلخيص الحبير، ابن حجر، المدينة المنورة، ١٣٨٤هـ/١٩٦٤م، تحقيق: السيد عبد الله هاشم اليماني المدني.

٣٠- فتح الباري، شرح صحيح البخاري، ابن حجر، دار المعرفة، بيروت، تحقيق فؤاد عبد الباقي، محب الدين الخطيب، ١٣٧٩هـ.

٣١- شرح صحيح مسلم، النووي، دار إحياء التراث العربي، بيروت، ١٣٩٢هـ.

٣٢- شرح معاني الآثار، الطحاوي، دار الكتب العلمية، بيروت ١٣٩٩هـ، ط١، تحقيق محمد زهري النجار.

٣٣- السيرة النبوية، ابن هشام، دار الجيل، بيروت، ١٤١١هـ، ط١، تحقيق: محمد السعيد بسيوني زغلول.

٣٤- الطب النبوي، ابن القيم، دار الفكر، بيروت، تحقيق: عبد الغني عبد الخالق.

٣٥- زاد المعاد، ابن القيم، مؤسسة الراسالة – مكتبة المنار الإسلامية، بيروت – الكويت، ١٤٠٧هـ/١٩٨٦م، ط١٤، تحقيق: شعيب الأرناؤوط – عبد القادر الأرناؤوط.

٣٦- لسان العرب، ابن منظور، دار صادر، بيروت – لبنان، ط١، ١٩٩٧م.

٣٧- مجمع الزوائد، أبو بكر الهيثمي، دار الريان للتراث، دار الكتاب العربي، القاهرة، بيروت١٤٠٧هـ.

٣٨- شرح العمدة، ابن تيمية، مكتبة العبيكان، الرياض، ١٤١٣هـ، تحقيق: د. سعود صالح العطيشان.

٣٩- بدائع الفوائد، ابن قيم الجوزية، مكتبة نزار مصطفى الباز، مكة المكرمة، ١٤١٦هـ/١٩٩٦م، تحقيق: عبد العزيز عطا، عادل عبد الحميد العدوي.

٤٠- المستطرف في كل فن مستظرف، أبو الفتح الأبشيهي، دار الكتب العلمية، بيروت، ١٩٨٦م، ط ٢، تحقيق: د. مفيد محمد قميحة.

٤١- القاموس المحيط، الفيروزآبادي.

٤٢ - مختار الصحاح، الرازي، دار العلوم، تحقيق: د. مصطفى البغا.

٤٣- موسوعة النباتات المفيدة، فريد بابا عيسى، دار عكرمة، دمشق، ٢٠٠٢م.

٤٤- روائع الطب الإسلامي، القسم العلاجي، الجزء الأول ، دار المعاجم، ط١، ١٤١٥هـ/١٩٩٤م.

٤٥- الأنوار في شمائل النبي المختار، الحسين بن مسعود البغوي، تحقيق: إبراهيم اليعقوبي، دار المكتبي، الطبعة الثانية، ١٩٩٩م.

٤٦- الطب الوقائي بين العلم والدين، د. نضال عيسى، دار المكتبي، الطبعة الأولى، ١٩٩٧م.

٤٧- أساسيات علم المفاصل، أنس القطيفاني – دانة الفقير، جامعة دمشق، ١٩٩٩م.

٤٨- إعجاز القرآن في العلوم الجغرافية، محمد مختار عرفات، دار إقرأ، ط١، ٢٠٠٣م.

٤٩- اعرف جسدك، سلسلة الثقافة العامة، ترجمة العقيد ماجد العظمة، سلسلة الثقافة العامة.

٥٠- اعرف نفسك، د. فاخر عاقل، دار العلم للملايين، ط٣، ١٩٧٤م.

٥١- الأسودان التمر والماء، د. حسان شمسي باشا، دار المنارة (السعودية) ط١، ١٩٩٢م.

٥٢- الأمراض الشائعة، د. محيي الدين طالو العلبي، دار ابن كثير، ط١، ١٩٨٩م.

٥٣- الأمراض النفسية وعوامل الشد إلى الخلف، د. مأمون حموش، دار المأمون، ط١، ٢٠٠٣م.

٥٤- الإنسان بين العلم والدين، شوقي أبو خليل، دار الفكر، ط٥، ١٩٨٩م.

٥٥- الأنسان ومعجزة الحياة، د. خلوق نور باقي، مؤسسة الرسالة، ط١، ١٩٩٨م، ترجمة أورخان محمد علي.

٥٦- الإيدز والأمراض الجنسية، د. محيي الدين طالو العلبي، دار ابن كثير، ط١، ١٩٨٨م.

٥٧- الإيدز وباء العصر، د. محمد علي البار – د. محمد أيمن صافي، دار المنارة، ط١، ١٩٨٧م.

٥٨- الأسرار الطبية الحديثة في السمك والحوت، د. حسان شمسي باشا، دار المنارة (السعودية)، ط١، ١٩٩١م.

٥٩- الانفجار الكبير أو مولد الكون، أميد شمشك، مؤسسة الرسالة، ط١، ١٩٩٨م، ترجمة أورخان محمد علي.

٦٠- البدانة والسمنة، د. حلمي رياض جيد، دار المعارف، ١٩٦٩م.

٦١- التغذية والنمو، د. محمد غسان سلوم، جامعة دمشق، ط٤، ١٩٩٤م.

٦٢- الجديد في أمراض التدخين، د. نضال عيسى، دار المكتبي، ط١، ١٩٩٤م.

٦٣- الجنين المشوه والأمراض الوراثية، د. محمد علي البار، دار القلم – دار المنارة، ط١، ١٩٩١م.

٦٤- الحبة السوداء بين الدين والطب، د. عبد الرحمن النجار، دار العلوم القرآن، ط١، ١٩٩٢م.

٦٥- الختان بين الطب والشريعة، د. عبد الرحمن القادري، دار ابن النفيس، ط١، ١٩٩٦م.

٦٦- الخنزير بين ميزان الشرع ومنظار العلم، د. أحمد جواد، دار السلام (القاهرة)، ط١، ١٩٨٧م.

٦٧- الدخان أحكامه وأضراره، عبدالكريم محمد نصر، ١٩٩٦م.

٦٨- الدليل الطبي والفقهي للمريض في شهر الصيام، د. حسان شمسي باشا، دار السوادي (جدة).

٦٩- الدماغ بنيته ووظائفه، عمران المقداد، جامعة دمشق، ١٩٨٦م.

٧٠- الدين في مواجهة العلم، وحيد الدين خان، دار النفائس، ط٤، ١٩٨٧م، ترجمة ظفر الإسلام خان.

٧١- السجائر حلال أم حرام، د. عبد الصبور شاهين، الدار الذهبية.

٧٢- السواك في ميزان الصيدلة، علي الرغبان – فراس رزوق – مجاهد كرمان، دار فصلت، ط١، ١٩٩٧م.

٧٣- الشفاء بالحبة السوداء، فرح عبد الحميد القداحي، دار الإسراء (القاهرة)، ١٩٩٨م.

٧٤- الشمس والقمر بحسبان،.. أحمد عبد الجواد، دار هاشم الكتبي.

٧٥- الطب الإسلامي، محيي الدين طالو العلبي، ابن كثير، ط١، ١٩٩٢م.

٧٦- الطب المجرب، خالد سيد علي، مكتبة دار التراث (الكويت)، ط٥، ١٩٩٣م.

٧٧- الطب النبوي في ضوء العلم الحديث، د. غياث حسن الأحمد، دار المعجم، ط١، ١٩٩٥م.

٧٨- الطب النبوي والعلم الحديث، د. محمد ناظم النسيمي، الشركة المتحدة، ط١، ١٩٨٤م.

٧٩- الطب محراب الإيمان، د. خالص كنجو جلبي، مؤسسة الرسالة، ١٩٧١م.

٨٠- الطقس، أ. ج فور سدايك، معهد الإنماء العربي (بيروت)، ١٩٨١م، ترجمة نبيلة (هيلين) منسي.

٨١- العلاج بالنبات، وديع جبر، دار الجيل، ط١، ١٩٨٨م.

٨٢- العلم في حياة الإنسان، د. عبد الحليم منتصر، كتاب عربي، ١٩٨٤.

٨٣- العلم في منظوره الجديد، روبرت م. أغروس، سلسلة عالم المعرفة، عدد ١٣٤، ترجمة د. كمال خلايلي.

٨٤- العلم والدين مناهج ومفاهيم، د. أحمد عروة، دار الفكر، ط١، ١٩٨٧م.

٨٥- العلم يدعو إلى الإيمان، أكريسي موريسون، مكتبة النهضة المصرية، ط٣، ١٩٥٨م، ترجمة محمود صالح الفلكي.

٨٦- العلوم في القرآن، د. محمد جميل الحبال – د. مقداد مرعي الجواري، دار النفائس، ط١، ١٩٩٨م.

٨٧- الغذاء لا الدواء، د. صبري القباني، دار العلم للملايين، ط٣، ١٩٦٦م.

٨٨- الفيزياء المسلية، ياكوف بيريلمان، دار مير (موسكو)، ط٥، ١٩٧٧م، ترجمة د. سليمان المنير.

٨٩- القرآن وعلم النفس، د. عبد العلي الجسماني، العربية للعلوم، ط١، ١٩٩٩م.

٩٠- القرآن المكين، د. مأمون شقفة، دار حسان، ط٢، ١٩٨٧م.

٩١- الكوكب الوطن، كيفن دبليوكيلي، دار مير (موسكو).

٩٢- الكون وأحجار الفضاء، محمد فتحي عوض، دار الوثبة.

٩٣- الكون والأرض والإنسان في القرآن العظيم، رجا عبد الحميد عرابي، دار الخير، ط١، ١٩٩٤م.

٩٤- الله والعلم الحديث، عبد الرزاق نوفل، دار مصر للطباعة، ط٢.

٩٥- الله يتجلى في عصر العلم، نخبة من العلماء الأمريكيين، دار إحياء الكتب العربية، ترجمة د. الدمرداش عبد المجيد سرحان.

٩٦- الميلاتونين هل هو الدواء السحري، د. حسان شمسي باشا، دار المنارة (السعودية) ط١، ١٩٩٦م.

٩٧- النحلة تسبح الله، محمد حسن الحمصي، ط١، ١٩٧١م.

٩٨- النفس بين العلم والدين، محيي الدين مقري، مطبعة عكرمة، ط١، ١٩٩٦م.

٩٩- الوافي في تخطيط القلب الكهربائي، د. ضياء الدين الجماس – د. عبدالملك الكزبري، مكتبة الرازي ط١، ١٩٨٧م.

١٠٠- الوجيز في أمراض الكبد، ليلى محمد أديب المؤيد العظم – نهى أحمد كامل، جامعة دمشق، ١٩٩٨م.

١٠١- بدائع السماء، جيرالد هوكز، ترجمة: د. عبد الرحيم بدر، المكتبة العصرية (صيدا)، ١٩٦٧م.

١٠٢- تشريح وفيزيولوجيا الإنسان، فاسيلي تاتارينوف، دار مير (موسكو)، ١٩٨٣م.

١٠٣- جهاز التنفس، مجموعة من الأطباء، جامعة دمشق، ١٩٨٠م.

١٠٤- حرب النجوم، عاطف معتوق.

١٠٥- حركة الأرض ودورانها، محمد علي الصابوني، دار القلم، ط١، ١٩٩١م.

١٠٦- خلق الإنسان بين الطب والقرآن، محمد علي البار، الدار السعودية للنشر، ط٤، ١٩٨٣م.

١٠٧- دراسات حول الطب الوقائي، مجموعة من الأطباء، مجلة الكتاب العربي (١٧)، ١٩٨٧م.

١٠٨- دليل الأنفس بين القرآن الكريم والعلم الحديث، توفيق محمد عزالدين، دار السلام (القاهرة) ط١، ١٩٨٦م.

١٠٩- دليل العائلة الطبي، جان غوميز، دار الحوار، ط٢، ١٩٨٨م.

١١٠- دور الجراثيم في حياتك، ليو شنيدر، منشورات وزارة الثقافة، ١٩٨١م، ترجمة غسان مصري زادة.

١١١- رحلة الإيمان في جسم الإنسان، حامد أحمد حامد، دار القلم، ط١، ١٩٩١م.

١١٢- روائع الطب الإسلامي، د. محمد نزار الدقر، دار المعاجم، ط١، ١٩٩٥م.

١١٣- سبعون برهاناً علمياً، ابن خليفة، دار الإيمان، ط٣، ١٩٨٨م.

١١٤- شفاء التباريح والأدواء في حكم التشريح ونقل الأعضاء، الشيخ إبراهيم اليعقوبي، مطبعة خالد بن الوليد، ط١، ١٩٨٦م.

١١٥- طبيبك معك، د. صبري القباني، دار العلم للملايين، ط.٧

١١٦- طعامك سليماً وسقيماً، د. ضياء الدين الجماس، مركز نو الشام للكتاب، ١٩٩٩م.

١١٧- عظمة الرحمن في خلق الإنسان، علي الشيخ علي، جامعة دمشق، ١٩٧٧م.

١١٨- علم النفس الإسلامي، محمد رمضان القذافي، منشورات صحيفة الدعوة الإسلامية، ط١، ١٩٩٠م.

١١٩- غرائب مخلوقات الله، لطفي وحيد، المكتب الجامعي الحديث، ١٩٩٠م.

١٢٠- غريزة أم تقدير إلهي، شوقي أبو خليل، دار الفكر، ط٦، ١٩٨٧م.

١٢١- فيه شفاء للناس العسل، د. محمد نزار الدقر، دار الكتب العربية.

١٢٢- قصة العناصر، ألبير دوكروك، منشورات وزارة الثقافة، ١٩٨١م ، ترجمة وجيه السمان.

١٢٣- قصص وطرائف عن الفلزات، س. فينيتسكي، دار مير (موسكو)، ١٩٨٤م، ترجمة: عيسى مسوح.

١٢٤- كتاب المعرفة الحيوان، د. عبد النعم عبيد، شركة ترادكسيم.

١٢٥- كتاب المعرفة جسم الإنسان، د. عبد النعم عبيد، شركة ترادكسيم.

١٢٦- كتاب المعرفة النبات، د. عبد النعم عبيد، شركة ترادكسيم.

١٢٧- ما هي نظرية النسبية، لانداو ورومر، دار مير (موسكو) ط٤، ١٩٧٨م.

١٢٨- ماذا في العلم والطب من جديد، مجموعة من الأطباء، كتاب العربي (٢١).

١٢٩- مبادىء البيولوجيا، إرينا كروزينا، دار مير (موسكو)، ط٢، ١٩٨٢م.

١٣٠- مبادىء التشخيص في الطب الباطني، مجموعة من الأطباء، جامعة دمشق، ١٩٩٩م.

١٣١- مع الطب في القرآن الكريم، د. عبد الحميد دياب – د. أحمد قرقوز، مؤسسة علوم القرآن، ط١، ١٩٨٠م.

١٣٢- مع الله في السماء، د. أحمد زكي، دار الهلال (القاهرة).

١٣٣- معالجة التدخين بين الأطباء والمشرعين، د. ضياء الدين الجماس، دار ابن حيان.

١٣٤- معجزات الشفاء في الحبة السوداء والعسل والثوم والبصل، أبو الفداء محمد عزت محمد عرف، دار تهامة.

١٣٥- معجزات في الطب للنبي العربي (صلى الله عليه وسلم)، د. محمد سعيد السيوطي، مؤسسة الرسالة، ط٢، ١٩٨٦م.

١٣٦- مقدمة في علم الخلية والجنين، هاني رزق، جامعة دمشق، ١٩٨٦م.

١٣٧- من أسرار وإعجاز القرآن الكريم، محمد أديب النابلسي، مكتبة دار الصفا، ط١، ١٩٩٩م.

١٣٨- من علم الطب القرآني، عدنان الشريف، دار العلم للملايين، ط١، ١٩٩٠م.

١٣٩- من علم الفلك القرآني، عدنان الشريف، دار العلم للملايين، ط١، ١٩٩١م.

١٤٠- من علم النفس القرآني، عدنان شريف، دار العلم للملايين، ط١، ١٩٨٧م.

١٤١- موسوعة الشباب، مجموعة من المؤلفين، شركة ميدليفانت.

١٤٢- موسوعة بهجة المعرفة، الشركة العامة للنشر والتوزيع و الإعلان.

١٤٣- موسوعة لايف الأرض، آرثر بيزر، مؤسسة تايم، ترجمة: محمد جمال الدين الفندي.

١٤٤- موسوعة لايف البحر، ليونارد إنجيل، مؤسسة تايم، ترجمة: د. عزت خيري.

١٤٥- موسوعة لايف الكون، دافيد برجاميني، مؤسسة تايم، ١٩٧١م، ترجمة: نزيه الحكيم.

١٤٦- موسوعة لايف جسم الإنسان، آلان أ. نورس، مؤسسة تايم، ١٩٦٨م.

١٤٧- مولد طفل، روبرت لافون، شركة ترادكسيم، ١٩٧٧م، ترجمة: محمد نصر.

١٤٨- نحل العسل في القرآن والطب، د. محمد علي البني، مركز الأكرام، ط٢، ١٩٨٧م.

١٤٩- وفي الصلاة صحة ووقاية، د. فارس علوان، دار السلام (القاهرة)، ط١، ١٩٨٩م.

١٥٠- معجزة القرآن، محمد متولي الشعراوي، المختار الإسلامي، مصر.

١٥١- التوحيد، عبد المجيد الزنداني، التراث الإسلامي، مصر.

١٥٢- الإعجاز الطبي في القرآن، السيد الجميلي، دار ومكتبة الهلال، مصر.

١٥٣- الإسلام ملاذ كل المجتمعات الإنسانية، محمد سعيد رمضان البوطي، دار الفكر، دمشق.

١٥٤- التمر دواء ليس فيه داء، محمد عبد الرحيم، دار أسامة بيروت.

١٥٥- تنبيه العقول الإسلامية لما في آيات القرآن من العلوم الكونية، ترجمة: عبد الرحمن عيسى، محمد نجيب المطيعي.

١٥٦- الإسلام والحقائق العلمية، محمود القاسم، دار الهجرة، مصر.

١٥٧- القرآن وعلوم العصر الحديثة، إبراهيم فواز عراجي، دار النهضة العربية، مصر.

١٥٨- الإسلام يتحدى، وحيد الدين خان، دار الجيل المسلم، مصر.

١٥٩- الطب محراب الإيمان، خالص جلبي، دار النفائس، بيروت.

“ ڤەکۆلینەکا بابەتێ - ئایینی - زانستییە بۆ نیشانێن گەردوونیی، و موعجیزەیێن خودایێ مەزنن د بەرفرەهییێن گەردوونیدا، و ئەو بەلگەیێن گەش یێن تێدا ل سەر شیانا خودایی یا ڤەبڕ ژ چێکرنێ و داهێنانێ. پەرتۆکەکا زیندییە د وەرگرتن و گەهشتنا دوماهییا هەمی وان تشتێن د ژیانێدا هەی کو ئەو بەلگەنە شیانا خودێ دیار دکەن، و بەلگەیێن ڤەبڕن کو بەرێ هەر هزرکەرەکی ددەتە باوەری ئینانێ ب چێکەرێ مەزن و پەروەردگارێ کار بنەجهدا. ب ڕاستی دانەرێ پەرتۆکی مە دبەتە گەشتەکا خۆش و ب مفا؛ چونکی د پەرتۆکا خۆدا ئەو تشتێ کۆمکری یێ ل دەڤ خواندەڤانی گرنگ ژ زانینا موعجیزەیێن خودایی دڤی گەردوونێ بەرفرەهدا. و گەشت و پێزانینێن وی ژ ژێدەرێن باوەرپێکری هاتینە وەرگرتن و لێڤەگەڕێن پشت بەستی ، کو ژ سەد و پێنجی جوینا پترن، و یێن کورتکری د ڤێ پەرتۆکێدا، و بەرهەمێ ئەزموونێ پێشکێشی خواندەڤانی کرییە، و کاکلکا خواندنەکا بەرهەمدار، ب شێوازەکێ زانستی یێ رۆهن، دناڤبەرا جوانییا رستە و هویربینییێن وێ، و ساناهییا بێژە و مەزناهییا وان، دگەل رۆهنکرنێ، و ژێگرتنا وان پەیڤێن رامانێ دگەهینن، و بڤێ چەندێ ئەو ئەنجامێ مەرەم پێ هەیی دگەهینیت ، و وئارمانجا خواستی بجهـ دئینیت. ”

Design: **Muhammed** Hussein